٧

دەزگەی شاراوەی ئاژانسی هەواڵگری
ئاوەندی ئەمریکی (سی. ئای. ئەی)

بە درێژایی 34 ساڵ وەك سیخوڕێكی ئەفسانەیی بوو،
سەرۆكی ئۆپەراسیۆنە نهێنییەكان بوو لە نێوەندی
سی ئای ئەی، هەماهەنگی وەزارەتی دەرەوەی
ئەمریكی بوو بۆ كاروباری نەهێشتنی تیرۆر

هێنری کرامبتۆن

وەرگێڕانی:
ڕەسووڵ عەزیز محەمەد

هینری ا. کرامبتۆن

# هونەری سیخوڕی

## دەزگەی شاراوەی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی (سی. ئای. ئەی)

بەدرێژایی ٢٤ ساڵ وەك سیخوڕێکی ئەفسانەیی بوو، سەرۆکی ئۆپراسیۆنە نهێنییەکان بوو لە نێوەندی سی ئای ئەی، هەماهەنگی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی بوو بۆ کاروباری نەهێشتنی تیرۆر.

وەرگێڕانی

رەسووڵ عەزیز محەمەد

ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# هونەری سیخوڕی

## دەزگەی شاراوەی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی (سی. ئای. ئەی)


- بابەت| هەواڵگری
- نووسینی| هێنری ا.کرامبتۆن
- وەرگێڕانی بۆ کوردی | ڕەسووڵ عەزیز محەمەد
- نەخشەسازی ناوەوە| موحەمەد حوسێن خەتی
- چاپ| یەکەم - ٢٠٢١
- تیراژ| ١٠٠٠ دانە
- نرخ| ١٠.٠٠٠ دینار

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (     ) ی ساڵی (٢٠٢١)ی وەرگرتووە

# ناوەڕۆك

# پێشەکیی وەرگێڕ

لە نێوەندی ئەم کتێبەدا زۆر بابەت ئاشکرا دەکرێ، سەبارەت بە چۆنیەتی کۆکردنەوەی زانیارییەکان، لە لایەن دەزگە سیخوڕی و هەواڵگرییەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو راپۆرتانەی بۆ دەستبەسەرداگرتنی شوێنێك یان نەیار و یاخیبوویەك.

ئەو سیخوڕەی لێرەدا باس لە خۆی و کارەکانی دەکات، جەخت لەوە دەکاتەوە، هەر جوولەیەکی بۆ خزمەتکردنی وڵاتەکەی بووە، هەردەم ویستوویەتی نەیار و دوژمنان زەفەر بە وڵاتەکەیان نەبەن، نەوەك تیرۆریستان بە ئارەزووی خۆیان بیکەن بە مۆڵگەیەك بۆ داپڵۆسین و کوشتن و بڕین.

لە لایەکی دیکەوە لە هەنگاوی یەکەمەوە باس لە داگیرکردنی ئەفغانستان دەکات، ئەوەش دەخاتە روو، هەواڵگری و سیخوڕی چ کاریگەریەکی هەبووە لە دەستنیشانکردنی هەموو شتێك لەو وڵاتەدا، چۆن توانیویانە خەڵکی ئەو وڵاتە لە دۆخێکەوە ببەن بۆ دۆخێکی دیکە، زیاتریش مکوڕە لەسەر ئەوەی سیخوڕی و هەواڵگری هۆیەکە بۆ ئەوەی بەرچاومان روونتر بێ تا بزاندرێ جەنگ و شەڕ لە دژی کێدا بەرپا دەکرێ.

نووسەری ئەم کتێبە خۆی سیخوڕێکی پیشەگەر بووە، بۆیە هەموو هەنگاوەکانی سیخوڕبوون و هەواڵگری و کۆکردنەوەی زانیارییەکان و چۆنیەتی شیکردنەوەی باس دەکات، هەر لە منداڵیشەوە وەك خولیایەك ویستوویەتی ببێتە

سیخوڕ، زۆر شوێن و وڵات و کیشوەر گەڕاوە، لە کاری سیخوڕیدا زۆر بابەتی بۆ روون بۆتەوە، هەموو خاڵێکی ژیانی وەك باس دەکات، لە خزمەت وڵاتەکەیدا بووە.

**وەرگێڕ: رەسووڵ عەزیز محەمەد**

**٢٠٢٠-١١-٥**

**هەولێر- کوردستان**

# پێشەکی

لە هاوینی ٢٠٠٢ دەستم بە راپەڕاندنی کارێکی نوێ کرد، ئێستا کاتی گۆڕانکارییە، دوای ئەوەی بۆ ماوەی بیست ساڵ کارم کرد لە نێو دەزگەی شاراوەی (سی، ئای. ئەی)، ئەمەش دوای ئەو دە مانگە دێ، کە هەڵمەتی سەربازی ئەمریکی لە ئەفغانستان دەستی پێ کرد.

کارەکە جۆرێك بوو لەو کارانەی، کە دەرچوونە لە خود و دەروونی خۆت، چونکە، بەبێ هەلیکۆپتەری "ئێم ئەی ١٧" نە فرۆکەی "برید ئاتۆری" بێ فرۆکەوان، یاخود تفەنگی "ئێم ٤" و دەمانچەی "گلۆت"ی ١٩ ملم، هەروا بەبێ ئەو گولەبەندانەی داپۆشرابوو بە سیرامیك، بەبێ دەرزییەکانی زانین و دۆزینەوەی درۆ، بەبێ خۆشاردنەوە بوو، واتە هیچ بنەمایەکی پیشەکەی تیادا نەبوو، پێویستیشی بەوە نەدەکرد چاودێری هیچ کام لە هاوڕێیەکانم بکەم، بە هیچ شێوەیەك بوونی تیرۆریستەکان بە گرنگ نازانم تا هێرش بکەمە سەریان، کەچی کارەکە تەنیا تێکەڵبوونە بە کلتورێك، لە لای من زۆر نامۆیە، هەروەها دەبێ شێوازەکانم رێك بخەم و کەسایەتییەکی جیا بۆ خۆم دروست بکەم.

جارێکی دیکە وەك قوتابییەك گەڕامەوە بۆ زانکۆ.

سی ئای ئەی مۆڵەتێکی ئەکادیمی لە کۆلیژی (پۆڵ هـ نیتزە)ی پێ بەخشیم، کە سەر بە ئەکادیمیای نێودەوڵەتیی پێشکەوتوو بوو لە زانکۆی جونز هوبکینز، ئەم کارەش سەرکێشی تیادا بوو، بەڵام زۆر هێمنتر بوو، واتە ئەزموونێکی مۆدێرنانە بوو، ئەمە و لە ساڵێکی ئەکادیمیای تەواو، چوومە نێوەندی قوڵایی

کتێبەکانی هزری سیاسی و ستراتیژیی سەربازی چین و مێژوو و سیاسـەتی دەرەوە و تیرۆر و فەلسەفە، بۆیە زۆرم لەم زانست و خوێندنەوانە بینی.

سەرسوڕماو بووم، کاتێك لە نێوەندی ڕێبەری بەرنامەکانی بەهاری ٢٠٠٣دا گەڕام، بەرامبەر بە کارێکی پێشبینینەکراو بووم: کاتێك لەوانـەکانی هـەواڵگری ناونیشانێك بۆ لای خۆی ڕاکێشام، ناونیشانەکە بە نـاوی "هونـەری هـەواڵگری و پیشەگەرییەکەی"، لە لایەکی دیکەوە، گەڕانەکانم سەبارەت بەو بابەتانە بوو، کە دکتۆرە جینفەر سیمس وانەکانی دانابوو، ئەو ژیانی پیشەیی جێگەی سەرسوڕمان بوو، چ لە نێوەندی ئەکادیمیا یان حکومەت، جگە لەوەی خەسـڵەتێکی بـەهێزیش هەبوو وەك توێژەر.

بۆیە من وەك پیشەگەرێکی کۆن لە نێوەندی هەواڵگری سی ئای ئەی، هـانی دام لەنێو وانەکانیدا بەتەواوی گوێڕاگر بم، ئەوە جگە لـەوەی هەسـتم بـەوە کـرد، خوێندنەکە پڕ لەخۆشی دەبێ.

بەڕاستی وانەکان جێگەی تێڕامان بوون، لەوێدا باسمان لەوە کرد، کـە جـۆرج واشنتنۆن کاری کردووە، وەك یەکێك لە گەورە پیاوانی سیخوڕی ئـەمریکی، لـەو کاتەی توانیویەتی بە تەکتییکەکانی هەموو پیاوانی سـیخوڕی بجووڵێنێـت، لـەو کاتەی بەهایەکی ستراتیژی داوەتە کاری هەواڵگری، هەروا وانەی تواناکانم خوێند لە شەڕی ناوخۆیی ئـەمریکی، لەوێـدا زانیمـان، کـە سـەرۆك لینکـۆلن زۆربـەی ڕۆژەکانی لە ژووری تیلیگرافی کۆشکی سـپی بەسـەر بـردووە، لـە پاشـاندا ئـەو ژوورەی گۆڕیووە بە بنکەی هەواڵگری و سەرکردایەتی، هەر لەوێدا بەردەوامبووین لە خوێندنی وانەکانی گەیاندنی بێتـەل و فرۆکـە و ڕادار و مانگەدەسـتکردەکان،

جگە لەوەی بەشێکی تایبەت بە تەکنیکی ئەو باسانە، لەو کاتەی لە سەدەی بیستەمدا چۆن کاری هەواڵگری بەرەو پێشەوە چووە.

تێبینی ئەوەمان کرد چۆن زۆربەی سەرکردە سیاسییەکان، سیاسەتی ئاسایشی نەتەوەیی دادەڕێژن و لەپاشاندا شەڕ هەڵدەگیرسێنن، کەچی لەدواتردا شکست دەهێنن، ئەمەش پێچەوانەی واشنتن و لینکۆلنە لە چۆنیەتی تێگەیشتنیان لە هەواڵگری یان چۆن ڕێز لەو کارە بگرن، لە کاتێکدا بەشێك لەشکستەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ هاوکاتی گۆڕانکاری جیۆسیاسی و ئەو زانیارییە هەڵانەی دەخرێتە ڕوو، لەو کاتەی کە زانیارییەکان کۆدەکرێتەوە و لەپاشاندا شیکردنەوەی بۆ دەکرێ، بەتایبەت کاتێ ڕوانینی حکومەت و کۆمەڵگە و پیشەگەرانی هەواڵگری و خەیاڵی کارتۆنی بەپێی پێشبینییەکان دەخرێتە ڕوو، زۆرجار باسەکانی عەقڵانی نین، بۆیە پێویستە ئەفسەر و بریکارەکان لە ڕێڕەوی مێژووی ئەمریکادا وەك نەتەوە بیربکەنەوە، ئەگەر وانەبێ ئەوا هەموو تواناکانم بەهەدەر دەڕوا و کاری هەموو دروستکەرانی سیاسەت و هاووڵاتییان بەهەدەر دەڕوا، لەو کاتەی ئێمە خزمەتیان دەکەین.

وانە و خوێندنەکە جۆشوخرۆشی پێ دەبەخشین، بەڵام ئاسان نەبوو، لێرەدا دکتۆرە سیمس داوای کرد زیاتر بیر بکەینەوە ئەمەش لە سەرووی وانەکان بوو، زۆر جار درکپێکردنەکانم ئاڵۆز دەبوون، بەتایبەت سەبارەت بەوەی چەند دەزانم، یان ئەو شتانەی نایزانم، سەرەڕایی ئەوەی شارەزایم لە کاری سیخوڕی بۆ چەند ساڵێك دەگەڕێتەوە، بەڵام هەر دەبوایە زیاتر بخوێنم و بزانم نەوەك کاتێك لە بابەتێك نەزانم ڕووبەڕووی کارەساتم بکاتەوە.

بۆیە لە نێوەندی وانە ئەکادیمییەکاندا هەوڵم دا درك و تێگەیشتنەکانم فراوان بکەم، بە شێوەیەك رۆشنبیرییەکی زیاتر لە کاری هەواڵگری بەدەست بێنم. لە سەرەتادا واتە لەو بیست ساڵەی کاری هەواڵگریم دەکرد، تەنیا جەختم لە کاری هەواڵگری نەدەکردەوە، هەردەم وانە و بیرکردنەوە و رامان لە شتەکان وای دەکرد بتوانم جیهان زۆر بەخێرایی وەرچەرخان بەخۆیەوە ببینم، وەکچۆن ئەو بابەتانەی پەیوەستە بە ململانێ و ترسناکی و هەرەوەزیکردن لەگەڵ یەکتردا، لە نێو ئەوانەدا بابەتێکی هاوبەش یەکتر دەگرنەوە، کە بەهای هەواڵگری بەرەو زیادبوون دەرۆیشت، نموونەی ئەمەش هەڵمەتی ئێمە بەرەو ئەفغانستان لە نێوان ساڵانی ٢٠٠١-٢٠٠٢ دا بوو، بەمەش تەوەرەکانی جیۆسیاسی وەرچەرخانی بەخۆیەوە بینی، دیارە هەموو ئەمانەش پەیوەستە پێشکەوتنی خێرایی تەکنەلۆژیا، لێرەوەش رۆڵی هەواڵگری زیاتر بەرەو پێشەوە چوو، لە کاتێکدا جیهان جۆرێك لە سەربەخۆیی و ئاڵۆزی بەخۆیەوە بینووە، لە لایەکی دیکەوە تێگەیشتنمان بۆ هەواڵگری ناگاتە ئەو پێویستیانەی وڵاتەکانمان پێویستی پێیەتی، ئەمەش بەپێی رێڕەوی مێژووی ئەمریکا.

لە پاش ئەوەی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی جەنگی ساردیان بردەوە، لە تشرینی دووەمی ١٩٨٩ دیوارە ئاسنینەکەش رووخا، بەشێك لە بەرپرس و سەرکردە بەرێزەکان گومانیان هەبوو، چیتر پێویستیان بە هەواڵگرییەکی بەهێز و دەزگایەکی شاردراوە هەبێ، بەتایبەت بۆچوونی دانیال پاتریك موینهانی سیناتۆر، بۆیە گونگرس لە نەوەدەکان بە هۆی هاوکاریکردنی ئاشتی زۆرێك لە بودجەی هەواڵگرییەکانیان برد، لە کاتێکدا بودجەش تووشی دارمان دەبۆوە، بۆیە زۆربەی ئۆپراسیۆنەکان تەنیا لە نێوەندی رەفەکان دانرا، تۆری سیخورەکان هێدی هێدی نەدەما، هەروا سی ئای ئەی بەشێك لە وێستگەکانی لە هەموو وڵاتانی

جیهان داخست، لێرەوە سەرکردەکانمان پێشبینی ئەوەیان دەکرد، هیچ ترسناکییەك لە نێوەندی جیۆسیاسیدا نەماوە.

لێرەوە بەشێك لە سەرکردەکانی سی ئای ئەی پرسیاریان سەبارەت لە کارە تەماوییەکانیان دەکرد، بەشێکیان زۆر بەشەرمەزارییەوە دەستیان لەکار کێشایەوە، لە کاتێکدا بەشێك لەو سیخوڕانە باوەڕیان بەوە هێنا، کە جیهانی نوێ هیچ جۆرە دوژمنێکی تیادا نییە، لەمەوەش میلتۆن بیردن وەك سەرکردەی بەشی دەزگەی شاراوەی سی ئای ئەی رای گەیاند، کە رووسیا وەك پێشتر هەڕەشەیەك نییە تا سیخوڕی بەسەردا بکرێ، ئەم قسەیەشی وای کرد زۆرێك لە کارە سیخوڕییەکانی رووسیا بچێتە نێو تۆڕەکانی سیخوڕی ئەمریکی، بۆیە وای لە ئەلدریچ ئایمس لە سی ئای ئەی و رۆبەرت هانس لە ئیف بی ئای کرد چەندین زانیاری ئاشکرا بکەن، ئەم ناپاکانەش زیانێکی گەورەیان بە ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا گەیاند، کاتێك چەندین زانیاریان بەخشی بووە رووسەکان، ئەمەش وای کرد بەشێك لە سیخورەکانی سی ئای ئەی لە رووسیا لەسێدارە بدرێن، بۆیە سیخوڕی راستییەکە ناکرێ خۆت لێی لابدەیت، سەرەڕایی ئەوەی ئەمریکا و رووسیا و چین دەتوانن رێکبکەون و هەردوو لا سوود لەیەکتر وەربگرن، بەڵام هەردوو لا دژ بەیەکن لە بواری سیخوڕیدا، لەگەڵ ئەوەی ئەو دوو دەوڵەتە مەزنە هاوبەشی سەرەکین لە دیبلۆماسی و زانست و بازرگانیدا، بەڵام هەردووکیان دوو دژی سیخوڕین لە بەرامبەر ئەمریکا، لە راستیدا دەتوانین بڵێین رووسیا و چین لە سەدەی بیست و یەکەمدا و بەتایبەتی لە دەی دووەم زۆرێك لە کارمەندانی هەواڵگریان لە نێوەندی ئەمریکادا چاندووە واتە زیاتر لەوەی لە جەنگی ساردا هەیانبوو.

کەچی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پاش جەنگی ساردا وەك نەتەوە زیاتر بەرەو خۆشگوزەرانی هەنگاوی نا، واتە ماوەیەك ئاسوودە بوون بەرامبەر ئەو جیهانە خەیاڵییەی، کە هەردەم وەك هەڕەشە و دوژمن خۆی دەنواند، بۆیە سیاسەتمەداران پێیان وایە خودی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیرەکانە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە ئەمەش بەپێی هزری سیاسیی لیبرالی و بازاڕی ئازادا، بەمەش ژیان بەرەو کوالیتییەکی بەرزتر هەنگاوی نا.

زۆری نەبرد قاعیدە لە نێوەندی ئەمریکادا هێرشێکی گەورەی هێنا کایەوە بەتایبەت لە١١ی سیبتێمبەری ٢٠١١دا، لە پاشاندا ئوسامە بنلادن و رفێنرەکان هەموویان کوژران، لەپاش ئەوەی ٢٩٧٧ کەس لەو باڵەخانەیە کوژران، بەڵام زۆربەی قوربانییەکان ئەمریکی بوون جگە لە هەندێك هاووڵاتیانی وڵاتانی دیکەش وەك مەسیحی و جوو و مووسڵمان و هیندۆس و چەندانی دیکە، هەردوو تاوەری بازرگانی جیهانیان لە نیۆریوك رووخاند، لاشەی مرۆڤەکان لە نێوەندی شوێنە کاولبووەکانی شار ونبوو، هەتا هەندێك لە قوربانییەکان لەبەرزی باڵەخانەکانەوە خۆیان فڕێ دا، هەر ئەو ساتە پنتاگۆن رووخا، کە بارەگای مەزنترین سووپا بوو لە جیهان، راستە ئەمە لە دەرەوەی واشنتنی پایتەختدا بوو، بەڵام لە شوێنی رووداوەکەدا قووڵاییەکی گەورەی لەنێو شاردا دروست کرد و لە هەموو لایەکەوە دووکەڵی رەش بەرچاوانی گرتبوو، ئەوە جگە لەوەی زۆرێك لە سەربازانی ئەمریکی کوژران و بریندار بوون و لەرێڕەوەکاندا دەبیندران.

سەرنشینە پاڵەوانەکانی گەشتی ٩٣ی کۆمپانیای یۆنایتد تاکە بەرگریکار بوون بەرامبەر بە دوژمن و توانیان سەربکەون بەسەر رفێنەران، فرۆکەکە تەقییەوە لەو کاتەی نەیانتوانی بەسەر فرۆکەکەدا زاڵ بن بۆیە لە دێهاتەکانی شانکسفێلی بنسلڤانیا کەوتە خوارەوە. ئەو سەرنشینانەی لەنێو فرۆکەکەدا بوون بە هۆی

مۆبایلـەکانیان توانیـان زۆرێـك لـە زانیـاری کۆبکەنـەوە، چـونکە لـەو کاتـەدا ڕووبەڕووی ترسناکییەکی گەورە بوونەوە، ئەمـە وەك زانیـاری هێرشـێکی بـەهێز بوو، ژمارەی سەرنشینەکان سی و سێ کەس بوو لەتەك حەوت کەس لەئەفسەرانی فڕۆکەکە، هەر هەموویان مردن، بێگومان ئەوان توانیان سەدان گیـانی سـەرکردە سیاسییەکانی واشنتونی پایتەخت ڕزگار بکەن.

ئەمریکا و جیهان تووشی شۆك بوون، کاتێك تێگەیشتن هێرشەکە لەپای چی بـووە ئەمـە دوژمنـە؟ بـەڵام بۆچـی؟ بۆیـە دەبـێ پرسـیار بکـرێ ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا چـی کـردووە بـۆ پاراسـتنی هاوولاتیـانی؟ دەبـێ بەرپەرچدانەوەکە چۆن بێ؟

ئەم ڕۆژە کارەساتبارە هەستێکی داڕووخانی لـەنێو هـزری هـەموو کەسـێك هێناکایـەوە، لێـرەدا هاوولاتیـان پرسـیاری ئـەوەیان دەکـرد، ئایـا ڕووبـەڕووی هێرشێکی دیکە دەبنەوە، بۆیـە گفتوگـۆی پرسـیارەکان لەنێوەنـدی هاوولاتیانـدا دووبارە سەری هەڵدایەوە سەبارەت بە جەنگ و ئاسایش لەپێش هەموویاندا ڕۆڵـی هەواڵگری دووبارە هاتـەوە بەرباسـان، ئەمـە و گـۆنگرس لـەپاش ١١-٩ ڕۆڵـی هەواڵگری توند کردەوە، لەمەوەش هەستی سەرکردە سیاسییەکان وا خۆی نیشـان دەدا، کە لەپاش ١١-٩ هەواڵگری جگە لە شکستی سیاسی شکستی هـەواڵگری بەخۆیەوە بینووە، لەپێشتریشدا هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو تا ئـەو کارانـە ئـەکیف بکەنەوە.

لەپێشتردا لێژنەی کۆنگرس و بڕیاردەرانی سیاسەت و زۆرێك لـەوانی دیکـە ڕێکەوتن تا بودجەکان کەم بکەنەوە بەتایبەتی بودجەی هـەواڵگری، بۆیـە ئـەوان

هەڵە بوون، بەڵام هەواڵگری لە ئێستادا زۆر گرنگە، تا ویلایەتە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆرێك لەزانیارییەکان بەدەست بێنێ.

لە سەردەمی پاش ١١-٩ بودجەکانی هەواڵگری و بیرۆکراتییەکان بەتـەواوی تەقییەوە ئەمەش لە نێوەندی ئالۆزی و پەرەسەندندا، بەمەش بودجەی هـەواڵگری لـە چـەند ملیارێکـەوە بـوو بـە ٧٥ ملیـار دۆلار، هـەر لەسـاڵی ٢٠١١ لـە شەووڕۆژێکدا سیاسەتی ئەمریکی بەرگریان لە هەواڵگری دەکـرد، بۆیـە چـەندین لێژنە پێك هات و زۆرێك لە دۆلارەکـانی باجیـان کـۆکردەوە و چـەندین بنـەما و سیستەمیان دانا بۆ بنکە سـەرەکییەکانی واشـنتن وەك نووسـینگەی بەڕێوەبـەری هەواڵگری نیشتمانی و بنکەی نیشتنمانی بـۆ نەهێشـتنی تـیرۆر لەتـەك دانـانی ئاسایشی ناوخۆیی.

هەردوو ئیدارەی کۆماری و دیموکراتی لەو نێوەندەدا دەیانویست سی ئای ئەی بۆ لای خۆیان رابکێشن تا دەسکەوتی سیاسی زیاتر بەدەسـت بێـنن، هـەردوو لا دەیانویست کارەکان زۆر زیاتر بکـرێ لـە لایـەن ئاژانسـەوە، هـەروا بەشـێك لـە تیمەکەی جۆرج دەبلیو بۆش دەیانویست جۆرێك لە دەستپاکی لـەم بابەتـە بخەنـە روو، بۆیە فالیری بلایم کە کارمەندی سی ئای ئەی بوو، پاش چـەند رەخنەیـەکی باڵیۆز جۆ ویلسۆن هاوسەری بەرامبەر بـە کۆشـکی سـپی کرایـەوە، پرسـیارەکە لەوەدایە چۆن یەکێك لە شاراوە پیرۆزەکان ئاشکرا دەکەن، هەموو ئەمانە لـەپێناو دەسکەوتی سیاسی بوو، لە کاتێکدا ژیانی ئەفسەرێکی سی ئـای ئـەی دەخەیتـە مەترسییەوە، کە ژیانیان بۆ سیخوڕی بەکار هێناوە لەپێناو ئەمریکا، بۆیە سکۆتر لیبی راوێژکاری کۆشکی سپی دادگایی کرا، چونکە ئامادە نەبوو هیچ هاوکاریەك بکات، سەبارەت بە پرۆسەی ئاشکرابوون.

کاتێك ئەو جۆرە متمانەیە بەرەو شکست دەڕوا، سەرۆك بۆش و تیمەکەی سی ئای ئەی و هەواڵگرییەکانیان لەباوەش گرت بەتایبەت لە رووی خزمەتگوزارییەکانی، بەتایبەت ئەو کاتەی هاوشانبوو لەتەك پێشبینیە سیاسییەکان، لەمەوەش جۆرج پەیوەندییەکی پتەوی لەتەك بەڕێوەبەری سی ئای ئەی بەستا، زۆر جار سەرۆك بۆش لە کاتی مۆڵەتەکان چەندین پرسیاری دەکرد سەبارەت بە ساڵانی ٢٠٠١-٢٠٠٢ بەتایبەت ئەو کاتەی لە کامپ دیڤید دەبووین، زیاتر باسی لە ژووری ئۆپراسیۆنەکان دەکرد و هانی دەدایـن زیاتر لـە ئەفغانستاندا بەربڵاو بین، هەر لەوێدا پشتگیری تەواوی دەخستە روو، بەڵام چۆن بە رێگەی ئاشکرا هێرش بکرێتە سەر ئەفسەرێکی سی ئای ئەی، کە هەردەم بەشاراوەیی کاری دەکرد؟

کاتێك سەرۆك ئۆباما لەکانوونی دووەمی ٢٠٠٩ دەسەڵاتی گرتە دەست، وەزارەتی داد هەڕەشەی زیندانیکردنی لە ئەفسەرێکی سی ئای ئەی کرد، چونکە لە سەردەمی ئیدارەی پێشتر چەند فەرمانێکی یاساییان جێبەجێکردووە، پرسیارەکە لەوەیە ئایا سیاسەتی پێشتر تاوانبار بکرێ کاتێك سی ئای ئەی سزا دەدەیت؟ یان هەڕەشە لە ئەفسەرێکی سی ئای ئەی دەکرێ تەنیا لەپێناو دەسکەوتێکی سیاسی؟

بۆ ماوەی دوو ساڵ مایکل هایدن جێگری بەڕێوەبەری سی ئای ئەی رووبەرووی لێپرسینەوە دەکرد، ئەو سەرکردەیەکی دەستپاك و ئازا بوو، ئەو کاتە وازیان لێ هێنا کاتێك شکستیان هێنا تا بەڵگەیەکی سەرپێچی رووبەرووی بکەنەوە، هیچ رووناکییەکی سیاسیان بۆ دەسکەوت بەدەست نەهێنا.

## هونەری سیخوڕی

سەرۆك ئۆباما هەموو لێكۆڵینەوەكانی بڵاوكردەوە لەو كاتەی كە ئیدارەكەی ڕەزامەندیان دەربڕی، ئەمە سەرەڕایی ناڕەزایی بەڕێوەبەری سی ئای ئەی دژ بە مایكل هایدن، ئەو لە ژیان ماوە، بۆیە ئەوە دەردەكەوێ، كە ئیدارەی ئۆباما دەیویست ماستاو بكات بۆ چەند ئەندامێكی دیموكراتەكان ئەمەش لەسەر حیسابی سی ئای ئەی و ئەفسەرەكانی.

هەر لەو كاتەدا چەندین پارێزەریان زیاد كرد بۆ بەرگریكردن لە گیراوەكانی زیندانی گۆنتانامۆ، وەك پارێزەری تیرۆرستەكان، ناو و وێنەی ئەفسەرانی سی ئای ئەیان كۆكردبۆوە، بەڵام وەزارەتی دادی ئیدارەی ئۆباما هیچی نەكرد، نەیان دەتوانی كارێكی وابكەن، لە كاتێكدا بەڕێوەچوونی كارەكانی دژ بە قاعیدە بوو تا كۆتایی، بۆیە بەرامبەر بەو ئەفسەرانە نەیاندەزانی چی بكەن.

لە لایەكی دیكەوە سەرۆك ئۆباما كارەكانی گۆڕی و بەرەو لای سی ئای ئەی هەنگاوی نا تا لە چەند مانگی داهاتوو چەند ئەنجامێك لە باشووری ئاسیا دیاری بكەن، وەك چۆن سەرۆك بۆش لە پێشتردا ڕای گەیاندبوو، تیرۆرستەكان ڕاو بكەن و لە هەر كوێیەك بن بیانكوژن، یەكە یەكە پەیوەندی بە كارمەندانی هەواڵگری كرد و دڵخۆشی دەربڕی سەبارەت بە سەركەوتنی كارەكانیان، بەو شێوەیە متمانەی بە سی ئای ئەی كردەوە، ئەم متمانەیەش هۆیەك بوو تا سی ئای ئەی ئوسامە بنلادن بدۆزێتەوە، بەو شێوەیە سەرۆك وەك فەرماندەی گشتی خۆی نیشان دا، بۆیە لە ئایاری ٢٠١١ بەئازایانە فەرمانی بۆ سی ئای ئەی و هێزی دەریایی دەركرد تا ئۆپراسیۆنێك بۆ شوێنی خۆشاردنەوەی ئوسامە بنلادن لەپاكستان بكەن.

هاوپەیمانە ئەوروپییەكان لە سەردەمی ١١-٩ چوونە ناو جەنگێكی سیاسی دژ بە هەواڵگری و تۆمەتەكانیش دژ بە ئەفسەرەكانی سی ئای ئەی بوو، بەبێ

گوێدانە ئەوەی ئەفسەری هەواڵگرییەکانیان دەستیان تێکەڵ کردووە لە ئۆپراسیۆنە هاوبەشـەکان، کـە دواتـردا کۆتاییـەکی ناخۆشـی نوانـد، بـۆ ئەمـەش ئیتاڵیـا لەپێشەوەی ئەواندا بوو، بۆیە سی ئای ئەی هەردەم پرسیاری ئەوەی دەکرد تا چەند هاوبەشە هەواڵگرییە بیانییەکانی جێگەی متمانەن، هەروا چۆن باوەڕ و متمانەیان بە هەواڵگری ئەمریکی هەیە، ئایا دەکرێ لۆمەی زۆرێك لەو دەزگایانە بکرێ بـە هۆی دزەکردنی زانیارییەکان و دڵەڕاوکێی گەورە ئەفسەرەکان، لـە کاتێکـدا هـەر یەك ڕۆڵێکیان دەگێڕا لە نێوەندی دەسەڵاتە ئاڵۆزکاوەکانیـان؟ بـە هـۆی ئەمـەوە نووسینگەی نوێی ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکی تیمێکی دامەزراند کە پێکهاتبوو لە ئەفسەرانی پرۆتۆکۆل بۆ بەدواداچوون لە هەموو کاروبارەکـانی ئـەو بیانیانـەی سەردان دەکەن، ئەم نووسینگیەش لە نێوەندی هەواڵگری نیشتمانی خۆی لە سـێ هەزار ئەندام و گرێبەست دەنواند، زۆربـەیان گەڕانـەکانیان بـۆ سـەرکەوتنی ئـەو ئۆپراسیۆنەیە.

هەستی هاووڵاتیانی ئەمریکی بە شێوەیەکی فراوان و جۆراوجـۆر بـوون، لـە مەوەش سەرسوڕمانیان دەبڕی سەبارەت بە کارەکانی سی ئـای ئـەی، بەتایبـەتی ئەو کاتەی هەواڵی ئـەوە بڵـاوبۆوە ڕۆڵـی پێشـەنگیان بینیـووە دژ بـە قاعیـدە، هاوکات جۆنی مایـك یەکـەم ئـەمریکی بـوو لـەپاش ١١-٩ بکـوژرێ لـەپێناو نیشتمانەکەی، ئەم پاڵەوانە ڕومالێکی زۆر باشی بۆ کرا لەنێوەندی ڕۆژنامەگـەری ئەمریکیدا.

ئێمە لە سی ئای ئەی هەستمان بە زیانێکی گەورە کرد، چونکە مایـك لـەو ئەفسەرانە بوو هەردەم جێگەی ڕێز و شانازی و ئازایەتی بوو.

کەچی لە پاش دوو ساڵ دووبارە هەندێك لە سەرۆکەکان گومانیان لـە ڕۆڵـی هەواڵگری کردەوە، ئەمەش وای کرد ببێتە جێگەی نیگەرانی لە نێوەندی هەندێك لە فەرمانگەکانمان، بەتایبەتیش کاتێـك تـەکنیکی لێپرسـینەوەیان بـەکاردەهێنا لەمەڕ کاروباری سیخوڕی لەنێوەندی وڵاتدا، کەموکورتییەکانیان دیـاری دەکـرد، لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەی ئازادی مەدەنی.

بەو شـێوەیە دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن و گاڵتـەجاری لـە هـەموو ڕوویەکـەوە هەواڵگرییان ناشیرین دەکرد، بەشێوەیەك پاڵەوانەکانیان وا نیشان دەدا کە بابـەتی پڕوپووچن.

لێرەوە زۆربەی سەرکردە سیاسییەکان و پیاوانی یاسـا پرسـیارە گەورەکـەیان دەکرد، بەوەی ئایا ئێمە لە جەنگداین دژ بە قاعیدە؟ لـەم کاتـەدا چـۆن مامەڵـە لەگەڵ دوژمن بکەین؟ ئایا ئەوانە تاوانبارن و دەبێ ڕووبەڕووی دادگـایی مـەدەنی ببەنەوە؟ یان ئەو دوژمنانە بخەینە نێو گرتووخانـەکانی گۆنتانـامۆ؟ بۆچـی ڕازی دەبن فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکان بفڕن لە لایەن سـی ئـای ئەیـەوە تـا سـەرکردەیەکی دیارنەکراوی دوژمن بکوژن، لەوانەیە ئەمە ببێتە هۆی ئەوەی خێزانێکی بەدبەخت هەموویان بکوژرێن، ئایا دەکرێ دوژمنێکی زیندانیکراو لە کـاتی لێپرسـینەوەدا لێ نەگەڕێن خەوی لێ بکەوێ؟

بۆچی سی ئای ئەی لە سەرووی هـەموو ئـەو ململانێیەدایـە؟ ئەمـە تـەنیا کۆکردنەوەی زانیاری نییە، بەڵکو کارێکە بەشاراوەیی لەسـەر ئاسـتی جیهانیـدا، بۆچی ئەمە کارە شاراوانە دەکرێ؟ ئایا کەرەستەی دیکە نییە بەکاربهێندرێ؟

بەشداریم لە هەندێك لەو ململانێیـە سیاسـیانە کـرد، بەتایبـەتیش ئـەوەی پەیوەست بوو بە ئەفغانستان لەپێش و لـەپاش ١١-٩، لـەزۆر گۆڕەپانـدا کـارم

دەکرد هەتا لەنێوەندی واشننی پایتەختیشدا، زۆر جار لە کورسی پێشەوە بووم و سەیرم دەکرد، بەجۆشەوە بووم لە کاری هەواڵگری ئەمریکی و سیاسەتی دەرەوە، هەموو ئەمانەش بۆ پاراستنی نەتەوەکەمان بوو، بەڵام زۆرجار کارەکان بەرەو خراپی دەڕۆیشتن. وەك داگیرکردنی عێراق، لەپاشاندا سۆزی نێودەوڵەتی دارِما، چونکە لەپش هێرشی ١١-٩ سەرکەوتنمان بەدەست هێنا بەتایبەت لە ئەفغانستان ئەمە هەستێکی باش بوو.

لەلایەکی دیکەوە هەموو ئەمانە لەنێوەندی ساسی و بەرپرس و سەرکردەکان تێگەیشتنێکی لاوازیان هەبوو بەرامبەر بە هەواڵگری، بەتایبەتیش کاتێك لە لایەن بەشێك لە سیاسی و رۆژنامەنووسی هەڵپەرست یاری بەبابەتەکان دەکرا، پرسیارەکە لەوەدا بوو ئەگەر هەواڵگری رۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە پاراستنی نەتەوەکەمان، دەبێ گرنگییەکی زیاتری پێ بدرێ، ئەگەر هاووڵاتییان ویستیان لەو نهێنییە تێ بگەن، چ رێگەیەکی باش هەیە؟

ئەمە تووشی هەڵەمان دەکات، چونکە زۆر جار سەرکردەکانی هەواڵگری گرنگی بە جەماوەر نادەن، بەتایبەت بە هۆی کارە نهێنییەکەی سی ئای ئەی، زۆر جاریش سیاسییەکان نایانەوێ ئەو هەڵوێستە بزانن نەوەك جیا بێ لەبۆچوونەکانیان، لەراستیدا سیاسییەکان دەیانەوێ هەواڵگری تا بۆ خۆیان بەکاری بێنن، زۆرجاریش تهێنییەکان پێویستن بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە سەرچاوە و شێوازەکان، بەبێ ئەوەی بەقووڵی لە هەواڵگری تێ بگەن.

ئەم بابەتەم لەگەڵ دۆرە سمیس باس کرد، هەروا لەگەڵیدا سەبارەت بە رەوشت و ئاکاری هەواڵگری لەگەڵیدا کرد، لەوێدا هاورێیەکی خۆم پێ ناساند کە ناوی برۆتۆن گریر بوو، ئەو سیخورێکی خانەنشینکراو بوو لەتەك ئەوەی کاسۆلیکییەکی

باوەڕدار بوو، دکتورە سمیس سەبارەت بەم بابەتە زۆرێـك لـە ڕەوەشـت و ئاكـاری سیخوڕی پێ ڕاگەیاندین ئەمەش گفتوگۆیەكی گرنگ بوو.

من و دکتۆرە سمیس لەسەر ئەوە ڕێكەوتین كە هەواڵگری پێویستی بە زۆرێك لەخاڵ و سەرچاوە هەیە، زیاتریش جەختی كردەوە كـە گفتوگۆكـان دینـامیكی و بەرێزەوە بێ، هەروا هانی داین بۆ ڕێكخستن و نووسینەوەی دەقێك سـەبارەت بـە هەواڵگری، ئێمە بیرمان لەوە نەكردبۆوە، بۆیە برتۆنی ڕازی كرد تا هاوكاری بكات لـە نووسـینەوەیدا، لەوێـدا ڕازی بـوو سـەبارەت بـە دوو بـەش كـە بەشـەكانی "هــەواڵگری و جــەنگ: ئەفغانســتان ۲۰۰۱-۲۰۰۲" و بەشــی "هــەواڵگری نیشتمانی و ئاسایش"، ئەمەش دوو بەش بوو لە كتێبی "گۆڕانكـاری هـەواڵگری ئەمریكی"، كە خانەی زانكۆی جۆرجتاون لەساڵی ۲۰۰۵ چاپی كرد.

ئەم كتێبە بەسوودە بۆ ئەوانەی گرنگی بە لێكۆڵینەوەكانی هـەواڵگری دەدەن لەڕووی ئەكادیمییەوە، لەگەڵ ئەوەی كتێبێكی بچووكە، بەڵام شانازی بەوە دەكـەم كە بەشدارم تیایدا.

لەپاش ۲۰۰۳، كە مۆڵەتی ئـەكادیمیم تـەواو كـرد گەڕامـەوە بـۆ دەزگـەی شاراوە، لە ماوەی دوو ساڵدا سەرۆكی بەشی سەرچاوەكانی نیشـتمانی بـوو، كـە یەكێك لەپێكهاتە هەستیارەكانی سی ئای ئـەی بـوو، ئـەم بەشـەش لـە هـەموو ویلایەتەكانی ئـەمریكا بـەربڵاوە، ئـەم بەشـە لەگـەڵ دەزگـای ڕزگـاری یاسـا و هاووڵاتییان و دەزگا گشتی و تایبەتیـەكان لەكاردایـە بـۆ سـەركەوتنی دەزگـەی شـاراوە، لەوێـدا تێگەیشـتنێكی نـوێم سـەبارەت بـە وڵاتەكـەم زانـی، لەوێـدا بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ نیەتی پاكی سی ئای ئـەیم زانـی سـەبارەت بـە ناوەنـدی كەرتی تایبەتی نەتەوەكەمان، هەروا وەك سەرۆكی بەشـی كەرەسـتەی نیشـتمانی

لەکاردابوومە، لەوێدا بوونی تەکنەلۆژیا و جیهانگەرایی وەك قازانج و زیان بۆ دەرکەوت، ئەمەش وای کرد بگەمە لای هەموو بەڕێوەبەرانی کەرتە تایبەتییەکان و زانینی پسپۆڕییان لە هەموو جیهاندا، هاوکات پەیوەستبوونی گشتی و تایبەت بووە جێگەی سەرسوڕمان لە لای من، بۆ وەدەستهێنانی زانیارییەکانی هەواڵگری.

کەچی ڕێگرییەکان زۆرجاران دەبێتە هۆی نەبوونی لێکۆڵینەوەیەکی گشتی و بەرپرسیاریەتی تا گفتوگۆ سەبارەت بە هەواڵگری بکەین، بەتایبەتی کاتێك ڕۆڵی هەواڵگری لە سروشتی خۆی دەگۆڕێ بۆ ترسناکی، زۆرێك لەدەنگەکان بەرزبۆوە، بەڵام زۆرجار دەنگی ئەوانەن کە شتێکی وا نازانن لەمبارەیەوە، کە هەندێکیان هۆکاری سیاسین یان دەنگی سیخوڕە کۆنەکانن، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی جیهانی نوێ، کە بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ لەگەڵ ئاوات و باوەڕە ئایدۆلۆژییەکانیان یان پێشبینییە پیشەگەرییەکانیان.

وەك ئەفسەرێك لە دەزگەی سیخوڕی و شاراوە، درکم بەوە کرد ئەمە بەرپرسیاریەتی من نییە، بۆیە خۆم بەدوور خست لەم پشتگیرییە ئاشکرایە، بەڵام توانیوومە پەیڕەوەکانی کلتووری سی ئای ئەی فراوان بکەم، بە نووسینی دوو بەش لە دەقێکی ئەکادیمی.

دۆخەکان لەساڵی ٢٠٠٥ گۆڕا پێشبینیم نەدەکرد ڕۆڵێکی گشتی بگێڕم، لەپاش ئەوەی کۆندیزا رایسی وەزیری دەرەوە داوای لێ کردم وەك هەماهەنگی گشتی لەکاردابم بۆ بنبڕکردنی تیرۆر، ئەمەش بە پلەی باڵیۆزی گەڕان، ئەم دامەزراندنە لەسەرۆکایەتییەوە بوو، ئەنجوومەنی پیرانیش ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی، لەوێدا درکم بەوە کرد، ڕادەیەك لە ژیانمدا دانراوە تا ژیانم هەمووی وەك سیخوڕێك نەبێ.

بەو شێوەیە لە جیهانی شاراوە بەرەو شانۆی دیبلۆماسییەتی گشتی جیهانی هەنگاوم نا، بەو پێیەی نوێنەری سەرۆك و وەزیری دەرەوەم لە کاری سیاسەتی بنبڕکردنی تیرۆر. واتە ژیانێکی نویێ لە سیخوڕییەوە بۆ دیبلۆماسییەت، لە کاری شاراوە بۆ چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنییەکان، لە ناوی خوازراوەوە بۆ نازناوێکی بەڕێز، جگە لەوەی پێشتر زانیاریی هەواڵگرییم کۆ دەکردەوە بەڵام ئێستا بەکاریدەبەم، لە ئەفسەرێکی ئۆپراسیۆنەکان بۆ راوێژکار و بڕیاردەری سیاسی، کاتێك بۆ یەکەمجار سەرۆك بۆشم بینی لە وەزارەتی دەرەوە لە رایسی پرسی: هیچ ریگرییەکی دیبلۆماسی ناکەم؟ ئایا ئەمە سەردەکەویێ؟

لە نەهێشتن و بنبڕکردنی تیرۆردا لەگەڵ زۆرێك لە ئاژانس و بەش کارم کردووە، زانیاری تەواوم هەیە سەبارەت بەپەیڕەوی کاری ئاژانسەکان، بۆیە چوونم بۆ ناو سیاسەت قورس نەبوو، لە کاتێکدا قووڵبوونەوەم لە دژی تیرۆر و پەیوەندیم لەگەڵ زۆرێك لە وڵاتان سوودێکی زۆری بۆم هەبوو، بۆ ماوەی هەژدە مانگ لەگەڵ کۆندەلیزا رایسی وەزیری دەرەوە کارم کرد، لەم وڵات بۆ ئەو وڵات کارم لەگەڵ باڵیۆز و سەرکردە سەربازییەکان و هاوبەشە دەرەکییەکان دەکرد، لەراستیدا گۆڕینی کارەکەم کەمێك گرفتی بۆ نامەوە، بەڵام هەولّم دا فێر ببم، بەڵام تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە هاتە پێشم، چونکە درکم بەوە کرد ئەم کارە کارێکی زۆر گەورەیە، زیاتر لەسەد چاوپێکەوتنی رۆژنامەگەریم لەگەڵدا سازدراوە لەسەر ئاستی جیهاندا، ئەمەو گوێگری ناوخۆ و بیانی زۆریان حەز بەوە بوو بێنە ناو گفتوگۆکانم، کاتێك باسم لە سیاسەتی دژ بەتیرۆر دەکرد لە کاتێکدا باسی رۆڵی هەواڵگریم دەکرد، کە دەتوانێ پشتگیری بکات، هاوکات زۆرێك لە بەرپرسە ئەمریکییەکان بەئاگاییەوە گوێیان لە قسەکانم دەگرت.

لەم كارەكەمدا گرنگی رۆشنبیری و گفتوگۆی بەرپرسیارانە خاڵێكی گرنگـە، هەوڵەكانم هەمووی بۆ ئـەوە بـوو تـا نوێنەرایـەتی وڵاتەكـەم بكـەم، بەتایبـەتی لەنێوەندی گفتوگۆ كراوەكان لەگەڵ جەماوەردا لە بەریووت و بۆگۆتا و بەرلین.

دواتر لە ساڵی ٢٠٠٧ وازم لە كاری حكوومی هێنا، ئەمەش بـە پشـتگیری ئەو ئافرەتەی خێزانمە و چەندین ساڵ تێپەڕیووە بەسەر زەماوەندەكەمان، بۆیـە لـە كەرتی تایبەت دەستم بەكار كرد، تا بتوانم قیستەكانی زانكۆ بۆ منداڵەكانم دابین بكەم، هەروا زۆر بەنەرمی لەگەڵ خێزانەكەمدا بژیم، لەپاش ئەوەی بۆ ماوەیـەكی زۆر بیرم لە دوژمن دەكردەوە، بۆیە خانەنشینبوونم باشترین بژاردە بوو دوای ئەوەی بۆ ماوەی بیست ساڵ لە خزمەتی حكومەتدا بووم.

هـەردەم لـەنێو هەسـتمدا شـانازی بـەوە دەكـەم، وەك ئەفسـەرێكی ئۆپراسیۆنەكانی سی ئای ئەی كارم كـردووە، لەوێـدا كـاری پیشـەگەریم دەكـرد، لەراستیشدا كارێكی مەزن بوو وەك شێوازێكی ژیان، ئەوە جگە لە ئەزموونـەكانم لە دژەتیرۆر و ئەكادیمیا و بەشی كەرەستەی نیشتمانی و دیبلۆماسیەتی گشـتیدا، كە دەبوایە زیاتر خۆم رۆشنبیرتر بكەم، بەتایبەت لەوكاتەی وەچەرخانی گەورە لـە ململانێی جیوسیاسی لەئارادا بوو، ئەمەش كاری هەواڵگری و پیشەگەرانی بوو.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە چۆن ئەفسەرێكی پێشـووی سـی ئـای ئـەی بـە رۆشـنبیریانە توانیویـەتی بێـدەنگ بـێ، لـە لایـەكی دیكـەوە تێگەیشـتن و دركپێكردنەكانی فراوان بكات، ئەمەش بۆ پشتگیری هەواڵگری بەكاربێنێ؟ هەوڵ دەدەم هاوسـەنگییەكی شـەرفمەندانە لـەنێوان سـیخوڕێكی خانەنشـینكراو و بەرپرسیاریەتییەكی گشتی بۆ هاووڵاتییەكی چالاك بخەمە روو.

لەپاش خانەنشینم نەمویست كتێبێك لـەو بارەیـەوە دابنـێم، بـەڵام ئەنـدرۆ وایلی و سكۆت مـۆریز وەك دوو ئـەدیب رازیـان كـردم، لـە سـەرەتادا سـكۆت

## هونەری سیخوڕی

لەدەزگاکانی راگەیاند سەبارەت بەمن دوا، لەمەوەش پەیوەندی بە هاوڕێ بیل هارلو کرد، لەپێشتریشدا هارلۆ بەشێوەیەکی لەبار وەك ئەفسەر لە سی ئای ئەی کاری کردووە بەتایبەتی لە سەردەمی جۆرج تنیتی بەڕێوەبەر، ئەمە و سکۆ و ئەندرۆ داوایان لێ کردم سەردانیان بکەم بۆ نووسینگەکەیان لە نیۆریوك، تا بەشدار بم لە هەندێك بابەت، کە من دەیزانم.

لە سەرەتادا پشتمان بەست بە چەندین کەس، کە رۆمان دەنووسن، تا بابەتەکان بەقووڵی باسی لێوە بکەین، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەستە بە هەواڵگری و جەنگ و سیاسەت، لەنێوەندی رۆمانەکانیشدا بەشدار بم، لەتەك ئەوانەی لەژێر فەرمانی مندا کاریان کردووە، هەروا ئەو کەسانەی لە کۆتاییدا پەیوەندییان بە سیخوڕی کردووە و کاری شاراوە دەکەن، یاخود چۆن بتوانین کەسانێك بۆ لای خۆمان رابکێشین تا کارمان لەگەڵدا بکەن.

بەشی یەکەمی ئەو کتێبە باس لەبنەماکانی کار دەکات، تیایدا چۆن زانیاری هەواڵگری کۆدەکرێتەوە، کە بۆ ماوەی ٢٤ ساڵ کارم تیایدا کردوە، لە لایەکی دیکەوە زیاتر گرنگیم بە کاری شاراوە داوە، ئەمەش رووبەکی نادیاری هەواڵگرییە و هەردەم گفتوگۆی زیاتر هەڵدەگرێ، هاوکات کاری شاراوە زیاتر پەیوەستە بە پیشە و یادەوەرییەکانم، واتە هەڵمەتی ئەفغانستان لە نێوان ساڵانی ٢٠٠١-٢٠٠٢، وەك نموونەی یەکەم، هەروەها لە زۆربەی کارەکانی رۆڵی سەرکردەم گێڕاوە، بەشی دووەم زیاتر لێکۆڵینەوەم کردووە سەبارەت بە هەواڵگری کامڵ لەتەك کاری شاراوە و جەنگ و سیاسەت، ئەم هەڵمەتەش گرنگی بۆ داهاتوو هەبووە، لەگەڵ ئەوەیدا زۆر ئاڵۆزکاو بووە، چونکە دوژمن و هاوپەیمانەکان و زۆر یاریزان لەو گۆڕەپانەدا یارییان کردووە، لەلایەکی دیکەوە گفتوگۆمان سەبارەت بە زۆر بابەتی قەدەغەکراو کرد، جگە لەو کەسایەتیانەی کە رۆڵی درامیان بینیووە،

بەتایبەتیش ئەوانەی بۆ ماوەی چەندین ساڵێك لە باشووری ئاسیا مانەوە، واتە لەو شوێنانەی کە ناوچەی هەستیارن لەمەڕ ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکی، بۆیە دەبێ لە سەرکەوتن و هەڵەکانمان فێر ببین.

ئەم دەقەی لەبەردەستدایە جیهانێکی نوێیە لە ترسناکییەکان، لەتەك رۆڵی هەواڵگرییەکان و کاری شاراوە لەم ژینگەیەی، کە تیایداین، ئەمەش دۆزینەوەی بنەما ستراتیژیی و دینامییە ئاڵۆزەکانە، کە لەنێوەندی هەواڵگری و سیاسەتدایە، لەم نێوەندەشدا باس لە پەیوەستبوونی ململانێ و هەواڵگری و دەسەڵات و کۆمەڵگە دەکات.

هیوام وایە تیشکم خستبێە سەر هەندێك وانەی هەواڵگری، کە لەنێوەندی ژیانی پیشەیمدا فێری بوومە، لەتەك خستنە رووی ئەزموونی چەندین کەسی دیکە لەمبارەیەوە، تا بتوانین بەهای هەواڵگری بخەینە روو لە پاراستنی دەزگە لیبرالییەکان تا بەرەو کۆمەڵگەیەکی جیهانی هەنگاو بنێین، هەموو ئەمانەش بەهای ئەفسەرەکانی هەواڵگرییە بۆ نەتەوەکەمان.

ناونیشانی کتێبەکی سڵاو و رێزلێنانە بۆ ئەڵان داڵاسی بەڕێوەبەری سی ئای ئەیە، کە لەساڵی ۱۹٦۱ کتێبێکی نووسی سەبارەت بە "پیشەی هەواڵگری و ستراتیژیەتی چینی —سەن تزو، کە لە سەدەی پێنجەمی پێش زاین کتێبێکی نووسی سەبارەت بە "هونەری جەنگ"، ئەمەو داڵاس هەر لەدێری یەکەمەوە پشتی بەستووە بە بەکیبی سەن-تزو، هاوکات لێرەوە سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەم، کە رێنماییان کردووەم.

سەن تزو زیاتر مکوڕە، کە زانینی هونەری جەنگ زۆر پێویستە بۆ دەوڵەت، باسیش لەوە دەکاتەوە هەموو ئۆپراسیۆنەکان پێویستی بە فرتوفێڵە، ئەگەر دوژمن

تۆی ناسی پێویست ناکات نیگەران بیت لە ئەنجامی شەڕ و جەنگەکـە، لێـرەوەش بەهای هەواڵگری بەدەردەکەوێ.

ئەوەی لەدێریندا لە چین راست بوو ئێستاش هەر راسـتە، ئەمـە و جـەنگ و هەواڵگری ئێستا بە جۆشوخرۆشترە لە جاران نەك بۆ دەوڵەتان، بەڵکو بـۆ هـەموو یاریزانەکانی نێودەوڵەتی و هاووڵاتییان، چونکە ئێستا لەنێوەندی ململانێیەکـدین خەسڵەتەکانی تایبەتن.

ئێسـتا جیهـانی هـەواڵگری لـە وەرچـەخانێکی گەورەدایـە لـەو نێوەنـدە مێژووییەدا، بۆیە کۆمـەڵگە هەواڵگرییەکانی زۆر کارایانە تێدەکۆشن بۆ ململانـێ و هاوکاری نوێ، ئەمەش بە هۆی بەرژەوەندییە گۆڕاوەکانە بەتایبەت بۆ ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هاوکات کۆمـەڵگەکان پێشبینیەکانیان لەیەکتر جیاوازە لەبارەی هەواڵگرییەوە، ئەمەو رێز و رۆمانسییەت و زانین و نەزانین و ترس لـەنێو هەستی نیشتمانەکەماندایە، کاتێـك بـیر لـە سـیخوڕەکان دەکەینـەوە، وەکچـۆن کۆندەلیزارایس لە کۆنگریسدا گوتی : "ئێمە جۆرێـك لـە تـرس و هەسـتەوەریمان هەیـە بەرامبـەر بـە هـەواڵگری"، بۆیـە نەتـەوەکان دەیانـەوێ تـێ بگـەن لـە ئاژانسەکانی هەواڵگری و پیشەگەرانی سیخوڕی، تاوەکو پشتگیری بکەن.

رۆڵی هەواڵگری پەرەدەسێنێ لەگەڵ سروشتی جەنگەکاند، تـەنیا حکومـەت نا، بەڵکو هاووڵاتییانیش دەبێ زیاتر درك بە هەواڵگری بکەن، بۆ ئـەوەی بتـوانین بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانـەکانی بپـارێزین، ئەمەش بۆ زیاتر بەرەو پێشبردنی دیموکراتی لیبرالییـە لەسـەر ئاسـتی جیهانـدا، ئەمەش وای کرد تا خزمەت بە وڵاتەکەم بکەم، هەردەمیش رێزم بۆ ئەو سـوێندە هەبووە کە بۆ دەستوور داومە، هەر ئەمەش بوو وای کرد ئەم کتێبە دابنێم، هیوام وایە ئەو فێری بوومە بۆتانم گۆازتبێتەوە.

# بەشی یەکەم

## خەون

"ئەگەر توانیت درك بەشتێك بکەیت، ئەوا بەدەستی دەهێنیت، ئەگەر خەونت پێوەبینی، ئەوا دەتوانیت ببی بەو".

ولیام ئارسور وارد

## هونەری سیخوڕی

ئەو کاتەی کوڕیژگەیەکی بچووك بووم، خەونم بەوە بینی ببمە سیخوڕ، کاتێك تەمەنم دە یان یانزدە ساڵی بووم، ناونیشانی نووسینگەی سی ئای ئەیم زانی، بۆیە نامەیەکم بە دەستخەتی خۆم لەلاپەڕەیەکدا نووسی و تیایدا باسم لە خزمەتکردن کردبوو، لە ماوەی دوو هەفتەدا سی ئای ئەی وەڵامیان دامەوە، پاش ئەوەی لە قوتابخانەدا بۆ ماڵ گەڕامەوە نامەیەکی مۆرکراو چاوەڕوانی دەکردم، دایکم لە ژووری خەوتنەکەم لەسەر مێزی نووسیندا بۆمی دانابوو، نامەکە لەیەك لاپەڕەی چاپکراو پێکهاتبوو، لەسەرووی لاپەڕەکە دورشمی سی ئای ئەی بوو، کە هەڵۆیەك بەدەوریدا چەندین ئەستێرەی لەسەر نەخشێندرابوو، ئەوەی وەڵامی دابوومەوە، زۆر بەسۆزەوە سوپاسی کردم و هانی دام لە تەمەنێکی بەرزتردا داوەکەم دووبارە بکەمەوە.

بەیرم دێ کاتێك نامەکەم گرتە دەست، بەکارێکی زۆر مەزنم زانی؟ سی ئای ئەی بەراستی بوونی هەیە، لەوانەشە رۆژێك لە رۆژان وەرم بگرن.

ئێستاش دوای چل ساڵ، نامەکەم لەلا نەماوە، بەڵام شانازی بەو یادگاریە و چەندین یادگاری دیکە دەکەم، لەپاش ئەوەی بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە دەزگای شاراوەی سەر سی ئای ئەی بووم، کارەکە زیاتر لەوەیە، کە بیر لە کار و ژیان بکەیتەوە، ئەمە مکوڕبوونە لەسەر هیوایەك، هەموو رۆژەکانم خوش دەویست کە لە سی ئای ئەی بووم، بە رۆژە خۆش و ناخۆشەکانەوە، هەتا هەلم بۆ رەخسا کارە رۆمانسییە مندالکارییەکانی خۆشم ئەنجام بدەم.

لە کۆتایی تشرینی دووەمی ٢٠٠١، لەو کاتەی هێزەکانی ئەفغانی و ئەمریکی راوی تالیبان و قاعدەیان دەدا لە ئەفغانستان، جەنەڕاڵ تۆمی فرانکس

کۆبوونەوەیەکی ئەنجام دا، لە راستیدا هەموو کۆبوونەوەکان لەگەڵ ئەودا باش بوو، لە کاتێکی دیاریکراوی سارد و لەسەر پلیکانە چەمەنتۆیەکەی فرۆکەخانەی سەربازیدا جەنەڕاڵ تۆمی فرانکس دەستی لەسەر شانم دانا، بە دەنگە گڕەکەی، کە کێشانی جگەرە تێکی داوە بە شێوە تێساسیەکەی گوتی "هانك دەزانم چی دەکەی! تۆ لەنێو خەونەکانت دای!".

لە وەڵامدا گوتم "تەواوە جەنەڕاڵ"، لەوێدا چەندین پرسیارم لە خۆم کرد ئایا ئەو راست دەکا، یان وەك من کاتێك تەنیا کوڕیژگەیەك بووە هەمان بۆچوونی رۆمانسی هەبووە؟ وا وێنام کرد ئەویش بە هەمان شێوە بووە، یاخود کارێکی کردووە نزیك لەمە، ئەو بە هەستەکانی درکی بەوە کردووە، من خەون بە چییەوە دەبینم، لەو شەوەدا سەیری جەنەڕاڵم کرد ئەو گەورەتر و دڵڕەقترە لەو مرۆڤانەی کە لەنێو دەریادا سەوڵ لێ دەدەن، هەر لەو شەوەدا بیرم لە ئەرکەکانم دەکردەوە لە سی ئای ئەی.

هەموو ئەمانە گیانی لەپێش چەند دەیەکدا سەرکێشی و خزمەتکردنی خستە کەلەمەوە، چونکە ئالنگارییەکانی پاشتر زۆر دڵڕەقانە بوو، هیچ کاتێك خەونم بە ناخۆشی و تووڕەیی کارەسات ١١-٩ نەدەکردەوە، کاتێك چەندین پیاو و کارمەندانی بیانی و ئەفسەرانی سی ئای ئەی لەنێوچوون و لەپێشتردا لەژێر فەرمانی مندا کاریان کردبوو، ئەو کات لەنێوەندی جەنگدا بووین لە ئەفغانستاندا، بەتایبەت لە هەڵمەتی سی ئای ئەی، جگە لەوەی لەپێشتردا تیمی یەکەمان لەناو ئەفغانستاندا دانا، لە پاش چەند رۆژێك لە رووداوی ١١-٩ نزیکەی سەد ئەفسەر لە هەموو لایەکی وڵاتدا بڵاوەی کرد، واتە لە هەموو گۆشەیەکی وڵاتدا تا کاربکەن لەگەڵ میلشیاتە خێڵەکییەکان، تا زانیاری کۆبکەنەوە و بەشدار بن لە ئۆپراسیۆنی جەنگ و کوشتن، بەشێك لە پیاوانمان

چوونە ناو سووپای تایبەتی ئەمریکی و خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ، هەردەمیش فرۆکە بێ فرۆکەوانەکانی "بریداتۆر" لەسەر سەریان بوو تا بیان پـارێزن، چـونکە ئێمە هاتووین تۆڵەی نیشتمانەکەمان بکەینەوە، هەر کاتێـك سـەرۆکی ویلایەتـە یەکگرتووەکان داواکاری و ڕێنمایی هەبوایە، ئێمە هەزارانمان لە دوژمن دەکوشت.

خەونم زۆر دەبینی بەوەی خزمەت بە وڵاتەکـەم بگەیـەنم، لـە سـەردەمێکدا ڕووبەڕووی دڕندەترین دوژمن دەبینەوە.

کاتێك منـداڵ بـووم، دایکـم مامۆسـتا بـوو و دەیبردمـە کێتبخانـەی وارن جۆرجیا، سەیری کتێبەکانی جەنگم دەکرد وەك منداڵێك، هـەردەم دایکـم هـانی دەدام تا خۆم شتەکان بدۆزمەوە، بۆیە ئەو کتێبخانەیە بوو بە شوێنی من، ئەمەو کێبخانەکە لە سێ نهۆمی بەردین پێکهـاتبوو، کتێیـەکان لەسـەر ڕەفەکانـدا تـا بنمێچەکە چوو بوو، هەردەم دەمویست ئەو کتێبانە بخوێنمەوە، کە چەندین سـاڵە نەخوێندراوەتەوە و تۆز ناونیشانەکانی ون کردووە، ئەم شوێنە تاکە داڵدە بـوو بـۆ زانینی زانیارییە ترسناکەکان، بۆیە ئەو شوێنەم خۆش ویست.

هەروەها کتێبخانـە بچـووکەکەی مـن لـەنێو ڕەفـەکانی چـەندین پاڵـەوانی ئەمریکی لەخۆی گرتبوو، هاوکات جۆرج واشنتن و نتائیل گرین و فرانس مـاریۆن کە نازناوی ریوی زەلکاوەکەی پێ بەخشـرابوو، لـەلای مـن خۆشەویسـت بـوون، زۆربەی جەنگەکانیان دژ بە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی بووە زۆر خەسڵەتی ئاسایی و لاسایکردنەوەی بەخۆیەوە نەبینووە، بۆیە دەبوایە زانیارییەکی تایبەتت هەبێ و بە لەسەرخۆبوونەوە بڕوانیە باسـەکان، بەتایبـەت کاریزمـا بوونیـان لەسـەکردایەتی کردندا، لەوێدا فێربووم بەبێ هەواڵگری و کاری شاراوەی سیخوڕی ئەو سەرکردە و جەنگاوەرانە نەدەگەیشتنە ئامانجەکانیان.

جۆرج واشنتن لـەنیو هەموویانـدا وەك سـەرکردەیەکی جیـا زۆر گرنگـی بـە سیخوڕی داوە، هەردەم جەختی لەوە کردۆتەوە، کار لەسەر پیشەگەری هـەواڵگری بکرێتەوە و بزاندرێ بەهای کارەکانی چەندە، چەندین جۆر هەواڵگری بـەکارهێناوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و شیکردنەوەی و دژایـەتیکردنی سـیخوڕانی دیکـە، کـە بەچەندین فرتوفێڵ و پروپاگەندە دەیانەوێ کارەکان لەکەدار بکـەن، لەوێـدا زانـیم بنجـامین فرانکلینـی رۆشـنبیر و قەڵـەو، سـیخوڕێکی بـەتوانا بـووە لەنێوەنـدی هەواڵگریدا، هەروا تۆڕێکی سیخوڕی لەنێوەندی ئەورووپادا بەڕێوەبردووە.

زۆر سەرسامی فرانسیس ماریۆن بووم، لەوانەیـە زیـاتر ئـەوم بـە پێشـەنگ زانیبێ، ئەمەش بە هۆی هەموو ئەو هێرشانەی کـە بەشـاراوەیی کردویـەتی، لـە کاتێکدا تواناکانی لە پارتیزانی دژ بـە بەریتانییـەکان، بەتایبـەتیش لـە زەوییـە نزمـەکانی کارۆلینـایی باشـوور، تـەنیاش دوژمنەکـەی نەناسـییەوە، بـەڵکو ژینگەکەشی زانیـووە، ئـەوە یەکێکـە لـە پاڵەوانـە سـەرەتاییەکانی نـا نیزامـی ئەمریکا، تا ئێستاش بـیر لـە ئۆپراسـیۆنەکانی ریـویی زەلکاوەکـان دەکەمـەوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی بە ئۆتۆمبیلەکەم لەسەر پردی زێی "بی دی"ی کارۆلینـایی باشوور دەپەڕمەوە هەردەم بیری لێ دەکەمەوە.

کاتێك هـەراش بـووم هـەردەم بەرۆمانسـیەتەوە دەمڕوانییـە باسوخواسـتی جەنگاوەرەکان، ئەمەشم بەکردەیی ئەنجام دەدا بەتایبەتی لەپشـت ماڵەوەمانـدا و لەناو کێڵگەکاندا، خەندەق و رەبیەم هەڵدەکۆڵی و دروستم دەکرد، هێرشم دەکـردە سەر درەختەکان، بەدوای دوژمنە خەیاڵییـەکان دەچـووم و هـەردەم تەقـەم لێیـان دەکرد، وابزانم هاوسێیەکانم وا بیریان دەکردەوە من شێت بوو بووم.

زۆر بابەم سەبارەت بە ئادگار رایس بۆرۆ و کۆنان ئای هوارد خوێندەوە، هەردەم ئەم خوێندنەوانە بوو بووە بەشێك لەیارییەکانم، هەروا خوشیم بینی لە هونەری وێنەگرتنی فرانك فرازیتا، کە لەنێوەندی رۆمانە خەیاڵەکاندا دانرابوو، کاتێك کەسەکان قۆڵ و باسکیان ئەستوور و بەهێز بوون، زۆر جاریش باس و قۆڵیان نەخشێندرابوو بە ئافرەتی نیمچە رووت و دوور لە عەقڵ.

لە خوێندنی سەرەتایدا هیچ خۆشییەکم نەدەبینی لە ماتماتیك و زانست، بەڵام وانەکانی کۆمەڵایەتیم خۆش دەویست بەتایبەت جوگرافیا و مێژوو، بەروونی لەبیرمە کاتێك خاتوو لانگونی مامۆستامان باسی لە داگیرکارییەکانی ئاشووری دەکرد لەمیزیۆپۆتامیا دەکرد، بۆیە دەتوانم بڵێم لە ٢٠٠٦ بەهیلیکۆپتەری "سی ئاتش-٤٧" و گۆڕەپانی جەنگ ببرم، بەتایبەتی هێزێکی تایبەتی ئەمریکی لەگەڵمدایە، بەو پێیەی باڵیۆز و هەماهەنگی دژ بە تیرۆر بووم، بۆیە جارێکی دیکە لەناوچەیەك بووم جەنگ تیایدا بەرپا بوو، ئەو ناوچەیەش ناوی عێراق بوو.

وەك دەزانن هەر لەمنداڵییەوە ئارەزووم چووبووە سەر خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی تایبەت بوو بە هەواڵگری، بۆیە لەگەڵ تەمەنم هەڵدەکشا و زیاتریش ئەو کتێبانەم دەخوێندەوە، کە باس لە هەواڵگری و جەنگی نوێ دەکات، بەبیرم دێ هێڵی سوور و ئەستووری جایمس جۆنسم خوێندەوە کە سەبارەت بەجەنگی گوادلکانال بوو، بەجۆشوخرۆشێکی مرۆڤانە بەدواداچوونم لەنێوەندی لاپەڕەکان دەکرد بەتایبەت کاتێك کارە پاڵەوانییەکانم دەخوێندەوە، هاوکات رۆمانی " بەتەنیا دەمرین" خوێندەوە، کە زیاتر باسی راکردن بوو لە جەنگی دووەمی جیهاندا، لەوێدا باس لەجانی کۆمندانی نەرویجی دەکات، لەو کاتەی پێیەکانی لەناو بەفردا بەتەواوی لەکار کەوتن، ئێش و ئازارێکی زۆری بینی و پێیەکانی بریندار بوو و رووبەڕووی مردن دەبۆوە، زۆر کتێبی دیکەشم خوێندۆتەوە سەبارەت

به نووسینگەی کارگوزارییە ستراتیژییەکان (ئاو.ئاس.ئاس) کە ڕێگەخۆشکەر بوو لە سەردەمی جەنگدا تا هێزی تایبەتی سی ئای ئەی دروست بێ، هەروا کتێبی "دزەکانی مێریل"ی بۆرمام خوێندەوە، لە هەمووی گرنگتر دەستم بەخوێندنەوەی "پیشەگەری هەواڵگری"کرد، کە لە نووسینی ئالان دالاسە، تا ئێستا ئەو کتێبەم لەلایە، کە لە بڵاوکراوەکانی خانەی "سیگنت"ە و لەساڵی ١٩٦٥ چاپکراو، ئێستا لاپەڕەکانی کەمێك زەرد و گەچراو بوونە.

هەروا شۆن کۆنریم بینی کە ڕۆڵی جیمس بۆندی بینووە لە فیلمی "ئۆپراسیۆنی زریان"، لە ناوەڕاستی هۆڵی سینەما نۆکسی وارنتۆنی جۆرجیا دانیشتم، سەیری هەموو کەسایەتییە نەخۆشەکانم کرد، لەتەك ئەوەی بەشێکیان خزمەتێکی سەیری دەسەڵات دەکەن، شێوەیەکی خۆپەرستانە بۆ خزمەتی حکومەت، ئەمەش بەشێك لە هزرەکانمی ڕێککردەوە، هەروا کەسێکی زۆر کۆمەڵایەتیش نەبووە، چونکە لە کۆتاییدا ئەو بەریتانییە، لە کاتێکدا درکم بەوە کرد، کە ڕەگوریشەم دەگەڕێتەوە بۆ جۆرجیا، هەروا هیچ کاتێك نەگەیشتوومەتە ئەو شیکبوونە کۆزمۆپۆلیتییە، لەوانەشە حەزم بە خواردنەوە و جلوبەرگی گرانبەهان نەبوو بێ، بەڵام مکوڕ بووم تا بگەم بەو شتانە.

لەگەڵ خانەوادەکەم لە تۆڕی هەواڵەکاندا رووماڵی تەواوی جەنگی ڤێتنامم بینی، هەروا باسی چەند گەنجێکی ناوچەکەمان کرد، کە لەوێدا دەجەنگن، بەشێکیان نەگەڕانەوە، ئەوانە زۆربەیان گەنجانی کێڵگە و دارستانەکانی هەرێمی وارنی جۆرجیا بوون، ئەوان نەگەڕانەوە، بۆیە مۆنیمێنتێك بە ناوی ١٥٤ کەس لەگۆڕەپانێکدا هەیە لەنزیك دادگادا، ئەمەش ژمارەیەکی زۆرە بۆ هەرێمێکی بچووك.

زۆرجار باوکم لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ راوکردن، باوکم رووپێـو و وێنەکێشـی نەخشە و پاسەوانی دارستان بوو، زۆرجار چەندین گـۆڕی لـەبیرکراومان دەبینـی، بەشێك لەزەوییـەکانی نێـو دارسـتان بـۆ گـۆڕ بـەجێ هێڵـدرابوو بـۆ مردووانـی خانەوادەیەك، بەشێك لەکێڵەکانی ئەو گۆڕانە شـکا بـوو و هەنـدێکیان بـە هـۆی قەوزە و گەڵا سەوزەکان ون بووبوون و زۆر بەزەحمەت دەتـوانی نـاو و رێککـەوتی مردووەکە بخوێنیتەوە، هەندێك لەو گۆڕانە گۆڕی سەربازەکان بوون، بۆیە جێگـەی سەرسوڕمان بوون لەلام و بەجێگەی پیرۆزم دادەنا لە قووڵایی دارستاندا.

خانەوادەکـەمان مێژوویـەکی دووردرێـژیان هەیـە لـەراژە و خزمـەتی سەربازیدا، باوکم بۆ ماوەی دوو ساڵ ئەفسەر بووە لـە تیمـی ۱۰۱، هـەروا هـەر چوار برای لەجەنگی دووەمـی جیهانـدا سـەرباز بوونـە، جگـە لـەوەی باپیرانمـان خزمەتیان کردووە لەنێوەندی سوپای کۆنفیدرالیدا، باپیرە گەورەم ولیام کرامبتـۆن لە ۱۸٦۳ لە تەمەنی چل و سێ ساڵیدا بۆتە سەربازی خۆبەخش، باس لەوە دەکەن کەسێکی باڵا بەرز بووە و رووخسار و قـژی کـەمێك رەش بـووە، بـاپیرە گـەورەم نەخوێندەوار بووە، تەنیا زانیوویەتی لە هێمای X واژوو بکات.

کەچی یەکەم باپیرەم تا ناوەندی خوێندویەتی و دەریشچووە، ئەمەی هەمووی بەشێوەی نامە تەواو کردووە ئەو کاتەی تەمەنی سی و هەشت ساڵان بـوو، ئـەو لەخانەوادەی کرامبتۆن دووەم کەس بووە لە زانکۆدا دەرچووە.

کەسوکارەکەم زیاتر هانیان دام بخوێنم. دایکم خوێندنی تـەواو کـرد، دایکـم وەك قوتابییەکی بەتوانا و مکوڕ بوو لەسەر خوێندن دوای ئەوەی پەیمانگەی تەواو کرد لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا یەکسەر لە قوتابخانەیـەکی سـەرەتایدا دەسـتی بـە

مامۆستایەتی کرد، باوکم لە زانکۆی جۆرجیا دەیخوێند ئەویش هەلی خوێندنی بۆ دابین کردم.

خۆشەویستیم بۆ زانست هەبوو بۆیە لە قوتابخانەیەکی فەرمی دانرام ئەو قوتابخانەیە پۆلەکانی خوێندنی پێشکەوتوو نەبوو و بەرنامەی ڕێزلێنانیان نەبوو بۆ قوتابیان، بەڵام مامۆستایەکانی زۆر باش بوو، وەك قوتابییەکی زیرەك لە پۆلەکەمدا یەکسەر منیان بردە پۆلی حەوتەم، کاتێك لە پۆلی هەشتەمدا بووم یەکەم توێژینەوەم نووسی کە باسی لە جەنگی شەش ڕۆژەکە دەکرد لە ساڵی ١٩٦٧ کە تیایدا ئیسرائیل سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەر هاوسێ عەرەبەکاندا هێنا، شەڕەکە زۆری نەخایاند، بەڵام لەپێش شەڕەکەدا ئامادەکردنێکی زۆر هەبوو لە رووی هەواڵگرییەوە، ئەمەشم بۆ ئەوە نووسی چونکە هەردەم خەیاڵم لەلای خزمەتی نیشتمان بوو، زیاتریش جەختم لە سەرکێشییەکان کرد،کاتێك لەماڵ چوومە دەر ئەو کات تەمەنم شانزدە ساڵان بوو و تەنیا سەد دۆلار لە گیرفانم دابوو، لەتەك لیسێکی سەربازی تایبەتی باوکم، لەپاشانیشدا باوکم بەپارە هاوکاری کردم، دایکیشم تەنیا ماچێکی کردم تا ئێستا ئەو ماچەی دایکم لەبیرناچی، چونکە منی زۆر خۆش دەویست، بەڵام کاتی ماڵئاوایی دەست پێ کرد، چونکە لەدەرەوەی ژووری پۆلەکەدا جیهانێکی دیکە هەیە، بەتایبەت لەپشت جۆرجیای درختی کاژەکاندا.

بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتم لەگەڵ تیمێکی ڕووپێوی زەوی لە ئەلەباما کارێکم دۆزیەوە، بەڵام دوای چەند هەفتەیەك وازم لەکارەکەم هێنا، چونکە لە کارگەی رستن کارێکم دۆزییەوە، لەوێدا خریلە گەورەکانم دەگوازتەوە، لە دەوامی ئێواراندا کارم دەکرد تا بتوانم بەرۆژ بچمە قوتابخانە، لە ساڵی دواتردا ئەلەبامام جێ

هێشت، لەپاش ئەوەی چل کاتژمێر لەو کارگەیە کارم دەکرد و هاوکات دەمخوێند، کاتێك جێم هێشت سەرامایەکی بچووکم هەبوو لەتەك بڕوانامەی ناوەندی.

بەردەوامبووم لە گەشتەکەم بەرەو رۆژئاوا، لە تەمەنی حەڤدە سالێدا یەکەم گەشتم بۆ دەرەوە کرد، گەشتەکەش بۆ ناوچەی خواریوی مەکسیك بوو، بەپیادە پردەکەی ئال باسۆی تەکساسم بڕی بەرەو مەکسیك، لەپاشاندا چەند جارێکی دیکە چوومەوە مەکسیك.

پەیوەندیم بە پەیمانگەی سانت جۆن لە سانتا کرد، لەوێدا زیاتر ئەو کتێبانەم دەخوێندەوە، کە زیاتر مەزن بوون، زۆریشی نەبرد زیاتر هەلی خوێندنم بۆ رەخسا لە زانکۆی نیومەکسیکۆ لە بوکرك، لەوێدا بۆ ماوەی چوار سال بەجۆشوخرۆشەوە خوێندم زیاتریش بابەتەکان زانستی سیاسەت و مێژوو و ئەنترۆپۆلۆجیا و جوگرافیا، لەوێدا لەتەك زۆرێك لەخوێندکارە کچەکان بووم و بەفرەخلیسەکەم لە ناوس کرد و هەموو جۆرە هونەرە جەنگ فێر بووم و یاری رەکبیم کرد لەسەر ئەو گۆڕەپانانەی خۆر چیمەنەکەی وشك کردبۆوە بەتایبەت لە باشووری رۆژئاوادا.

لەپاش دەرچوونم لە زانکۆ بەرەو پشت دەرەیایەکان رۆیشتم، کە پێم وابوو گرنگی بە جۆگرافیای جیهانی و سیاسەتی نێودەوڵەتی دەدەم، تا زیاتر روانینەکانم قووڵتر بێ، کارەکانم وای کرد بچمە نیوزلەندا و ئوسترالیا و ئەندونیسیا و سەنگاپوورە (بەڵام هەموو ئەو پیاوانەی قژیان درێژ بوو لە کۆتایدا دەبێ بگەڕێنەوە خاڵی پشکنینی گومرگ و کۆچ). هەروا سەردانی مالیزیا و تایلەند و یەکێتیی سۆفیەت و نەرویج و دانیمارك و ئەڵمانیا و هۆڵەندا و ئینگلتەرام کرد، بەپەنای خودا توانیم خۆم بپارێزم لە خاڵی پشکنین و یاسا دوای ئەوەی چەندین سەرپێچیم کردبوو لەگۆڕینەوەی دراو لە بازاڕی رەشدا، ئەمەش تێکدانی ئاسایشی

گشـتییه، ئـەم سـەردانانە بـۆ مـن سـاڵێك بـوو وەك پێناسـەیەك وابـوو بـۆ سەركێشییەكی جیهانی.

كاتێك گەڕامەوە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا تەمەنم بیست و دوو ساڵ بوو، جارێكی دیكە داواكاریم پێشكەش كردەوە بۆ پەیوەنـدیكردن بـە سـی ئـای ئەی، جارێكی دیكە نامەیەكی رەتكردنەوەم بۆ هاتەوە، لـە نامەكـەدا دەركـەوت زۆر كەموكورپیم هەیە، هاوكات سی ئای ئەی پێی ڕاگەیانـدم كـە بـەردەوام بم تـا زیاتر پسپۆڕیی بەدەست بێنم و ئاگـاداری باسـەكانی نێودەوڵـەتی بم و زمـانێكی بیانی فێر ببم، زمانێك بێ بەسوودتر بێ لە زمانی بازاڕی سـەرەتایی ئیسـپانی و یان ئوسترالییەكی گشتی.

وەك قوتابییەك قـەرزێكم وەرگـرت، لەمـەوەش بـەرەو واشـنتنی پایتـەخت ڕۆیشتم، لەوێدا كارێكی نیودەوامیم دۆزییەوە و ناوی خۆم لـە كۆلیـژی حزێنـدنی باڵای زانكۆی ئەمریكی تۆمار كرد، زۆر ڕەزامەند نەبووك لـە خوێندنەكـەم بۆیـە مكوڕ بووم تـا ببمـە سـیخوڕ، بۆیـە دوای دوو مـانگ ناونیشـانی نووسـینگەی وەرگرتنی لۆكاڵی سی ئای ئەی لە ڕۆسلینی فێرجینام وەرگرت.

چوومە نووسینگەكە بەبێ ئەوەی كاتێكی پێشـترم بـۆ دانرابـێ و لـە هـۆڵی چاوەڕوانی دانیشتم، لەكۆتاییدا كارمەندێكی پێشوازی بەخێرهاتنی كردم، لەتـەك ئەودا هەموو بۆچوونەكانم بۆی ڕوونكـردەوە، كـە دەمـەوێ پەیوەنـدی بكـەم بـە دەزگای سی ئای ئەی شاراوە، ئەو داوای كرد چـاوەڕێ بكـەم، لـەم كاتـەدا جێـی هێشتم، كەسێك لەو شوێنەدا نەما، لەوێدا پرسیارم لە خۆم كرد، كە ئایـا ئێسـتا چاودێریم دەكەن یان وێنەم دەگیرێ، وەك ئەوە وابوو قژم لە شوێنی خۆیدا ڕەق بێ.

## هونەری سیخوڕی

لەپاشاندا گەنجێکی رێکوپێك تەمەن سی ساڵە بەخێرهاتنی کردم، لە سەرەتادا بە ناوێکی ناشیرین خۆی بە من ناساند و وا خۆی پێناسە کرد، کە ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکانی سی ئای ئەیە، تازە لە دەرەوە گەڕاوەتەوە بە مەبەستی کارێك، لەپاش دوو پرسیار لە هۆڵی پێشوازیدا ویستی نیەتی من بزانێ، بەخۆشحاڵییەوە گوتی چاوپێکەوتنت لەگەڵدا دەکەم، لەوێوە چووینە نووسینگەیەکی بچووك، چاوپێکەوتنەکە نزیکەی یەك کاتژمێری خایاند هەر لەوێدا سیڤی خۆم پێدا لەرووی پیشەییەوە لەتەك راپۆرتێك سەبارەت بەوانەکانم لە پەیمانگە و چۆنیەتی پەیوەندی پێوەکردنم، چاوپێکەوتنێکی خۆش بوو، هەموو راستییەکانم پیێ گوت، زیاتر باسی سەرکێشییەکانم کرد لەدەرەوەی وڵاتدا، بەڵام پرسیاری ئەوەی لیێ کردم، کە ئایا هیچ یاسایەکی ئەمریکیم پێشێل کردووە، لەوێدا دانم بەوە نا کە شەرم کردووە لەگەڵ پاسەوانەکانی راو، ئەو کات کوڕیژگەیەك بووم بۆیە چەند جارێك بەتوندی قسەی ناخۆشیان پیێ گوتم، هەروا بەشداریم کردووە لە پێشبڕکێیەکانی ئۆتۆمبیلی پۆنتیاك لە جۆری جی تی ئاوی مۆدیلی ١٩٦٩، کە مەکینەیەکی بەهێزی هەبووە، هەروا بەشداریم لە پێشبڕکێی ئۆتۆمبیل کردووە لەجادەکان بەبیێ ئەوەی پۆلیس بتوانیێ بمگریێ، هەروا چەکم بەکارهێناوە لەدەرەوە شاردا، بەڵام زۆربەی شەڕەکانم هەر بەدەست بوو، بەڵام هیچ جارێك دەستگیر نەکراوم هەروا بەهیچ شتێك تۆمەتبار نەکراوم، زۆرجاریش هەبوو بەرووتی رام کردووە، بەڵام هیچ کاتێك نەگیراوم، لەدواتردا پرسیاری ئەوەی لیێ کردم، ئایا هیچ جارێك تلیاکت تاقیکردۆتەوە، لە وەڵامدا گوتم: نەخێر، لەتەك ئەوەی زۆر رقم لە خواردنەوەی مەیە، لەوانەیە پرسیاری هەموو کارە خراپەکانی کردووم، لەو کاتەی بەئاگام.

## هینری ا.کرامبتۆن

پرسیاری ئەوەی لێ کردم بۆچی دەمەوێ پەیوەندی بە سی ئای ئەیەوە دەکەم، لە وەڵامدا گوتم: نیشتمانەکەی خۆم خۆش دەوێ و دەمەوێ خزمەتی بکەم، ئەمەش باشترین رێگەیە بۆ بەشداریکردن، هەروا پێم گوت لەوکاتەی منداڵ بوومە نامەم بۆ سی ئای ئەی ناردووە و ویستوومە ببمە ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان، ئەمە خەونی منە.

بە رێزەوە قسەی لەگەڵمدا دەکرد، نە هانی دەدام نە هیچ وەڵامێکی دەدایەوە، کاتێك رۆیشتم بیرم دەکردەوە، کە چاوپێکەوتنەکە زۆر باشترە لە نامەیەکی رەتکردنەوە، هەرنا لەگەڵ ئەفسەرێکی سی ئای ئەی راستەقینەدا قسەم کردووە، لەپاشاندا یەکسەر بیرم لەوە کردەوە لەوانەیە بەچەند ساڵێکی خوێندی باڵا تەواو دەکەم، بەڵام مۆڵەتەکەم دەپچرێنم و زمانێکی بیانی فێر دەبم، لەوانەیە بچمە مەکسیك و فێری ئیسپانی ببم، لەوانەیە بگەرێمەوە بۆ باکووری رۆژهەڵاتی ئاسیا، لەوانەشە پەیوەندی بە سوپاوە دەکەم، لەگەڵ ئەوەی حەزم بەوە نییە جلوبەرگی فەرمی بپۆشم لەلای من زۆر ناشیرینە و کارێکی رۆتینییە، هەروا بیرم لەوە دەکردەوە تەمەنی سی و پێنج ساڵی دادەمەزرێندرێ بۆ ئەفسەری ئۆپراسیۆنی سی ئای ئەی، لەم تەمەندا زۆر دوورە، بۆیە دەبێ کەمێك بەنێو ساڵدا چووبم.

هەر ئەو شەوە سی ئای ئەی تەلەفۆنیان بۆ کردم تا لەهەفتەی داهاتوو جارێکی دیکە بۆ چاوپێکەوتن بچمەوە.

کاتێك ئەو تەلەفۆنە کرا و دوا داخستنی تەلەفۆنەکە لە خۆشیدا نەمدەزانی چی بکەم و لەنێو ژوورەکەدا دەسوڕامەوە، ئێستا دوای ئەو چەندین ساڵە هەلێك هاتووە تا لە ئامادەباشیدا بم.

لەپاش نۆ مانگ لە چاوپێکەوتن و تاقیکردنەوە و ملکەچبوون بۆ ئامێری پشکنینی درۆ، پەیوەندیم بە دەزگای شاراوەی سی ئای ئەی کرد وەك ئەفسەرێکی ئۆپراسیۆنی راهێندراو، ئەو کات تەمەنم بیست و سێ ساڵ بوو.

## بەشی دووەم

# راهێنان

وادانراوە شارەزایی و کارایی لەلای زۆربەی کەساکاندا، جۆرێکە لە ئازایەتی: هەروا سوکرات پێی وابووە، کە ئازایەتی جۆرێکی زانینە.

ئەرستۆ: رەوەشتی نیکۆماخی...

## هونەری سیخوڕی

لە پۆلی ڕاهێنانەکانی سی ئای ئەی تەمەنم لە هەمووان بچووکتر بـوو، یـان کەمتر شارەزا بووم، پێشتر نەچووبوومە سەربازی، هیچ زمانێکی بیانیم نەدەزانی، هەروا بڕوانامەی خوێنـدنی باڵـام نـەبوو، هـیچ جـۆرە تـەکنیك و پیشەیەکیشـم نەدەزانی.

لە تەمەنی سێزدە ساڵیدا کاری دەستیم کردبوو، ئەویش ڕاگرتنـی سـاتورێك بوو بۆ کردنەوەی ڕێگاکان بەرامبەر هێڵی رووپێو، ئەمەش لەو کاتانەی ڕێگـەکان زۆر جەنجاڵ بوون، لەلایەکی دیکەوە چـەندین شـوێنم هەڵکەنـدووە لەتـەك جـادە قیرکراوە گەرمەکاندا و ڕاکێشانی دار بۆ شوێنی باڵەخانەکان، لەلایەکی دی هەوڵم داوە بەپیشەیی یاری روکبی بکەم لـە پاڵەوانییـەتی ئوسـترالیدا، بـەڵام شکسـتم هێنا، هـەروا لـە چـوار کیشـوەردا شـەڕم کـردووە ئەمـەش وای کـرد زۆر جـار ئێسکوپرووسکم بشکێ و ددانم بشکێ، بەڵام هیچ کات تۆمارێکی تاوانبـاریم بـۆ نەنووسراوە، پێدەچێ سی ئای ئەی ئەمەی بەهەند وەرگرتبێ.

لەلایەکی دیکەوە توانیوومە نەخشـەکان بخوێنمـەوە و ڕێگـەی خـۆم لـەنێو جەنگەڵەکان بدۆزمەوە و رزگارم بێ لەنێوەندی خاکی بیانیدا، هاوکـات مامەڵـەم لەگەڵ چەك کردووە و هەردەم لە کارەکانمدا هەوڵم داوە، لەمەش گـرنگتر هـەردەم هەوڵم داوە فێر ببم تا ڕووبەڕووی ترسناکییەکان ببمەوە و بتوانم خزمەتی وڵاتەکەم بکەن لە شوێنە دوورەکاندا.

خولی ڕاهێنانەکەی سی ئای ئەی لە سی هاووڵـاتی ئـەمریکی پێکهـاتبوو، ئەوان تا ئەم دوایەش قوتابی و سەرباز و بزنسمان و پۆلیس و پارێزەر و بیرۆکراتی بوون، هەموومان دوای مانگێ دەروازەکانمان بـڕی لـەپاش ئـەوەی بەدواداچـوونی

تـەواویان بـۆ باکگراوەنـدەکانمان کردبـوو، زانینـی هـەموو ئەمانـەش بـە هـۆی تاقیکردنەوە و چاوپێکەوتنەکان بـوو، لـەدواتردا بـووین بـە راهێنـراوی دەزگـای شاراوەی سەر بە سی ئای ئەی بەتایبەت باڵی سیخوڕی ویلایەتە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئێمە کارمان بۆ بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەندی دەکرد، ئەویش کاری بۆ سەرۆك دەکرد، دوای هەژدە مانگ لە راهێنان چەند پرسیارێك لەلام گەڵاڵە بـوو، کە دەرئەنجامی ئەم هەموو راهێنانە چی بـوو یـان کـێ هەڵدەبـژێرن تـا لـەودیوو دەریاکانەوە دادەنرێ؟ من زۆر متمانەم بەخۆم بوو لەنێوەندی هەموو ئەوانەی، کە بەساڵاچوو بوون، لـە کاتێکـدا ئـەوان شـارەزایی و رۆشـنبیرییەکی زۆر باشـتریان هەبوو، بەڵام متمانەم بەخۆم بوو، چونکە ئازایانە دەمویست بابەتەکان فێر بـبم و شتە شاراوەکان بدۆزمەوە، بەو پێیەی زیاتر کەسێکی سـەرکێش بـووم، بـیرم لـە هەموو شتێك دەکردەوە، بەڵام بیرم لەوە نەدەکردەوە کە شکست دەهێـنم، هـەروا بە هیچ شێوەیەك ئەوانەی لە پۆلدا لەگەڵمدا بوون وەك من ئازا و پاڵـەوان بـن دژ بە ناپاکی و تاوانکاری.

یەکێك لەوانە ئیدوارد لی هوارد بوو، کە لەپاشاندا وەرگەڕا بۆ لای یەکێتیی سۆفیەت و ئابڕووی زۆرێك لە سیخوڕە بیانییەکانی برد، کە زۆر دڵسۆزی سی ئای ئەی برد، زۆربەی ئەوانەش رووسی بوون، ئەمەو لەپاش دەستگیرکردنیان، دادگایی کران، دوای کەلەبچەکردنیان لەپشتەوە گولەیەکیان لـە سـەریان دا، هـەروا نـاوی زۆرکەسیان ئاشکرا کرد لەوانە یەکێکیان من بوو، کە زۆر بەجوانی هەڵسەنگاندنی بۆ هەمووان کردبوو، من لەپاش چەندە ساڵێك لەبەڵگەنامەیەکی نهێنی کەی جی بی زانیم، کە کەوتبووە دەست دەزگای ئاسایشی دەرەوە و هـەموو سەرچـاوەکانی پێ دام، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی لەبیر چوو بێ، بەڵام بەڵگەنامەکەی کـەی جـی بی زۆر بەدرەنگەوە بەدەسـتم گەیشـت، بەتایبـەت ئـەو کاتـەی لەدانیشـتنێکی

ئێوارانەدا و لە دواتر لەکۆڵانێکی تەسکدا کەسێکم دیت، لـە پاشـاندا هـەر ئـەو ئێوارەیە ئۆتۆمبیلەکەی خۆم گـۆڕی، چـونکە لـە بەڵگەنامەکـەدا هـاتبوو، مـن کەسێکی زۆر ترسناکم دژ بە کـەی جـی بـی و دەزگـای ئاسایشـی بیـانی، بۆیـە پێویستە هەردەم من لەژێر چاودێریدا بم، لەلای من شـتێکی نـوێ نـەبوو، بـەڵام کەمێك تووشی دڵەڕاوکێ بووم، کاتێك ناوم لەلیستی کەی جی بی بوو، بۆیە لـەو ساتەدا زۆر بەهێمنی بیرم کردەوە.

هاوپۆلێکی دیکەم بەناوی ستیف کابس، کەسێکی باڵا بەرزی سەر رووتاوە و هەردەم چـاویلکەی لەچـاودا بـوو و لەپێشتریشـدا یـاریزانی تـۆپی پـێ بـوو لـە پەیمانگەدا، ئەو زانستی نەخۆشییەکانی لە پزیشکی شەرعی خوێندبوو، هەروا بـۆ ماوەی پێـنج لـە مـارێنزدا خزمـەتی کردبـوو، سـتیف هـەر لـە سـەرەتادا وەك سەرکردەیەك دیار بوو لەکارەکانیـدا و ئۆپراسـیۆنەکانی سـی ئـای ئـەی لـەرووی مەیدانییەوە لە سەردەمی جەنگدا بەڕێوە دەبرد، هاوکات کەسێك بوو دەیویسـت قەزافی واز لە بەرنامەی چەکی ئـەتۆمی لـە لیبیـا بهێنـێ، لـە پاشـاندا پلـەی هەڵدەکشێ بۆ سەرووی دەزگـای سـیخوڕ، کاتێـك گەڕایـەوە بکـرێ بـە جێگـری بەڕێوەبەری سی ئای ئەی، تا ئێستاش ستیف یەکێکە لە هاوڕێیەکانم و کەسـێکە نهێنییەکانم ئاشکرا ناکات.

ئەگەر بگەڕێنەوە سەرەتا لەدوای راهێنان دەرئەنجانەکانی تیمـی پزیشـکی و تەندروستی دەروونی دەرچوو تیایدا هەموو پرۆسەیەکی هەڵسـەنگاندمان بۆکرا تـا دابمەزرێندرێن لە ئاژانسەکە، ئەمەو من و ستیف لـەرووە دەروونییـەوە زۆر بـاش بووین، ستیف وەك کەسێك لەرووی ەدروونییەوە دەستنیشانکرا کە نموونەیەکە بـۆ نەفسەرێك تیایدا دەتوانێ هەموو ئەوانەی لەگەڵییـدان بیـانجوولێنێ و کەسـێکی

کراوەیــە و شــیکردنەوەکانی توونــدە و هەســتێکی ســەقامگیری هەیــە کاتێــك ڕووبەڕووی ترسناکی دەبێتەوە، هاوکات کەسێکە ڕێز لەسەرکردایەتی خۆی دەنێ.

کەچی من هەمان ئەو وێنەیە نەبووم، بەڵکو کەسێك لەنێو خشتەی پزیشکی دەروونیدا وەك کەسێك بووم لەنێوخۆمدا خۆم دەخۆمەوە، بەڵام کەسێکە زیرەکە و لەو کەسانەیە کە نیمچە یاخیبووە، کەسێکم پێکهاتەکەم جێگەی سەرســوڕمانە، لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە ڕقی لە دەسەڵاتە بەڵام بەشــاراوەیی، هــەروەها کەســێکە دڵسۆزە بەرامبەر ئەوانــەی کــە خزمــەتیان دەکــا، هــەروا نمرەکــانم لــە ســنووری زانستیدایە، بۆیە وایاندانابوو نمرەکانم تەنیا ئەگەر پیشەیەکە لەخۆی بوەشێتەوە.

هەردەم بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ دۆسییەی ئەدوارد هوارد چی تیادا بــوو بێ.

لەلایەکی دیکەوە لە هۆڵی وانەکاندا، کە چەند نووسینگەیەکی ئاسایی بوو، لە یەکێك لە شارۆچــکەکانی ڤێرجینــا بــوو، هاوکــات ڕاهێنــەرەکانیش کەســانی ئاسایی بوون، بەڵام هیچکامیانم بەبیر نایەنەوە، کەچی زۆربەی لیســتەکانم لــەبیرە کە پڕمان دەکردوە، لەتەك ئەو وانانەی بەشــێوەیەی وێنــەی بــوون ســەبارەت بــە سیستەمی چەکە بیانییە، کە لەتەك نموونە ئەمریکییەکان دانرابوو.

وێنەی چــەکەکان لەیەکدەچــوون، چــونکە ســیخوڕە بیانییــەکان بەشــێك لــە نەخشەکانی ئەمریکیان دزی بوو، لێرەوە وانەبێژ چەندین حاڵەتی ســیخوڕی بــاس کرد، کە دژ بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجامدراوە. لەتەك هەموو ئەو شتانەی جێگەی نیگەرانین بەتایبەتی ئەو زیانانەی هــیچ شــیکردنەوەیەکیان نییــە کەچی نهێنیی گەورە بۆتە جێگەی بەرژەوەندی هێزە دەرەکییەکان، ئــەم بابەتــەش بەردەوام وەك بابەتێکی بەجۆشوخرۆش لەنێوەنــدی مــاوەی ڕاهێنــان و لــە ژیــانی

پیشەگەریدا جێگەی بایەخ بوو، ئەمەش پێویستی بە پۆلینکردن و شیکردنەوەی هەواڵگری هەبوو تا لە سەرچاوەکەیەوە زانیاریت دەسکەوێ، هەموو ئەو باس و شیکردنەوانە سەرەتایەك بوو بە ئاسایش و دژە سیخوڕی لەلام وەك بنەمایەك بۆ کلتوورێکی سیخوڕی.

ئەم راهێنانە هۆیەك بوو بۆ ئەوەی بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك لەکار دابین بەتایبەتی لە بەشەکانی جوگرافی و کارکردن لەنێو دەزگای شاراوە، کەناونرابوو بە بەڕێوەبەرایەتیی ئۆپراسیۆنەکان، ئەمەش هۆیەك بوو تا بەخێرایی کار لە بەشەکانی دیکە بکەین، بۆ ئەمەش چەند جارێك گەشتم بەرەو باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا کرد، بەراستیش ئەو شوێنەم خۆش ویست، بۆیە داوام کرد لەو بەشەدا کار بکەم.

بەو پێیەی ئێمە وەك راهێنەر شتێکی وا نازانین سەبارەت بەو کارەی پێمان سپێردراوە، بەڵام زیاتر وەك پۆستەبەری نووسینگە بووین، ئەمەش هەلێکی باش بوو تا تیشك بخەینە سەر ئۆپراسیۆنە کردەییەکان، تا فێری سیخوڕی راستەقینە ببین، کە لە بارەگای سەرکردایەتی کار دەکەن، لەپاش کارەکەیان لەمەیداندا.

لە هەفتەی یەکەمدا کارێکی کاتیم دەستکەوت لەیەکێك لە نووسینگەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا، سەرەتایەك بوو لەو ئۆپراسیۆنانەی کە پەیوەستە بە ژیان و مردن، یەکێك لەو کەسانەی بەرپرس بوون ئەفسەرێکی رەقەکار بوو، بەڵام خۆی پیاوێکی باش بوو، ماوەیەکی زۆر لە جەنگی ڤێتنامدا کاری کردبوو، ئەو چەندین دۆسیەی خستە بەردەمم و داوای کرد بیخوێنمەوە و هەڵسەنگاندنی خۆمی بۆ بکەم، دەویست پارەی بەشێك لە سیخوڕە بیانییەکان لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، کە ماوەیەك نەمانتوانی پەیوەندیان پێوە بکەین، دۆسییەکان باسی

چەندین کاری پاڵەوانیەتیان دەکرد، کە بە هیچ شێوەیەك نەیاندەزانی بەزەیی چییە، یەکێك لەو دۆسیانە دانەیەکی نووسراو بوو بۆ پەیوەندییەکانی بێتەل لەلایەن سیخوڕێکی بیانییەوە، کە نەفرەتی لە کارەکەی دەکرد لەنێوەندی سی ئای ئەی، بە شێوەیەك ئەو لە شوێنێکی زۆر دوور بوو، بەتایبەت ئەو کاتەی تیمی چاوخشاندنەکانی رووبەڕووی هێرشێکی دوژمن بووبوونەوە، هیچ کام لەو سیخوڕانەی کاریان لەگەڵدا دەکرد، نەیاندەزانی لەنێو خێزانەکەیدا چ کەسێك ماوە لەژیانیدا، بۆیە پێشنیارم کرد حیسابەکەی دابخرێ و پارەکەی بگەڕێندرێتەوە بۆ گەنجینەی ئەمریکی.

بەبیرم دێ کاتێك لەنێوەندی ئۆپراسیۆنێکی کاتیدا دابووم، لەپاشانیشدا ئاشکرا بوو، ئەمەش دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٨١ لە رۆژنامەی واشنتن پۆست مانشێتی گەورەم بینی سەبارەت بەبوونی تیمێکی بەدواداچوونی سی ئای ئەی لە لاوس، کە بەدوای دیلەکانی جەنگی ڤێتنام دەگەڕێ، کەچی گێڕانەوەی راستەقینەی ئەم باسە رێکخستنەکانی لوجیستی بوو لە بارەگای سەرکردایەتیدا، دواتر زانیم تیمەکە تا ئەو کاتە لەلاوس بوون کە ماوەیەکی دوورودرێژە تا دەگەنە سنووری تایلەند، بەڵام چۆن ئەم باسانە ئاشکرا بوون؟ یان بۆچی رۆژنامەیەکی ئەمریکی ئەم باسانە چاپ دەکات؟

لە کاری کاتیی دووەمدا گوازرامەوە بۆ بەشی ئەفریقیا بەشێوەیەك شتێکی وام نەدەزانی سەبارەت بەو کیشوەرە، لە کاتێکدا سیخورە مەیدانییەکان هۆیەك بوون تا لەو کارە بەشدار بم، ئەوان کۆمەڵەیەکی تێکەڵاو بوون لەوانەی کەسانی سەرەڕۆ بوون، بەو پێیەی دەزگای شاراوەی بەشی ئەفریقیا ئەفسەرەکانی زیاتر یاخیبوونیان پێوە دیار بوون، زۆرێك لەوانە پێیان وابوو ناتوانم خۆم لەگەڵ ئەوانەدا بگونجێنم بەشێوەیەك ژینگەی کارکردن زۆر پێشکەوتوو بوو.

بە بڕیاری یەکێك لە سەرۆکەکانی بەشێك، کە پیاوێکی زۆر زل بوو، جۆرێك لەکاریزماشی پێوە دیار بوو، ئەو یەکێك لەو ئەفسەرە سەرەتاییانەی نیمچە سەربازی بوون لە سی ئای ئەی، کە لەسەرەتای شەستەکاندا لە لاوس بووە و لەگەڵ همونگ کاری کردووە، لەپاشاندا سەرکردایەتی وێستگەی وڵاتە ئەفریقییەکانی گرتۆتە دەست بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی بە فەرەنسی قسە دەکەن، ئەو هەردەم دەویست سەرکەوتوو بین بەتایبەتی لەرووی پەیوەندی و گەیاندنەوە، هەردەم دەستپێشخەرییەکانی دەگەیشتە داهێنان بۆیە دوودڵ نەبوو لە هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی لەلایەن ڕاهێنراوەکان بەتایبەتی ئەو گەنجانەی وەك منن.

لە نووسینگەکەی دانیشت و ڕووبەرێکی گەورەی داگیر کردبوو، وەك ئەوەی ژوورەکە بچووك ببێتەوە، ئەو فێری کردم چۆن مامەڵە لەتەك تیمی پەیوەندییەکانی بیانی بکەم، کە دەنێردرێتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کاتێك بۆ ڕاهێنان دەچن بۆ ئەوەی زانیاریان هەبێ لەسەر پیشەکە، ئەمەش پەیوەندییەکی هەواڵگری نوێیە و یەکەم جارە سەردانی ئەمریکا دەکەن، لەپاش ماوەیەکی کەم لەجێبەجێکردنی ڕاهێنانەکە سەرۆکی وڵات سەردانیان دەکات، بەشێوەیەك ئەمە کارێکی گەورەیە بۆ ئەم لقەی هەواڵگری و سیخوڕی.

پرسیاری ئەوەم لێ کرد کێ سەرپەرشتی ئەو سەردانە دەکات؟ کامە ئەفسەر بەرپرسی ئەمەیە، ئەمەو سەرۆکی لقەکەمان بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە گوتی "تۆ".

لە شوێنی خۆمدا تاسام، بڕوام بەوە کرد، کە عەقڵی خۆی لەدەست داوە، چونکە من ڕاهێنانم نەکردووە و هیچ شتێك سەبارەت بە ئەفریقیا نازانم، هەروا

پەیوەندیم نییە بەو دەوڵەتەوە، تەنیاش چەند مانگێکە من پەیوەندیم بەم ئاژانسەوە کردووە، بەڵام لەپاشاندا گفتوگۆیەکی زۆرم دەکرد سەبارەت بەو لقە.

سەرۆکی لقەکەم چاودێری دەکردم تا شتێك بڵێم، لەوانەیە ویستوویەتی بترسم تا رەزامەند نەبم، بەڵام یەکسەر رووداوێکی منداڵیم هاتەوە یاد کاتێك یاری تۆپی پێمان دەکرد، ئەو کات تەمەنم حەوت تا هەشتساڵان بوو، راهێنەرەکەم مایك هودجز داوای لێ کردم لە هێڵی بەرگرییەوە بگەڕێمەوە بۆ هێڵی یەکەم، مایك لێم تووڕە بوو، چونکە بڕوام بە بڕیارەکەی نەدەکرد، بۆیە ترسام گەڕامەوە هێڵی یەکەم، بۆیە تا وەرزەکەش تەواو بوو لەوێدا یاریم کرد، لەگەڵ چەند نموونەیەکی دیکە لەوانەیە شایەنی ئەوە بێ بەبیرم بێتەوە.

بۆیە بە سەرۆکلقەکەم گوت "بەڵێ بەڵێ، سوپاس، هیچ گرفتێك نییە"، وەڵامەکەم بەشێوەیەك بوو هەموو هێزێکم کۆکردەوە تا متمانە بەخۆم بکەم.

هاوکات دەمویست ریشم درێژ بێ، فرانکۆ یەکەم ناوی خوازراوی بۆ دانام، لەپاشاندا ئەوانەم بینی، کە کارم لەگەڵدا دەکەن و بەرنامەیەکم دانا، جگە لەوەی چاوم بە بە راهێنەرەکانی پەیوەندی بیانییەکان کرد تا هاوشانیان بێ لەهەموو جوولەیەکیان.

بە ماوەی چوار هەفتە کارەکانی خۆم رێکخست، بەڵام نەمتوانی کارایی راهێنانەکە هەڵبسەنگێنم لەرووی کاری سیاسییەوە، چونکە هیچ خاڵێکم نەخوێندبوو سەبارەت بەو سەرچاوانە، بەڵام وەك هاوکارێکی نەزان تەنیا ئەرکەکانم جێبەجێ دەکرد.

تەنیا شتێکی سەیرم بەبیرماوە لە ماوەی پشوودان، لەو کاتەی راهێنانمان تەواوکردبوو، بەڵام کاتەکە درەنگ بوو، لەپاش ئەوەی یەکێك لەو قوتابیانەی

سەردانیان کردبووین، داوای کرد بەتەنیا قسە بکەین، بۆیە چووینە ژوورێکی بچووك دوور لەوانی دیکە؟

قوتابییەکە ئاماژە بەنێو هەردوو رانی دا و بەچرپەیەك گوتی " ئەندامەکەم ئازارم دەدا".

پرسیارم لێکرد: " ئەندامەکەت".

دووبارەی کردەوە : " ئەندامی نێرینەم".

"چییەتی"

بەهێواشی گوتی "نازانم"، بۆیە دەبێ چاوەڕێ بکەین.

"نا نا ئەمە ڕوونادات"، زۆر بەرێزەوە وەڵامم دایەوە و گوتم " من تەنیا دەست لە ئەندامی خۆم دەدەم، با پزیشکێك بهێنین".

ئەمەو لە بەیانی ڕۆژی دواتردا پزیشکی سی ئای ئەی پشکنینی بۆ قوتابییەکە کرد، لەپاش چەند خولەکێك ژوورەکەی جێ هێشت، پزیشکەکە قوتوویەکی حەبی پێم دا و گوتی " دەرزییەکم لێ دا، ئاگادار بە بەپێی ڕەچێتەکە حەب بخوات".

پرسیاری ئەوەم لێ کرد: "ئایا تووشی نەخۆشییەکی خراپ بۆتەوە؟".

"لەوانەیە تووشی خراپترین نەخۆشی فرێدان بۆتەوە، بەهیچ شێوەیەك شتی وام نەبینووە"، بۆیە دەستی لەسەر شانم دانا و بەخێرایی بەرەو ئۆتۆمبیلەکەی ڕۆیشت.

زۆری نەبرد چوومە لای نەخۆشە بیانییەکە.

بڕوام بەوە نەدەکرد ئەمەش بەشێك بێ لە کارەکانم، هەروا هیچ جۆرە شیکردنەوە و کتێب و فیلمم لەو بارەیەوە نەبینی بوو بەتایبەتی کاتێك باس لە جیمس بۆند دەکرێ.

قوتووە حەبەکەم دا بە هاوکارە بیانییەکەم و زۆر بەهێمنی و بەزمانێکی سادە قسەم بۆ کرد "پێویستە هەموو رۆژێك ئەو حەبانە بخوێت" و قوتووە حەبەکەم جولاند "دەنا ئەندامەکەت لێ دەبێتەوە".

"بەلێ بەلێ، سوپاس، سوپاس" دەستی بۆ قوتووی حەبەکە برد.

کارکردنم لە بەشی ئەفریقیا زۆر بەرپرسیاریەتی خستە سەر شانم، زۆرێك لەئالنگارییەکان فێر بووم، لەتەك ئەوەی بووم بە هاوڕێی ئەو قوتابییەی نەخۆش کەوت، کارکردنم لەوێدا بووە هۆی ئەوەی زۆر شت بزانم سەبارەت بەو کیشوەرە، بۆ ئەمەش زۆرێك لە ئەفسەری رووس و چینی و کوبی هەتا کۆریەکانیشم بەکارهێنا بۆ خزمەتی ئەو لقە، تا کارگەیشتە ئەوەی بەرپرسانی ئەفریقی و یاخیبووەکانیشم بۆ لای خۆم راکێشا تا بەهەموو شێوەیەك زانیاری کۆبکەمەوە، چونکە ئەم بەشەی ئێمە باوەشی کردبۆوە بۆ هەموو بابەتێکی جوگرافی، لەمەوەش زۆرێك لە ئەفسەرەکان کاری مەزنیان کرد، زیاتریش کارەکانیان بەرێکوپێکی بوو، بەڵام زۆر بەکەمی داهێنیان لە کارەکانیان دەکرد.

لەلایەکی دیکەوە لەپێشتردا ئەفسەرەکانی ئەفریقیا بەشێوەیەکی گشتی کارەکانیان لەنێوەندی ژینگەیەکی نەگونجاودا بوو، ئەم بەشە کەسایەتیی گەورەی تیادا بوو وەك ولیام "بوانا" کە کەسێکی زل و خاوەن لەشێکی پتەو بوو، لە هەموو روویەکەوە ئەوانەی لەم بەشەدا کاریان دەکرد کەسانی بوێر بوون، هەردەم

حەزیان بەترسناکییەکان دەکرد، بۆیە هەردەم دەمویست لەگەڵیان بم و شتیان لێ فێر ببم.

لەگەڵ هاوڕێیانی خولەکەم لەپاش کارە کاتییەکانم لە بەشی ئەفریقیا، گوازراینەوە بۆ "کێلگە" (بارەگای راهێنانی نهێنی سەر بە سی ئای ئەی) تا چەند مانگێك راهێنانێکی چڕ سەبارەت بە پیشەکەمان بکەین.

زۆربەی راهێنەرەکانی "کێلگە" تەنیا دوانیان نەبێ، ئالوودەی مەی بووبوون، هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ چارەسەرکردنیان، بەڵام زۆر گرنگ بوو ئەفسەری وەك گاری شرۆنی تیادا بوو، کە شارەزایی باشووری ئاسیا بوو، کە لەپاش ١١-٩ سەرکردایەتی تیمی شکێنەری کۆدە دەکات لەنێو ئەفغانستاندا، زۆرێك لەوانەی لەوێدا بوون سەرۆکی وێستگەکان بوون و هەندێکیان وەك هونەرمەندێکی شارەزا خزمەتیان کردبوو لەو ناوچانەی کە قەدەغەکراو بوو، بە هۆی زیرەکیان توانیبوویان ژیانی زۆرێك لە ئەفسەر و سیخوڕەکان بپارێزن، ئەو راهێنەرانە لە یەکێتیی سۆفیەت و ئەورووپای رۆژهەڵات و وڵاتانی ئاسیای کۆمۆنیست کاریان کردبوو، هەموو ئەوانە لە دێرینەکانی ڤێتنام بوون، پسپۆڕی نیمەچە سەربازی بوونە، هاوکات ئەزموونی زۆر نوێیان ئەنجام دابوو بەتایبەتی لە ئەفریقیا و ئەمریکای لاتینی، هەندێکیان کارایەکی بەرزیان هەبوو لەلوجیستی و تەکنیکی، کەسانێك بوون چەندین زمانیان دەزانی، بەشێکی کەمیان کەسانی بیانیان لەخۆگرتبوو بۆ سیخوڕی ئەمەش بۆ هەموو بەشەکانی دەزگا دەکرێ وابێ، بەڵام ئەو چەند کەسە بیانییە بەهای گەورەیان هەیە.

ئەو راهێنەرانە لەنێوەندی راهێنانەکانیان ئێمەیان بە هەموو بنەماکانی کار سیخوڕی فراوان ئاشنا کرد، لە هەموو رووبەکەوە باسیان لە پیشەگەرییەکەمان

كرد، بەتایبەتی ئەو بابەتانەی پەیوەندی بەو نامانەیە كە كۆدیان لەگەڵدایە لەتەك سندووقەكانی نامە و چۆنیەتیی چاودێریكردن، بەپیادە و بە ئۆتۆمبێل راهێنانمان كرد، سەردانی زۆر شوێنی شارستانیەتمان كرد، تـا لەنێوەنـدی شـار و شارۆچـكە جەنجاڵەكان چۆن كارەكانمان ئەنجام بدەین.

لەوێدا بۆم دەركەوت، كە كۆكردنەوەی زانیاری هەواڵگری بـە هـۆی چـەندین سەرچاوەوە دەكرێ وەك ئەو وێنانەی لە ئاسمانەوە گیرابێ، بەڵام تواندرابێ هێمایـە هەواییەكان رێگری لێ كرابێ و بتوانیت بچیتە نێوەندی تەلەفۆنەكان و گوێگر بیت و بتوانیت لە شوێنە نهێنییەكان كارەكانت بكەیت، جگە لەو سەرچـاوەی هـەردەم بەكراوەیی زانیاریت پێ دەدەن.

لـە كاتێكـدا نـاوەڕۆكی هـەواڵگری سـیخوڕیكردنی كەسـەكانە، ئاسـانترین بنەمای تێگەیشتنە لە چوارچێوەی شێوازەكان چ لەرووی كەسێكەوە دڕنـدەوە تـا كەسـێكی خۆشەویسـت و بەبـەها، كاریگەرییـەكانیش بـە هـۆی تارماییـە هەڵچووەكانە، هەر تەنیاش كاری سیخوڕی تەنیا پەیوەست نییە بـە كۆكردنـەوەی زانیارییـەكان، بـەڵكو پەیوەسـتە بـە كەرەسـتەكانی پیشـەوە، ئەمـەش دەبێتـە پشتگیرییەك بۆ سیاسەتی دەرەكی.

كارەكانی من لە سیخوڕی یەكسانی تیادا نەبوو، بۆیە پزیشكەكانی سی ئای ئەی بەرادەیەك لەسەر هەقن، ئەمەو كارایم تەكنیكیم زۆر بەرزە، بـەڵام لـەرووی زانینی زانستیم تا ئێستا سەرەتایم.

جگە لەوەی ئەو زمانە بیانیانەی دەیزانم زۆر خراپـە، هـیچ بـەختێكم نییـە، تەنیا ئەوە نەبێ من ئەمریكیم، زۆر بەزوویی هەستم بـەوە كـرد تواناییـەكی زۆرم نییە لە زمانەكان و ناتوانم بەتەواوی خۆم بگونجێنم لەگـەڵ كلتوورەكـانی دیكـە،

زۆریش هەوڵم نەدا خۆم سەرقاڵ بکەم بە زمانەکانی دیکە، بەڵکو تەنیا ڕۆشنبیریی گوندەکانی جۆرجیام گواستەوە بۆ هەموو گۆی زەوی، چونکە هیچ بژاردەیەکی دیکەم نەبوو، بەڵام چۆنیەتیی قسەکردن و دەنگم گۆڕی تا بەرپرسانی ئەورووپی و یاخیبووەکانی ئەفریقیا و سەرکردەکانی جەنگ لە ئاسیا و دیبلۆماسییەکانی ئەمریکای لاتینی لە ئینگلیزییەکەم تێ بگەن.

زۆر بەکەمیش حەزم بەوەبوو لە شوێنە قەدەغەکراوەکاندا ئۆپراسیۆن ئەنجام بدەم، لەگەڵ ئەوەی چەندین جار گەشتم کردووە بەسیفەتی بازرگانی و ئەو ناوچانەی تیایدا بوومە ناوچە قەدەغەکراوەکان بووە، بیرکردنەوەم تا رادەیەك باش بوو بەتایبەتی لە خوێندنەوەی نەخشەکان بۆیە زۆر بەئاسانی دەمتوانی نەخشەکان بخوێنمەوە، هەر لەو کاتەی لە "کێڵگە" بووم هەوڵم دا زۆر باش بم، هەردەم بەدوای داڕشتنە ئاشکرا و ونبووەکاندا دەگەڕام، چونکە لەوانە ئینگلیزییەکاندا هەردەم من خەوم دەهات.

بەردەوامبوون یەکێکە لە کارە گرنگەکان بەتایبەتی لە پرۆسەی راپۆرتە یەکلاکەرەوەکان، ئەمەش بنەمایەکی راستەقینەی سیخوڕییە، ئەمەو لەژیانی پیشەیمدا هەزاران راپۆرت و بروسکەی کردەیی و نامەی دیبلۆماسیم ناردووە.

راهێنەرانی "کێڵگە" هەردەم جەختیان لەوە دەکردەوە کە زۆربەی کڕیار و کەسەکان دەبێ ببنە بەرهەمێك بۆ هەواڵگری، هاوکات کڕیاری یەکەم سەرۆکە، لەدوای ئەویشدا زۆرێك لە باڵیۆز و سەرکردە سەربازییەکان و یاساناسان و ئەفسەرانی چەسپاندنی یاسا و دیبلۆماسییەکان و شرۆڤەکارانیش کڕیارن، چونکە هەر هەموو ئەوانە پێویستیان بە هەواڵگرییە بۆ وەرگرتنی بڕیارە سیاسییەکان و دانانی پلانی کردەیی لە هەر بوارێکدا.

ئەو ئەفسەرانەی بەکردەیی لەکاردان بۆ هەواڵگری، هەموو شتەکان بەشێوەی راپۆرت بەرز دەکەنەوە، هاوکات هەموو ئەوانە ناونیشان و رێککەوتی وەرگرتنی زانیارییەکان دەنووسن، بەمەرجێك زانیارییەکانی سیخورِ راستگۆیانە بێ، زۆر بەکەمی ئەوانەی لە سی ئای ئەی دان ناسنامەی سەرچاوەکە نازانن، لە کاتێکدا کرِیارەکانی راپۆرتەکانی هەواڵگری پێویستیان بەناو نییە، بەڵام پێویستیان بەجۆر و راستگۆیی زانیارییەکان هەیە، دێرِی ناوەند پەیوەستە بەناوی سەرچاوە، لە کاتێکدا ناسنامەکەی پارێزراوە، ئەمەش پەیوەستە بەراستگۆیی زانیارییەکان لەسەرچاوەوە.

هەروا راهێنەرەکان فێری ئەوەیان کردین چۆن بروسکەکان بنووسین، ئەمەش هاوپێچی راپۆرتەکانی هەواڵگری فەرمییە، ئەو بروسکانەش هەموو رووەکانی کاری تیادا روونکراوەتەوە، بەمەش ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان دەتوانێ پشت بەهەموو ناوەرِۆکەکان ببەستێ، واتە چۆن سەرچاوە زانیارییەکانی دەستکەوتووە، تەنیاش چەند کەسێکی ناو سی ئای ئەی دەتوانن ئەو بروسکانە بخوێنەوە.

هاوکات راهێنەرەکان لەنێوەندی باسەکەیان جەختیان لەوە کردەوە، کە ئەم نامانە چەندین وەڵامی کردەیی لەخۆ دەگرێ: وەك ئایا سەرچاوەکە بە هۆی کارەکەیەوە توانیویەتی ئەو زانیاریانەی دەستبکەوێ؟ ئەگەر وانە بوو، چ دۆخێك وای کردووە ئەم زانیاریانەی دەست بکەوێ؟ چۆن کەسی سیخورِ توانیویەتی بگاتە ئەو زانیاریانە؟ ئەی سزای کارەکانی چی دەبێ؟ ئایا متمانە بە سەرچاوەکانی دەکا؟ بۆچی؟ ئایا بەردەوام دەگاتە ئەو زانیاریانە؟ چ ئەجندایەك هەیە تا بگاتە ئەو زانیاریانە، ئایا بەپێی پێویستی ئەفسەری کردەیی و رێنمایەکانیەتی؟ ئایا سیخورِ و کەسی متمانەپێکراو یاخود سەرچاوە لاوەکییەکان، تەنیا ویستویەتی

کاریگەری خۆی نیشان بدا و تەنیاش بۆ سەیرکردن نەبێ؟ هۆکاری ئەم دۆخە چییە؟

ڕاهێنەرانی "کێڵگە" هەردەم چەندین ڕاهێنانیان دووبارە پێ دەکردینەوە، تا بتوانین جیاکاری لەنێوان هەواڵگریی و پشتگیری بە ڕاستییەکان و تەخمین و بۆچوونەکان بکەین، ویان لێ کردین جیاکاری لەنێوان هەواڵگری لە زانیارییە کردەییەکان بکەین، لەیەکێك لە وانەکانی ڕاهێنان سێ ڕاهێنەر سێ ڕۆمانی جۆراوجۆریان پێ دام، ڕۆمانەکان جیا بوون بەڵام هەمان زانیاری تیادا بوو، مەبەستیش لەمە بوو بۆ نووسینی ڕاپۆرتێکی هەواڵگری دەبێ لەسێ سەرچاوە زانیاری وەربگری، هەرسێکیان هەمان ڕاستی دووبارە بێتەوە تیایدا، بێگومان بەپێی بروسکەیەکی کردەیی، لە کاتێکدا ڕاهێنەرەکانم کارەکانی منیان شیکردەوە، بەتەنیا جێیان هێشتم تا ڕوانینەکانم بچێتە نێوەندی تارماییەکان، ئەمەش وەك گەنجینەیەکی هەواڵگری سەیر دەکرێ.

ئەمجۆرە ڕاهێنانە ڕۆژانە بوون، وەك ئەوە بوو ڕاهێنانێك بکەیت و زەخیرەیەکی زۆرت لەلا بێ لەڕووی هەست و کۆمەڵایەتی و دەروونی، ئەمەش وەك سەربازگەیکی ئەدەبی توند و نامۆ وابوو، هەموو ئەمانە جۆرێك لە خۆشی و لە ئاوێتەبوونی دەنواند.

وانەی سیخوڕیکردن لەلای من شتێکی شاکار بوو، لە کاتێکدا لەهونەری تەجنیدکردن بەشێوەیەکی ڕەمەکی و دوور لە وردبینی، ئەمەو یەکێك لەڕاهێنەرەکان باسی لەوە کرد کاتێك یەکێك چەندین کەس بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ تا بەپێی پلانەکانی بجولێەوە و کاری بۆ بکا ئەوا کاتێك هەشتا لەسەدا باسەکە تەنیا لەگۆڕەپانی دەرەوەدا بڵاوە پێ دەکرێن، لەوێوە دەزاندرێ کامە

ئەفسەر توانیویەتی سەرکەوتوو بێ، بە مەرجێك نوێنەرەكانت بەشێوەیەكی فراوان كەسایەتی تیادا بێ، زۆرێك لەئێمە زۆر گرنگیان بە پزیشكە دەروونییەكان نەدەدا بەتایبەتی لەرووی چۆنیەتیی سەپاندن و كەسایەتی، بەڵكو هەر قوتابییەك بەپێی تواناكانی هەوڵێكی زۆری دەدا تا نەریتی باش لەخۆ بگرێ و هەمان رێگەی سیخوڕەكانی بگریتەوە، بەردەوام دەبێ فێر ببێ، جەختیش لەوە بكرێتەوە هەموو گەورەپیاوانی كۆكەرەوەی زانیاری دەبێ بەردەوام كارایان بەهێزتر بكەن، چونكە ئەوان هەردەم لەحاڵەتی تاقیكردنەوە و خۆگونجاندان بە هۆی جیاوازی مەبەست و ژینگەكان.

راهێنەرەكان پێكهاتەی پرۆسەی تەجنیدكردنیان بە وشەی "ماتا"گۆڕی بوو، كەمانای "پارە" و ئایدلۆژیا و تێخزان و پشتگیرییە، كەچی من بیرم لەشتێكی دیكە كردەوە بە ناوی تۆڵەسەندنەوە، ئەمەش تەواوكەری پشتگرییە، بەڵام دەكرێ هەریەكێكمان ناوی لێ بنێین، لەپاشاندا و لە ژیانی پیشەیدا فێری زۆر شت دەبم وەك دژیتیرۆر و جەنگ و پراكتیككردنی رقلێبوونەوە، هەموو ئەمانە ئالۆزكاوێكی جوولەدارن.

ئەفسەر لە هەموو پرۆسەی سەربازگیریدا(تەجنید) چەند پێكهاتەیەكی هاندان دەدۆزێتەوە و كاری پێ دەكا، هەر ئەفسەرێكی ئۆپراسیۆنێك كۆمەڵە كاراییەكیان هەیە، هەندێكیان تەنیا رەنگەكان بڵاودەكاتەوە لەسەر كوتاڵەكاندا، كەچی هەندێكی دیكە زۆر وردی چینەكان لەسەر چینەكان دادەنێ، بەشێكی دیكەیان پەیوەندی لەگەڵ ئەوانە دەبەستێ، كە لەوانەیە ببێتە كەسێك زانیاری بۆ كۆدەكاتەوە، ناشزانی چی كۆدەكاتەوە، بەشێكی دیكە پشت بەچەندین توێژینەوەی دەروونی دەبەستن بۆ رەنگكردن بەپێی ئامادەكراوەكەی بەردەستی.

ئەفسەری ئۆپراسیۆنی سەرکەوتوو دەبێ درك بەوە بکات، بەشی هەرەگەورەی کارەکانی تەجینیدکردنی سیخوڕەکانە لەدەوربەریدا، چونکە پێویستە بزانیت کێ دەست نیشان دەکەی، هەروا ئەفسەر نابێ بەخێرایی پرۆسەکان هەڵبژێرێ، دەبێ لەوە تێ بگا ئەوەی هاوکاریت دەکا، ئەویش پێداویستی خۆی هەیە، لەکۆتاییدا دەبێ کێ ئامانجە تا تێ بگات پێویستی بە خزمەتی هەواڵگرییە.

کارەکە زۆر ئاستەنگی هەیە، چونکە باری کوتاڵی جیوسیاسی هەردەم وەرچەرخان بەخۆیەوە دەبینێ، هەندێکجار ئەو کوتاڵە یان ئەو قوماشە دەدڕێ، هەردەم ئەفسەر و سیخوڕەکان دەیانەوێ زانیاری تەواو بدەنن بەڵام هیچ کات نموونەیی نابن، وەك ئەوەیە دەیەوێ وێنەیەك بگرێ، هەروا دەیەوێ خۆی و سیخوڕەکەی هەردەم رزگاریان بێ، تا رێخۆشکەر بن بۆ ئەوانەی کردەکە ئەنجام دەدەن و پەیامێك بدەن بە سیاسییەکان.

هەر دەم دەمویست زیاتر فێر ببم وەك برسییەك وابووم بۆ زانیاری زیاتر وەرگرتن لەسەر هەواڵگری و پێشکەشکردنی کارەکانم، تا لەناوەڕاستی وانەکان و لە کۆتایی راهێنانەکان بەباشی دەربکەوم، تا کارێکم لەدەرەوەی وڵاتدا بدەنە دەست.

بەشی ئەفریقیا رازی بوو لەسەر داواکارییەکەم، کاری من وەك ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان بوو، تا ئێستاش وەك راهێنراوێکی کاتی وام: پۆستەبەری نووسینگە، لەوانەیە لە "کێلگە" دەربچم، بەڵام شارەزایی مەیدانیم کەمە، تا ئێستا تەنیا وەك نووسەرێکی راپۆرتەکان وام، بەڵام زۆر دڵخۆش بووم کاتێك لە چاوەڕوانی خولێکی نیمچە سەربازی دام، تا لەدواتردا رامسپێرن بۆ کارێك لەدەرەوەی وڵاتدا.

رۆژێکیان لەو کاتەی لە چاوەڕوانیدا بووم، گەنجێکی باڵابەرز لە بەرامبەر نووسینگەکەمدا تێ پەڕی، لەناکاوێکدا ئاوڕێکی دایەوە و گوتی "تۆ کێی؟ چی دەکەی".

لە وەڵامدا گوتم "من ئەفسەری نووسینگەم"، لە دڵی خۆمدا گوتم ئەو کوڕە رەزاگرانە کێیە، کە تەنیا چەند ساڵێك لەمن گەورەترە، لەو کاتەدا هەستم بەوە کرد زۆر متمانەی بەخۆیەتی، لەوانەشە ئەمە ئەفسەرێکی مەیدانی بێ.

ئەو وەك ئەوەی بیرکردنەوەکەم بخوێنێتەوە و گوتی" من جێگری سەرۆکی ئەم وێستگەیەم، تۆ پشتگیری لە وێستگەکەی من دەکەی، ئایا بیرت لەوە کردۆتەوە تۆ چ کارێك دەکەی؟".

"بەڵێ من بەدواداچوون بۆ کاری سەرکردەکان دەکەم، وەڵامی پرسیارەکانی دیکەشت دەدەمەوە، من ئێستا لە کێلگە تەواو بوومە، چاوەڕێم فەرمان و کارەکانم دەکەم".

بەتوڕەیی سەیری کردم، بۆیە کورسییەکی راکێشا و پەڕەیەکی راکێشا، وێنەی بەیانی کێشا، سەبارەت بە کارکردن لەوێستگەکە، ناوی چەندین سیخوڕ نووسی و باسێکی دوورودرێژی کرد سەبارەت بە هونەرەکانی پیشە، هەروا باسی تۆڕی سیخوڕە باشەکان کرد، لەتەك ئەو ئالنگاریانەی تووشی دەبینەوە لەناو وێستگەکەدا، هەروا بەکورتی باسی پەیوەندییەکانی وێستگەی کرد لەگەڵ کەسانی ئەو ناوچەیە، هەروا ئەوەی شی کردەوە، کە وێستگە چۆن بەشێوەیەکی فراوان خزمەت بە سیاسییەکانی ئەمریکا دەکات، هاوکات زۆر بەروونی وەڵامی پرسیارەکانی دامەوە، ئەمەو لە بیست و پێنج خولەکدا بەرامبەر بەو رۆژانەی دەمخوێندەوە فێر بووم.

لەپاش ئەم بابەتانە کە خۆم داوام لێ نەکرد، گوتی " کاری تۆ لەم بارەگایە زۆر گرنگە، ئێمە پشت بەتۆ دەبەستین".

له وەڵامدا گوتم "سوپاست دەکەم، قوربان".

بەهەمان شێوەی دەرکەوتنی رۆیشت، ئەو کەسێك بوو بەڕوون و ئاشکرایی قسەی دەکرد، لەگەڵ ئەوەی ناچار نەبوو واز لەکارەکانی بێنێ و بێ هانی کەسێك بدات تا ئێستا تەنیا خامێکە.

بەڵام ئەمە کاری سەرکردە باشەکانە، بیرم لەوە کردەوە رۆژێك لەرۆژان کاری لەگەڵدا دەکەم.

ئەمە یەکەم چاوپێکەوتن بوو لەگەڵ کۆفر بلاك، هەردوو پێکەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ له ئەفریقیا بووین، هەر یەك لەلای خۆیەوە پلەی بەرز دەبۆوە، بۆ ماوەی دوو دەیە، لەپاشاندا ئەو دەبێتە سەرۆکی بنکەی دژەتیرۆر و منیش بووم بەجێگری، بەو شێوەیە دەبێتە هاوڕێم بۆ هەتا هەتایی.

لەپاش چەند هەفتەیەك سەرکردەیەکی مەیدانی لە ئەفریقیا بەدەرکەوت و هاتە ژووره بچووکەکەم، ئەو کورتەباڵا بوو. ئەو رستەکانی زۆر بەخێرایی دەردەبڕی، ئەو گوتی سەرۆکی وێستگەیەکی بچووك بوو، بەڵام کاری سەرەکی کاری شاراوەییه بەڵام بەپارەیەکی باش، هەروا گوتی وێستگەکەیان پێویستی بە کەرەستە و زانیاری زیاترە، زیاتریش ئامانجەکانیان جیهانی سێیەمە، بەجۆشوخرۆشەوە گوتی زۆرێك لەرووسی و چینی و لیبی و کۆبییەکان چاوەڕیی ئەوەن بەکاریان بێنین وەك سیخوڕ.

لەلایەکی دیکەوە گوتی " سەیری دۆسیەی تۆم کردووە، تۆ گەنجێکی و خێزانت پێك نەهێناوە، لە کێلگەدا کارێکی باشت کردووە، بەتایبەتی لە سیناریۆیەکانی سەربازگیری تەجنیدی سیخوڕەکان".

"بەڵێ قوربان زۆر خۆشیم لەو کارانە بینی".

ئەو پێی وابوو لە مەیدان و گۆڕەپاندا خۆشییەکی زیاتر دەبینی، "داوام وایە پەیوەندی بە وێستگەکەمان بکەی، کاری رووماڵکردنی بەدرێژایی رۆژ بەردەوامە، بەڵام کۆبوونەوەکانت لەگەڵ سیخوڕەکان تەنیا بەشەو دەبێ، ئێستاش وەڵامم دەوێ".

"هەر کاتێك تۆ کارت بەمن بێ من دێم".

"مانگی داهاتوو".

"بەڵام قوربان، لەوکاتەدا دەبێ دەست بە راهێنانی نیمچەسەربازی بکەم، من زۆر شارەزایی سەربازی نیم، ئەمەش بەسوودە بۆ من".

"تۆ پێویستیت پێی نییە، هیچ جەنگێك نییە تۆ بچیتە ناوی، ئێمە کار لەبواری سیخوڕیدا دەکەین".

دەمویست بچمە خولی نیمچەسەربازی، بەڵام ئارەزووشم لە مەیداندا زیاتر بوو، هیچ کاتێك بیرم لەوە نەکردۆتەوە لەساڵی ۲۰۰۱ خۆم سەرکردایەتی جەنگی سی ئای ئەی دەکەم لەئەفغانستاندا، کە گەورەترین پرۆسەی شاراوەی نیمچەسەربازی بوو لەدوای ڤێتنامدا.

"مانگی داهاتوو، لەوێ دەبم، سوپاس قوربان".

بەو شێوەیە وازم لەخولی نیمچەسەربازی هێنا، هاوکات یەکەم کەس بووم لە هاوڕێیانی خولەکەمدا بچمە مەیدان.

تەنیا بە وانەکانی "کێڵگە" نەوەستام، بۆ ئەوەی زیاتر زانیاریم هەبێ لەسەر بنەماکانی سیخوڕیدا، هاوکات چەندین خاڵی لاوازی و بەهێزی خۆم دۆزیەوە بەو پێیەی ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان بووم، هەروەها لەرووی زمان و کاری پیشەیی مەیدانی و کارایم لە نووسین لەو کاتەدا گونجاو بوو و بەرەبەرەش باشتر دەبووم.

لەلایەکی دیکەوە زۆر بەجوانی داهێنانم لە کاری سیخوڕیدا دەکرد وەك: چۆنیەتی پەیوەندیکرن بە سیخوڕە بیانییەکان، چونکە ئەو کاتەی من گەیشتمە ئەفریقیا تەمەنم بیست و پێنج ساڵان بوو، هەر زووبەزوویی هێڵە سەرەکییەکانی سیخوڕیکردن و کەسانی باوەڕپێکراوم دۆزیەوە، هەر بەزوویی توانیم لەبواری سیخوڕیدا راو بکەم بۆ خزمەتی ئەمریکا، هەر زوو زانیم ئەمە خەونی منە.

بۆیە بۆ ماوەیەکی دە ساڵان لە ئەفریقیا خزمەت دەکەم، لەوانەیە بگەمەوە هاوسەرەکەم، لەپاشاندا منداڵەکان پەروەردە بکەین، تا لە ئەفریقیا بووم بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو ببمە خاوەن هاوسەر، بێگومان بیرم لەوە نەکردۆتەوە، تا بەشێوەی ئەفریقییەکان خێزانەکەم خۆش بوێ، بەڵێ ئەمە پێشبینیکراو نییە، چونکە لە بنەڕەتدا بۆ کارێك هاتووم، کە ناوی: سیخوڕیکردنە.

# بەشی سێیەم

# سەربازگیری (تەجنید)

"ئەو پیاوەم خۆش ناوێ، دەبێ زانیاری زیاترم دەست کەوێ".

ئەبراهام لینکولن وای گوتووە.

هاواری کرد "دەبییە هۆی کوشتنی پیاوەکەم، هەروا دەبییە هـۆی کوشـتنی هەمووومان".

پیاوەکەی لەپشـتەوەی کورسـی ئۆتـۆمبێلی سـیدانە بچـووکەکە بـەهێمنی دانیشت، ئەویش لە کورسی پێشەوە دانیشت، وبستم بەرامبەر یەك دابنیشین بۆیە دەسـتێکی بـە کورسـییەکەوە گـرت و دەسـتەکەی دیکـە لەسـەر تـابلۆی نـاو ئۆتۆمبیلەکە بوو، دەنگی لەنێوەنـدی مەکینـەی ئۆتۆمبێلەکـە ئینگلیزییەکـەی دانەپۆشت و ون نەکرد، کاتێك بەسەر جادە تەڕ و پڕ کەندوکۆسپەکانم دەڕۆیشـتم، نەمدەزانی چۆن وەڵـامی ئـەو دۆخـە بدەمـەوە، کـە تیایـدا دەگـری، لەلایـەکی دیکـەوەش ئاگـاداری خـۆم بـووم نـەوەك سـەربازە هـەرزەکانی ئـەفریقی خـاڵی پشکنینان دانابێ.

لەپێش هەفتەیەکدا پیاوەکەیم سەربازگیر کردبوو وەك سیخوڕێك تـا کـار بـۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکات، ئەویش وەك مـن بیانییـە، بـەڵام لـەو شـوێنە هەژارنشـینەدا نیشـتەجێ بـووە، کـە نـاونراوە دەوڵـەت، بـەپێی ئامۆژگارییەکانم هەنگاوی نەهاوێشتبوو، بۆیە بە هاوسـەکەرەکەی را گەیانـدبوو، لە کاتێکدا ئەو ئافرەتێکی جوان و بەهێز بـوو، شـایەنی ئەوەیـە ڕێـزی بگریـت، بەتایبـەتی پیـاو و منـداڵانی خـۆی خـۆش دەوێ، سـەرەڕای ئـەوەی رقـی لەحکومەتەکەی دەبۆوە، بەڵام پێی وانییە پیاوەکەی ببێتە سـیخوڕ و سەرچـاوەی زانیارییـەکان بـۆم، چـونکە ئـەو خاتوونـە خانەوادەکـەی رووبـەڕووی ترسـناکی ناکاتەوە، لەوەش تێ نەدەگەیشت چۆن دەتوانم ئـەو ترسـناکییە کـەم بکەمـەوە، هاوکات نایەوێ گوێی لە هیچ بێ.

هەوڵم دا بۆی شی بکەمەوە، کە پێویستیم بە یارمەتی ئەوە، هاوکات هەوڵم دا بنەماکانی ئەو پیشەیەی بۆ روون بکەمەوە، تا هەموو لایەك بەتەندروست بیننەوە، ویستم بۆ لای خۆم رای بکێشم، بەو شەوە بۆ ماوەی کاتژمێرێك گفتوگۆم لەگەڵدا کرد، بەڵام پرۆسەکەم شکستی هێنا.

لەپاشان لەنزیك ئۆتۆمبیلەکەی خۆیدا دابەزاند، هەروا جارێکی دیکە هەوڵم دا وەك ئەگەرێك نەوەك رێگریەك هەبێ، هەر لەمێشکی خۆمدا بروسکەیەکم دارشت، ئەو بروسکەیەی بۆ رۆژی دواتر دەینێرم بۆ بارەگای سەرکردایەتی، کە لەپێشتردا سوودم لێ بینیوە بۆ تەجنیدکردنی سیخوڕی دیکە، لەو کاتەی بارەگا بەجۆشەوە وەڵامیان دامەوە کە باشترین کارم کردووە یان لەوانەیە باشترین کار بێ.

لە رۆژی دواتردا بروسکەکەم نووسی و پاشەکشەم بەو پرۆسەی تەجنیدکردنە هێنا، لەگەڵ ئەوەی ئەمە دۆخێکی زۆر نالەبار بوو بۆ من، بە لەدەستدانی سەرچاوەیەکی پێشبینکراوی مەزن.

لەدوای چەند مانگێك ئەو شوێنەم جێ هێشت تا بچمە وڵاتێکی دیکە، دەمویست ماڵئاوایی لەو کەسە بکەم، واتە ئەو سەرچاوە پێشبینکراوە، هاوکات لە کاتی توڕەبوونی ژنەکەیەوە هیچ گفتوگۆیەکمان نەکردووە.

پەیوەندیمان باش بوو، سەرەڕایی چەند جارێك یەکترمان بینی بەتایبەت لە قۆناغەکانی هەڵسەنگاندنی پێشکەوتووی پرۆسەی بەسیخوڕیکردن، بەجۆشوخرۆشەوە باسی خۆشەویستی خانەوادەکەی و وڵاتەکەی کرد، هەروا باسی ترس و دڵەڕاوکییەکانم کرد، کە چۆن لەو حکومەت دەترسێ و رقی لێ دەبێتەوە، رۆژ بەرۆژیش بێزاری خۆی دەنوێنێ، هیچ کات نەیدەزانی چ کارێك بکات، بەڵام

ئاماژەی پێدا کە پێویستە کارێك بکات، چونکە ناتوانێ بەو شێوە زەلیلبوونە بەردەوام بێ، لە کاتێکدا ناتوانێ لە رژێمێکی گوناهبار خۆش بێ، کە خزمەتی دەکات.

هەروا ئەوەی پێ راگەیاندن کە حکومەتی ئەمریکی بێ ئومێد بووە لە تێگەیشتن لە حکومەتەکەی، ئاماژەم بەوەدا رۆژێك لە رۆژان هاوکاریت دەکرێ بۆ رزگاربوونی گەلەکەی، بۆیە هەڵگرانەوە تاکە ئامانجە، چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێویستی بە هاوکاریکردنی بەهێزەکانە، ئەو کەسانەی دژ بە حکومەتی خۆیانن، ئەگەر بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بووە جێگەی متمانە ئەوا دەتوانێ نیشتەجێی ویلایەتە یەکگرتووەکان بێ، هیچ کاتێك داوای پارەی نەکرد و منیش ئەوەم نەخستە روو، پێی وابوو لەدواتردا باس لەمە دەکرێ.

بڕوام بەوە بوو ئەو سەرچاوەیەکی باش دەبێ، چونکە کەسێکی ئازا بوو و تێڕوانینەکانی جێگەی سەرنج بوون، ئەو تەنیا دەیویست سیخوڕی بکات لەپێناو هۆکارێکی راستدا: کە بەشداریکردنە لەپێناو وڵات و گەل و خێزانەکەیدا، منیش بۆ ئەوەی هەڵەکانی ئەو حکومەتە دیکتاتۆرییە راست بکەمەوە، هاوکات هاوسۆزیم هەبوو لەگەڵ هەموو ئەوانەی سەربازگیریم کردبوو، لە هەموو گرنگتریش رێزم لێ دەگرت، هەردەم جێگەی متمانەکردن بوو، بۆیە دەمویست ماڵئاوایی لێ بکەم.

بەپێ بەرەو ماڵیان رۆیشتم تازە رۆژهەڵاتبوو، لەدوورەوە گوێم لێ بوو کەڵەشێرەکان دەیان قوقاند، لەو کاتەشدا دەنگی ئۆتۆمبێل لەوناوە نەدەهات، پێشتر سەردانیم نەکردبوو، چونکە لە شوێنە نهێنییەکان یەکترمان بینی بوو،

هەروا چاوپێکەوتنەکانمان پێشتر ڕێکخرابوو، جگە لە چاوپێکەوتنی یەکەم و دووەم، هیچ کاتێ تەلەفۆنم بۆ نەکردووە.

لەو بەیانییە گەرمە شێدارەدا شوێنەواری هیچ کەسێکم پێشبینی نەکردبوو، کاتێك باسی ئەوەم بۆ کرد، کە لەم وڵاتە نامێنم بۆیە ویستم ماڵئاوایت لێ بکەم، ئەو زۆر ئاسوودە بوو، چاوپێکەوتنەکە چەند خولەکێکی خایاند و لەپاشاندا بۆ ماوەیەك لەگەڵمدا ڕێی کرد دوای ئەوەی لە پلیکانەکە هاتە خوارەوە، کەچی ژنەکەی لە بەلەکۆنەکەدا سەیری دەکردین و چاوی بڕیبووە من ئەمەش لەدووری ١٥ مەتر.

تەوقەم لەگەڵدا کرد، بەڵام دەستی بەرنەدام و پشتی لە ژنەکەی کرد و بەچرپە پێی گوتم دەبێ شتێك بکەم، بزیەکم بۆ کرد و بەچرپە پێم گوت: سبەی ئێوارە لە کاتژمێر ١٨:٣٠ هەروەها ناونیشانەکەم پێ دا، لەپاشاندا سەرم بۆ خێزانەکەی دانواند، کە وەك پاسەوانێك تا ئەو کاتە لەسەر بەلەکۆنەکەدا بوو، کاتێکیش لە گەڕەکەکە چوومە دەرەوە ڕێگەیەکی دیکەم گرتە بەر.

لە ئێوارەی ڕۆژی دواتردا لە هەمان شوێن یەکترمان بینی، کە پێشتر لەسەر ڕێککەوتبووین، بۆ ماوەی نیو کاتژمێر بە تۆتۆمبێلەکە دەسوڕاینەوە، هەردەمیش جەختم لەوە دەکردەوە کە کەس چاودێریمان ناکات.

لێم پرسی : "تۆ مکوڕی دەتەوێ کارێك بکەی؟".

"بێگومان پێویستە کارێك بکەم، من بەو جۆرە ناتوانم بژیم، من پشتگیری لە حکومەتەکەم دەکەم، ئەویش بەو جۆرە دڕندەییە مامەڵە لەگەڵ گەلەکەم دەکات، نامەوێ بەدزی ژنەکەمەوە هیچ کارێك بکەم، بەڵام ڕۆژێك لەڕۆژان تێ دەگات".

"ئەو دەزانێ من دەڕۆم ئەمەش دوا چاوپێکەوتنمانە، بۆیە پێویستە بە ئەفسەرێکی دیکە بتناسێنم، پێویستە ئێستا بچینە لای".

سیخوڕە نوێیەکە پرسیاری ئەوەی کرد "کێیە، ئایا ئەو باشە؟".

"دەتوانین مەرجی لەسەر بکەین، ئەو لەدێرینەکانی ڤێتنامە و سەرۆکمە، هەروا ئەو هاوڕێیەکی مەزنە، حەز بەوە دەکات کار لەگەڵ تۆدا بکات".

ئەوەی شیاوی باسە پرۆسەی بەسیخوڕیکردن کارێکی قورسە، هەروا گواستنەوەی بۆ ئەفسەرێکی دیکە، کارێکی ناخۆشە، بۆیە سیخوڕی باش ئەوەیە دەبێ ئەوەی پێ رابگەیەنێ کە پەیوەندییەکانی بە سی ئای ئەی تەنیا وەك تاکێکە، نەك وەك ئەفسەرێك، هەروا گواستنەوەی سیخوڕێك بۆ یەکێك دیکە دیدێکی دیکە بۆ حاڵەتەکە دروست دەکات.

لە شوێنەکە نزیکبووینەوە، کە لە رێگەیەکی خۆڵاویی بوو تا دەگاتە خانوویەکی بچووك، کە دەڕوانێتە سەر جۆگەلەیەکی بچووك، هاوڕێیەکەم لەدەرەوەدا چاوەڕێی کرد، لە شوێنێك راوەستا تا سەرچاوە نوێیەکەمان هەموو شتێك ببینێ ئەو کاتەی ئۆتۆمبیلەکەم رادەگرت لەلایەکدا.

هاوڕێیە باڵا بەرزەکەم بەهێمنی لە ئۆتۆمبیلەکە نزیك بۆوە کاتێك لە ئۆتۆمبیلەکە دەهاتینە خوارەوە، لەو کاتەدا بەیەکتریم ناساندن و بوارێکمدا بەهەردووکیان.

هەردووکیان تەوقەیان لەگەڵ یەکدا کرد، هەردوو لایان بزەیان بۆ یەکتر کرد لەدواتردا دەستیان بە گفتوگۆیەکی بەجۆش کرد.

بیرم لەوە کردەوە کارەکە زۆر ناخایەنێ، من لـەو کاتـەدا چـاودێری هـەردوو لایان دەکەم تا پەیوەندییەکی بەهێز بهێننە ئاراوە، چونکە خودی پرۆسەکە ئەمەی پێویستە و هەردوو لاش ئەمە دەزانن.

تەنیا دوو جار زۆر بەکورتی قسەم کـرد، چـاودێریم دەکـردن، لـەدواتردا بـۆ ماوەیەکی کەم لێیان گەڕام، بۆ ماوەی نیو کاتژمێر بوو، لەمەوەش توانیان باسـی زۆر شت بکەن، بۆیە پێویست نەبوو بەشدار بم.

هاوڕێ سیخوڕەکەم جارێکی دیکە نەبینیەوە، نەمـدەزانی چارەنووسـی چـی بووە، تەنیا لەم ساڵانەی دوایدا زانیم خانەنشین بووە، ئەو بەشێوەیەکی بەرهەمدار کاری بۆ سی ئای ئەی کردبوو، هەروا ژنەکەی پشتی گرتبوو، لە هەموو شتێکدا، هەواڵگری زۆر شتی بۆ دابین کردبـوو، هـیچ کاتێـك ئاشـکرا نـەبووە، بۆیـە زۆر بەهێمنی و سانایی خانەنشـین بـوو، وەك کەسـێکی دەوڵەمەنـد، بۆیـە سـیخوڕە بەشەرەفەکانی وەك ئەو لە شەڕی سارددا، لە جەنگەکەدا سەرکەوتوو بوون.

## پارە

بە باڵابەرزەکە و قژە چڕ و رەشە شانەکراوەکەی، بۆ ماوەی چـەند خولـەکێك لەناو مەیخانەکەدا دەیڕوانییـە هـەموو شـتێك، وەك یـەکێك بـەدوای کەسـێکدا بگەڕێ، بەڵام وام دانا بەدوای کەسێکی دیاریکراودا ناگەڕێ.

بەخەندەیەکەوە سەیری کردم و ددانە سپییەکانی دیار بوون دوای ئەوەی خـۆم پێ ناساند و گوتی "کچانی ئێرە چۆنن؟".

لە وەڵامدا گوتم : "نازانم لەوانەیە مەرجت لەگەڵدا بکەم باش نییە".

هەردوو برۆ رەشەکەی بەرەو سەرەوە و خوارەوە چوون و هـەروا زیـاتر ددانـە سپییەکانی بەدەرکەوتن، لەپاشاندا سەیرێکی ئەو مەیخانە پیسەی کرد.

لە دڵی خۆمدا گوتم : ئەی بێقیمەت.

دوای دانیشـتن چـەندین سـەرنجمان بەیـەکتر دا سـەبارەت بـەو حاڵەتـە کومەڵایەتییە ناخۆشەی تێی کـەوتووین، دانیشـتنەکە زۆری نەکێشـا، ئـەو دەی خواردەوە، بەڵام من نەم خواردەوە، بەڵام من پـارەی پەرداغـە ویسـکییەکانم دا، چونکە ئەو دیبلۆماسییەکی بیانی بوو، هەردەم پرسیاری ئەوەم لەخۆم دەکرد، ئایا دەشێ ئەمە ببێتە سیخوڕ.

چاوپێکەوتنەکانمان بەردەوام بوو، لـە هـەمان مەیخانـە، زۆرجـار دەیویسـت سۆزانییەکی دەست کەوێ، گوێم لە هەموو گلەییەکانی دەگرت، کە پەیوەست بوو بەمووچە کەمەکەی، یان باسی ئاستی ئەو ئافرەتانـەی دەکـرد کـە لـەو وڵاتـەدا بینیوویەتی، بە ماوەی چەند هەفتەیەك هەموو زانیارییەکم سـەبارەت بـە ژیـانی زانی، هەوڵم دا بزانم تا چەند دەتوانێ زانیارییـە نهێنییـەکانی دەسـت دەکـەوێ، ئەمەش زۆر ئاسانە، چونکە کەسێکی زۆربلێییـە، هـەروا کەسـێکی تـەماحکار و خۆپەرستە، داوای پارەی دەکرد ئەگەر هەر شتێکی بکردبوایە، هیچ گرنگییـەکی بە ئایدۆلۆژیا و بە بنەما نێودەوڵەتییەکان نەدەدا، هەروا هیچ گرنگی بەبۆچـوونی کەسانی دیکە نـەدەدا، بۆیـە پێویسـت نـەبوو رووبـەڕووی هـیچ جـۆرە کـارێکی ئابڕووبەری بکەیتـەوە، وەك خـۆی رۆڵـی دەگێـڕا، بـەڵام توانایـەکی وای نـەبوو، جێگەی باس نەبوو، ئەوەندە توانای هەبوو، تەنیا لەبەر ئەوە سەرسام بووم پێی کە کەسێکی روون و ئاشکرا بوو.

زۆری دەگوت و گلەیی دەکرد " ئایا تۆ کەسێکی گونجاوی؟ ئایا تۆ کەسێکی گونجاوی لە بالیۆزخانە ئەمریکییەکەت؟ لەوانەیە باشترە قسە لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بکەم؟ بەڵێ؟ نەخێر؟ " هەردوو دەستی لەبن هەنگڵی نا سەری بەرزکردەوە، لەو کاتەدا زۆر بێقیمەت دیار بوو.

لە وەڵامدا گوتم: " نەخێر، من کەسێکی گونجاوم، تەنیا دەمانەوێ جەخت لەوەبکەینەوە تا چەند ئەو کارە لەلای ئێمە و تۆدا سەرکەوتوو دەبێ".

"کارتان بۆ دەکەم، بەڵام پارەم پێ دەدەن، نهێنیتان پێشکەش دەکەم، هەر بەو سانایییە"، خەندەیەکی کرد و هەردوو شانی خۆی جوولاند و گوتی" لەوانەتە تۆ کەسی داواکراو بیت، لەوانەشە وا نەبێ، لەوانەیە کەسێکی دیکە باشتر بێ".

لێم پرسی : "چەندت دەوێ".

لە وەڵامدا گوتی "مانگانە هەزار دۆلار".

"داوای سێسەد دۆلار دەکەم و لە هەفتەی داهاتوو وەڵامت دەدەمەوە".

لێوەکانی لەرزین، لەوانەیە هەراسان بوو بێ، وەك کەسێکی بچووك، لەم کاتەدا چاوی بەنێو مەیخانەکەدا گێڕا، کە نیمچەبەتاڵ بوو، لەپێش ئەوەی لەگۆشەیەکی هێمندا دانیشین، لەگەڵ ئەوەی کاتی ئەوە نەبوو سۆزانییەك لەگەڵ خۆیدا بباتەوە.

دەم ویست بڵێم دەڕۆم، تا لەماڵەوە کتێبێك بخوێنمەوە سەبارەت بە پاڵەوانێکی راستەقینە، تا بەجۆشوخرۆشەوە بچمە ناو پرۆسەکە، چونکە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسێکی وا بێزارکەر قورسە، لەگەڵ ئەوەی پلەی وەرگرتنی نهێنی بۆ هەواڵگرییەی پێشبینیکراو بەرز بوو.

لە کۆتایدا کاندیدکراوەکەم لە وەڵامی خستنە رووەکەم گوتی "ئەمە بەسە، بەڵام لە هەفتەی داهاتوودا دەتبینم".

کاتێك دەم ویست بچمە دەرەوە دوو گەنجی باڵابەرزی لوبنانی دەهاتنە ناو مەیخانەکە، بیرم لەوە کردەوە لەوانەیە ئەمانە دوو جەنگاوەری حزبی ئەڵڵا بن لە بەیرووتەوە یان دەشتاییەکانی بیقاع هاتبن بۆ گەشت و پشوودان، پێم باش بوو یەکێك لەوانە تەجنید بکەم وەك سیخوڕ، پرسیارم لە خۆم کرد، ئایا سیخوڕی پێشبینیکراو دەتوانێ لێیان نزیك ببێتەوە، لەوانەیە من نەتوانم لێیان نزیك بکەومەوە.

لەپاش هەفتەیەك رازی بوو لەسەر مووچەکە، پاش ئەوەی زۆر گلەیی و گازاندەی کرد، پێداگری لەسەر ئەوەش کرد زۆر بەرێکوپێکی کارەکانی بکات، لەپاشاندا بۆ ماوەیەکی کەم گەڕایەوە وڵات تا ئەفسەرێکی ناوخۆیی سی ئای ئەی ببینێ، تا زیاتر جەخت لەوە بکەینەوە، کە سەرچاوە نوێیەکەمان دەتوانێ زانیاری زیاترمان پێ ببەخشێ، لەپاش لێکۆڵینەوە بڕیارەکە هات و تیایدا هاتبوو: سیخوڕەکەمان بەرادەیەکی کەم دەتوانێ بگاتە زانیارییەکان، چونکە هاوڕێیەکانی لە کاردا نهێنی پێ نادەن، بە کەسێکی گاڵتەجاڕی دەزانن.

لەپاش هاتنەوەی کارێکی دەرەکی ئەنجام دا، رادەی زانیارییەکانی کەم و بێ بەها بوو، بەڵام ئەمە شتێکی نامۆ نییە بۆ بەرپرسەکانی دەرەوە، دەبێ کاری بچووکیان پێ بسپێردرێت، بەڵام گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی باشترە، چونکە لەوانەیە زانیاری زیاتر و بەهادارتری دەست کەوێ، واتە لە رێگەی بەڵگەنامە و پەیوەندییە کەسییەکانی.

لەو حاڵەتدا من هیچ ئـەنجامێکم دەسـت نەکـەوت، چـونکە ئـەم سـیخوڕە زانیارییەکانی پڕوپووچن و هیچ توانایەکی وای نییـە تـا پیشـەگەر بـێ، چـونکە یەکێك لەو کاریانە دەبێ پەیوەندییەکی پتەوی تایبەتی هەبێ، بیرمان لەوە کردەوە بیخەینە خولێك تا وەلامی بۆ سی ئای ئەی هەبێ، بـۆ ئەمـەش لـە پرۆسـەیەکی ئەزموونیدا تاقیمان کردەوە، بەتایبەت بۆ ماوەیەکی کـورت سـەردانی وڵاتەکـەی کردەوە.

لە کۆتاییدا گواستمەوە بۆ ئەفسەرێکی دیکە، بەڵام هیچ بیرۆکەیەکم نییە کە تاچەند کارایە تا وەك سیخوڕ بمێنێتەوە، بۆیە گومـانم لێـی دەکـرد، چـونکە زۆر خۆپەرست بوو، ترسیشم لەوە هەبوو لە هەر شوێنێکدا دەتوانن بەکرێی بگرن.

لەلایەکی دیکەوە زۆربەی سیخوڕە باشەکانی کە لەگەڵ سی ئای ئەی مامەڵە دەکەن، لەو شوێنانە بوون کـە گۆشـەگیر بـوون، زۆرجـاریش هاوکارییـەکی کـەم لەحکومەتەکانیان وەردەگرن، ئەم یارمەتیدانـە جێگـەی شـەرمەزارییە، هـەردەم دەرمانم بۆ ژنێکی نەخۆش دابـین دەکـرد، تـا لـەدواتردا خـۆم ئامـادە بکـەم تـا تەجنیدی بکەم، لەوانەیـە پـاش ئـەو مانگـە بـێ، هـەروا لەبۆنەیـەکی دیکـەدا ڤیدیویەکی ئابڕووبەرم وەرگرت، کە ئامانجمان بوو تەجیندی بکـەین، دواتـر ئـەو ڤیـدیۆ و گۆڤـارە سیکسـیانەمان لـە وێسـتگەیەك بـۆی دانـا، ئەمـەش وەك فریاکـەوتنێکی خۆمـان، بەدرێـژایی ئـەو رۆژگـارە چـاوم نەکـەوت بـە هـیچ دیبلۆماسییەکی کۆریای باکوور، بۆیە داوای شتی پڕوپووچی ئابڕووبەری نەدەکرد، هاوکات هیچ پارەیەك تەرخان نەکرابوو لە لایەن پێـدەرانی بـاجی ئـەمریکی، تـا کۆرییەکان وا لێ بکەین تا کارێکی سیکسی بکـەن؟ بـەڵام گرفـت نییـە ئەگـەر سەرچاوەیەکی کۆریای باکوور یارمەتی سی ئای ئـەی بـدات، بەتایبـەتی تـا تـێ بگەین هەڕەشەی ئەتۆمی کۆریا تا چەندە، جگە لەوەی زۆربەی مووچەکەیان دەدا

بە کاری خراپ؟ ئەوانەش دەتوانن نهێنییەکانت بۆ بخەنە روو، لە کاتێکدا زانیارییەکان بەهایان هەبێ، بەتایبەت نیشانە پێشبینیکراوەکانی کەسانی نێو خزبی ائەللا، چونکە زۆر بەدگمەن ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان وەلامیان هەیە بۆ ئەم رووە رەوشتیانە کاتێك سیخوڕێك بۆ خۆی دەدۆزێتەوە، زۆرجار سیخوڕەکە تاقی دەکاتەوە، بەمەش خۆی و سی ئای ئەی تووشی ترسناکی ماددی و سیاسەت و رەوشتزڕاندن دەکات.

ئایا کەسێکی خۆپەرست و نەزان و بێڕەوشت پێویست دەکات ئەم هەموو هەوڵەی بۆ بدەیت و لەپاشاندا تووشی ترسناکی و بەهەدەردانی پارەیەکی زۆرت دەکا، زۆر جار ئەو ئەفسەرەی کەسێك تەجنید دەکات ئەو شتانە نازانێ.

## ئایدلۆژیا

چەکدارە چەتە گەنجەکانی ئەفریقیا، هیچ کاتێك بەختی ئەوەیان نەبووە، تا لە کاتێکی دیاریکراودا بجەنگن، یاخود پەیوەندی پێوە بکرێ، لەو پاسەوانە ناوخۆییەی نزیك باڵیۆزخانەی ئەمریکی بۆوە، ئەوەی سەردانی دەکرد، ناسنامەکەی دەرهێنا و پشکنینی بۆ کرا و چووە ناو باڵەخانەی باڵیۆزخانە، چووە نێوە کۆشکی پاسەوانیەتی کە دژە گولەیە، لەم کاتەدا پاسەوانی سەر بە مارێنز ئەوی بینی، سەردانیکەرەکە گوتی دەمەوێ پەیامێکی سیاسی هەستیار بگەیەنم، بۆیە جارێکی دیکە چەند لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە ناسنامە و چاوەڕوانییەکی کورت بۆوە، لەپاش ئەوەی رووپێوکرا بە ئامێری پشکنین تا بزاندرێ هیچ جۆرە کانزایەك یان ئاسنێکی پێیە، لەپاشاندا بەهاوشانی بردرا بۆ ژوورێکی بچووکی کۆبوونەوە، ئێمە لەوێدا چاوەڕوانمان دەکرد.

جێگری باڵیۆز داوای لێ کردم لەگەڵیدا بم سەبارەت بە هەر ماددەیەکی هەواڵگری، هاوکات هیوام وابوو سەرچاوەیەکی دیکەی نهێنینم دەست کەوێ، ئەوە جگە لەوەی لەماوەی پێشتردا زانیاری وردم سەبارەت بەوانە وەرگرتووە، کە خودی خۆیان دێن، ئەوانە زۆربەیان درۆزنن، هەندێکیان جێگەی گاڵتەجارین و هەندێکی دیکەیان پێویستە هاوکاریان بکەین، زۆر بەکەمی کەسانیان تیادایە خۆبەخشی راستەقینە بێ، دەیانەوێ هاوکاریمان بکەن لەبڕی پارە یان وەرگرتنی فیزەی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام هەموویان بە بێ هیوایی رۆیشتن، تەنیا بەشێکی کەمیان جێگەی ئەوەیە هەوڵیان لەگەڵدا بدەین و داهاتوویەکی نهێنیان هەبێ.

زۆر بەهێمنی لەدەوری مێزەکەدا کۆبووینەوە، گوێمان بۆ ئەو کەسە گرت، کە بانگێشتمان نەکردبوو، تا خۆی چی لەلایە باس بکات، بەئینگلیزییەکەی تەواو قسەی دەکرد، بەڵام ئاوازی دەنگی بەرز بوو، بۆیە دەنگی جێگەی دڵخۆشی بوو، بەردەوام خەندە لەسەر لێوانی بوو، لە سەرەتادا وامزانی ئەمە ئاماژەیەکە بۆ دڵڕاوکێیەکەی، بەڵام لە دواتردا زانیم خەندەکانی بۆ ئەوەیە وەك کەسێکی دڵخۆش بەدەربکەوێ، ئەمە سروشتی ئەو بوو.

ئەوە وەك خۆبەخشێك نەهاتبوو، بەڵکو وەك پەیامهێنێك هاتبوو، هاوکات باسی لەوە کرد سەرکردەی رێکخستنەکانی کۆمۆنیست نین یان دژ بە ویلایەتە یەکگرتووەکان بن، بەڵکو تەنیا دەیانەوێ ئازادی و دادپەروەری دابین بکەن بۆ چەندین کەسی خێڵەکی، کە دەچەوسێندرێنەوە، هەروا سەرکردەکانی نایانەوێ بەهەڵە لێیان تێ بگەن، بەڵکو داوای رێز و یارمەتی دەکەن، من لەپێشتردا ئەو قسانەم گوێ لێ بووبوو، کەسانێك خۆیان وادادەنێن چاکساز و جەنگاوەرانی ئازادین.

بە کاری خراپ؟ ئەوانەش دەتوانن نهێنییەکانت بۆ بخەنە روو، لە کاتێکدا زانیارییەکان بەهایان هەبێ، بەتایبەت نیشانە پێشبینیکراوەکانی کەسانی نێو خزبی ائەللا، چونکە زۆر بەدگمەن ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان وەڵامیان هەیە بۆ ئەم رووە رەوشتیانە کاتێك سیخوڕێك بۆ خۆی دەدۆزێتەوە، زۆرجار سیخوڕەکە تاقی دەکاتەوە، بەمەش خۆی و سی ئای ئەی تووشی ترسناکی ماددی و سیاسەت و رەوشتزڕاندن دەکات.

ئایا کەسێکی خۆپەرست و نەزان و بێڕەوشت پێویست دەکات ئەم هەموو هەوڵەی بۆ بدەیت و لەپاشاندا تووشی ترسناکی و بەهەدەردانی پارەیەکی زۆرت دەکا، زۆر جار ئەو ئەفسەرەی کەسێك تەجنید دەکات ئەو شتانە نازانێ.

## ئایدلۆژیا

چەکدارە چەتە گەنجەکانی ئەفریقیا، هیچ کاتێك بەختی ئەوەیان نەبووە، تا لە کاتێکی دیاریکراودا بجەنگن، یاخود پەیوەندی پێوە بکرێ، لەو پاسەوانە ناوخۆییەی نزیك باڵیۆزخانەی ئەمریکی بووە، ئەوەی سەردانی دەکرد، ناسنامەکەی دەرهێنا و پشکنینی بۆ کرا و چووە ناو باڵەخانەی باڵیۆزخانە، چووە نێوە کۆشکی پاسەوانیەتی کە دژە گولەیە، لەم کاتەدا پاسەوانی سەر بە مارێنز ئەوی بینی، سەردانیکەرەکە گوتی دەمەوێ پەیامێکی سیاسی هەستیار بگەیەنم، بۆیە جارێکی دیکە چەند لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە ناسنامە و چاوەڕوانییەکی کورت بۆوە، لەپاش ئەوەی رووپێوکرا بە ئامێری پشکنین تا بزاندرێ هیچ جۆرە کانزایەك یان ئاسنێکی پێیە، لەپاشاندا بەهاوشانی بردرا بۆ ژوورێکی بچووکی کۆبوونەوە، ئێمە لەوێدا چاوەڕوانمان دەکرد.

جێگری باڵیۆز داوای لیٚ کردم لەگەڵیدا بم سەبارەت بە هەر ماددەیەکی هەواڵگری، هاوکات هیوام وابوو سەرچاوەیەکی دیکەی نهێنینم دەست کەویٚ، ئەوە جگە لەوەی لەماوەی پێشتردا زانیاری وردم سەبارەت بەوانە وەرگرتووە، کە خودی خۆیان دێن، ئەوانە زۆربەیان درۆزنن، هەندێکیان جێگەی گاڵتەجارین و هەندێکی دیکەیان پێویستە هاوکاریان بکەین، زۆر بەکەمی کەسانیان تیادایە خۆبەخشی راستەقینە بیٚ، دەیانەویٚ هاوکاریمان بکەن لەبری پارە یان وەرگرتنی فیزەی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام هەموویان بە بیٚ هیوایی رۆیشتن، تەنیا بەشێکی کەمیان جێگەی ئەوەیە هەوڵیان لەگەڵدا بدەین و داهاتوویەکی نهێنیان هەبیٚ.

زۆر بەهێمنی لەدەوری مێزەکەدا کۆبووینەوە، گوێمان بۆ ئەو کەسە گرت، کە بانگێشتمان نەکردبوو، تا خۆی چی لەلایە باس بکات، بەئینگلیزییەکەی تەواو قسەی دەکرد، بەڵام ئاوازی دەنگی بەرز بوو، بۆیە دەنگی جێگەی دڵخۆشی بوو، بەردەوام خەندە لەسەر لێوانی بوو، لە سەرەتادا وامزانی ئەمە ئاماژەیەکە بۆ دڵڕاوکێیەکەی، بەڵام لە دواتردا زانیم خەندەکانی بۆ ئەوەیە وەك کەسێکی دڵخۆش بەدەربکەویٚ، ئەمە سروشتی ئەو بوو.

ئەوە وەك خۆبەخشێك نەهاتبوو، بەڵکو وەك پەیامهێنێك هاتبوو، هاوکات باسی لەوە کرد سەرکردەی رێکخستنەکانی کۆمۆنیست نین یان دژ بە ویلایەتە یەکگرتووەکان بن، بەڵکو تەنیا دەیانەویٚ ئازادی و دادپەروەری دابین بکەن بۆ چەندین کەسی خێڵەکی، کە دەچەوسێندرێنەوە، هەروا سەرکردەکانی نایانەویٚ بەهەڵە لێیان تیٚ بگەن، بەڵکو داوای رێز و یارمەتی دەکەن، من لەپێشتردا ئەو قسانەم گویٚ لیٚ بووبوو، کەسانێك خۆیان وادادەنێن چاکساز و جەنگاوەرانی ئازادین.

لێم پرسی: "بۆچی سەرکردەکانت رازی بوونە لەوەرگرتنی پارە و چەك و راهێنان لەلایەن ئەڵمانییە رۆژهەڵاتییەکان و چەندان شوێنی دیکەی بریکارەکانی سۆفیەت؟".

بەجوانی وەڵامی دایەوە :"چونکە ئەوان ئێمەیان دەوێ و ئێوەش ئەو کارە ناکەن".

لە خۆم پرسی ئایا ئەو فێڵبازە، بەڵام ئەگەر منیش بوام هەمان وەڵامم دەدایەوە، یان چیم دەکرد ئەگەر لە هەمان دۆخەدا لەدایك بووبام؟ ئایا رازی دەبووم چەك لە هاوپەیمانی وارشۆ وەربگرم؟ ئایا هەمان ئازایەتیم دەبوو تا بەردەوام وا کارا بم لە کاتێکدا ژینگەکەی زۆر ناخۆشە؟

سەیریم کرد و کەچی ئەو خەندەکانی بەردەوام بوو.

لەتێوەندی لێکۆڵینەوەکان چەندین پرسیارم لێ کرد، لە کاتێکدا ناسنامەکەیم بەدەستەوەیە و ناسنامەکەشی ناسنامەی پەنابەران بوو، دەزانم چ کارەساتێکە تۆ لەنێوەندی جەنگدا بیت، لە کاتێکدا ئەو هەموو شتێکی کۆن و نوێی دەزانی، بەڵام بەگشتی وەڵامەکانی بەئاگاییەوە بوو، هەستم بەوە کرد ئەوە کەسێکی دەگمەنە، دەیزانی جیاوازی لەنێوەندی زانیارییەکان بکات، جگە لەوەی کەسێکی زیرەك و بەهێزە، ئایا ئەمە بەخۆڕسکی سیخوڕ بووە؟

جێگری باڵیۆز سوپاسی کرد و بەڵێنی پێ دا نامەکەی بگەیەندرێتە واشنتن، لەپاش وەرگرتنی وەڵام باڵیۆزخانە پەیوەندی پێوە دەکا.

گومانم لەوە هەبوو حکومەتی ئەمریکی کارێکی زۆریان بۆ بکات، ئەگەر کردی، لە کاتێکدا لەنێوەندی ئەو هەموو ململانێیانەدایە بەتایبەتی لەجەنگی ساردا، کار بۆ کەسانێك بکات دەجەنگن و دەکوژرێن؟ دەبێ ئەجندیان چی بێ؟

له کاتێکدا ئەو گەنجە لەنێوەندی هەموو جەنگەکانی ناوەڕاستی ئەفریقیا دایە، لەنێوەندی گێژاوەی ململانێی ئایدۆلۆژی جیهانی لەنێوان کۆمۆیست و سەرمایەداریدا، لەتەك ئەوەی هەموو پلانەکانی سوفیەتی و نیەتەکانیان بۆ چەندین دەوڵەت و ئەو بۆمبانەی دانراوەتەوە بۆیان، بۆیە چەندین پرسیار هەیە سەبارەت بەبڕیاردەرانی سیاسەتی ئەمریکی و جەنگ و ململانێیەکان و سەبارەت بەم کەسەش.

پرسیاری شوێنی نیشتەجێبوونەکەی لێ کرد، ئەویش ناوی هوتێلێکی ناخۆشی پێ گوتم کە لەلایەکی ئەو شارەدایە.

له شەوی دووەمدا داوەتم کرد تا بەیەکەوە ئێوارە نان بخۆین وەك خواردنی گوشتی مانگا، لەلایەکی شوێنەکە لەگەڵ ئەوەی زۆر راقی نەبوو، چونکە تێکەڵ بوو لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچەیە و ئەو گەشتیارانەی جانتاکانیان لەپشتە، شوێنێکی وا نییە تا بەرپرسە حکومییەکان بچنە نەوێ، من جلوبەرگی ئاسایم پۆشی کە پێکهاتبوو لە جێنز و و تیشێرتێك.

کاتێك باسی داوەتەکەم کرد هەردوو برۆی بەرز بۆوە و خەندەیەکی کرد و سەری لەقاند و گوتی " دەتوانیت مەرجم لەگەڵدا بکەیت".

لەپاش ئەو نانخواردنەی ئەو ئێوارەیە هیچ کاتێك لە شوێنی گشتی کۆنەدەبووینەوە، هەردەم لەناو ئۆتۆمبیلەکەی باسی رێکخستنەکانی دەکرد، لەچاوپێکەوتنی دووەمدا زۆرێك لە زانیاریی دیکەشی گوت، کاتێك دەیویست بڕواتە قووڵایی جەنگەڵەکان پارە و دەرمان و چەند شتێکی دیکەم پێ دا، چونکە دوای سێ مانگی دیکە ناگەڕێتەوە و هیچ ئامرازێکیش نییە تا پەیوەندی پێوە

بکەم، بیرم لەوەکردەوە و هیوام وابوو کارەکانی بەجوانترین شێوە بکات، نەك تەنیا هیوای گۆشتخواردن و وەرگرتنی پارە بێ.

دوای ئەوەی چەند سەد میلێك بەناو خاکی ئەفریقیای ترسناکدا سوڕایەوە، کە خۆی لەسێ وڵاتدا دەنوێنێ، ڕۆژێك پەیوەندیم بەو تەلەفۆنەوە کرد، کە لەمێشکی خۆمدا دامنابوو.

پرسیارم کرد: ئایا دەتوانم قسە لەگەڵ کیماو بکەم.

ئەو ژنەی وەڵامی دایەوە گوتی: "ئەم ژمارەیە هەڵەیە کەس بەو ناوە لێرە نییە"، هێڵەکەی دانایەوە.

مەبەستم لەو پەیوەندییە ئەوە تا لەگەڵ کیماو قسە بکەم و لەپاش دوو ڕۆژی دیکە کۆبوونەوەیەك بکەین، لەو شوێنەی کە پێشتر دانرا بوو، دڵخۆش بووم چونکە لەنێوەندی شارم دا، بەڵام نەدەبوایە ئەفسەرێکی پشتگیری لەوێدا کۆببێتەوە.

هەردەم جەختم لەوە دەکردەوە کە بەهیچ شێوەیەك چاودێریم ناکرێ، چەند جارێك لە ڕێگەکان دەوەستام تا بەنزین لە ئۆتۆمبیلەکە بکەم، یان بتلێك ئاو بخۆمەوە یاخود داوای گۆڤارێکی وەرزشیم دەکرد، لەنێوەندی هەموو ئەو ڕێگایانە دیسان جەختم لەوە دەکردەوە نەوەك چاودێری بکرێم، بەو شێوەیە تا چوومە نێو کۆمەڵگەیەك هەموو باڵەخانە بوو، لەناکاودا سەرچاوە نوێیەکەم هاتە نێو ئۆتۆمبێلەکە، منیش بەخێرایی ڕۆیشتم تا دوور بکەمەوە لەو ناوچەیە.

ئەو نۆ کیلۆ لەکێشی هاتبووە خوارەوە، بەنێو شەقامەکەدا تێپەڕ دەبووین و تیشکیش لەزێی نیلی دەدا، لەژێر پێستە ڕەشە بریسکەدارەکەی ئێسکی ڕوومەتی

بەدیار کەوتبوو، وام دانا ئەگەر چەند کیلۆیەکی دیکە لە کێشی دابـەزێنی تـەنیا وەك پەیکەرێکی ئێسك دەمێنێتەوە.

لێم پرسی : " چۆنی و لەچ دۆخێکدای".

"هە، من باشم، سوپاست دەکەم". بەبێ ئـەوەی هـیچ لاوازی و ناخۆشـی و گاڵتەجارییەکی پێوە دیار بێ.

تەنیا هەناسەی دەدا و دەجولا، هەروا حەزی بە گفتوگۆی جوگرافیای سیاسی و داهاتووی گەلەکەی بوو، وابیرم کـردەوە ئەمـە رازیبوونـە تـەنیا رێژییـە، ئایـا بەراستی ئەو بەو شێوەیە دڵخۆشە؟ یان بەرجەستەی خۆی وایـە؟ باشـە لـەو سـێ مانگە تووشی چی بۆتەوە؟

لە ماوەی دوو هەفتەی داهاتوودا هەموو شوێنەکان دیاری دەکەم، بەتایبەتی رەشنووسێکی نەخشەیی بۆ سەربازگەی رێکخستنە چەکدارەکانی، زانـیم رێگـەی بەهانەوەچوون و گەیشتنی کەلوپـەل لەکوێـدا دێ، هـەروا تێگەیشـتم پەیوەنـدی ناوخۆیی و دەرەکی رێکخستنە چەکدارییەکە چۆنە بەتایبەتی لـە دۆخـی جـەنگی ساردا، بێگومان ئەوانیش هۆکـاری خۆیـان هەیـە بـۆ شـەڕکردن وەك هۆکـاری خێڵەکی و ناوچـەیی، چـەندین راپـۆرتی هـەواڵگریم نووسـی و چـەند وێنەیـەکی ئاسمانیم بەدەست گەیشت، کاتێك یەکێك لەو وێنانەم بەدەسـت گەیشـت هاوشـانم کرد لەگەڵ پێوەرەکان و لەگەڵ نەخشە و رێگەکانی کەڵك وەرگرتن دام نا هەمووی تەواو بوو.

سەرچاوە نوێیەکەم کارەکانی زۆر بەسوود بوو، پێویست دەکات خۆمان بخەینە ترسناکییەوە هەروا گرنگیشە ئەوان ئێمە بەکاردەهێنن.

داوام لە یەکێك لە پزیشکەکانی سی ئای ئەی کرد پشکنینی بۆ بکات، وەك هەموو ئەوانەی لە دەزگادا ناسیومن، بۆ کەسانێك کە تازا و روونن، کاتێك پشکنینەکانی هاتەوە چەندین نەخۆشی هەبوو، وەك مەلاریا و بەدخۆراکی لەتەك ژیانێکی کولەمەرگی.

خواردن و دەرمانم پێ دا و گوێم بۆ راگرت، باسی جیهانێکی ونبووی دەکرد کە هیچ کاتێك لەپێش چاوی بڕیاردەرانی سیاسەت و سیاسییەکانی واشنتن نەبوو.

لەگەڵیدا باسی بەهای کار و ئامازە و مەڕ و ئافرەت و تفەنگە هێرشبەرەکان و جەنگەکان و پارە کرد، کە لە جیهانی ئەودا لەکوێدان، هاوکات باسی شکۆی مرۆڤ کرا کە بەپارە ناکڕدرێ، جگە لەوەی باسی هەموو پێوەرەکانی خێڵەکی و کلتوور و سیاسەت بەشێوەیەکی وێنەیی کرد.

ئەو خێڵەی سەر بەرێکخستنەکانی ئەوە هێرشێکیان بۆ سەر مەڕ و ماڵاتی خێڵێکی دیکە کردووە، لە سەرەتادا ئەمە وەك پرۆسەیەکی ساکار سەیر کراوە، بەڵام زۆری نەبردووە بۆتە کارەسات ئەویش بە کوشتنی ژن و منداڵ، هەروا خێڵی بەرامبەر بۆ تۆڵەسەندنەوە چەندین هێرشی کردووە بەتایبەتی رێی هاتنی کەرەستە و کەلوپەلی گرتووە، لەلایەکی دیکەوە خاوەنەکانیان کە هاوپەیمانی وارشۆیە تووشی سەرسوڕمان بوونە و بە هۆی ئەو کارانە بەیەکجاری تووڕە بوونە، پێیان گوتوونە ئەم بێ عەقڵییە دەبێتە هۆی شکاندنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا، بۆیە پەیوەندییەکانی نێوان رێکخستنەکەی و ئەڵمانییە رۆژهەڵاتییەکان تێکچووە، هەموو ئەمانەش بە هۆی ململانێیە خێڵەکییەکان.

سیخوڕەکەم لەمانە تێ دەگەیشت، چونکە لەرۆژئاوا خوێندویەتی، سەرسام بوو بە دیموکراتییەتی جیفرسۆن، گومانی هەبوو لەوڵاتەکەیدا ئەو جۆرە

پێشـــکەوتنە بێتـــە ئـــاراوە، ئـــەو راســـت دەکـــا، چـــونکە مـــن و ئـــەو هـــیچ ئەلتەرناتیفێکمان نییە نە بەهێمنی نە زیاتر، هەروا ئەو هاوکارییەی نێوان مـــن و ئەو نابێتە ئەلتەرناتیف.

بۆ ماوەی سێ ساڵ لەلای من کاری دەکرد دواتر گواستمەوە لای ئەفسەرێکی دیکە، لەپاش دوو ساڵی دیکە گواسترایەوە بۆ ئەفسەرێکی دیکە، ئەو بەدڵســـۆزی کاری بۆ سی ئای ئەی دەکرد و بـــە هـــۆی ئـــەوەوە ســـەدان راپـــۆرت نووســـرا بۆیـــە مووچەیەکی باشیان پێ دەدا، لەراستیدا هاوکارییەکانی زیـــاتر بـــۆ ئـــەوە بـــوو تـــا هاوکاری گەلەکەی بکرێ، دەیویست دەوڵەتێك بۆ گەلەکـــەی بهێنێتـــە ئـــاراوە تـــا بەسەقامگیری بژین و خاوەن دەزگای لیبرالی و بازاڕی ئـــازاد و دیموکراتیـــەت بـــن، هەردەم دەویست ئەو بۆچوونانە لەنێوەندی ئەفریقیادا بچندرێ.

ئەو بە خەونەکانی نەگەیشت، لە یەکێك لە ئۆپراسیۆنەکانی ســـی ئـــای ئـــەی مرد، کاتێك دەیویست لە سنورێکدا بپەڕێتەوە، سی ئای ئەی دوای رۆژێك ئەمەی زانی و منیش لە کارێکی دیکەدا بووم دوای چەند هەفتەیەك زانیم، بێگومان ئەم پاڵەوانە زۆر لەمێژە لەنێوەندی سی ئای ئەی لەبیر کراوە، تەنیا سێ کەس لەبیریان ماوە کە خێزان و دوو ئەفسەر و من دەزانم، ئەمە سروشتی سیخوڕییە.

ئەگەر ئێستا لەژیاندا بوایە داوەتم دەکرد تا بێتە ماڵەکـــەم و بـــە هاوســـەر و منداڵەکانم دەناساند بەتایبەتی ئەو کوڕانەم کە لە ئەفریقیا پەروەردە بوونە، ئێستا باسی سیاسەتمان دەکرد، وەکچۆن لەژێر درختەکانی سندیان هەموو شتێکمان باس دەکرد و هەر لەوێدا گوشتم دەبرژاند تا گۆشتەکە بخوا، ئەو زۆر خۆشی لە خواردن دەبینی، وەکچۆن ژیانی وابوو.

ئەو یەکێکە لەو سیخوڕانەی هەردەم دڵخۆش بـوو، یـەکێك بـوو لەباشـترین سیخوڕەکانم، ئەو مامۆستام بوو، ئەو کەسێکی بریسکەدار و بەهێز و ئـازا بـوو، گەلەکەی خۆی خۆش دەویست، ئـەو هـاوڕێ و سەرچـاوەی بـەهرەکانم بـوو، ئـەو هیوایەکی ئەفریقیا بوو، بیری دەکەم.

## خۆتووشکردن

لە سندووقی پارەی باڵیۆزخانە، بڕە پارەیەکی دەرهێنا بەو بیانووەی دەیـەوێ چەند پێداویستییەك بکڕێ، کەچی لە کارێکی بەرەڵاییدا هەموو پارەکەی لەدەست دا، بۆیە هیچ ئامرازێکی نەدۆزیەوە تا پارە دزراوەکە بگەڕێنەتـەوە، پارەکـە زۆر نەبوو، بـەڵام بـۆ ئـەو پـارەی وا زۆری نـەبوو، لەلایـەکی دیکـەوە بـەوەی زانـی لەهەفتەی داهاتوودا باڵیۆزخانە وردبینی لە حیسابی سندووقەکەدا دەکات، ئەگەر زووتر وردبینی نەکەن، چونکە ئەمکارە بە دزی دەژمێردرێ، شکاندنی ئاسایش و ترسناکییە لەسەر حکومەت.

بەرپرسەکەی بەدوای هەلێکدا دەگەڕا تا تۆڵەی لێ بسێنێتەوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی رووبەڕووی ترسناکی دەبێتەوە، بۆیـە ئـەو کەسـە بەرپرسـیاریەتی دەگرێتـە ئەستۆ، هیچ کام لە باڵیۆزخانەکە و سەرۆکەکەی بـەزەیـیان پـێ نەهاتـەوە، بۆیـە پرسیاری ئەوەیان دەکرد چ تاوانێکی دیکەی ئەنجام داوە، ئەگەر تاوانبار کرا، ئەوا چەندین کاری دیکەی کردووە، هەموویان وەك مارێك وابوون تا رووبـەڕووی هـەر ترسناك ببنەوە، چونکە هەموویان لەنێو ترسدان، ئەگەر هەر دەستگیر کـرا ئـەوا بەرامبەر لێکۆڵینەوەیەکی گەورە دەبێتەوە و سزاکەشی بۆ ماوەیـەکی دوورودرێـژ

له زینداندا دەبێ، ئەمە بە هۆی بەرپرسیاریەتی لە شوێنەکەی و بە هۆی بەرپرسیاریەتیی پیشەگەرییەکەی.

ئەو وەك ئەفسەری گەیاندن ناسراوە، هەروا وەك نووسەری کۆدەکان ناسراوە لە یەکێك لە باڵیۆزخانەکان، تەنیاش نووسەرێکی ئاسایی کۆدەکان نییە، بەڵکو بۆ دەزگای هەواڵگری دەرەوە کار بۆ وڵاتەکەی دەکات، هەردەم کلیلی کۆدەکانی لەلا بوو، هەروا کار لەنێو دۆسییەکان دەکات، جگە لەوەی هەموو شتێك سەبارت بە دەزگای سیخوڕی وڵاتەکەی خۆی دەزانێ.

کەچی دەزگاکەی بەهیچ جۆرێك لێی نابووریێ، کاتێك رێکخستنەکان تێك دەدا، چونکە ئەمکارە تاوانە، لەگەڵ ئەوەی کارێکی پڕووپووچە، لە کاتێکدا هاوسەر و منداڵەکانی تووشی ترسناکی کردەوە، کە لەوڵاتدا لەلای خزمانی خێزانەکەیەتی، بەڵام هەموویان تووشی سزا دەبنەوە، ئەگەر ئەو شەرمەزارییە لەسەری ئاشکرا بوو، هەروا خۆی گوتی: کارێکی گێلانەم کردووە بۆ ئارەزوویەکی گێلانە.

وەك هەر بەرپرسێکی وڵاتەکەی دەیوست هەڵگەڕێتەوە، چونکە ژیانی رۆژئاوا جۆرە ئارەزوویەکی روونە، لەوانەشە لەژێر پەنجەکانی چەندین شت ئاشکرا بووە بەتایبەتی وێنە و چەمکەکانی ئازادی و پارە و ئۆتۆمبێل و فیلم و خانووی گەورە و هەڵەکان، کاتێکیش ئەوانە دەچنە دەرەوە بەتایبەت لە وڵاتانی سێیەم، ئارەزووەکان زیاتر و زیاتر دەبن، لە کاتێکدا ئەو شتی وا ناکا، چونکە خێزانەکەی خۆی خۆش دەوێ، دەبێ بیان پارێزێ.

بەو شێوەیە دەژیا، زۆربەی جارانیش مەی دەخواردەوە و بەکەمیش قوماری دەکرد، بەڵام هەر کاتێك سۆزانییەکی دەست بکوتایە ئەوا لەگەڵ خۆیدا دەی

بردەوە، پێی وابوو ئەم کارانە ئەوەندە چەپڵ نین، بۆیە زۆرێك لە گوناهی دیکەی دەکرد، بەڵام دەزگاکەی چاودێریان دەکرد و رادەیەکیان بۆ ئەو کارەی دادەنا، لە کاتێکدا خۆی بەپیاوێکی باش و مێردێکی باش و باوکێکی باش لەقەڵەم دەدا، بەڵام بەگێلانە هەڵسوکەوتی دەکرد، ئەو وڵاتی خۆی خۆش دەویست، بەڵام سیاسی نەبوو، کەچی لەنێوەندی کۆمەڵگە ژیاوە و لەدەزگایەکدا کاری کردووە، کە سیاسەت رێگەی پێ داوە، دژ بە خودا دەجولایەوە، لەگەڵ ئەوەی دەیزانی خودا بوونی هەیە، لەو کاتەی باپیرەی کتێبی پیرۆزی پێ خوێندۆتەوە، بڕوا مەسیحییەکەی خۆی دەشاردەوە، بەنهێنی نوێژی دەکرد، بۆیەش نوێژی دەکرد تا وەڵامێك بۆ کێشەکانی بدۆزێتەوە.

هەموو بەیانییەکی رۆژی شەممە لەگەڵ خێزانەکەی و چەند کەسێکی باڵیۆزخانەدا سەردانی بازاڕی دەکرد، ئەو نەخشەی ناوچەکەی بەتەواوی ئەزبەرکردبوو، لەپێشتریشدا ناونیشانی هەموو ماڵێکی ئەفسەرەکانی سی ئای ئەی دەزانی لەو شارەدا، چونکە دەزگاکەی چاودێری ئەو ئەفسەرە دژانەی دەکرد، ئەمەش پەیوەستە بە دژە سیخوڕی، بیروهۆشێکی سەیری هەبوو، هەموو ناونیشانەکانی بەبیر دەهاتەوە، کاتێك سەیری نەخشەکەی دەکرد، دەیزانی یەکێك لە ئامانجەکانی سی ئای ئەی چۆنیەتی چوونەژوورەوەی باڵیۆزخانە و دەزگای هەواڵگرییەکەیەتی، بەڵام پێشبینی ئەوەی دەکرد چ بەهایەکی لەناو سی ئای ئەی هەیە.

ئەوەشی دۆزیەوە، کە خۆی مەبەستیەتی، واتە ناونیشانی یەکێك لە ئەفسەرەکانە، ماوەی هاتنوچوونی بیست خولەکە ئەگەر بەناو بازاڕدا بڕوات، بۆیە بەخێرایی دەڕۆیشت لەدەرەوەی بازاڕدا، چونکە هیچ بژاردەیەکی دیکەی نەبوو.

بەپێی دۆسییەی سی ئای ئەی ئەو ئەفسەرێکی گەنج بوو، ئەمەش دووەمجارە دەچێتە نێو خزمەتەوە، هەروا هیچ هەڵسەنگاندنێك بۆ ئەو ئەفسەرە نییە، ئایا ئەو بەتەواوی تێگەیشتنی هەبووە و پێ گەیوە؟ ئایا ئەو کارا بووە؟ تەنیا توانیویەتی بچێتە ناو دەزگای وەزارەتی دەرەوەی وڵاتی میواندار، کە هەموو زانیارییەکی پێ داوە سەبارەت بە هەموو فەرمانبەرە فەرمییەکانی ئەمریکا، لێرەوە دەزگای سی ئای ئەی دیاری کرد تا بزاندرێ چۆن هەموو زانیاری و ناسنامەکان وا گەیشتۆتە دەستیان، لەتەك ئەوەی هەر هەمووشیان دەناسی، هەروا لەنێو مێشکیدا وێنەی ئەفسەرەکەی کێشاوە، هەتا جۆری ئۆتۆمبیل و مۆدیل و رەنگ و ژمارەکەی دەزانێ.

لە بەیانییەکی زووی رۆژی دواتر یاداشتێکی بە زمانی ئینگلیزی نووسی، کە پێکهاتبوو لە نەخشەیەکی ساکار بەڵام ورد، کارەکە ماوەی دوو کاتژمێری خایاند ئەمەش بە هۆی بەکارهێنانی فەرهەنگی ئینگلیزی، چونکە زمانەکەی زۆر سەرەتایی بوو، مکورِ بوو لەوەی هیچ هەڵەیەکی تیادا نییە، بیری لەوە کردەوە بەزمانی رەسەنی خۆی یاداشتەکە بنووسێ، بەڵام دەیزانی سی ئای ئەی نایباتە هیچ شوێنێك بۆ وەرگێڕانی، ئەو چاوەڕێی دەکرد لە کاتێکدا وەڵامەکەی پێ بگات، چونکە ئەو قەرزەی لەسەری بوو کاتێکی درەنگی بەسەردا چووە، کاغەزێکی بەکار هێناوە لەنێو ئاودا دەتوێتەوە و بەچەند چرکەیەك شوێنەواری نەمێنێ، هەروا قووتی دەدا ئەگەر پێویست بوو، لەلایەکی دیکەوە کاغەزە بەشێوەیەکی ئەندازیاری ورد دانرابوو، هاوکات زۆر بەشارەزایانی شاردبوویەوە.

لەبازاڕ دوور کەوتەوە، نەوەك خێزانەکەی و کەسانی دیکە ببینن، لێرەوە بەجۆشەوە بەرەو ناونیشانی ئەفسەری سی ئای ئەی رۆیشت، لەپاش دە خولەکدا خۆی لەشوێنکدا بینیوە، تیایدا ئۆتۆمبیلەکەی پارك کردووە، لەدووری چەند

هەنگاوێك لە شوێنی سوڕانەوە لە دڵی خۆیدا گوتی "سوپاس خودایە" تەنیا چەند کەسێك لە نیشتەجێبووانی ئەو شەقامە هێمنە بینیوویانە، لەگەڵ ئەوەی هێشتا زووە، یەکسەر بەرەو دەروازەکە رۆیشت و یاداشتەکەی لەنێوان دەرگا و چوارچێوەکەدا دانا، ئەمە بەپێنج چرکە، بۆ دووبارەش گەڕایەوە شەقامەکە.

نەی دەویست یاداشتەکە بخاتە پارچە پەرۆکە چوار گۆشەکەی بەردەم دەرگا، چونکە ئەمە لەلایەن زۆر کەسەوە دەبینـدرێ، هەر لـەدەرگادانێکیش کارێکی قورسە، هەروا کاتێکی زۆری دەوێ و ترسناکە، ئەوەی ئێستا کەمێك سەرکەوتنی بەدواوە دێ، لە کۆتاییدا هەلێکی دەست دەکەوێ.

گەڕایەوە بازاڕ و چەند جۆرە گوڵێکی بۆ هاوسەرەکەی کڕی، بەهێمنی گەڕایەوە، لەئێوارەدا داواکاری کرد بچێتە ئەو کوشکەی نزیك باڵیۆزخانە تا جگەرە بۆ خۆی بکڕێ، لەگەڵ شکوڵاتە بۆ هاوسەرەکەی، ئەفسەری ئاسایشەکە رەزای بوو و گوتی منیش دێم، لەدڵی خۆیدا گوتی "بەنەفرەت بێ، کارەکە لەگەڵ بوونی پاسەوانێك لە تەکەمدا سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ"، بڕاردەی نەبوو و هەردووکیان بەرەو کوشکەکە چوون.

هیچ نیشانەیەك نەبوو ئەفسەرێکی سی ئای ئەی لەوێدا بێ، هەروا نیشانەیەك نەبوو ئەمریکییەك لەوێدا بێ، بەبوونی پاسەوانێك ئەوا ئەفسەری سی ئای ئەی ترسی لە خۆی دەبێ، ئەگەریش بەدەربکەوێ کاتەکە باش نییە، وەك ژیانی باش نییە.

پاسەوانەکە جگەرەی دەکێشا و بەهێمنی دەبڕوانییە گەڕەکە کۆنەکە، ئەو کەسێکی قەڵەو بوو، هیچ جۆرە زیرەکییەکی پێوە دیار نییە، بەڵام دڵسۆزی ئەو رژێمە بوو، کە لەخزمەتی دابوو.

نووسەری کۆدەکان پارەی ئەو شتانەی دا کە کڕیبووی، لەپاشاندا دوور لەمێزی کاشێر راوەستا و ئەو ئافرەتەی خڕ و پڕەی لەوێدا بوو بەچاوێکی گومانەوە سەیرێکی کرد، بەڵام بەردەوام بوو لەرۆیشتن، کەچی پاسەوانەکە لەدووری دە هەنگاودا وەستا بەبێزارییەوە هیچ بوونێکی بۆ ئەو لە ئاوێنە دانەنا.

سی ئای ئەی وەڵامی یاداشتەکەی دایەوە، هەروا ئەفسەرەکە ئەوەندە پارەی بۆ دانابوو تا پارە دزراوەکە لە شوێنی خۆی دابنێتەوە، ئەوەشی زانی ئەمکارە بەپێی رێنماییەکانە.

هیچ کاتێك ئەفسەرەکەی سی ئای ئەی نەبینی کە نامەکەی بۆ نارد، جارێکی دیکە ئەو ئافرەتەشی نەبینی، کە یەکێك لە ئافرەتە بەتواناکانی سی ئای ئەی بوو، رووبەڕوو لەگەڵ هیچ کام لە ئەفسەرانی سی ئای ئەی یەکتریان نەبینی، لەگەڵ ئەوەی بۆ ماوەی چەند ساڵێك چەند راپۆرتی مەزنی بۆ هەواڵگری دەنارد لەبەرامبەر پارەیەکی کەمدا، ئەمەش لەحیسابێکی نهێنیدا، ئەو بە هۆی چەندین ئامرازی کۆن بابەتەکانی دەنارد، ئەو یەکێك لە گەورە سیخوڕەکانی سی ئای ئەی بوو، هیچ کاتێکیش دەستگیر نەکراوە.

## ئالانا

پیاوە باڵابەرزەکە، کاری کاغەزی بەهێمنی جێبەجێ دەکرد، سێ دانەی رێکخست و لەنێوانیان کاغەزی مەرەکەبی شینی دانا، بەنەرمی دەستێکی لێ دا، لەپاشاندا دەستی بە نووسین کرد و وشەکانی گەورە و دوور بوون لەیەکتری، بە قەلەمێکی مەرەکەبی وشك، لەپشت چاویلکەیەوە دەیڕوانییە هەموو لایەك.

هەوای پانکەکەی سەرەوە دەنگی دەهات و هەوای گەرمی بەنێوەندی نوسینگەکەدا بڵاوە پێ دەکرد، لەسەر دیواری نووسینگەکەی وێنەی شۆفەڵێك هەڵواسرابوو، هەروا لە ساڵنامەکەدا زۆربەی رۆژەکان هێڵی بەسەردا دانرابوو، لەسەر مێزەکە چەند کاغەزێك دوو مۆر دنرابوو، کە زۆر لەیەکتر دوور نەبوون، هیچ شتێکی دیکەی لێ نەبوو، کە ئاماژە بەژیانی ئەو بدا، ئەو تەنیا وەك نووسەرێکی داواکارییەکان لە نووسینگەکەی بەهێمنی کار دەکات.

چاوەڕێم کرد و چاودێریم کرد.

یەکێك لە دانە نووسراوەکانی پێ دام، ناوەڕۆکەکەم خوێندەوە، هەموو شتەکانی بەتەواوی نووسی بوو، سوپاسم کرد.

تەنیا جارێك سەری بلند کردەوە و بینم یەخەی کراسە سپییەکەی چلکن بووە و بۆینباخە گەورەکەی هاتبووە خوارەوە.

لێم پرسی: " دەتوانم پەیوەندیت پێوە بکەم، ئەگەر هەر پرسیارێکم هەبوو؟".

"بەڵێ، دەتوانیت" بەبێ هیچ جۆشێك و خۆشییەك وەڵامی دایەوە، بەڵام دوژمنانە نەبوو، ئەو کارتی نەبوو، بەڵکو ژمارەی تەلەفۆنەکەی لەسەر پارچە کاغەزێك نووسی.

لەپاش دوو هەفتە پەیوەندیم پێوە کرد، باسی گرفتێکی بیرۆکراتیم بۆ کرد، رازی بوو یەکتر ببینین، بۆ چارەسەرکردنی بابەتەکە.

زۆر بەخێرایی چەندین باسمان خستە روو، لەنێویاندا جوگرفیای سیاسی و ژیانی تایبەتی خۆی، ئەو فەرمانبەرێکی حکومییە و نە هاوسەری هەیە، نە

هـاورِێ، ئـەو زانکـۆی تـەواو نـەکردووە، بـەڵام بـەردەوام دەخوێنێتـەوە، چـەند پرسیارێکی سەبارەت بە ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد، کە بەهیچ جۆرێك سەردانی نەکردووە، حەزیش بەوە دەکـات نیۆیـۆرك و لـۆس ئـەنجلۆس ببینـێ، پێشـتر لـە تەلـەفزیۆن چـەند دیـمەنێکی ئـەو شـارە مەزنـەی بینـووە، باسیشـی لـەوە کـرد بەڕێوەبەرەکەی کەسێکی دادپەروەرە بەڵام زۆر سـەرقاڵە، هـەروا هـیچ پلانێکـی پیشەگەری داهاتووی نییە، هەروا خۆشیی لە کارەکەیدا دەبینـێ، لەتـەك ئـەوەی کارێکی سانایە.

لـەپاش چـەند کۆبوونەیـەك، لەپاشـاندا چـەندین زانیـاری پـێ دام، بـەڵام ئاستەکانی زۆر سەرەتایی بوو، هیچ زانیارییەکی هەستیاری تیـادا نـەبوو، بـەڵام جێگەی متمانەکردن بوو، دوای ئەوەی زۆرێك لە نووسراوی نهێنی خوێندبۆوە، دوو دیاری سانام پێ بەخشی، کە کۆمـەڵێك قەلەمی مەرەکەب و کۆمـەڵێك قەڵـەمی دار، چونکە لای ئەو قورس بوو شتە بەنرخەکان لەیەکتر جیا بکاتەوە، هەروا چەند جارێك پارەم پێ دا بەڵام زۆر نەبوو، ئەمەو لەپاش ماوەیەك چەندین بەڵگەنامـەی نهێنی پێ دام، نەمودەویسـت رازی بکـەم، ناچـاریش نـەبووم، تـەنیا پەیوەنـدی کارمان بەرەو پێشەوە چوو.

پارە و ئایدلۆجیەت زۆر گرنگ بوو، بەڵام ئەم سیخوڕە دەیویست زیاتر گوێی لێ رابگریت، چونکە بەختی نەبوو تا پلەکەی بەرزبکرێتەوە، چونکە بڕوانامەکەی وا نەبوو و هاوکات خێزانداریش نەبوو، ئەو نووسەرێکی زیرەك بوو، بەڵام رێزێکی وای لێ نانرێ، ئەو دەیەوێ بەشداری شتێك بکا، لـەپێناو کەسـێکی دیکـە، زۆر بەروونی سەرسوڕمانی دەربارەی ویلایەتـە یـەکگرتووەکان دەربـڕی، بـەڵام ئەمـە کارێکی لاوەکی بوو، بۆیە دەیویست کارێ بکا، مانایەکی هەبێ.

لـەپاش سـاڵێك لەپەیوەنـدیکردنی، لـەنێو ئۆتۆمبیلـدا لەکۆبوونەوەیەکـدا دەستەیەك کاغەزی پێ دام کە بەرگکرابوو، ئەو گوتی ئـەم دۆسـییە زۆر گرنگـە، بەڵام ئێمە باسی دیکـەمان هەیـە پێویسـتە باسـی بکـەین، چـونکە دەمویسـت کۆبوونەوەکان تەنیا ١٥ خولەك بخایەنێ.

دام بەزانـد و دەسـتم بەچـاودێری رێگاکـە کـرد، و ئۆتۆمبیلەکـەم گـۆڕی، لەکۆتاییدا گەڕامەوە ماڵ، کاغەزەکانم خوێنـدەوە کاتێـك لـە ژووری نانخواردنـدا بووم.

گوتم :ئەی خودای بەخشندە

دەستم بەخوێندنەوە کرد و لە ماوەی چل و هەشت کاتـژمێردا ئـەو بەڵگانـە گەیشتە دەستی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە پرسیاری کرد کێ ئەو زانیارییەی پێ بەخشیوون و داوای سەرچاوەی راپۆرتەکـە دەکـرد، هـەروا لـە وەڵامدا پێیان گوتبوو، کەسێکە بەرپرسی ئەو سەرچـاوە نهێنییەیـە، سـیخوڕێکی بیانییە، نەیدەتوانی زانیاری زیاتر بداتە سـەرۆك، هـەروا ناسـنامەی سـیخوڕەکە نازانی، هەروا سەرۆك سوپاسی کرد و داوای کرد بە نـاوی ئـەوەوە سوپاسـی ئـەو سیخوڕە بکەن، ئەو کەسەش نامەکەی نارده بەرپرسی نهێنی ئەو ئۆپراسیۆنە.

لە رۆژی دواتـردا لـە بارەگـای سـەرکردایەتی پێیـان راگەیانـدم تـا بـەپێی بروسکەی کۆدەکە فەرمان بکرێ، لەدوای دوو هەفتە سـیخوڕەکەم بینـی و باسـی ئەوەم کرد، کە سەرۆك سوپاسـی کـردووە، گـوێم لـە وەڵامەکـەی نـەبوو چـونکە بەخێرایی بەئۆتۆمبێلەکە بەجادەکاندا دەڕۆیشـتین، بـەڵام گـوێم لـێ بـوو گـوتی: سەرۆك ئەو نووسراوانەی خوێندۆتەوە؟

گوتم: بەڵێ خودی سەرۆك.

"تــۆ بــەمن دەڵێــت ســەرۆکی ویلایەتــە یــەکگرتووەکان ئــەو نووســراوانەی خوێندۆتەوە".

بەڵێ، بۆ دووبارە جەختم کردەوە.

"نەمدەزانی کارێکی وا روو دەدات، ئایا شتێك دەربارەی من دەزانی؟

هیچ شتێك سەبارەت بەتۆ و ناسنامەکەت نازانێ، تەنیا ئەوە دەزانێ تۆ کار بۆ هەواڵگریی ئەمریکا دەکەیت"ئێمەش پشتت پێ دەبەستین".

ئۆتۆمبیلەکەمان لەژێر رێژنە باراندا کەوتە ناو چاڵێك دوای دەرهێنانی پێـی گوتم: "بەڵێ دەتـوانن پشـتم پـێ ببەسـتن، هـەروا سـەرۆك دەتـوانێ پشـتم پـێ ببەستێ".

پێم گوت " وادەکەی، منیش شانازی بـەوەوە دەکـەم، کـە کـارت لەگەڵـدا دەکەم".

سیخوڕەکە گوتی" بەڵی بەیەکەوە کار دەکەین، ئەمە گرنگە".

بەدرێژایی رێگەکە قسەمان دەکرد و لەژێر بارانی ئیستوائیدا بووین، هەموو شتێکمان باس کردبوو، بۆیە شتێکی وا نـەمابوو تـا لەسـەری بـدوێن، رێگەکـەم دەبڕی تا لە شوێنێك دابەزم کە خۆم دەمەوێ.

وەك باوە هیچ کاتێك تەوقە لەگەڵ یەکتردا ناکەین لەو کاتەی دادەبـەزین تـا کات بەهەدەر نەدەین، لەپاشاندا پاداشتێکم لەناو نامەیەکدا پێدا، پارەیـەکی زۆر نەبوو، سوپاسی کردم و من دەمزانی دەیەوێ هەردەم کار بکا، سەرم بۆی لەقانـد، لە ئۆتۆمبیلەکە چـووە دەرەوە، دوور کەوتـەوە تـا گەیشـتە شـەوانی ئـەفریقیا و لەنێوەندی کۆڵانە قوڕاوییەکاندا و هیوای وابوو تاکسییەکی دەست کەوێ.

## ماتا \ اج

هەمموو ئەوانەی من سەربازگیر و تەجنیدی سیخوڕیم دەکردن یان سەرپەرشتیم دەکردن، ئەوان دابەشبوونە بەسەر چەندین هۆکار و جیاوازی، پێکهاتەکان جیان لەرووی پارە و ئایدۆلۆژیا، وەك تووشبوونی ئالانا (ماتا)، بەڵام هەموو ئەمانە دوای چەند ساڵێك لە ئەفغانستاندا پێکهاتەکەیان بەکاردێنین، کە تۆڵەسەندنەوە و رۆی حیسابە، فێری ئەوە بووم ناکرێ هیچ کام لەرەنگەکانی ماتا کۆپی بکرێ، هەر کارێك بە جۆرێکە، کەچی هیچ پرۆسەیەکی سیخوڕگرتن لەلای من پێش نەکەوت، زۆربەیان ناتواندرێ بەتەواوی وردبوونەوەی لەبارەیەوە بکرێ، لە هەندێکیان شکستهێنانە، کەچی هەندێکی دیکە رووبەڕووی چەند گرفتێکت دەکەنەوە کە هیچ کاتێك پێشبینی ناکەی، تەنیا کەمێکیان نەبێ هێز و بەهای خۆی هەیە.

تواناکانم لە سەربازگیری و تەجنیدکردنی سیخوڕەکان بەرەو باشی هەونگاوی نا، چونکە ئەزموونێکی زۆرم هەبوو لە پێکانی کەسەکان، بەڵام بەهێمنی ئاهەنگم بۆ سەرکەوتنەکانم دەگێڕا، بۆ ماوەی دوو ساڵ دەمویست ببمە هاوڕێی نووسەرە هێمنەکەی کۆدەکان، ئەویش خۆشی دەبینی کاتێك چاومان بەیەکتر دەکەوت، فێری ئەوە بووم ئەوم و خێزانەکەیم خۆش بوێ، چونکە هاوسەرەکەی بەئاگاتر بوو، راستە کارەکە بەهێمنی بەرەو پێشەوە چوو، لە کاتێکدا گەیشتە قۆناغێك هیچ پێشکەوتنێکی دیکەی بەخۆیەوە نەبینی، هیچ کاتێك کارم بۆ ئەوە نەکرد تا رازی بکەم، چونکە دەمزانی رەتی دەکاتەوە، لەوانەشە هەر لەدەزگاکەی خۆیدا بمێنێتەوە بەسوودترە، لەوانەشە هەر لەسەرەتادا وای کردبێ.

بۆ ماوەی چەند مانگێك وەك خۆبەخشـێك كـار بـەفرتوفێڵ كـاری دەكـرد، ئەمەو چەندین بابەتی هەواڵگری باشی پێ دام هەر یەكـەو چـەند بەشـێك بـوو و نەمتوانی لەیەكتری جیا بكەمەوە، بۆ ماویەك پارەم پـێ دەدا بـەڵام پارەكـە زۆر نەبوو، هەموو ئەوانەش بۆ ئەوە بوو تا زاڵبم بەسەریدا، تا ئەو كاتەی خۆی داوای یارمەتی كرد، داوام لەیەكێك لە شیكارییەكان كرد سەیری هـەموو راپۆرتـەكانی بكاتەوە، هـەروا بخرێتـە سـەر ئـامێری پشـكنینی درۆ، هـەروا شـیكاریكارەكە پێداچوونەوەیەكی وردی كرد و توانیمان سیخوڕەكە بخەینە سەر ئامێری پشكنینی درۆ، هەموو كارەكە دوو كاتژمێری خایاند.

لە ژوورەكەی دیكەی هەمان هوتێل بووم، هوتێلێكی تەسك و بۆنی ناخۆشی مافوورەكان كاسی كردبووم، لەگەڵ ئەوەشدا لـە دڵـی خۆمـدا چـەندین پرسـیارم دەكرد، ئایا سیخوڕەكە سەركەوتن بەدەست دێنێ لەبەرامبەر ئـامێری پشـكنینی درۆ، یان شكست دێنێ لەو تاقیكردنەوەیەدا، بەڵام خراپی كارەكە لە كوێ دایە؟

ئامێری پشكنینەكە گەیشتە ئەو بۆچوونەی جۆرێك لە فرتوفێڵ بـەكاردێنێ، بەڵام تا ئێستا ناتوانین رادەیەك بۆ درۆودەلەسەكانی دابینێن، هەموو كارەكانی بۆ ئەوە بوو پارە بەدەست بێنێ، كاتێكی بەنرخ و چەندین هەزار دۆلاری بەهەدەر دا، بەڵام دەبێ رادەی ئەو هەموو زیانانە چەند بێ؟ ئایا لەلای كەسـانی دیكـە باسـی كردووە؟ ئایا ئەو ملكەچی دەزگای دوژمنە؟

رووبەڕووی سیخوڕەكە بووینەوە و دانی پیا نا، بۆ مـاوەی چـەندین كاتـژمێر لێكۆڵینەوەمان لەگەڵیدا كرد، دواتر گەیشتینە ئەو رادەیەی تـەنیا لـەپێناو پـارە دەستی بە فرتوفێڵ كردووە، هەموو ئەمانەش بۆ ئەوە بـوو رۆشـنبیری سـیخوڕیم بەرەو زیاتر بڕوات.

ئەو سیخوڕە جێگەی متمانەپێکردن نەبوو، پێم وایە دوای ئەوەی ڕۆیشت ڕووبەڕووی چەندین سزا بۆوە، لەلایەکی دیکەوە یاداشتێکی نارد بەوەی هەموو بارەگاکانی سی ئای ئەی لە کیشوەرەکە دەسووتێنێ.

لەوانەیە نە پێکان هەندێکجار پەسەند بێ ئەگەر تا رادەیەك سەرکەوتن بەدەست بێنیت و بەکەمیش لێدانەکە ئازارت بدات، بەڵام کار گەیشتە ئەوەی کاری سووتاندن بەشێوەیەکی کارا و شێوازێك بێ، بۆیە لەپاش ئەمە دەستم کرد بەزیاتر زانین لە هەڵەکانم و هەردەمیش بەرەو باشتر دەڕۆیشتم.

هەڵچوونەکانم لەنێوان تورەییەکی کوشندە و خوشەویستیی برایانە بوو، بەتایبەتی بۆ هەموو ئەو کارانەی کەسانی دیکەم تیایدا کردۆتە سیخوڕ، لەو هەڵچوونانە فێر بووم ئەگەر تێگەیشتنی تیادا بوو، پێویستە پرۆسەی شیکاری و دینامیکی تیادا بێ لەتەك ئەو پەیوەندیانەی لەگەل کەسانی دیکە ئەنجامی دەدەم، بەتایبەتی کاتێك کار بۆ ئەوە دەکەم یەکێك بهێنمە ناو تۆڕی سیخوڕی، درکم بەوە کرد ئەو هەڵچوونانەم رەنگدانەوەی کەسایەتیی خۆمە، تا دەگەیتە ئەوەی تۆ بڕوات بە چییە، هەتا ئەو کاتەی ئەفسەر بەشاراوەیی کار دەکات یان بەراوردی بۆچوونەکان دەکات، دەبینی کارەکان زۆر لەیەکتر دوورن، رقبوونەم لە رژێمەکانی کۆمۆنیست و قاعیدە و رێزگرتنم بۆ گەلانی مەکسیك و زیمباوبۆی و ئوسترالیا و تایلەند و ئەفغانستان و ئەمریکا، لەسەرووی هەموو ئەو شتانەوەیە کە سیخوڕی پێشبینیکراو دەیڵێت.

لەوانەیە هەڵچوونەکان هەموو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان لەناو ببات، لەوانەشە ناپاکی و تۆڵەسەندنەوە و دڵپیسی یەکێك لە ئەفسەرەکان لەدەست دەرچێ، لەو کاتەدا هیچ زاڵبوونێکت بەسەردا ناشکێ، بەڵکو دوور لەوانە دەبێ

نەخشەیەکی هەموو رووەکانت کێشایێ بەو پێیەش کارەکانت لە هەوالگری ئەنجام بدەیت، ئەوە جگە لەوەی هەندێکجار هەست و هەڵچوونەکانت خەڵك لەیەکتر نزیك بکاتەوە، لەو کاتەشدا کاری سیخورپکردن دەکرێ ئەنجام بدرێ، هەروا هەڵچوونەکان دەبێتە هۆیەك بۆ زانینی هزرەکان و بتوانیت لە دواتردا زاڵ بیت بەسەر کارەکاندا و پەیوەندی ببەستیت بۆ کار و ئازایەتی کە جۆرێك لە هەوالگری بەبەها.

صن —تزۆ لە کتێبی هونەری جەنگ جەختی لە خود کردۆتەوە تا دوژمن بناسیت، هەروا فەیلەسووفە کۆنەکانی گریك هەمان کاریان کردووە، لە کاتێکدا من فێر نەبوومە هۆشیاری خودم هەبێ یان لە کتێبی نووسەرێك یان شارەزایەکی هەوالگری فێر ببم، لەوانەیە لە منداڵێکی ئەفریقی فێر ببم.

ئەو رۆژە پلەی گەرمی شێدار و زۆر بەرز بۆوە، تەنیا هەوایەك لەنێوەندی خۆری ئیستوایی خۆی بەدەر دەخست، بەڵام تیشکەکەی دەی سووتاندی، بەڵام ئێستا هێدی هێدی هەواکە بەرەو ساردی دەڕوا، ئەو رێگەیەی گرتبوومە بەر لەزۆر شوێندا شوێنی گڕکاندا دیار بوو لەنێوەندی کەندو کەندەلانەکان، لەولاوەش شوێنێك هەیە جێگەی گڕکانێکی کۆنە، لەو رۆژەدا وەسفەکان لەپێش چاوم تێکەڵ بەیەکتر بوو بوون و نەمدەزانی ئێرە کوێیە" دەشتاییە، کۆنە، دڕندەیە، جوانە، دلڕەقییە، یان شوێنێکی سەرەتاییە.

زۆری نەمابوو بگەمە چادرگەکەم، دلخۆش و ماندوو، چونکە ئەو گەشتەم لە زۆربەی رۆژدا بەپیادەیی بوو، بەراستی دۆڵە دژاوەکانی ئەفریقیا تەلەزگەن، لەدوورەوە چادرێکی بچووکم بینی کە لەسەر ئۆتۆمبیلە سوزوییەکم وەك قوبەك دانرابوو، لەنزیك گڕکانێکی بچووکدا بوو، هەستم بەشانازی کرد، چونکە ئەو

## هونەری سیخوڕی

دەوروبەرە وەك دیمەنێکی درامی وابوو، ئەمەو گڕکانە چەند میلێك لەمن دوور بوو، چونکە لە شەوی پێشتردا گەیشتبوومە ئەوێ و چادرم هەڵداوە دوای ئەوەی خەوتووم لەبەیانییەکی زوودا بەڕێکەوتم، ئێستا کارەکان هەموو باشن، چونکە نە مرۆڤ و نە ئاژەڵ و نە هێزێکی سروشتی دەستکاری چادرەکەی نەکردووم.

لەنزیك چادەرکەم خۆم بەناو ئەو خۆڵ و خاشاکەدا دا، هەموو لەشم ئارەقە بوو و ئارەقەکەم لەگەڵ خۆرەکەدا تێکەڵبوون و قوڕ بە سەروچاومدا لکا، لەم کاتەدا چەندین جار بەڵغەمم فڕێ دا.

ئاگادار نیم کوڕێکی بچووکی (ماسای) بەبێ جوولە لەبەرامبەردا وەستاوە، لەوانەیە تەمەنی هەشت ساڵان بووبێ، سەیرکردنەکەی هیچ مانایەکی نەدەبەخشی، گوێك لە دەنگی نەبوو، نەشمبینی نزیك ببێتەوە، تەنیا لەو کاتەدا لەوێدا بەدەرکەوت.

ئاماژەم پێدا بێتە نزیکمەوە، کوڕەکە هاتە پێش بەڵام دانەنیشت، ئەو هەموو لەشی خۆڵ و ریخی مانگا بوو، سەدان مێش لەدەوری قاچیدا کۆبوو بوونەوە، لەو کاتەدا شکۆلاتەی (کادبۆری) پێدا، کەچی سوپاسی نەکردم و هیچ سۆزێکی دەرنەبڕی، کەچی بەدەوری شوێنی چادرەکەمدا دەسوڕایەوە.

پێم وابوو، هیچ کاتێك ئەو جۆرە شتانەی نەبینیووە، کە هەموو لەئەلمنیۆم دروستکراوە و لەدەوریشیدا بە نایلۆنێك دەور دراوە، سەیرێکی ناو چادرەکەی کرد، پێی سەیر بو لە سەردەمی ئەودا ئەو جۆرە شتانە هەبێ، هەروا منیش پێم وابوو ئەم چاوپێکەوتنە بۆ هەتا هەتایە لەبیرم ناچێ.

لەتەنیشتم دانیشت، تا ئەو کاتەش هەر شکۆلاتەکەی دەخـوارد، لەنزیکـەوە سەیرم دەکا، کاتێك شکۆلاتەکەی تەواو کرد هەڵسـایەوە، هەنـدێك ئـاوم پـێ دا، ئەویش کەمێکی خواردەوە، بەڕوویدا پێ دەکەنم، کەچی ئەو پێ ناکەنێ.

ئێستا سەیری قاچە سپییەکانم دەکا، کە تا ئێستا نیشانەی قـوڕ و ئارەقـەی پێوە دیارە، بەڵام قاچەکانی ئەو وەك چەند چینێك لەسەر یەك وابـێ وابـوو و بـە پێستی خام دەچوو، دەستێکی لە پێڵاوەکانم دا، دواتر بەرزی کردەوە و بۆنی کرد.

برۆیـەکانی لەیـەکتر نزیککـردەوە و هـەردوو چـاوی نوقانـد، گـوتم ئێسـتا دەڕشـێتەوە، پێڵاوەکـەی فـڕێ دا و بەتوڕەییـەوە سـەیرێکی کـردم، هەسـتم بەشەرمەزاری کرد.

جارێکی دیکە سەیرێکی پێڵاوەکەی کـردەوە، لەپاشـاندا بەگاڵتـەوە سـەیری دەکردم، دواتر رووی وەرگێڕا و بەتەنیا جێی هێشتم.

پێڵاوەکەی هەڵگرتم و بۆنی کرد، بەڕاستی ئەمە شتێکی ناخۆشە.

لە دڵی خۆمدا گوتم ئای چەند گێلم! وا تێدەگەیشتم ئەم منداڵە سـەیری بـە هەموو تەکنیکەکانی ئەو چادرە دێ، کاتێکیش رۆیشت رقی لێم هەڵسا بوو.

لەو نێوەندە کە خاڵەتێکی گێژاوەییە، دەبێ بیری لە چی کردبێتەوە؟ لەوانەیە وا بیری کردبێتەوە من کەسێکی لاواز بم.

ناچار بووم بۆ ماوەی دوو شەو بەو کەرەستانە لە جەنگەڵ بمێنمـەوە، لەگـەڵ ئـەوەی گۆچانێکیشـم پـێ بـوو، لەوانەیـە مـن کەسـێکی نـەزان بم لـەرووی کۆمەڵایەتییەوە، هەر لەوانەیە ئەو منداڵە وا تێگەیشتبێ من کەسێکی تـەنیا و هەژارم و هیچ مەڕوماڵاتێکم نییە، هەتا ناتوانێ لەگـەڵ ماڵـەوە و خێزانەکەیـدا

## هونەری سیخوڕی

بخەویّ، تەنیاش ئۆتۆمبیلێکم هەیە، لەلای ئەو من "دۆرۆبۆم" واتە کەسێك مەرِ و ماڵاتی نەبیّ، ئەو مندالّە شوانی مێگەلێك بوو، لەوانەیە وا تێگەیشتبیّ من ونبوومە، چونکە ئەو دەزانیّ خۆی لە کوێدایە، لەوانەیە لەلای ئەو شتێکی سەیر بم.

کاتێك سەیری دەکرم و سەیری ناو پێڵاوەکانی دەکردم، لەو کاتەدا سەیری ئاسمانم دەکرد پیّ دەچوو بارانێك بەخوورِ بباریّ، بۆیە پێڵاوەکانم لەدەرەوەی چادرەکەدا جیّ هێشت، بۆیە زۆر بەزەحمەت خۆم گەیاندە نزیك گرِکانەکە، لەو کاتەشدا زۆری نەمابوو شەو هەمووی داپۆشیّ، لەو کاتەدا لەدڵی خۆمدا بیرم لە مرۆڤایەتی و لەو شوێنە دەکردەوە، ئەدەبم لە پەیمانگە خوێندووە، ژمارەیەکی زۆرم لە کتێبی مرۆڤناسی- ئەنترۆپۆلیژیا و کۆمەڵناسی خوێندۆتەوە، بەتایبەتی ئەو کتێبانەی باس لەکۆمەڵگە کلاسیکییەکان دەکات، لە کاتێکدا لە چەند ساڵی رابردوو چەندین ئۆپراسیۆنی ئاڵۆزی سیخوڕی ئەنجامداوە، چوومەتە نێوەندی چەندین کلتوور و رۆشنبیری و تێکەڵیان بوومە، زۆرێك لە مامۆستایان هاوکاریان کردووم تا زانیاری زیاتر و رۆشنبیریەکی بەرزم هەبیّ، بەڵام لەوانەیە گەورەترین مامۆستام ئەو مندالّە نیمچەرووتە بیّ.

لە داهاتوودا لەگەڵ زۆرێك لە پیاوانی جەنگاوەرەکانی ئەفغاندا تێکەڵبوومە و قسەم لەگەڵیاندا کردووە، هاورِیّی زۆرێك لە نەخوێندەوار و تەکنۆکراتە ئەورووپییەکان بوومە، گوێگری زۆرێك لە وتەکانی کەسانی ناوچەکان بوومە، زۆربەیان قسەکانیان جێگەی رێزە، زۆر جار بە هۆی کلتوورەکەم کوێرانە هەڵسوکەوت دەکەم، وەکچۆن لەو ئێوارەیە جوانەدا لە دۆڵی گێژاوەکان تووشی بووم.

## هینری ا.کرامبتۆن

ئەوانەی بابەتەکانی هەوالگری کۆدەکەنەوە و شیکار دەکەن، زۆرجاران هەستی بنکۆلیکردنیان نییە، یاخود زیرەکییەکی قوڵیان نییە تا بگەنە دەرئەنجامی دیاریکراو، بەڵکو زیاتر دەگەنە پرۆسەیەکی خراپ و بڕیاری سیاسی کارەساتبار، بۆیە زیاتر ترسناکی دێتە ئاراوە، بەمەش پاداشتەکان زیاتر دەکەن، ئەمەش بە هۆی پێوەرە ناوچەییەکان لە ڕێرەوی تێگەیشتنە مرۆڤایەتییەکان، کار بۆ ئەوە دەکەن تا مەبەستێکی سیاسی هاوبەشیان هەبێ لەگەڵ هاوبەشە ناوچەییەکان.

تێگەیشتنی خود، لەنێوەندی پشکنینی خود، وەك بنەڕەتییەکە بۆ ئەفسەری هەواڵگری سەرکەوتوو، بەتایبەتی ئەوانەی بۆ لای خۆت رادەکێشیت و تەجنیدیان دەکەی، لە نەبوونەی سەرچاوەیەکی پتەوی ناوەندێك بۆ خود، هەموو هەڵسەنگاندنەکان بەلاڕێدا دەڕوا، لەنێوەندی هەموو ئەو وانانەی بۆ داواکارانی هەواڵگری پێشکەش کرد، بەکارهێنانەکانم بەراوردکردنی سیستەمی بابەتیانەی (جی بی ئاس) بوو، لە سەرەتادا خۆت داتاکان دادەنێت، لەپاشاندا دەستدەکەی بەدانانی نەخشەیەك بۆ ئەو ناوچەیەی کە دەتەوێ بچیتە ناوی، واتە تۆ لەنێوەندی خاکێکی بیانیت بۆ دەبێ ڕێڕەوی خۆت دیاری بکەیت، هەمان کاریش لەسەر ئەفسەری جوولەیە، واتە چۆن خەڵکی دیکە دەناسێ، ئەگەر خۆی نەناسێ؟ چۆن دەتوانێ پەیوەندییەکی متمانەپێکراوی هەبێ تا بزانێ ئەو پەیوەندییە بەرەو کام لادا هەنگاو دەنێ؟

لەنێوەندی "کێڵگەدا" درکپێکردنی خود ناچێنن، تەنیا تواناکانی ئاشکرا دەکەن، لێرەدا سی ئای ئەی تەنیا کاری بەداواکاران ئەوەیە جۆرێك لە تێکەڵیان هەبێ بۆ ئەنجامدانی پرۆسەکان تا ببنە سیخوڕی باش، وەکچۆن وەرزشەوانەکان کاتێك لەدایك دەبن دوای ئەوەی ڕاهێنانیان پێ دەکەن، ڕاهێنانی سی ئای ئەی

## هونەری سیخوڕی

دەیەوێ سیخوڕەکە پێش بکەوێ بەپێی پێشکەوتنی ڕێڕەوی ژیانی، ئەم ڕێـڕەوەش حەتمی نییە، چونکە ڕێڕەوی پێشکەوتن زۆرجاران بەپێی ئیرادەیـەکی ئـازاد دێتـە ئاراوە، کاتێك دەیەوێ یەکێك بکاتە سیخوڕ چەندین هۆکـار بـەکاردێنێ لـەپێش ئەوەی بیانخاتە ناو سی ئای ئەی، زۆر جار ئەو کارە ترسناکی و ئاستەنگ دەبـێ، تا خۆیان لەنێوەندی ژینگەیەکی دیکەدا ببیننەوە، بۆیە زۆرێـك هەڵـە و چـەوتی دەکەن، کەچی لەدواتردا خۆیان دەدۆزنەوە و گەشە دەکەن.

باسی بابەتی جایمس سی لانگدۆنم کرد، کـە پۆسـتی ئەنـدامی ئەنجوومـەنی ڕاوێژکاری هـەواڵگری لـە سـاڵی ۲۰۰۱ -۲۰۰۵ سـەر بەسـەرۆك بـوو، ئەمـەو ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری چوارچێوەیەکی فراوانی گرتبووە خـۆی بـۆ ئـەو بابەتانـەی لەلای سەرۆك گرنگ بوو، هەموو ئەندامەکان مۆڵەتی ئاسایشـی ئاسـت بـەرزیان هەبوو و دەیانتوانی بگەن بە کۆمەڵگەی هەواڵگری، جایمس ئەفسەری هـەواڵگری نەبوو بەڵکو پارێزەرێکی سەرکەوتوو بوو لە واشنتن و لـەڕووی ستراتیژیشـەوە زۆر سەرکەوتوو بوو، ڕێگەی پێ درا توێژینەوەیەك سەبارەت بە کۆمەڵگەی هەواڵگری بکات، ئەمەش بە هۆی پۆستەکەی لە ئەنجوومەنی ڕاوێژکاریدا، لە مـاوەی چـوار ساڵدا زنجیرەیەك لە گفتوگـۆی نـاڕێکی خسـتە ڕوو و ئـەو گفتوگۆیانـەی لەتـەك ژمارەیەکی زۆری ڕەگەزەکانی هـەواڵگری بـوو، هـەموو ئەمانـەش بـۆ وتووێـژە فەرمییەکانی ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری هەواڵگری بوو، لەوێدا وەك گوێگرێکی باش توانی وێنایەکی جیا بنیات بنێ سەبارەت بەو کۆمەڵگەیە.

جایمس لە زۆر بۆنەدا جەختی لە خاڵی گرنگ دەکردەوە، هەموو ئەو شـتانەی لە ئەفسەری هەواڵگری گوێی لێ بـوو بـوو، وەك پرسـیاری ئـەوەی دەکـرد: ئـەو ئەزموونە نموونەیانە کامـەن بـۆ پێشـکەوتنی ئەفسـەری هـەواڵگری، چ لـەڕووی ئۆپراسیۆنەکان یان کاتێك شیکردنەوە دەکات، هەروا دەبێ هەردەم سەیری دۆخـی

ئێستا و گومانەکان بکات، هەندێکجار دەبێ ڕووبەڕووی ببێتەوە، هەموو درکپێکردن و هەست و ڕۆشنبیری جیۆسیاسییەکانی دەبێ بەپێی ئەزموونەکانی ژیانی بێ، هەروا دەبێ خۆیان بناسن، جایمس هەتا پێش ۱۱-۹ جۆرێك لە ترس بوو، لە کاتێکدا زۆر کەس پێیان وابوو، سی ئای ئەی دەیەوێ ئەفسەرێك دابنێ خاوەن لاپەڕەیەکی سپی بێ و خاوێن بێ، جگە لەوانەی خاوەن ئەزموونن و کێشەکانیان گەیشتۆتە سەر چەقۆ، بەشێك لەو ئەفسەرانە لەگەڵ کەسوکاریان چوونەتە وڵاتانی پاکستان و چین، ئەوانە چەندین کێشەیان هەیە بەپێی دۆخەکانیان، چونکە لە کۆتاییدا ئەوانە بیانین، کەچی جایمس ئەوەی ئاشکرا کرد کە بەشێك لەو ئەفسەرانەی لە سی ئای ئەی دان بەشێکیان وەك سیخوڕەکانی بیانی هەمان جۆرن.

ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان کەسانێکن لە خۆیان تێ دەگەن بە شێوەیەك ئایدۆلۆژیای کەسانی دیکەش ئاشکرا دەکەن، لەتەك ئەوەی هەموو خاڵەکانی لاوازی و توڕە بوون و ترسەکانیان دەزانن، بە هۆی کارەکانیان باشترین سیخوڕ تەجنید دەکەن و بۆ لای خۆیاندا ڕای دەکێشن، باشترین جۆری هەواڵگری بەکار دەهێنن، مەبەستمانە بڵێین ئەمە کلیلەکەیە، واتە هەواڵگر و سیخوڕ سەرەتا دەبێ گوێ لە خۆی ڕاربگرێ، بۆیە درك بەوە دەکات کێشەکان لە کوێیە تا چارەسەری بکات؟ ئەگەر گوێ لە خۆی و کەسانی دیکە ڕانەگرێ یان چوارچێوەیەکی فراوانی نەبێ بۆ ئەزموونەکانی، پرسیارەکە لەوەدایە چۆن سەرچاوەکان بەکرێ دەگرێ و زانیارییەکان کۆدەکاتەوە؟

ڕاستە سەرچاوە مرۆییەکان بەشێکن لە سیستەمەکە، بەڵام ئەگەر سەرچاوەی نوێ هەبێ لەتەك سەرچاوە کۆنەکان ئەوا زانیارییەکی زۆرت بەدەست دەکەوێ، لێرەوە دەزگای هەواڵگری بە هۆی تەکنەلۆژیا و تەکنیکی نوێ قەرەبووی زۆر شت

دەکاتەوە، بەڵام بەبێ سیخوڕیش ئەگەر نەبوو، بەتایبەتی ئـەو جـۆرەی خزمــەتی خودی سەرکردایەتیی دەوڵەت دەکـات بەشـێوەیەکی تایبـەت، ئـەوا شـێوازەکان خراپن.

ئەو ئەفســەرانەی دەتـوانن زۆرێـك لــە سەرچـاوەمرۆییەکان بـۆ لای خۆیـان رابکێشن، ئەوا بەهایەکی زۆری هەیە، چونکە بەچەند کەسێك دەتوانن فـەرمانێك جێبەجێ بکەن، بەو شێوەیە بەهای ئەو ئەفسەرانە بەرەو بەرزی دەڕوا جگە لەوەی چەندین ئالۆزی لەنێوەندی جیهانی جوگرافیای سیاسیدا هەیـە، بۆیـە هـەواڵگری داوای هەموو سەرچاوەکان دەکا، بەڵام لە سیخوڕیکردن جۆری تایبەت.

هــەردەم ســەربازگیری —تەجنیــدی ســیخوڕەکان خــۆی دووبــارە دەکاتــەوە، پێویســتە لەســەر ئەفســەری جوولــەکردن کــار لەســەر متمانــەپێکردنی هــەموو سیخوڕێك بکاتەوە و هەردەم باشتری بکات، هەر کاتێك هەلی بۆ رەخسا، چونکە هــیچ شــتێك نــابێ لــە جێگــەی خۆیــدا بووەســتێ، بــۆ زیــاتر روونکردنــەوەش سیخوڕیکردن ئامرازێکە لەپێناو ئامانجێك، زۆربەی هەواڵگرییەکان ئۆپراسیۆنەکان زۆر بەشاراوەیی ئەنجام دەدەن، بۆیە سیخوڕە بیانییەکان پێویستە کارییان هــەبێ، وەك تاقیکردنەوە هەندێك ئەفســەر لــەم رووەوە بەپێچــەوانەی هەنـدێکی تـر زۆر باشترن، چونکە زۆر جار سیخوڕە بیانییەکان دوای ئـەوەی دەکـرێن بەسـیخوڕ زۆر گرنگیان پێ نادرێ، ئەمەش خراپــە، پێویســتە لەســەر ئـەو ئەفســەرانەی چــەند کەسێکیان کردۆتە سیخوڕ هەر خۆیان کارگێڕی تۆڕەکانیان بن، باشـترین کــاریش رێگە خۆش بکرێ بۆ ئەوانەی دەتوانن کارەکان ئەنجام بدەن.

# بەشی چوارەم

# کۆکردنەوەی زانیاری

کۆکردنەوەی زانیاری، بنەمای سیخوڕیکردنە...

ئالان دالاس-پیشەگەری هەواڵگری

## هونەری سیخوڕی

بەسەر پیلکانەکەدا سەرکەوتین تا بچینە شوقەی ئامانجەکەمان، تا ئەو کاتە کەشەکە گەرمایەکی بەتین بوو، لەگەڵ ئەوەی لەنیوە شەو تێپەڕی بوو، هەموو جلوبەرگەکانمان بە ئارەق تەڕ بوو، ئەو کاتەی کەرەستە داپۆشراو بە نایلۆن بەپشتمان دادا، من لایتێکی درێژم لەدەستدا بوو، هەروا چەقۆیەکم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرت، کە درێژەیەکەی چوار ئینج بوو، زۆرجار وەك کەرەستەیەك بەکار دێ، هەروا لایتەکە وەك چەکێکی فریاکەوتن بوو و سەرچاوەیەك بوو بۆ رووناکی. لە هەڵگرتنی گۆچانێك باشتر بوو، ترس و نیگەرانی دایگرتم بە هۆی سەگ بەرەڵا و رێگر و هەواڵگریی هەڵە، نیگەران بووم لە دەزگە هەواڵگرییەکانی دوژمن، لەو کاتەدا گۆچان و چەقۆ سوودێکی نییە، لەلایەکی دیکەوە لایتێکی بچووکی دیکەم لەلا بوو کە قەبارەکەی بەقەد قەلەمێك بوو، بەڵام توانیمان ئەو ناو رووناك بکەینەوە تا گەیشتینە سەر پلیکانەکان.

هەروا لە پێشتردا هاوبەشەکەم کە لە دەزگای خزمەتگوزارییە تەکنیکییەکانە، دەیان کاری لەو جۆرەی ئەنجامداوە تا زانیاری بدەست بکەوێ، هەردەم دەیتوانی بەهێمنی رێ بکات، بەڵام یەکەم بەسەردادانی شاراوەی من بوو، هەستم بەنیگەرانی دەکرد نەوەك ئاشکرا بین، کاتێکیش زیاتر نیگەرانییەکەم زیاتر دەبێ کاتێك کردەیەکی خراپ لەلایەکەوە دەکرێ، هاوکات ئەفسەری جوولەپێکردن هەموو لایەنەکانی بەهێزی و لاوازییەکان دەزانێ، لەو کاتەدا زانیم شتێکی وا لەتەکنیك نازانم.

پێدەچوو رۆڵی من مامەڵەکردن بوو لەگەڵ هەر کار و گۆڕینێك لە پلانەکە، لەوێدا زانیم شوێن و دەوروبەرەکەم و بەرپرسیاریەتی ئۆپراسیۆنەکە لەسەر منە،

هەروا ئەو هاوبەشەم داواکارییە تەکنیکییەکان رایی دەکات، ئەمەو لەپێش چەند رۆژێك چووە ناو شار.

بەشی خزمەتگوزارییەکاتی تەکنیك لەئازاترین ئەفسەرەکانی سی ئای ئەی بوون، ئەوانەی بەشاراوەیی دەیانتوانی بچنە پێش کامیرا و تەلەفۆنی شاراوە گەورەترین ئامانج لەنێو بالێۆزخانە و ماڵ و تاقیگەکان بپێکن، هەروا هەموو ئەو شتانەیان دروستکردبوو، کە ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان پێویستی پێیەتی، وەك ئامێری بەلارێدابردنی نەیار.

هاوکارەکەم توانی لەچەند چرکەیەدا کیلۆنی دەرگاکە بکاتەوە و چووینە ژوورەوە، هەروا سەرچاوەکەمان ئەوەی پێ ڕاگەیاندین هیچ کەسێك لەو کاتەدا لە شوقەکە نییە، بەڵام گوێمان راگرت تا گوێمان لە شتێك بێ، لەژێر شوقەکە گوێمان لە دەنگ بوو، کەچی بەهێمنی چووینە ناو ژوورەکە، لە کاتێکدا تاریکی زیاتر دەبوو، تەنیا لەپشت پەردەکانەوە تیشکی رووناکییەکی خامۆشمان دەبینی، بەڵام کەشەکە زۆر گەرم بوو، بەتایبەت لە شوقەیەك لە نهۆمی سەرەوەدابێ، هەر زیاتر ئارەقەمان دەکرد.

لەپێشەوە بووم و زۆر بەهێمنی لەلایەکی تاریکەکە دەڕۆیشتم، لەو شوێنەدا بۆنی میزی پشیلەمان کرد، ئەمەش بەو مانایەی نیشتەجێبووەکان زۆر درەنگ دێنەوە، پێدەچوو پشیلەکەیان لەگەڵ خۆیاندا بردبێ، لەوانەشە لەبن سیسەمەکان بێ، لەو کاتەدا لە دڵی خۆمدا گوتم دیارە زۆر هەستیارم بەرامبەر بە پشیلە، چونکە زۆری نەمابوو بپشمم بۆیە تەنیا لە رێگەی دەمەوە هەناسەم دەدا.

من و ئەفسەری تەکنیکی لەسەر زگ لەسەر زەوییەکە هەنگاومان دەنا، تا بگەینە ئاستی لێواری پەنجەرەکان ئەو شوێنەی دەمان ویست بیگەینێ، کاری

## هونەری سیخوڕی

منیش تەنیا هەڵگرتنی ئەو لایتە بچووکە بوو، تا بەتیشکێکی گەمارۆدراو بەرەو ئامانجەکە برۆین، هاوبەشەکەم زۆر بەهێمنی لەکاردابوو و هـەموو تێلـەکانی لـێ کردەوە و رێکی خستەوە، تا هیچ شـوێنەوارێك جـێ نـەهێڵێن و کـەس تـێ نـەگا دۆخەکە یاری پێ کـراوە، کارەکـە تـەواو بـوو و هـەموو کارەکـەش دە خولـەکی خایاند، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە شوقە و باڵەخانەکە جێ بهێڵێن.

جارێکی دیکە جەختمان لە فەرشـەکە کـردەوە، لەوێـدا پارچـە قوماشـێکم بینییەوە و ئارەقەکەم پێ سڕی، خۆمان بەرزکردەوە بەرەو دەرگاکە رۆیشتین کەچی ئارەقە لەرووخسارم دێتە خوارەوە، ئایا ئەو دڵۆپە ئارەقانە وشك دەبێتەوە، کاتێك ئاوڕی لێم دایەوە وەك ئەوە وابوو پێم بڵێ ئاگاداربە ئەمـە چـییە، مـن هـەر لـە تاریکی دەتوانم هەستی پێ بکەم.

ئاوڕدانەوەکەی بەتەواوی سوڕایەوە منیش تا ئەو کاتـە دەمـەوێ خـۆم بـەرز بکەمەوە، کەچی خۆم وەرگێڕا و ئارەقەکەم سڕی، کاتێك بەدەستەسڕەکەی دەسـتم ئارەقەم دەسڕی، نەم دەزانی ئەو چوونە دەرەوەیە زۆر باش نییە.

هەر لەو کاتەدا و لەدەرەوەدا هاوەبەشە راسپێردراوەکەم لەسەر شەقام لەگـەڵ پۆلیسەکانی دەوریە کەوتبووە گفتوگۆ، بیرەیەکی پێ دا کە لـەناو جلوبەرگـەکانی شاردبۆیەوە، باسی جۆرەکانی مەی و ئافرەتیان دەکرد، هەروا ئـەو پۆلیسـەی لـە خوارەوە چاودێری شوقەکانی دەکرد سەر قاڵ بوو بەشتێکەوە، تەنیا بـەیانی زانـیم ئەگەر ئاشکرا بایین کارەسات دەقەوما.

هەروا لە پێشتردا لـە پرۆسـەیەکدا توانیمـان گفتوگۆکـانی کەسـی ئامـانج وەربگرین ئەمە لەپێش شەش مانگدا، بـەڵام بەدرێـژایی ئـەو کاتـە نـەمانتوانی راپۆرتێکی هەواڵگری ئامادە بکـەین، واتـە هـیچ زانیارییـەکی بەسـوود نـەبوو،

تەنیاش کارەکە بەهەدەردانی کات و هەوڵەکان بوو و خۆشمــان تووشــی ترســناکی کردەوە.

چوونە ناو شوقەکەشمان تەنیا بۆ ئەوە بوو هەموو کەرەستەکان بهێنینەوە تـا رادەیەك بۆ ئەو پرۆسەیە دابنێین.

کەسی ئامانج کەسێکی سەرکەوتوو بوو، زۆر زۆریش باش بـوو، لـەلای ئـەو هەواڵگری بەهای هەبوو، بەڵام هیچ قسەیەکی نەدەکرد لەگەڵ ئەوانـەی سـەردانی دەکەن، ئەو کەسێکی زۆر پیشەگەر بوو.

هەموو ئەو سیخوڕانەی کە پشتگیریان لەو ئۆپراسیۆنە کرد و ڕێگەخۆشـکەر بوون بۆ گەیشتن بەو باڵەخانەیە، بەتایبەتی پرۆسەی چوونەژوور و چاندنی تەکنیك و پەخش و بنکەی گوێگرتن و کـاری کـۆپی و وەرگێـڕان هـەمووی پتـەو بـوون، لەلایەکی دیکـەوە هـەڵگرتنی ئـامێری گـوێگرتن، هـەمووی بـەپێی پێوەرەکـان ئۆپراسیۆنێکی زۆر باش بوو، لەو کاتەی مرۆڤ هیچ زانیارییەکی هەواڵگری دەست ناکەوێ، مەبەستیش لەو کارانە دەستەبەرکردنی باشـترین جـۆرە لـە هـەواڵگری، بەتایبەت کاتێك دەتوانین زانیاری بەدەست بێنین، بۆیە هیوامـان وابـوو قسـە بـۆ هاوسەرەکەی یان یەکێك لە میوانەکانی بکات.

لەپاش قسەکردن زۆر ئاسانە درك بەجۆری باسەکان بکرێ، بەتایبەت کاتێـك پێشینەی کێشەکان دەخەیتە روو، هیچ کاتێك نـابێ هۆکـارە مرۆییـەکان بەکـەم بزانین بەرامبەر بە تەکنەلۆژیا، وەك دەبینین ئەو کردەیە سەرکەوتوو نەبوو؟ لێرەوە زانیمان ئەو کەسە دەتوانی خودی خۆی بگرێ هیچ شتێك لەو رووەوە باس نەکات؟ لێرەوە بۆت بەدەردەکەوێ کە هەواڵگری یەکێك لە بابەتـە گرنگەکانـە بەرامبـەر

کەسی مەبەست، هەر کارێك بکرێ ئێمە دەتوانین بیخەینە ژێر رکێفی خۆمان و بکەوێتە دەستمان، بەڵام ئەم ئامانجە هیچ نەگوت و زۆر بڵێ نەبوو.

چەندین هۆکاری مرۆیی دیکە هەن، کێ دەوریەی پۆلیسی ناسی و چۆن توانی مامەڵەیان لەتەك بکات، چۆن زانی ئەو پۆلیسە خۆشی لە مەی و ئەلکهول دەبینێ؟ چۆن زانیمان خاوەنەکەی پشیلەیەکی هەیە؟ ئایا بیرمان لەو باسانە کردبۆوە؟ چۆن وردبینیمان سەبارەت بەو سیخوڕە کردووە، کە ئەو زانیاریانەی پێ بەخشیووین؟ هاوکات بۆ من دەستەسڕێکم لایە، لەکاتی ئارەقەکردندا رووخسارمی پێ دەسڕمەوە؟

لە دواتردا هەموو پرۆسەیەکی تۆماری دەنگی داهاتوو بەدواداچوونی بۆ دەکەم، بەتایبەتی ئەوانەی ئامانجن و زۆر بڵێن، دەیخەمە بەردەم زانایانی دەروونناسی، چونکە گێلییە نەزانیت ترسناکییەکان چییە لە کاتێکدا پێشبینی سەرکەوتن دەکەی، بۆیە کار لەسەر زۆر شت دەکەم، بەتایبەتی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ئامرازانە دەکەم کە دەزگای هەواڵگری ئەو ناوچەیە پەیڕەوی دەکات، دەبێ بزانم لەو شوێنە ئاژەڵ هەیە، هەروا دەستەسڕێك هەڵدەگرم.

لە کێڵگەی راهێنەرەکانمان هەموو جۆرە سیستەمێکی تەکنیکیان بۆ باس کردین بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان وەك : هەواڵگری بە هێما و هەواڵگری بە شێوەی وێنە و ئەو هەواڵگرییەی پەیوەستە بە پێوەر و شێواز، لە کاتێکدا هەواڵگری لەگەڵ هاتنە کایەوەی زانیارییە دیجتاڵییەکان تەقینەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، بەو شێوەیە هەواڵگری مرۆیی و دیجتاڵییەکان هاوکاری یەکتر بوون چ لە پرۆسەی تەجنیدکردن، لەپێشتردا زۆر کارم کردووە وەك سیخوڕەکان کە گوێگری تەلەفۆن و تەکنیکی وەرگرتنی زانیاری و راسپاردنی سیخوڕەکان تا

كارێك بكەن، لەلایەكی دیكەوە چـۆنیەتی هـاككردنی ئەنتـەرنێت و ئامێرەكـانی دەنگ و بێتەل و خستنە روو وێنەی مانگـە دەسـتكردەكان، هـەروا سـوودم لـەو فرۆكانە وەرگرتووە كە بێ فرۆكەوانن، زۆر جاریش لەوانەیە تووشی كارەسات ببـام ئەگەر ئەفسەری نەیار كارێكی پێچەوانەی بكردبوایە، ئەمەو هـەواڵگری مرۆیـی هاوكاری تەكنیكە و دەیەوێ شتێك بێتە كایەوە و بەپێچەوانەش دەبێ.

پێویستە هەموو زانیارییەكانی هەواڵگری كۆبكرێتەوە، زۆرجاران گرنگترە لە كەسی سیخوڕ و كەسی مەبەست، لە كاتێكدا هەموو ئەمانە بابـەتی گـرنگن بـۆ ساڵانی سەرەتا ئەمەش ڕێڕەوێكی سەركەوتووە بـۆ كۆكردنـەوەی زانیـاری ئەگـەر ئەمە لەنێوەندی تەكنیكیشدا بێ، زۆرێك لـە سەرچـاوەكان سـوودیان لـە ئەگـەر تەكنیكییەكان وەرگرتووە، هەر كاتێكیش پشتگیریت لـە سەرچـاوەكانی زانیـاری كرد چ تەكنیكی یان مرۆیی، ئەوا بەهای زانیارییەكان زۆر زیـاتر دەبـێ، لێـرەوە چەندین نموونە بێنە پێش چاوت چۆن كرِیارانی هەواڵگری سی ئای ئەی توانیویانـە سوود لە هەواڵگریی مرۆیی و كۆكردنەوەی زانیارییە تەكنیكییەكان وەربگرن.

## هەڵسەنگاندنی سەركردە بیانییەكان

سەركردە ئەمریكییـەكان هـەردەم دەیانـەوێ هـەموو زانیارییـەكیان هـەبێ بەرامبەر بە نەیارەكانیان، دەیانەوێ سـەبارەت بـە كەسـایەتی و سیاسـییەكانیان هەموو شتێك بزانن، بۆیە سـی ئـای ئـەی هـەواڵێكی زۆر دەدا بـۆ زانینـی ئـەو داواكاریانە.

سەركردە بیانییەكان هەردەم خۆشی دەبینن لە مۆتێل و هۆتێلـە گـەورەكان، ئەمەش وەك پێداویستییەكی كار و بەپێی پێداویسـتی كەسـایەتی و پرۆتۆكۆلـە،

زیاتریش هەوڵ دەدەن لەنزیك لەباڵێۆزخانەكانیان بن، ئەمەش ئەو هوتێلە گەورانە دەگرێتەوە كە لە ناوچـەیەكی دیـاریكراودان، لێـرەوەش هەواڵگرییـەكان هـەموو پێشبینییەكیان هەیە.

چەندین زانیاریمان بەخشییە سیخوڕێكی كۆن كە لەیەكێك لە هوتێلەكاندا كار دەكات و ژمارەیەك ناوی سەركردەكانمان پێ بەخشی گە لەو هوتێلـەدا دادەبـەزن، لێرەوە پەیوەندیمان بە بارەگای سەركردایەتی كرد تا بزانین تـا چـەند گرنگـی بـەو بابەتە دەدەن و چۆن ترسناكیی وەربەهێنەكان هەڵدەسـەنگێنن، هـەروا بـەهێمنی بیرمان لەبڕی پارەی وەرگێڕانەكان كردەوە لەبەرامبـەر دەسـكەوتێكی هـەواڵگری پێشبینیكراو، بۆیە هیچ كاتێك هەڵەكانم دووبارە نەكردەوە بەدرێژایی ئەو ساڵانەی كە كارم تیادا كردووە.

ئامانجەكەمان دیاری كرد، كە بە ئامێرێكی كۆنترۆلی ئاسایی دوور، هـەموو شتێك سەبارەت بەژووری ئامانجـە بزانـێ، لەتـەك ئەمەشـدا ئامێرێكمـان زیـاتر پێشخست تا بەروونی هەموو دەنگێك وەربگرێ لەنێو ئەو ژوورەدا.

دیارە هەموو ئەو بابەتانەی كە بەهایەكیان هەیە بۆ سەركردەكان، بەتایبەتی ئەو سەركردانەی پێشوازی لە میوانەكان دەكەن بۆ گفتوگۆكردنی سیاسی، زۆرجار كارەكانمـان بەهــەدەر نـاڕوات، بۆیــە زۆر جــار شــتمان دەســتكەوتووە، چــونكە سیاسییەكان حەز بەزۆر قسەكردن دەكەن، بۆیە هەموو وێنایەكمان سەبارەت بـەو جۆرە سەركردانە وەرگرتووە.

لە یەكێك لە كارەكانمان تۆمارێكی دەنگیمان زۆر لـەلا گـرنگ بـوو كاتێـك بۆچوونی بەرپرسێكی بیانی وەرگیرا سەبارەت بەهاوتا ئەمریكییەكەی، بۆیـە ئـەو

زانیاریانەمان بۆ بەرپرسێکی ئەمریکی نارد، لێرەوە چەندین پرسیاری کرد سەبارەت بەو راپۆرتە.

لە حاڵەتێکی دیکەدا سەرکردەیەکی بیانی هەموو ستراتیژیەکی سەبارەت بە وڵاتی دەوروبەری خستە روو، ئێمەش ئەو راپۆرتەکان ناردە بارەگای سەرەکی و بەتایبەتی بۆ وێستگەکەی من، بەمەش توانیمان لەپێشینەدا زۆر شت بزانین و هەموو ئەو بابەتانەمان ناردە لای بڕیاردانی سیاسەتی ئەمریکی لەتەك ئەوەی ئەو زانیاریانەمان بە وڵاتانی دەوروبەری ئەو وڵاتەدا، چونکە وڵاتێکی دەوربەری یەکێك لە هاوپەیمانەکانمان بوو، ئەمجۆرە هەواڵگرییەش هۆیەکە تا هەماهەنگییەکی هەواڵگری هەبێ لەگەڵ دەرەوەدا.

زۆرجار زانیاری کەسیەتییەکانان زۆر زیاتر لەوەی پێویستمان پێ بووە کۆمان کردۆتەوە، بۆیە هەردەم ناردوومە بۆ وەرگێڕ تا بەئاگاییەوە لێی بڕوانێت و لە کۆتاییدا هەموو ناوەڕۆکێکیان پێ بەخشیووم بۆ راپۆرتی کۆتایی، بۆیە بە هیچ شێوا بەسانایی سەیری سەرکردە بیانییەکانم نەکردووە، بەڵکو لەدوورەوە لە رێگەی ئامێری کۆنترۆلی دوور سەیرم کردووە.

## سیاسەتی دەرەکی

توانینمان بچینە نێوەندی یەکێك لە باڵیۆزخانە بیانییەکان بە هۆی تەکنیکی لۆکاڵی، بەمەش توانینمان بگەین بە نووسینگەکانی دەرەکی باڵیۆوخانە، ئەمە دانرا کاتێك خودی سی ئای ئەی سەرپەرشتیی دەکرد، بەتایبەت بەدانانی ئامێری گوێگرن لە دوو ناوچەدا، لە کاتێکدا هێزی پاترییەکانمان زانی، بەشێوەیەك تا بتوانین زۆر لەنزیکەوە بێ.

## هونەری سیخوڕی

پلانمان دانا بۆ بەکرێگرتنی شووقەکەی تەنیشتی، بەڵام ئەو پرۆسەیە شکستی هێنا، بۆیە بەدوای ئەلتەرناتیفێك دەگەڕاین، چونکە هیچ شوێنێکمان نەدەدۆزیەوە بۆ وەرگرتنی هێماکـان، بۆیـە کارەکـە قـورس بـوو، بـەوەش نەوەسـتام چـونکە کەرەستەکانی سی ئای ئەی دیاریکراو بوون، وەك بەکرێگرتنی شووقە یان کڕینـی تا نزیك ئەو شوێنە بێ؟ لەپێشتریشدا ئامێری گوێگرتنمان لەو شوقەیە دانا بـوو، چونکە وامان دەزانی دەتوانین ئەو شوقەیە بۆ خۆمان دابین بکـەین، لـە کاتێکـدا نەمان توانی ئەو شوقەیە بەکرێ بگرین بۆیە پرۆسەکە بەگشـتی بـەرەو ترسـناکی دەچێ، دوای ئەوەی سەرکردایەتیم ئاگادار کردەوە سەبارەت بە بازاڕی عـەقارات، لە کاتێکدا کارەکە زۆر ساکار بوو.

لـە یـەکێك لـە شـەوەکان ئـامێری لەرەلـەری بچـووك لـەنزیك یـەکێك لەباڵیۆزخانەکان بەستا، راستە ئامێرەکە هێمای دەدا بەڵام ناگاتـە ئـەوەی ئێمـە شوقەیەك بەکرێ بگرین.

بەدواداچوونمان بۆ ناوچەکە کرد و هەموو شـتێکمان لەنێوەنـدی نەخشـەکەدا چەسپاند بەتایبەتی کاتێك بەپیادە دەگەینە ئەوێ، بەڵام نەگەیشتینە هیچ شـتێك ئەمەش بەتەواوی بێزاری کردین.

بۆیە لێرەوە لەگەڵ یەکێك لە خاوەن بەلەمەکان رێککـەوتین، کـە کەنارەکـە نزیك بە باڵیۆزخانەکە بوو، داوام لێ کرد هاوکاریم بکات تا بەدەوری ئامانجەکەدا بسوڕێتەوە، ئامێرێکی لەرەلەری گەورەمان لـەناو بەلەمەکـە دانـا، لـەو کاتـەدا دەنگ دەستی پێ کرد بۆ ناو ئامێرەکـە و لـەوێوەش بـۆ وێسـتگەی دەنگـەکان، ئەمکارە چەند هەفتەیەکی خایاند، هێما و دەنگ دەهات، یەکسەریش ئەو دەنگە دەگەیشتە خاڵی دەنگ تۆمارکردن و نووسینەوەی.

بەو شێوەیە هەموو زانیارییەکانی کۆکردنەوەی دەنگ و پەخش ئامادە بوو، ئەمەش لە ڕێگەی وەرگرتن و وەرگێڕانی، لەپاشاندا خرایە رووی کرپارانی حکومەتی ئەمریکی و هاوپەیمانەکان، هەموو ئەم کارەمان بۆ دوو رۆژ بوو، ئەگەر بۆ چەند کاتژمێرێك یان بۆ چەند خولەکێك بێ کارەکانمان ئەنجام دەدەین.

ئەم ئۆپراسیۆنە دوای چەند مانگێك لە لایەن کۆمپانیایەکی کارەباوە ئاشکرا بوو، لە کاتێکدا سەیری چەند هێما و لەرەلەرێکیان کرد کە لە ناوچەیەکی گشتییەوە کاری لەسەر کراوە، ئەوەی جێگەی دڵخۆشی بوو هیچ شتێك بەسەر ئێمەدا ساخ نەبۆوە، هەتا ئەم هەواڵە لە رۆژنامەکانی ئەو ناوچەیەش بڵاونەکرایەوە، بەڵام ئەوەمان زانی دەوڵەتی میوان بەوەی زانیووە ئێمە کارێکی وامان کردووە.

بۆیە هەموو شتەکانمان گواستەوە و تا بیبەینە شوێنێکی دیکە، شوێنێکی دیکەمان دۆزیەوە، ئەم پرۆسەیەش لە دواتردا چەند ساڵێکی خایاند، چونکە ئەو باڵیۆزخانەی وڵاتی میوان یەکێك لە دەوڵەتە گرنگەکان بوو، ئەمکارەش لە باشترین ئەو کارانەمە کە بە پرۆسەی سیخوڕی گوێگرتن دەستی پێ کرد.

## سیخوڕی پەیوەندیی و گەیاندن

لەگەڵ سیندی هاوسەرەکەم زۆر بەهێمنی قسەم دەکرد سەبارەت بە پشووی کۆتایی هەفتە، لەو کاتەی ئێمە لەریزدابووین لەبەرامبەر خاڵی پشکنینی گومرگ، لە فرۆکەخانەیەکی بچووك، پێشتریش چەندینجار ئەو رێکارانەمان کردووە، ئەو شوێنە بەزوویی لێی بێزار دەبیت، چونکە گەرم و شێدارە، دەتوانم لە

پەنجەرە پیسەکەوە دارخورمایەکان ببینم کە بەهێمنی لەگەڵ شەماڵی دەریادا لار دەبێتەوە، هاوکات گوێم لە غەڵبەغەڵبی ڕێگاکانیشە، لەوکاتەی بۆنە ناخۆشەکەی ناو هۆڵی فڕۆکەخانەکە گێژت دەکات، هیچ هەوایەکی دیکە نەدەهات، جگە لە بۆنی ناخۆشی کەسەکان، بەڵام هێمنی باڵی بەسەر هەموو شوێنەکاندا گرتبوو، کارەکان بەڕێکوپێکی دەڕۆیشت بەبێ ئەوەی هیچ بەرتیلێك بدەی، کەچی کاتێك وەڵامەکان تەواو نەبوون لەلای پیاوانی پشکنین، ئەوا لەوانەیە بۆ هەر پرۆسەیەك چەند کاتژمێرێکی بوێ.

کاتێك گەیشتینە مێزی پشکنین هەردوو جانتای پشتمان دانا لەسەر مێزە ئەلمنیۆمە کۆنەکە، لەوێدا جگە لەدوو پشکێنەر هیچ شتێکی دیکەی لێ نەبوو، وەك پشکنین لە تیشکی سینی، چەند پرسیارێکیان کرد و سەیری هەردوو جانتاکەی کرد و تەنیا چەند شتێکی بینی بۆ خواردن بوو، بەڵام بیرەەی تیادا نەبوو، بۆیە ئاماژەی دا تا تێپەڕین.

جانتاکەم لەسەر پشتم دانا وشتەکانی دیکە کە خواردنی تیادا بوو وەك ترمزەکە بۆ تاکسی چاوەڕوانکراو دام نا، من و سیندی هیچ قسەیەکمان نەکرد کاتێك لەنێز تەکسیدا بووین، تەنیا دڵمان خۆشبوو بەوەی سەرکەوتین و هەموو ئەو ئامێرە سیخوڕانەی لەسەر سنوور بوون شکستمان پێ هێنا، ئەم هەستەش زۆر گەورەیە.

ماوەی گەیشتن بەو موتێلەی کە گرتبوومان لەسەر کەنار زۆر نزیکە، کاتێك گەیشتین هەندێك ئاومان خواردەوە و هەموو کەرەستەکانمان لە شوێنی باش دانا، لەپاشاندا بە پلیکانەکە چووینە خوارەوە تا بچینە سەر کەنارەکە.

کاتێك ئەو ئاوە سازگارە بەپێیەکانم کەوت، هەستم بەوە کرد ئاوی ئەو زەریایە هێمنە، لەبەرامبەرمان شارێکی کۆن دیارە بۆیە لەپاشاندا چووینە ناو دارخورماکان کە لە هەموو شوێنێکدا بوونی هەیە، بەراستی شوێنێکی خۆشە بۆ ئەوەی کاری سیخوڕی تیادا ئەنجام بدەین.

لە ئێوارەی رۆژی دواتر چووینە ناوشار و چەندین کاتژمێرمان بەپیاسە بەرێ کرد لە کاتێکدا لەنزیك کۆگا و دوکان و فرۆشیارەکان رادەوەستیان و چایەمان لەو چایخانانە دەخواردەوە کە سەرەکەی قامیش بوو، سیندی چەند وێنەیەکی چرکاند، هەروا خەڵکێکی دیکەش هەمان کاریان کرد، زۆربەیان ئەورووپی بوون تەنیا هەندێك نەبێ خەڵکی ئاسیا بوون، لە شوێنێك دانیشتووانەکەی لە رەچەڵکی رەشپێست بوون.

رێگەمان دەبڕی لە کاتێکدا من سەیری یەکێك لە نەخشەکانم دەکرد، لە هەر کۆڵانێك هەندێك دەوەستام نەوەك یەکێك بەدوامانەوە بێ، کاتێکیش لەگەڵ یەکێك دەوەستی و چەند پرسیارێکی لێ دەکەی زیاتر ئاگادار دەبێ لەوەی یەکێك بەدواتەوەیە یان نا، لەو کاتەی ژن و پیاوێك کە لەسەر کەنار دەسوڕێنەوە زیاتر دەتوانین بەبێ ترس کارەکانمان بکەن و ئاوێتەی ئەو خەڵکە بین کاتێك دەمانەوێ پرسیار لە چەند شتێك بکەین.

کاتێك تاریکی دەیویست باڵی بەسەر هەموو شتێکدا بکێشێ گوێمان لێ بوو مەلا بانگی دەدا تا نوێژکەران بەرەو مزگەوت بڕۆن، لەو کاتەدا زۆربەی کۆڵانەکانی شارە کۆنەکەمان بڕی بوو، تا ئەو کاتەش هیچ جۆرە چاودێرییەکمان لەسەر نەبوو، لە گۆشەیەکدا سوڕاینەوە و بینمان دەرگایەك لەدووری چەند مەترێك هەیە، یەکجار لە دەرگام دا، بەخێرایی پیاوێکی کورتەباڵا دەرگاکەی

کردەوە، دوای سڵاو تەوقــەی لەگــەڵم کــردوو و باوەشــی بــە ســینددیا کــرد، زۆر بەجۆشوخرۆشەوە پێشوازی لێ کردین، کەچی تەنیا دوو جار بینوومە یەکێکیان لە ئەورووپا تا چەندین زانیاریم پێ بدا، بەڵام پەیوەندییەکانمان زۆر قــووڵ بــوو بــوو، ئەمەش لەپای ئەنجامدانی کارێکی ترسناك بوو، ئەو یەکێکە لە ســەرکەوتووترین سیخوڕەکانی سی ئای ئەی، هاوکات منیش لەدواتردا بۆ ماوەی چــەند دەیەیــەك لەگەڵیدا کارم کردووە.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو لەدواتردا ئێمەی بــە هاوســەرەکەی ناســاند، ئەو کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو، لەنێو ماڵەکەی خۆیدا پێشوازییەکی گەرمی لێ کردین و لەپاشاندا دەستی کرد بە گێڕانەوەی نوکتەی نــاخۆش، بــەڵام مــن وا سەیرم دەکرد کە هاوبەشێکی دڵسۆز بێ، ئێمەی هێنــابووە نێــو ماڵــە کۆنەکــەی خۆی و لەنێو ئەو ماڵەشدا بۆن و بەرامی خواردنی گەرم دەهات.

لەبەرامبەر مێزێکی بچووکدا دانیشتین و خۆشترین خواردنمان خوارد، کە قەد تامی لەژێر ددانم لاناچێ، خواردنێك بوو تێکەڵەی بیبەر و گەڵاکان بوو، بەشــێك لە خواردنەکە عەرەبی بوو و بەشەکەی دیکەشی ئەفریقی بوو، بەو شێوەیە برنج و نیسك و سەوزە و نانێك لە ماڵ دورستکرابێ هەردەم لە هەستەکانمان دەمێنێتەوە.

چەندین کاتژمێر قسەمان کرد ئەم نانخواردنە جۆرێك لە هاوتایی پێــوە دیــار بوو، لەگەڵ ئەوەی چوون بۆ ئەو ماڵە جێگەی ترسناکییەکی گەورە بوو، چونکە بۆ یەکەمجارە بچمە ماڵی یەکێك لە سیخوڕەکان، زیاتر یەکترمان ناســی، بــەڵام ئــەم سەردانەمان تەنیا بەشێکی لاوەکی بوو، بۆیە پێویست بوو زیاتر بچــینە نێوەنــدی باس کردن و دانانی ئامێری پەیوەندیکردن و گەیاندن.

لەپاش نیوەشەو چەندە پەیوەندییەك هات بەتایبەت کاتێك جەنتای پشت و ترمزەکەم لە شوێنێك دانابوو، کابرای خاوەنماڵ یەکسەر کەرەستەکانی لێم وەرگرت و سەیری هەموو شتێکی کرد، ئەو کەسێك بوو زۆرێك لە زمانەکانی دەزانی و سەبارەت بەو کەرەستانەش لە من باشتری دەزانی، لەوێدا باسمان لەوە کرد چۆن دەتوانێ پەیوەندی بە سێ ئای ئەیەوە بکات، ئەو وەك کەسێکی دوورەپەرێز لە شارێکی دوورەدەست چۆن رۆژانە پەیوەندی دەکات، چونکە ئەو ئامێرەی لەلای بوو بەتەواوی کاری نەدەکرد، بەڵام دەیویست چاکی بکاتەوە و دەیەوێ بە سیستەمێکی دیکە پشتی پێ ببەستێت، بەڵام ئێمە نەمان دەویست زۆر هاتووچۆ بکات نەوەك تووشی ترسناکییەك ببێتەوە، بۆیە ئێمە دەمانویست ئامێریکی لا بێ بەردەوام بێ.

لە شوێنی لایەکی دیکەوە هەڵسایەوە و بەرەو پلیکانەکە رۆیشت تا بچێتە سەر بان، لەوێشەوە لەتەك ئەو تەلە ئاڵۆزانە بووین کە لەسەر بان و عاموودەکاندا دانرابوو بەتایبەت تەلێمی بەستا بە چەند وارێکی هێڵە تەلەفۆنە کۆنەکاندا، لەسەر ئەو بانە سەری زۆربەی خانووەکانم کرد و گلۆپی زۆربەی ماڵەکان بریسکەیان دەدایەوە، سەیری نزیك کەنارم کرد وا بزانم یەکێك کەرکەندی دەبرژاند، لەنێوەندی کۆڵانەکانیش هیچ دەنگێك نەدەهات تەنیا شەماڵێکی فێنگ بوو لەنێوەندی کۆڵان و دارخورماکاندا دەهات.

سیخوڕەکەم لەو کاتەدا بەخێرایی و بە شێوەی فەرمان گوتی: خێراکە بابڕۆین، لەم کاتەدا سەیرێکی ئەو لاو ئەو لای خۆی کرد و سەری لەقاند و بزەیەکی کرد و لەپاشاندا بەرەو پلیکانەکە رۆیشت و منیش بەدوایدا.

نیوکاتژمێری خایاند تا یەکەم نامەی بۆ بێ لەو ئامێرە نوێیەی، بەو شێوەیە کارەکە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لەپاشان کاتژمێرێکی دیکـە خۆمـان سـەرقاڵ کرد بە چاخواردنەوە، باسی زۆر شتی سیاسـیمان کـرد و هـەروا باسـی چـۆنیەتی کۆکردنەوەی زانیارییەکانمان کرد و پلانمان دانا تا لەدوای چـەند مـانگێکی دیکـە یەکتر ببینین.

سەیرێکی دەرەوەی کرد و لەپاشاندا باوەشـی بـە هەردووکمانـدا کـرد، بـەو شێوەیە من و سیندی لەو شەوە خوشەدا بەپێ دەڕۆیشتین.

بە هاوسەرەکەم گوت من و تۆ بەپیادە بەرەو ئەو خانووە دەڕۆین کە بەکرێمان گرتووە کە لەدووری دوو میلدا بوو.

ئەو گوتی " بەراستی ئەو دووانە جوان بوون، هەروا تامی خواردنەکان خۆش بوو! کەی دەگەڕێنەوە"؟

پەیوەندیی من و هاوسەرەکەم و سیخوڕەکەمان چەندین ساڵی خایاند.

## ئاسمانی ئەلیکترۆنی

ئێستا زۆر بەسانایی باس لە ئۆپراسیۆنەکانم دەکەم، کە پێش بیست و پێـنج ساڵ پێشتر ئەنجامم داوە، کاتێك بیر لە شتێکی نوێ و ڕەنگـاوڕەنگ دەکەمـەوە، بەتایبەتی ئاڵۆزییەکانی پرۆژە تەکنیکییە نوێیـەکان، کـە وەرچـەرخانی گـەورەی بەخۆیەوە بینیووە لە گرتنی وێنە و پەیوەندییەکان و زانستی رۆبۆت، لە کاتێکـدا ئـەم پێشـکەوتنی تەکنەلۆژیایـە لـە کـۆی گشـتی نـەبووە هـۆی ئاسـانکردنی

کۆکردنـــەوەی زانیارییـــەکان، بەپێچـــەوانەوە کۆکردنـــەوەی زانیارییـــەکان بـــەم تەکنەلۆژیایانە زیاتر تووشـــی ترســـناکی جۆراوجـۆرت دەکـات لەتـەك ململانێـی بیرۆکراتـــی و یاســـای کـــۆن و سیاســـەتی پشتبەســـتوو بـــەزانین و بنـــەما کۆمەڵایەتییـــەکان، لەلایـــەکی دیکـــەوە کـــۆکراوە تەکنیکییـــەکان ســـەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێناوە، بەڵام ترسناکییەکانی زیاترن.

ئـەم پێشـکەوتنە کاریگـەر دەبـێ لەسـەر ئاژانسـێك کـە لەسـاڵی ١٩٤٧ دامەزراوە، لەو کاتەی تۆڕێکی جیهانی داناوە بۆ کردنەوەی زانیاری و وێنە، هەروا هەزاران ئەفسەری بەتوانا کۆدەکانیان شکاندووە، ئەمەش وای کـردووە ملیۆنـەها نامە و راپۆرت بەرز بکرێتـەوە، کـە لـە هـیچ سـەردەمێکدا ئەمـەی بەخۆیـەوە نەبینووە، لە هەموو روویەکەوە هـەر ئامـاژە و هێمایـەك هـەبێ وەری گرتـووە، هەزران کیبلی ریشاڵی شووشەیی داناوە بۆ بنەمای داتاکان و لە کاتێکدا سـوودی زمانەکان زۆر کارا بوونە بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان زۆر بەهێمنی، بە شێوەیەك ناونراوە "هەواڵگریی هێما و ئاماژەکان لەپشوودان"، بێگومانیش ئاژانس بـەرەو ئەو خۆگونجاندنە رۆیشتووە، بەڵام لە زۆر رووەوە سەرچاوە مرۆییەکان بـەکار دێ، بۆ دزینی زانیارییەکان لەنێوەندی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێتدا، بۆیە سی ئـای ئـەی چەندین زانیاری لە هەواڵگری بیانی دزیووە، هاوکات بەدرێـژایی ژیـانی پیشـەیم هیچ کاتێك دابرانێك نەبووە لەنێوان تەکنیك و توانای مرۆیی، بـەڵام ئەنتـەرنێت زۆر کات ئەو دابرانە ئەنجام دەدات.

لە ساڵی ١٩٩٥ لەلایەن سـی ئـای ئەیـەوە گومـان لـەوە هـەبووە خێرایـی تەکنەلۆژیا تا بێتە هۆی فراوان بوون سەبارەت بەو بوارانەی کە ئامانجمانە، بۆیـە ئاژانس چەندین تیمی دروست کرد بـۆ توێژینـەوەی ئـەو ئاڵنگارییـە، هاوکـات

تیمەکان لە هەموو سەرچاوەکانیان کۆڵییەوە و بەدواداچوونیان بۆ کرد بەتایبەتی لەتەك هاوبەشە بنەڕەتییەکان و کۆمەڵگەی هەواڵگری و کرپارە سیاسییەکان.

بەپێی پوختەی توێژینەوەکە سی ئای ئەی گەیشتە ئەو بۆچوونەی ناگەنە هەڵی تەواو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە ژینگەیەکی تەکنەلۆژیادا، هەروا راسپاردەیان ئەوە بوو نووسینگەیەکی نوێ دابمەزرێنن بە ناوی "نووسینگەی نهێنیی تەکنەلۆژیای زانیاری" هەموو ئەمانەش بکەونە ژێر رکێفی دەزگای شاراوە و بەڕێوەبەرایەتی زانست و تەکنەلۆژیا.

سی ئای ئەی داوای لە دکتۆر جایمس گوسلەری زانای ماتماتیك کرد کە لە تاقیگەی ساندیای نیشتمانییە، تا ببێتە بەڕێوەبەری یەکەمی نهێنیی نووسینگەی تەکنەلۆژیای زانیاری، ئەوەیش رازی بوو، زۆری نەبرد دکتۆر گوسلر بەهرەی خۆی بەگەڕ خست بۆ ئۆپراسیۆنە شاراوەکان، بەمەش وانەیەکی یەکلاکەرەوەی دا بە ئەفسەرانی هێڵی ئۆپراسیۆنەکانی وەك من، سەرەتا گوسلر بە هەموو لایەنە شاراوەکانی گوت تا کارەکان بەجوانترین شێوە رایی بکەن، وەکخۆم پێم وابوو ئەمکارە بۆ من گونجاو نییە، بەڵام چەند رێنماییەکم بۆ هات تا خولێکی سەرەتا ئەنجام بدەین بەتایبەت بۆ ئەفسەرانی ئۆپراسیۆن، بەڵام زانینی تەکنەلۆژیا مەرجێکی پێشوەختە بوو، بەتایبەت بۆ ئەوانەی هیچ راهێنانێکی تەکنیکیان ئەنجام نەدابوو، کەچی خۆم وا دادەنا من لەوە کاراترم تا بچمە نێو ئەو خولەوە، بۆیە پێویستیم بە راهێمانی راستەوخۆ نەبوو، چونکە کەمێك گەڕانەوە بۆ دواوە سەبارەت بە هەوڵە سیخوڕییەکانم، لەوە گەیشتم سیستەمی دیجیتاڵی زۆر سوودم پێ دەگەیەنێ بۆ دزینی ئەو زانیاریانەی شایەنی دزین، هیچ کاتیش لەو باوەڕە دانەبووین ئۆپراسیۆنی ئەنتەرنێت سوودێکی زۆری بۆ دەزگای شاراوە هەبێ، کەچی گوسلر و چەندانی دیکە بە پێچەوانەوە بیریان دەکردەوە.

لەلایەکی دیکەوە وانەکان زیاتر جەختیان لەوە دەکردەوە نووسینگەی نهێنیی تەکنەلۆژیا و زانیاری و وانەکانی سەبارەت بە سیخوڕی کلیلی هەواڵگری دیجیتاڵییە، هەروا گوسلر سەرنجی ئەوەی دەدا خەڵك هەر هەمووی خاڵی گەیشتنی یەکەمە، وەك پێکهاتەی قفلێکە بۆ گەیشتن بە هۆڵی ئۆپراسیۆنەکان، هەموو ئەو خەڵکە کلیل و کۆدی نهێنی و نامیلەکەن تا بگەین بە هەموو شتێك، چونکە هەر ئەوانن بەرنامەکان دەنووسن و هەموو سیستەمەکانیش لەدەست ئەوانە، بۆیە پێویستە ئەفسەرەکان هاککەرەکان بەکرێ بگرن و بیانکەن بە سیخوڕ، ئەمانەش لە ڕێگەی سیستەم و تەکنیکی ڕیشاڵی چاو و لە ڕێگەی کیبڵەکانی ڕیشاڵەکانی بینین.

لەمەوەش گوسلر هاوکاری هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگەی هەواڵگری دەکات و لەنێو ئەوانەشدا ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی، هەردەم ئەو مزگێنی دەدا، لەگەڵ ئەوەی گوسلر وەك سەرکردە لێهاوتووەکان دەهاتە بەرچاو، چونکە بەجۆشوخرۆش بوو، بە شێوەیەك ئێمەی وا دانابوو کە پێشەنگی هێرشە ئاسمانییە ئەلیکترۆنییەکانین، بەو شێوەیەش ئۆپراسیۆنی ئاسمانی ئەلیکترۆنی فراوان دەبێ، بەتایبەت سی ئای ئەی لەدواتردا سەبارەت بە ژمارە و دیجیتاڵی و فراوانبوونی ئەنتەرنێت وەك پێشەنگ دێتەبەرچاو.

هەردەم گوسلر دڵنیایی پێ دەبەخشین لەگەڵ ئەوەی لایەنێکی نوێی زانستی بوو، جەختی لەوە دەکردەوە ئێمە تەنیا دەبێ بیر لە ئۆپراسیۆنەکان بکەینەوە، هەروا ئێمە پێویستیمان بە مۆڵەتی زانستی کۆمپیوتەر نییە، بەڵکو تەنیا پێویستیمان بە تێگەیشتنی ژمارەیی هەیە لەنێوان هەواڵگرە دەرەکییەکان و سروشتی مرۆڤایەتی، بۆیە ئێمە ئەم پەیوەندییە بەهەڵ دەزانین و کاری لەسەر دەکەین.

سیخوڕی ئاسمانی زۆر بەزوویی گەشــەی کــرد و کاریگــەری گــەورەی هــەبوو لەسەر ئۆپراسیۆنەکانمان، مــن پێشــبینیم نــەدەکرد بــەو شــێوەیە ئۆپراســیۆنەکانم سەرکەوتوو بن، زۆرێــك لــە زانیارییــەکانمان لــەو رێگەیــەوە دزی ئەمــەش بــووە دەستکەوتێکی هەواڵگری.

لە ساڵی ۱۹۹۹ لەو کاتەی پەیوەندیم بە بنکەی دژەتــیرۆر کــرد، ئــەو کــات زۆربەی ئۆپراسیۆنەکانمان تەکنیکی بوون لەنێوەندی ئاسمانێکی ئەلیکترۆنیــدا، بــە شێوەیەك ئۆپراســیۆنە ئاســاییە ئەلیکترۆنیــەکانمان کــاری گــەورەی ئــەنجام دا لــە کاتێکدا ئێمە بەدواداچوونمان بۆ تیرۆرستان دەکــرد چــەندین کــەسمان لــە هــەموو جیهاندا لەو تیرۆرستانە دەستگیر کــرد یــان کوشــتمان، لەمــەوە توانیمــان کــاری ئۆپراسیۆنەکانمان بەهێزتر بکەین بە هۆی فرۆکەکانی بریــداتۆر کــە بێفرۆکەوانــە، لەهەمانکاتدا زیاتر ئامانجە دیاریکراوەکان لە هــەموو جیهانــدا دیــاری بکــەین، ئینجا چ لە جیهانی راستەقینەدا یان لە جیهانی ئەلیتکرۆنیی ئاسمانیدا.

# بەشی پێنجەم

# پەیوەندیکردن

هاوپەیمانیبەستن لەگەڵ دیکتاتۆرەکان سەقامگیری بۆ دەوڵەتە ئازادەکان ناهێنێتەکایەوە.

دیموستینۆس-وتاری فیلیپی دووەم

پەیوەندیکردن لەگەڵ دەرەوەدا بەشێکی هەرە گرنگی کاری هەواڵگری سی ئای ئەیە، پەیوەندییەکانیش بە شێوەی هاوکاری و هەرەوەزی یەکترە لەرووی پرۆژە و کاری هاوبەش، هەروا هاوبەشە بیانییەکان دەتوانن کاری سی ئای ئەی باشتر بکەن، کە هەموو لەسەر بنەمای کۆکردنەوەی زانیاری و شیکردنەوە و کاری شاراوەیە، هەروا ئەم هاوبەشییە دەتوانی هەموو شێوازێك بەخۆیەوە بگرێ وەك ئاڵوگۆڕکردنی زانیارییە هەواڵگرییەکان تا دەگاتە هەموو لایەنەکانی هەواڵگری تەکنیکی، کە ملیۆنەها دۆلاری تێدەچێ و تیایدا خەرج دەکرێ جگە لە زانیاری کەرەستەش بدەن بەیەکتری بۆ رووماڵکردنی کاری هاوبەش، زۆرجارانیش زانیاری بەجۆشوخرۆش ئاڵوگۆڕ دەکرێ دژ بە یارێکی هاوبەش، جگە کارکردنی هاوبەش سەبارەت بە تەکنەلۆژیا و پیشەگەری و تەکتیکەکان.

هەروا ئەو ئۆپراسیۆنانە زۆرجار دەکرێ ئەفسەر و شارەزای دەزگاکانی ئاسایشی بیانی لەخۆ بگرێ، بۆ نموونە یەکێك لە دەزگاکانی هەواڵگری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست چەندین ئەفسەری جوولەکەی لەخزمەت سی ئای ئەی دانا بەتایبەتی بۆ دژەتیرۆر، پێدەچێ هاوکارییەکی قووڵتر هەبێ لەگەڵ هاوپەیمانەکان بۆ جیاوازییەکی فراوان لەرووی بەرنامە و راهێنان و ئۆپراسیۆنەکان، بەتایبەتی ئەو ئۆپراسیۆنە هاوبەشانەی کە پێکەوە ئەنجاممان دەدا.

بەڕێوەبەرانی "کێلگە" لە ساڵی ١٩٨١ زۆر فێری ئەوەیان نەکردین تا زۆرتر مامەڵە و پەیوەندی لەگەڵ دەرەوەدا بکەین، تەنیاش کارەکانمان بەتاکلایەنە بێت، ئەمەش وەك ئاوڕدانەوەیەك بۆ دواوە خراپ نییە، بەڵام بەراورد ناکرێ لەگەڵ سەرچاوە تاکلایەنەکان، تەنیاش ئەم کارە بۆ ئاڵوگۆڕی زانیارییەکانە، چونکە

کاری یەکەمی ئاژانسی سیخوڕی، سیخوڕیکردنە، بەو واتایەی بەکرێگرتنی سیخوڕەکان و کارپێکردنیان، لە کاتێکدا ڕاهێنەرانی کێڵگە ئەم پەیوەندیکردنەیان لەنێوەندی پرسیارێکدا وا وەڵامدایەوە، بەیەك دەگەینەوە بەتایبەتی ئەوکاتانەی لەڕاهێنان و لەخزمەت دابین.

ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەم پەیوەندیکردنە تەنیا یەك ئامانجی هەیە ئەویش بەکرێگرتنی تاکەکانیەتی وەك سەرچاوە لەنێو ڕیزەکانیان، ئەمەش ڕێگەیەکی باشە بۆ دژە سیخوڕی، تەنیاش بەوە دەکرێ سیخوڕێکی نەیار دەستگیر بکەی ئەگەر نەتوانی بچیتە ناو دەزگاکەیانەوە، هاوکات ژمارەیەکی زۆر لە سیخوڕەکان ئاشکرا بوون لەنێو حکومەتی ئەمریکیدا هەمووشی بە هاوکاری سەرچاوەکانی سی ئای ئەی بوون کاتێك لەریزەکانی دەزگا بیانیەکاندا بوون.

چەمکی "پەیوەندیکردن لەبەرامبەر سیخوڕیدا" هەلێکە بۆ سی ئای ئەی تا هەموو ڕێکارەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەکان بەدەربخا لە کاتێکدا دەزگایەکی دیکە دەیکا، ئەگەر دەوڵەتێك تۆڕە شاراوەکانی نەبێ ئەوا لە ڕێگەی سی ئای ئەیەوە تۆڕەکانی بەڕێوە دەبرێ، بەمەش دەچێتە نێو خزمەتی هەواڵگریی دەزگایەکی بیانی، دیارە سی ئای ئەی لە ڕێگەی هەواڵگری مرۆییەوە زانیارییەکان کۆ دەکاتەوە، واتە لەنێوەندی دەوڵەتی میواندار یان ئامانج، بەو شێوەیە سی ئای ئەی لە ڕێگەی ئەو سەرچاوانەوە زانیاریەکی زۆری دەبێ، ئەمەش بە هۆی پەیوەندیکردنێکی ئاساییەوە ئەنجام نادرێ.

هاوکات جیاکارییەکانی تاکلایەنە و بێ لایەنە ئەگەر سی ئای ئەی هەوڵی نەدا نەچێتە ناو هیچ دەزگایەکی هاوپەیمانان، لەگەڵ ئەوەی بەهای گشتی

پەیوەندیکردنی دوولایەنە زۆر گرنگە، لە ساڵانی داهاتوو لایەنە باش و خراپەکانت بۆ دەردەکەوێ کاتێك ئۆپراسیۆن کرا لەنێوەندی دژەتیرۆردا.

کاتێك لەنێوەندی کێڵگەدا ڕاهێنانمان دەکرد زیاتر باسیان لەتاکلایەنە دەکرد بەتایبەتی بۆ بەکرێگرتنی سەرچاوەکان، ئەمەش بۆ ئەفسەرێکی بچووك کە لەپشت دیوارێکی ئاسنینەوە کارێکی پێ بسپێردرێ وەك کارکردن لەنێوەندی شوێنی پۆستە مردووەکان لەتەك چەندین ئامرازی سیخوڕیکردنێکی دیکە کە بەتەنیا دەی کات، کارێکی گەورەیە بۆ ئەفسەرێك لە شوێنێکی وەك ئەفریقیا کار بکات، ئەمەش وای کرد بگەمە ئەو بۆچوونەی بۆیە من ڕاناسپێرن بۆ ئەورووپا یان بمنێرنە وێستگەیەکی گەورە تا کاری ڕۆتینی گەورە ئەنجام بدەم، بۆیە هەردەم وا کارم کردووە کە ئەفسەرێکی ئۆپراسیۆنی شاراوەی تاکلایەن بم.

ئەو ئەفسەرانەی تاکلایەنانە کار دەکەن بەبەراورد لەگەڵ ئەوانەی ڕاسپێردراون بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ بیانیەکان تەنیا لە کاتی ڕۆژدا لەکاردان، بێگومانیش ئەوانە ئەفسەری بچووکن تەنیا شارەزایەکی دیاریکراویان هەیە، ئەمانەش زۆر بەکەمی تووشی ئاشکرابوون دەبنەوە بەو واتایەی باشتر ڕووماڵ کراون و پشتیان بەهێزە.

زۆرجاران سیخوڕی بەکرێگیراوە چالاکەکە کارەکان تێك دەدا، دەبێ بەرامبەر ئەفسەرەکە دەبێ خۆی بپارێزی نەوەك ئاشکرا بێ و لەو کاتەشدا هیچ کارێك نەکا، هەر کاتێك ئەفسەر توانی سیخوڕە تاکلایەنەکان بۆ لای خۆی بهێنێ و بیانجوولێنێ، دەتوانێ هاوسەنگییەك لەنێوان ڕووماڵکردن و ئیدارەی ئۆپراسیۆنی چالاك بکات ئەمەش دوورت دەخاتەوە لە نیگەرانیی ڕۆژانە.

## هینری ا.کرامبتۆن

له سه‌ره‌تای کارکردنم توانیومه ئه‌فسه‌ری ئۆپراسیۆنه‌کان وه‌ك سیخوڕ به‌کرێ بگرم و جولەم پێ کردووه به‌ده‌یان سه‌رچاوه‌ی تاکلایه‌نانه کـردووه جگـه لـه ئـه‌و سه‌رچاوانه‌ی که لاوه‌کی بوونه له سێ کیشوه‌ردا ئه‌و کاره‌م کردووه، لێره‌وه سـه‌دان راپۆرتی هه‌واڵگریم ده‌ست که‌وتووه به‌تایبه‌تی له‌نێوه‌ندی سه‌دان کۆبوونه‌وه له‌گـه‌ڵ سه‌رچاوه‌کان، وه‌ك چاوپێکه‌وتنی کورتمان ئـه‌نجام داوه لـه‌نێو ئۆتۆمبیـل و ژووری هوتێل و ماڵ و کوخی قامیش و به‌له‌م و شوێنی کتێبفرۆشتن و کۆڵان و گـه‌رماوه گشتییه‌کان و سێبه‌ری درخته‌کان، هاوکات بۆ ماوه‌ی ده ساڵ دوور که‌وتوومه‌ته‌وه بۆ په‌یوه‌ندیکردن له‌گه‌ڵ هه‌ر حکومه‌تێکی بیانی.

له‌دوا کاتدا که ده‌ست نیشانیان کـردم بـۆ په‌یوه‌نـدیکردن له‌گـه‌ڵ ده‌ره‌کیـدا کاره‌که زۆر ئاڵۆزکاو بوو، په‌یوه‌ندیم بـه نوێنـه‌ری حکومـه‌تی بیانییـه‌وه نـه‌کرد، به‌ڵکو په‌یوه‌ندیم به سه‌رکرده‌ی سوپای یاخیبووه‌کانه‌وه کرد.

## په‌یوه‌ندیکردن به جه‌نگی پارتیزانییه‌وه...

له سه‌ره‌تای رێڕه‌وه بۆگه‌نییه‌که‌ی هوتێله‌که ده‌سـتمان پـێ کـرد وه‌ك ئـه‌وه‌ی ماوه‌که‌ی دووروودرێژ بێ یه‌کێك له‌پێشه‌وه‌م و یه‌کێکی دیکه لـه‌دواوه‌م ده‌ڕۆیشـت، به‌ڵام به‌شێوه‌یه‌کی بێده‌نگ و هێمن، ئـه‌وان دوو پیـاوی لاوازی ماسـوولکه تونـد بوون، له‌وانه‌یه بۆ چه‌ندین سـاڵ له‌نێوه‌نـدی جه‌نگه‌ڵـه‌کان لـه جه‌نگـدا بـوو بـن، به‌خێرایی به‌گه‌ڵیان که‌وتم و هیچ قسه‌یه‌کم نه‌ده‌کرد.

پاسه‌وانێك له‌به‌رده‌م ده‌روازه‌ی ژووره‌که وه‌ستا بوو، کاتێـك چـوومه ژووره‌وه هه‌ردوو که‌سه‌ی پێشه‌وه و دواوه‌م له‌لای پاسه‌وانه‌که وه‌ستان، که چـوومه ژووره‌وه ژووره‌که زۆر تاریك بوو کاتێك دوو ئاوێنه‌م بینـی لـه‌م لاو لـه‌و لای دیواره‌کـه‌وه،

هەنگاوم هاویشت بۆ ژوورێکی دیکە، ئەو ژوورە زۆر جوان بوو، وەك ئەوەی بۆ یەکێك لە فیلمەکانی جیمس بۆند دانرابێ. چەند کەسێکی تیادا بوو بەڵام کەس قسەی نەکرد وەك ئەوەی بەشێك بن لەدیکۆرەکە، لەنێو ژوورەکەدا پیاوێك کورسییەکی بۆ راکێشان و یەکێکی دیکە دەیویست تەوقەم لەگەڵدا بکات پێم بڵێ دانیشە، لە کاتێکدا دووجار قژەکەی سەر سەری بادا، دیار بوو ماندووبوو، لەوانەیە ماندووبوونەکەی پەیوەندی بەو چەند ساڵەوە هەبێ کاتێك سەرکردایەتی یاخیبووەکانی دەکرد، لەوانەشە پەیوەندی بە نەخۆشی مەلاریاوە هەبێ، لەوانەشە خۆی وەك جیمس بۆند دانابێ.

پێش ئەوەی ئەو کەسە ببینم سەرۆکی وێستگەکەم پێی راگەیاندم ئەو کەسە زۆر فێڵبازە، چونکە پێشتر لەگەڵ زۆرێك لەوانە دانیشتووە و گفتوگۆی کردووە کە فێڵبازن، بۆیە لەو کاتەدا نەمویست لە سەرۆکی پارتیزانێك کەم بکەمەوە، لەگەڵ ئەوەی زۆر ماندووە، بەپێچەوانەوە ئەو لە شەڕی زۆر ترسناك رزگاری بووە لە ئێستاشدا بەرەو پێشەوە چووە، بۆ ئەمەش سی ئای ئەی پێشبینی ئەوەی دەکرد سەربکەوێ، بۆیە دەبوایە باشتری بناسین، تا پەیوەندییەکی قووڵتر لەگەڵ رێکخستنەکانی ببەستین.

ئەو گوتی: سوپاست دەکەم کە چاوت بەمن کەوتووە

پرسیاری کرد: ناوت چییە؟

لەوێدا درۆم کرد و گوتم: " فرانك".

"ئا بەڵێ" وەك ئەوەی بزانێ درۆ دەکەم، بەڵام قەیناکا.

هەروەها گوتم: سەرۆکەکەم سڵاوت لێ دەکات.

"سەرۆکەکەت پیاوێکی باشە، هەروا گوتیشی تۆش باشی، هیوام وایە بەردەوام بین، چونکە زۆر شت هەیە دەبێ باسی بکەین".

بەبێ پیشەکی رۆتینی دەستمان پێ کرد، سەرەتا باسمان لە روانینی حکومەتی ئەمریکی کرد سەبارەت بە رێکخستن و ئامانج و داهاتوو، بیروبۆچوونی خۆی دەربڕی و منیش بۆچوونەکانی خۆم دەربڕی، باسیشی لەوە کرد حکومەتی ئەمریکی گرنگییەکی یەکلاکەرەوەی هەیە سەبارەت بە داهاتووی وڵاتەکەی.

بەکورتی باسی پلانەکانی چەند هەفتەی داهاتوو و ساڵانی دواتری کرد، پێدەچێ کەسێك بێ هیوا بێ و ئاواتی زۆر بێ، هەموو شتێکیشی بەجوانی لە شوێنی خۆیدا دانابوو، باسی لە یاخیبوون کرد، هەروا باسمان لە هێزە هەرێمییەکان کرد بەتایبەتی هەوڵەکانی لەوبارەیەوە، باسی لە لیبیەکان و سۆفیەتی و چینییەکان کرد، هەروا ئەو پلانانەی جیاکردەوە دوای ئەوەی سەرکەوتن بەدەست دێنێ، کە لەدواتردا ژێرخانی وڵاتەکەی پتەو دەکات لەرووی پەروەردە و تەندروستی و بازرگانی و مافی ئافرەت، هاوکات باسمان لە بیردۆزە سیاسییەکانیشس کرد.

هیچ تێبینییەکم تۆمار نەکرد، بەڵام هەوڵم دا هەموو ئەو زانیاریانەم لەبیر بێ کاتێك گەڕامەوە وێستگەکە و دەیکەم بە راپۆرتی هەواڵگری، هاوکات لەرووی هەست و نەستەوە هەواڵم دا تێی بگەم، ئەوەی لێی تێگەیشتم ئەو زۆر ئاسوودە بوو.

"دەمەوێ یەکێکیان ببینیت و کاری لەگەڵدا بکەیت، چونکە لەم نزیکانە دەگەڕێمەوە جەنگەڵەکان، ئەو هەموو شتێکی لەلایە کە تۆ پێویستیت پێیەتی".

لە وەڵامدا گوتم" بەڵێ قوربان".

ناوی یەکێکی هێنا و سەیری لایەکی ژوورەکەی کرد، ئەو ئافرەتە نەبوو کە جیمس بۆند بینوویەتی بەڵکو ئافرەتێکی تەمەن گەورەتر و خاوەن لەشێکی پڕ بوو، دەستەکانی گەورە بوو، کەسێکی باش بوو، لەوانەشە پوری یەکێك لەوانە بێ.

زانیاریمان ئاڵوگۆڕ کرد سەبارەت بە ئامرازەکانی پەیوەندیکردن، هەروا شوێنێکم دانا تا لەوێدا چاوم پێی بکەوێ، واتە لە گۆشەی یەکێك لە شەقامەکانی شار یەکتر دەبینین و دواتر سواری ئۆتۆمبێلەکە دەبێ.

بەدرێژایی ساڵێك بەبەردەوامی یەکترمان دەبینی، بەتایبەتی لە شەواندا بە ئۆتۆمبێل پیاسەمان دەکرد، لە هەموو کۆبوونەوەکان ئامادە بوو، هیچ کاتێك لە کارەکانی شکستی نەهێنا، بەردەوام هەموو لایەنەکانی یاخیبوونەکەی بۆم باس دەکرد، هاوکات باسی لایەنەکانی جیۆسیاسی جەنگەکەیانی دەکرد.

لەلایەکی باسی هەموو رێگەکانی یارمەتیدانی چەك و تەقەمەنی و خواردنمان دەکرد لەتەك ئەو سیاسەتانەی کە خێڵەکان پەیڕەوی دەکەن چ لە ئێستادا یان لە رابردوو و داهاتوودا، زیاتر شەڕەکە پەیوەندی بە جوگرافیای سروشتییەوە هەبوو، هەموو ئەمانەش ئاڵنگاری گەورە بوون، زیاتریش جەنگەکان کاری تێکدەرانە بوو، ئەمەش پەیوەندی بە سەرکردایەتی یاخیبوون و حکومەتە پەرشوبڵاوەکە بوو، بەڵام پلانیان چییە؟

ئەوەی تێگەیشتم کارەکە زیاتر پەیوەندی بە سەرکردایەتیەوە هەبوو، بەڵام بۆ ئەو هەموو خەڵکە دەجەنگن؟ لەدوای سەرکەوتن دەیانەوێ چی بکەن؟ زۆر

پرسیاری دیکەشم کرد، هەموو ئەمانەش پرسیاری دیکەی لیّ دەهاتە ئاراوە، وەك ئەوەی کاتێکی زۆرم لەبەردەستدا نییە.

لەلای خۆمەوە وەفادار بووم بۆ ئەو کارە و هەموو هەڵوێستە فەرمییەکانن پێشکەش بە حکەمەتی ئەمریکی کرد بەتایبەتی ئەو شتانەی لەلای رێکخستنەکانیان گرنگە، هەروەها بەپێی داواکاری ئەوان خستومەتە روو، هەروا چەندین بۆچوونی خۆشم بۆی زیاد کرد، بەڵام ویلایەتە یەکگرتووەکان بەردەوام دانی بەو حکومەتە دانا، کە یاخیبووەکان دەیانویست بیڕوخێنن، تەنیا پشتگیرییەکی کەمیان دەکرا، لەگەڵ ئەوەی خۆم وەك نوێنەری سی ئای ئەی خستبووە روو، بۆیە وەزارەتی دەرەوە نەیدەتوانی هیچ لایەنێکی نهێنی بدرکێنیّ، لەپاشاندا درکم بەوە کرد ئەمجۆرە پەیوەندییە هەواڵگرییە پەیوەندی بە کارێکی دیبلۆماسیەوە هەیە، ئێمە ئێستا رێگە خۆش دەکەین بۆ پەیوەندییەکی دیبلۆماسی لە کاتێکدا سوپای یاخیبووەکان سەرکەوتن بەدەست دێنن، لەو کاتەش دان بە حکومەتەکەیان دەنێین.

هیچ کاتێك هەوڵم نەدا ئەو بەرامبەرەم بەکریّ بگرم، پێویستم بەوە نەبوو، چونکە زۆرێك لە زانیاریم دەست دەکەوت، هەروا هەوڵم نەدا یەکێك لە سەرکەوتووترین پەیوەندییەکانم تێك بدەم، کە سی ئای ئەی رێکیخستووە لەو کیشوەرەدا، سەرۆکی وێستگەم بەدوور بینی، سەیری بەردەوامبوونی ئەو پەیوەندییەی دەکرد وەك کەسێکی سەرەتا لە پەیوەندیکردن بۆیە هەلی بۆرەخساندم، ئەم کارەم بەمتمانە و کارایی ئەنجام دەدا، لەمەوەش چەندین هاوبەشی باش و درێژخایەن بەرهەمی ئەو پەیوەندییە بوو.

بیرم لە ڕێکوپێکی ئەو خاتوونە دەکردەوە، کاتێك بە چاویلکە ئەستوورەکەی دەیڕوانی، لەگەڵ ئەوەی شێوازەکانی زۆر ساکار بوو، هیچ کات لە یاخیبوو نەدەچوو، هەروا دەتوانم وەك یەکەم ڕاهێنەر و هاوبەش سەیری بکەم لە کارەکانی پەیوەندیکردن، بەڵام زۆر زیاتر سەیرم دەکرد.

## پەیوەندیکردن بە حکومەتە بیانییەکان.

بۆ یەکەمجار بەرێکەوت پەیوەندیم بە دەزگای پەیوەندیکردنی حکومەتە بیانییەکانەوە کرد، ئەمەش لە ڕێگەی ڕاونانی ئامانجێکی تاکلایەنە.

ئامانجم بەکرێگرتنی بوو بۆ سیخوڕی، ئافرەتێکی کورتەباڵا بوو، بەڵام جوان نەبوو، تەمەنی بیست ساڵ لە من گەورەتر بوو، سەیری دۆسییەکەیم کرد لەنێوەندی سی ئای ئەی، بەمشێوەیە سەیری دۆسیەی ۲۰۱ کرد، زانیاری زۆری لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی هەبوو، کەچی زانیارییەکانی سەبارەت بە وڵاتەکەی ئەو کەم بوو، هاوکات بەرێژەیەك ئەو بەرپرسێکی فەرمی بوو، منیش ئەفسەرێکی بچووکی نێو سی ئای ئەی، زیاتریش لەلای ئەو باسی بواری ئابووریم دەکرد، لە کاتێکدا من زیاتر لەنێوەندی هەواڵگریدا کارم لەسەر جیۆسیاسی بوو، بەتایبەتیش دژەتیرۆر و یاخیبوون، بۆیە بواری هاوبەشمان لەنێواندا کەم بوو، بۆ ماوەی شەش ساڵ هەوڵم دا ئەو سەربازگیر بکەم، لەگەڵ ئەوەی پەیوەندیکردنی ئەم جۆرە هەزاران کیلۆمەتر دوور بوو لە دەزگاکەم، هیچ کاتێکیش ئارەزووم لەوە نەبووە بچمە نێو دەزگایەکی دیکە، یاخود کەسێك هەبێ ڕام بکێشێ بۆ لای خۆی.

ئەو وڵاتەی مـن تیایـدا بـووم شـوێنێكی دیـاری كردبـوو بـۆ كۆنگرەیـەكی نێودەوڵەتیی گەورە، هاوكات هەموو ئەوانەی بەشدار بوون لەو كۆنگرەیە بەرپرسی حكومی بوون و لە هەموو جیهانەوە هاتبوون پێویست بوو هەر هەموویان تەجنید بكەم، بەڵام ئەوانە دوور بوون لە دەستی سی ئای ئەی، بەتایبەتی لەو كاتـەی لـە وڵاتی خۆیاندا دەزگاكانی ئاسایش زۆر بەئاگاییەوە چاودێری ئەفسەرانی سی ئـای ئەی دەكەن، لەلایەكی دیكەوە پێشدەچێ هەر ئەوانە خۆیان ئەفسـەرانی سـی ئـای ئەی بن، وەكچۆن لە وڵاتەكەیان چاودێری هەموو بەرپرسێكی حكـوومی دەكـرێ، كاتێك لەگەڵ بیانییەك گفتوگۆ دەكەن یـان دادەنیشـن، لـە كاتێكـدا لـەو جـۆرە كۆنگرانە ژینگەی ئەوە هەیە تەجنید بكرێن.

بەڵام ئەو سەرچاوانە لە ئێستادا لەنێو دەستی هەواڵگری لۆكاڵی و سی ئـای ئەی دان، بێگومان ئەفسەرانی نـاوخۆیی هـەوڵیان داوە لـەنێو ئـەو جەنجاڵییـەدا كەسانێك هەڵبژێرن تا بەشێك لە ئارەزووەكانیان تێـر بكـەن بەتایبـەتی بەرپرسـە بیانییەكان، بەتایبەتی ئەوانەی لە وڵاتی نـەیارەوە هـاتوون لەوانەشـە هـەواڵگری میوانیش لەگەڵیان هاتبن، هەروا هەواڵگرە ناوخۆییەكان بـەجۆرێك هـەوڵیان داوە مەبەستەكانیان بپێكن بەتایبەت بە مۆڵەتی فەرمی بۆ سەركردە سیاسـیەكانیان، بەو شێوەیەش سی ئای ئەی هاوكار بـووە لـە پاراسـتنی وڵاتەكەیـدا تـا بتـوانێ پەیوەندییەكانی لەگەڵ گەورە پیاوانی سیاسی زیاتر بكات.

لێرەوە هەواڵگری ناوخۆیی ئەو وڵاتە رۆژانە هەواڵگری تەكنیكی رۆژانەی پێ دەدایـن بەتایبـەتی ئـەو سەرچـاوە هەواڵانـەی لـەنێو كۆنگرەكـەدان، بۆیـە بەرژەوەندییەكی هاوبەش هاتە ئارا، لەمەوەش دەزگای ئەو وڵاتـە زانـی هەنـدێك سەرچاوە بۆ لای خۆماندا رابكێشـین، بـەڵام یـەك داواكاریـان هـەبوو تـا بـەهیچ شێوەیەك هەرا دروست نەبێ نەوەك شەرمەزاری یەكێك لەو وڵـات و حكومەتانـە

## هونەری سیخوڕی

بن نەوەك لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەكان ئابڕوویان بچێ، هەروا سەرۆكی یەكێك لەوێستگەكان گوتی " هەر شتێك دەكەن بیكەن، بەڵام كارەكان تێك مەدەن".

وێستگەكە لە چەند ئەفسەرێكی ئۆپراسیۆنەكان پێكهاتبوو، لە كاتێكدا سەرچاوەكان لەسەرووی ئێمەوە بوون بەتەواوی نەمان دەتوانی چارەسەری بكەین بەتایبەتی لە چەند ڕۆژێكدا، بۆیە هەر یەكێكمان ڕاسپێردرا بۆ ئامانجێك یان دوو ئامانج.

توێژینەوەم لەسەر بەشێم لە دۆسییەكان كرد لەگەڵ دوو ئەفسەری دیكەی بچووك، زانیمان هەڵوێستیان بەرامبەر بە حكومەتەكەیان چۆنە لەتەك باكگراوندی خێزانی و زانستی و بەهای هەواڵگریان، لەگەڵ شیكەرەوەیەك لەوێستگە كارم كرد لەگەڵ ڕاوێژكردن بە سەركردایەتی، بۆیە چەند بابەتێكم هەڵبژارد و پێم وابوو گرنگە بۆ خێزانەكەیان.

لە ڕۆژی دووەم چووم بۆ كۆنگرەكە بە سیفەتی چاودێر بەتایبەت كارتێكم لەسەر سینگم دانا، لە یەكێك لەدانیشتنە گشتییەكان دانیشتم و دەمویست ناوەكان لەیەكتر جیا بكەمەوە و سەیری وێنە و ژیاننامەكەیان بكەم، زۆر بێزار بووم چونكە لەكۆنگرەكەدا باسی شتی پڕوپووچیان دەكرد، ڕقم لەو جۆرە چاودێرییە بۆوە بە شێوەیەك نەم دەتوانی ئامانجەكە ببینم.

لەدوا بەیانی یەكێكم دۆزییەوە ئەو كاتەی قاوەی دەخواردەوە و شەماڵەكەش لاپەڕەكەی ڕۆژنامەكەی بەردەمی دەجووڵاند.

لێی نزیك بوومەوە لە كاتێكدا كات نەمابوو، بەڵام ئەمە دوا بژاردە بوو، خۆم پێ ناساند و داوام لێ كرد كەمێك باس لە وڵاتەكەی خۆی بكات، كاتێك سەیری كردم وام هەست كرد لەبەرامبەر دوكانێك وەستاوە، سەیرێكی كردم منیش

وام هەست كرد سەیری ئەو ئەفسەرانە دەكات كە چاودێری دەكەن، منیش بەهەمان شێوە سەیرێكی ئەولاو ئەولام كرد.

دەمێك بوو سەیری دەكردم، بیرم لەوە كردەوە ئێستا هاوار دەكا سی ئای ئەی سی ئای ئەی!

"بەڵێ باس لەوڵاتەكەم دەكەم" ئینگلیزییەكەی زۆر خراپ نەبوو.

پێم گوت "دەتوانم پیاڵە چایەكت بۆ بانگ بكەم؟".

بەخەندەیەكی ئاگایی سەری جولاند و چووین لەیەكێك لە مێزەكان دانیشتین، لە سەرەتای سی خولەكی دواتر هەستم بەوە كرد جیاكارییەكی گەورە لەنێوانماندا هەیە، بەڵام ئەویش زۆر بێزار بوو بوو لەو كۆنگرەیە، پێی خۆشبوو باس لە وڵاتەكەی بكات، لەوانەیە دژ بەوە بێ هەوالگر بم، بەڵام زۆر بەجۆشوخرۆشەوە باسی لەوڵاتەكەی دەكرد بەتایبەتی سەبارەت بە بۆچوونەكانی خۆی لەرووی سیاسەت و ژیانی خۆی، باسی هیچ بوارێكی هەستیارم نەكرد، بەڵام لە ماوەیەكی كەمدا كارێكم كرد تا متمانە لەنێوانماندا هەبێ.

لە كۆتاییدا دووبارە ناوی خۆم پێ گوتووە، هەروا كارتم پێ نەدا چونكە ئەمە ترسنامە، پێویست ناكات لەوانەشە نەیەوێ كارتێكی بەرپرسێكی ئەمریكی هەڵگرێ، بەڵام ئەو كارتی خۆی پێم دا.

تا چوار ساڵی دیكە نایبینمەوە، لەو كاتەدا دەبوایە كارێكی دیكە لە وڵاتێكی دیكە بكەم، جارێكی دیكە دەزگایەكی بیانی كلیلە، لەو كاتەی چاوی خستە سەر ناوەكەی لەنێوەندی لیستی میوانەكان، كە دەبوایە ئامادەی كۆنگرەیەكی دیكە بێ لەلایەكی دیكەی گۆیی زەوی.

سەرۆکی وێستگە هاتە نووسینگەکەم و چەند ڕێنمایەکی پێ دام و گوتی "جانتاکەت ڕێك بخە".

"بێگومان بەڵام بۆ کوێ".

نامەیەکی لەسەر مێزەکەم دانا و کاتێك چووە دەرەوەش گوتی "خواردنی ئەوێ زۆر خۆشە".

نامەکەم کردەوە هەستم بەوە کرد سی ئای ئەی لێم بێ ئومێد بووە لەوەی دوای چوار ساڵی دیکە دەیبینمەوە، تا هەر بەدوای ئەو گفتوگۆیە بچمەوە کە لەگەڵیدا باسم کردەوە، پێ دەچوو لەوڵاتە سەرچاوەمان زۆر کەم بێ.

لە ڕۆژی دواتردا بەبەرزایی سی هەزارپێ بەخێرایی ڕۆیشتم.

کاتێك گەیشتم ئەفسەری فڕۆکەخانە داوای لێ کردم بچمە ئەولاتر، لە چەند چرکەیەکدا یەکێك لە ئەفسەرانی وێستگە بەخێرهاتنێکی گەرمی لێ کردم، مۆر لەسەر پاسەپۆرتەکەم نەدرا وەك ئەوەی هیچ بوونێکم لەنێو ئەو وڵاتەدا نەبێ، لەوانەشە پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان حکومەتی میواندار و سی ئای ئەی هەبێ.

لەوێوە بۆ یەکەمجار هەستم بەوە کرد کە بەفەرمی من ئەفسەرێکم لە سی ئای ئەی، هیچ شتێك لەوێدا نەگوترا جگە لە سەرلەقاندنی ئەفسەری فڕۆکەخانەکە.

لە هوتێلێکی پێنج ئەستێرە دابەزیم خواردنەکانی زۆر نایاب بوو وەکچۆن سەرۆکی وێستگەکە پێشبینی دەکرد، لەپێشتردا زۆر جار لە هوتێلێکی ساکار دادەبەزیم کاتێك سەفەرم دەکرد، هیوام دەخواست تەنیا پانکەیەکی تیادا بێ.

هەستم بەوە کرد کارەکەم سەرکەوتوو نابێ بە هۆی ئەو خۆشییە پێشبینینەکراوە، لەلایەکی دیکەوە پەیوەندی لۆکاڵی ئەوەی پێ ڕاگەیاندم کە

ئامانجەکە تـا ئێسـتا نەگەیشـتووە، بۆیـە لەبـەیانیان رۆژنامـەم دەخوێنـدەوە و لەدواتریش وەرزشم دەکرد لەیانەی هوتێلەکەدا.

لەرۆژی چوارەم بەدەرکەوت، پەیوەندیی لۆکالّی لـەژێر چـاودێرییەکی تونـدی دانابوو، هاوکات ئەو دەزگایە کارەکـانی بەباشـترین شـێوە دەکـرد، بـۆ ئەمـەش زانیاری دابووە سی ئای ئەی و چەندین ئامێر و راهێنانی رێکخستبوو، چـاودێری هەموو شتێکیان دەکرد کاریشیان بۆ ئەوە کرد تا بەرێکەوت بیبینم.

لە کاتێکدا لەچـەند چـرکەیەکدا ئـەوەم بەبیرهاتـەوە سـەری بـۆم لەقانـد و خەندەیەکی کرد.

کاتێك بینیم چەندین بیانووی سەیروسەرمەرەم بۆی هێنایەوە بە هـۆی بـوونم لەو شارەدا، بەڵام ئەو ئەوەندە متمانەی بەخۆی بـوو بـەهیچ شـێوەیەك نیگـەران نەبوو، دووبـارە داوەتـی منـی قبـووڵ کـرد بـۆ کوپێـك چـای، لەوێـدا چـووینە چایخانەیەکی نزیك.

لێی پرسیم " چەند رۆژ لەم شارەدا دەمێنیتەوە؟".

لە وەڵامدا گوتم "لەراستیدا تۆ چەند دەمینێیەوە ...منیش ئەوەندە؟"

بەم قسەی من پێکەنی هەتا پێکەنینەکەی زۆر گەورە بوو.

ئەو گوتی " تەنیا دوو رۆژ". لەو کاتەدا بە دەستەسـرێك رووخسـاری خـۆی دەسرِیەوە، وام بیرکردەوە لەو چەند رۆژەدا خۆشییەك دروست دەکەم.

گفتوگۆکەمان بوو بەسیاسەت دوای ئەوەی باسی چەند خانەوادەیەکمان کرد، بەمشێوەیە قسەکردنمان زیاتر لە چل و پێنج خولـەکی خایانـد بـەپێی پێشـبینی قسەی پەیوەندی لۆکالّی، چونکە ئەو کاری دیکەی هـەبووە، لـەپاش کاتـژمێرێك

## هونەری سیخوڕی

رازی بوو ناوی خۆی بڵێ و ژمارەی تە لەفۆنەکەی بدات بەتایبەت کاتێک سەفەر بۆ وڵاتێکی دیکە دەکا.

لە ماوەی دوو ساڵدا هیچ پەیوەندییەکی نەکرد.

کەچی لەوڵاتێکی دیکە بەدەرکەوت، کاتێک پەیوەندی لۆکاڵی ناوی لە لیستی میوانان بینبوو، ئەمجارەیان بۆ ماوەی دوو مانگ دەمینێتەوە، بەڵام من لەجیاتی ئەوەی سواری فڕۆکە بم نامەیەکم بۆ نارد کە یەکێك لە ئەفسەرەکان دەنێرم، هەر ئەویش کار لەسەر ئەو شتانە دەکات.

هەموویم بۆ روونکردەوە ئەو ئەفسەرە کێیە لەپاشاندا ئەفسەرەکەمان چاوی پێ کەوتبوو و لەدواتر چەندین کۆبوونەوەیان ئەنجام دابوو.

هەرچۆنێك بێ نەمزانی ئەنجامی ئەمکارە چی بووە، پێویستیش ناکات بیزانم.

بۆ ماوەی چەند ساڵێك پەیوەندییە لۆکاڵییەکان لە سێ کیشوەردا هاوکاریان کردووین، لە کاتێکدا ئەو ئامانجە تاکلایەنە بوو، لەوانەیە لە کۆتاییدا رازی بوو بێ بۆ یارمەتیدانی ئەو دەزگایانە، گومانم لەوەیە وای کردبێ، بەڵام هەر هیوام هەیە.

## مایسۆن

پشت و شانەکانی پان و بەهێز بوون، ئەو کاتە تێبینیم کرد کە دەیویست دەرگەی ئۆتۆمبیلەکەی دابخا، یەکەمجار کە بینیم سەیری سینگیم کرد لە یاریزانانی تۆپی پێی ئەمریکی دەچوو، چاوەکانی دەسووڕاند کاتێک دەیویست

تەوقە بکات، منیش تەوقەیەکی خۆشحالّیم لەگەلّیدا کرد، سەری لەقاند و خەندەیەکی کرد بینیم ددانەکانی زەرد بوو بوون، قژی کورت کردبۆوە تا سەرە گەورەکەی بەتەواوی دیار بیّ.

مایسۆن دەبیّتە هاوبەشی بنەڕەتیم لە پەیوەندیکردن بۆ ماوەی سیّ سالّی داهاتوو، داوام لیّ کرد بچین چایەك بخوێنەوە، پەیوەندیی من و ئەو گەورەترین بەرهەمی هەبوو لەنێو ئەو کیشوەرەدا، زۆرجاریش پەیوەندییەکان سەبارەت بە هەڕەشەی هاوبەش هەبوو کاتێك ولّاتەکەمان رووبەڕووی هەڕەشەی وەك ئێران و کۆریای باکوور و لیبیا و چەند ولّاتێکی دیکە دەبێتەوە، هاوکات کۆمەلّە تیرۆریستییەکان زۆرجاران هەڕەشە بوون بۆ سەر هەردوو ولّاتمان.

سی ئای ئەی و دەزگا لۆکالّییەکانی بەشێك لەولّاتان پێویستیان بەیەکتر هەبوو، هەردوولا پێداویستییەکانیان گەورە بوو، لەتەك ئەوەی سی ئای ئەی پەیوەندییەکی بەرفراوانی هەیە لە هەموو جیهاندا، دەزگەی لۆکالّیش زانیاری تەواوی هەیە لەسەر ولّات و ناوچەکە.

دەزگا لۆکالّییەکانی ولّاتان کارمەند و ئەفسەری بەهێزیان هەبوو، زۆربەیان لە جەنگەکاندا رزگاریان بوو بوو، کەمێکیان نەبیّ کاراییان لاواز بیّ، زۆربەی ئەو بەهێزانە ولّاتیان بەڕێوە دەبرد مایسۆن وەك نموونە.

لەپاش گفتوگۆی ئەجنداکەمان لە مایسۆنم پرسی سەبارەت بە ژیاننامەی خۆی، ئەو لە تەمەنێکی بچووکدا بەشداری یاخیبوونی کردووە، ئەمەشم لە دۆسیەکەی خوێندەوە، بەلّام دەمویست خودی خۆی باسی بکات وەك رێزگرتنێك لەلای منەوە، دیار بوو ئەویش خۆشی لەو گفتوگۆیە دەبینی.

لێم پرسی "ئەی ئەو برینانە لەسەر دەستەکانتە؟".

چونکە لەپێشتردا پاڵتۆکەی لەبەرکردەوە و بینیم دەستەکانی زۆر گەورە، لەسەر شانی نووسینکم بینی وەك برین وابوون.

دەستەکانی بەرزکردەوە و سەیرێکی کرد و گوتی " ئەمە ناوی کورتکراوەی سوپاکەمانە".

ئەوەم دەزانی.

"بەڵام ئەو برینانە چین؟"

مایسۆن لێوە ئەستوورەکانی کردەوە سەیرێکی کردم و گوتی " لە کۆمەڵەکەم دوورکەوتمەوە واتە ونبووم، هەندێك لە هاوڕێیەکانم کوژران و هەندێکی دیکەیان بەدیل گیران و بەتەنیا مامەوە، هەستم دەکرد ناتوانم رزگار ببم، بەڵام لەدواتردا دەمویست بزانن من کێم".

لێم پرسی" خۆت ئەو برینانەت هەڵکۆڵیوە و نووسیووتە؟"

"بەڵێ"

"هەروەها ئەگەر بگیرابام یان بکوژرابام، ئەوا هیچ گومانێکیان لە من نەدەکرد".

"بەڵێ".

چ شتێك سەبارەت بەم کارە ناتوانم بیڵێم، هەموو شتەکان پەیوەست بوون بەیەکەوە، لێرەوە مایسۆن دانیشتووە و ناسنامەی جەنگاوەرییەکەی لە گۆشتی دەستەکانی هەڵکوڵێنراوە، کە سەیری من دەکا نە تووڕە و نە ئاڵۆز دەبیندرێ، بەڵکو زۆر بە ئاسوودەیی و پشوودانەوە دانیشتووە.

پێم گوت : حەزت بەچایەکی دیکە هەیە؟

بەڵێ سوپاست دەکەم

وێستگەکەمان لە سێ ساڵی رابردوودا بە هاوکاری لەگەڵ تیمی مایسۆندا چەندین ئۆپراسیۆنی چاودێری ئەنجام دا. هەروەها لە زۆربەی کاتەکاندا تەکنیکی زانیارییەکانی کۆدەکردەوە کە توانی چەندین ئامانج بپێکێ، لێرەوە چەندین باری جبەخانە لەتەك پارە و راهێنان پێشکەشکردن، بەشێکیان بەناچاری دەبوایە پەیوەست دەکرا بە مافەکانی مرۆڤ، بەمەش دەگەیشتین بەو شتەی کە دەمانویست، لەلایەکی دیکەوە پیاو و رووماڵی سیاسیان بۆ دابینکردین، بەمەش سەدان راپۆرتی هەواڵگریمان بەرهەم بوو.

هەروەها بەشداریمان کرد لە سەربازگیری هاوبەش بۆ بەشێك لە ئامانجە بیانییەکان، ئەفسەرەکانی ئەوان زیاتر کاریان رازیکردن بوو، هەندێکجاریش ئێمە ئەو کارەمان دەکرد، زۆرجاریش سەرچاوەی بەکرێگیراومان نەبوو، لەتەك ئەمەشدا نەمان دەزانی ئەو زانیاریانە دەچێتە لای سی ئای ئەی یاخود دەزگا لۆکاڵییەکەی ئەو وڵاتە.

زۆرجار ئەو دەوڵەتانەی سەرپەرشتی تیرۆر دەکەن، گەورە نێردراویان دەنارده ناو ئاسیا و ئەفریقیا، لێرەوە بارەگای سەرکردایەتی پەیامێکی نارد بۆ وێستگەکانی تا بگەین بە نێردراوێکی تایبەت کاتێك لەنێو مەراسیمە جۆراوجۆرەکاندا دەبیندرێ، ئەمەش پلانێکی فراوان بوو بۆ گەیشتن بە سەرچاوەی دیکە و پەکخستنی چالاکییەکانی دەوڵەتی نەیار، هەموو ئەو بروسکانە لەلایەن وێستگەکانەوە بۆمان دەهات، تا بگەین بەئامانجێکی جوولە پێکراو، چونکە تەنیا

## هونەری سیخوڕی

بۆ ماوەی دوو رۆژ لە وڵاتێکدا دەمایەوە، بۆیە هەلەکان زۆر کەمبوون تا بگەین پێیان.

چاودێریمان کردن و هەر وێستگەیەك دەیویست بەرێگەیەك هەلی خۆی بقۆزێتەوە تا بگات بەو سەرچاوەیە، ئەمەو هاوبەشەکانمان هەموویان لە چاوەڕوانیدا بوون، ئەو شوێنانەیان هەمووی دەکرد بە چاودێر، چەندین پلانمان دانا تا لە شوێنێکی گونجاودا هەلمان بۆ رێکبکەوێ تا لێیان نزیك ببینەوە.

جۆرج، کە یاریدەری مایسۆن بوو تیمی چاودێری بەڕێوە دەبرد و شوێنەکانی دیاری دەکرد، زۆر بەکارایی جیاکاری لەنێوان سەرچاوەکان دەکرد لەنێو هەموو نێردراوەکاندا، وەك ئەوەی تاکە گایەك لەنێو مێگەلێك دیاری بکات.

رووبەڕووی ئامانجێك بوومەوە لەو کاتەی جۆرج لەدووری پێنج هەنگاو لەتەنیشتم بوو و دەیڕوانیە هەموو نێردراوەکانی دیکە.

"سڵاو من فرانکم"، دەستم بۆی درێژ کرد تا تەوقەی لەگەڵدا بکەم.

کەمێك کشایەوە و بەخێرایی ناوی خۆی گوت و تەوقەمان کرد.

"من بەرپرسم لەنێو هەواڵگری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دەمەوێ بەرێزتان هاوکاریمان بکەی، تۆ پیاوێکی باشی، بەڵام هیچ داهاتووت نییە لەگەڵ ئەو رژێمەی خزمەتی دەکەی، تۆش ئەمە دەزانیت".

کەمێك زمانی گیرا "تۆ ...تۆ کێیت؟".

"تۆ من دەناسیت، تۆ پێویستیت بە ئێمە دەبێ، بەبێ ئێمە هیچت لە دەستدا نییە، ئەم نامەیە بگرە، بیخوێنەوە و رێنماییەکانت لەبیر بێ، لەپاشان

کاغەزەکە بسوتێنە یان پارچە پارچەی بکە، بۆ جارێکی دیکە تۆ پەیوەندیمان پێوە بکە، کاتێك لەدەرەوە ولاتدا دەبیت".

باوەڕم بەوە نەکرد کاتێك نامەکەی وەرگرت..

لێم پرسی" تێ دەگەی؟".

"من ناتناسم تکات لێ دەکەم لێم دووربکەوە"، هەروا نامەکەی خستە گیرفانییەوە.

"دەتناسم، دەزانم چی دەکەی، هەروا هاوڕێیەکانیشت دەناسین، ئایا دەتەوێ ببیتە بەشێك لە رژێمێکی نەگریس و بکوژ کە ناویان ناوە حکومەت؟ ئەو بژاردەیەت هەیە، بژاردەی راستەقینە لەگەڵ ئێمەدایە".

زۆر ترسا و سەری لەقاند، لەوانەیە لەوەترسابێ چۆن ئەومان دیاری کردووە بۆ رازیبوون، زۆری نەمابوو هەڵبچێ، منیش کاتم نەبوو، هەروا پیاوانی جۆرج نەیان دەتوانی زیاتر نیردراوەکانی دیکە سەرقاڵ بکەن، تەنیا ئەومان بەدەستەوە بوو.

"پەیوەندیمان پێوە بکە"، ئەمە وەك فەرمانێك وابوو، لەپاشاندا رووم وەرگێڕا و دوورکەوتمەوە.

جۆرج بەخێرایی بۆ لای من هات تا هەموومان ئەو شوێنە جێ بهێڵین، ئەو گوێی لە هەموو ئەو شتانە بوو کە گوتمان، هاوکات ئەو بۆ ماوەی دوو ساڵە لەگەڵمدا کاردەکا، هەردەم رێزم دەگرت، هیچ کاتێك گەمارۆی ئامانجێکمان نەداوە تیایدا شکست بێنین.

جۆرج گوتی: ئەوە چی بوو! با لێرە بچینە دەرەوە.

لەناو ئۆتۆمبێلدا سەیرێکی کردم و دایە قاقای پێکەنین.

"وابزانم لەشی خۆی پیس دەکات".

"لەوانەیە".

لێی پرسیم، ئایا ئەم هەوڵە رێکە بۆ رازیکردن؟ هاوڕێیان پەیوەندیتان پێوە دەکات؟

"نازانم، بەڵام وابزانم زۆر ترسا، بڕواش ناکەم بەکەس بڵێ، بەڵام پێویستە کارمان لەگەڵدا بکات، ئێستا کارەکە لەلای ئەوە ئەو دەبێ بیر بکاتەوە".

لە هەفتەی داهاتوو لەنێوەندی یەکێك لەدانیشتنەکانمان ئەمەم بە باڵیۆزی ئەمریکی گوت کە ئەو شێوەیە هەوڵم داوە، گوێم بە هیچ رەنگدانەوەیەکی سیاسی نەدا، بەڵام ئەمکارە زیاتر لەلای هاوبەشە پەیوەندیدارەکانمانەوە گرنگ بوو تا پەیوەندی زیاتر بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ببەستن.

دەبوایە بۆ دوو ئۆپراسیۆن لەکاردابم بەتایبەتی لە کاتی راپەڕاندنی ئەرکەکانم، سەرەتا بە باڵیۆز بڵێم، چونکە دەبوایە ئاگاداری هەستیاری حکومەتی میوان بکەین، یاخود نەبمە هۆیەکی ترسناك بۆ سەر ئەفسەرەکانمان.

لەلایەکی دیکەوە باڵیۆزخانەکەمان باڵیۆزێکی مەزنی بۆ دانرابوو، لەدواتر بووە هاوڕێیەکی گرنگ، زیاتر لەوەی داوای دەکرد جێبەجێم دەکرد، لەگەڵ ئەوەی رێنمایی و راسپاردەکانی زۆر جوان بوون، ئەمەو ئۆپراسیۆنی سی ئای ئەی زیاتر لەنێوەندی سیاسەتدا دەخولێتەوە، سەرەڕایی ئەوەی ئەفسەرانی ئاژانسەکە زیاتر ئەو شتانەیان لەبیر دەکرد، چونکە لە کۆتاییدا هەواڵگری خزمەت بە مەبەستە سیاسییەکان دەکات و پشتگیری لە سیاسەتمەداران دەکات، باڵیۆزخانەکەی

ئێمەش بەبەخت بوو، چونکە باڵێۆزەکەی لــە کارەکــەمان تێگەیشــتبوو و ڕێــزی دەگرتین، زۆر جاریش بەو شێوە دەرناچێ.

ســی ئــای ئــەی رابەرایــەتی تــۆڕێکی فــراوان دەکــا چ لەگــەڵ هاوبەشــە لۆکاڵییەکانی زۆربەی وڵاتانی جیهــان، لەگــەڵ ئــەوەی دەزگــەی شــاراوە زۆربــەی کارەکانی بەتواندی ئەنجام دەدرێ، زیاتریش کــار لەســەر سەرچــاوە تاکلایەنــەکان دەکات، بەڵام بەرنامەی هاوبەش ئەو کاتانە دێتە ئــاراوە کــە هەڕشــەکان لەســەر دەوڵەتان بێ.

لەلایــــەکی دیکــــەوە فراوانبــــوونی ئۆپرۆاســــیۆنی هاوبــــەش لەگــــەڵ پەیوەندیــدارەکانی وڵاتــان، هۆیەکــە بــۆ زۆربــوونی دوژمنــەکان بــە شــێوەیەکی پێشکەوتوو، ئەوانەش ترســناکی گــەورە دەهێننــە ئــاراوە زۆرجــاران ئاڵۆزییەکــە بەزەحمەت تیایدا دەردەچین، ئەمەو تیرۆر و بازرگــانیکردن بــە مــرۆڤ و تێکــدان و تاوانی تلیاك تا دەگاتە ترســناکییەکانی ژینگــە، ئالنگــاری گــەورەن لەنێوەنــدی دەزگا هەواڵگرییەکان، تەنیا یەك دەزگاش ناتوانێ چارەسەری هەموو ئــەو شــتانە بکات، بەڵام سی ئای ئەی رۆڵی ســەرکردایەتی وەرگرتــووە بــە هــۆی بــوونی لــە جیهانــدا و پەیوەندییــە قووڵــەکانی، لــە لایــەکی دیکــەوە تواناکــانی زۆرن بــۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان و شــیکردنەوەیان، هــەروا هەماهــەنگی بکــات لەگــەڵ دەزگاکانی دیکە لە کــاتی راســتەقینەدا، هەنــدێکجار وەك هەماهــەنگ بــووە و زۆرجاریش وەك رابەر کارەکانی بەرێوە بردووە. لەگەڵ ئەوەی ئەم پەیوەندیانە تەنیا هۆیــەك نییــە بــۆ یــەکرپزی، چــونکە ململانــێ دەکەوێتــە نێوەنــدی دەزگاکــانی هەواڵگری، تاکە رێگەی سەرکەوتن بۆ ئەمەش سەرچاوە تاکلایەنەکانە لەنێوەندی ئەو دەزگایانە، بەمەش دەتواندرێ ئاگاداری ترسناکی و دەستکەوتەکان ببیت.

گەورەترین ڕەنگدانەوەش ئەوەیە کاتێك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك هێزێك شکست بێنێ، بەتایبەتی هێزە سروشتییەکەی، کاتێك دەچینە ناو پەیوەندیی هاوبەش؟ دیارە ئەو پەیوەندیانەش بە ڕەزامەندی بڕیاردەری سیاسەتەکانی ئەمریکایە، ئەوانەی هەندێکجار خۆیان بەڕێوە دەبەن، بەڵام سی ئای ئەی چۆن کار دەکات کاتێك ڕەوتەکە گۆڕا بەتایبەتی گۆڕانی سیاسەتی نێودەوڵەتی؟ ئایا بەهای ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرز دەبێتەوە یان پاشەکشە دەکات؟

تاکە کار بۆ بەستنی ئەو پەیوەندیانە تەنیا بۆ کاری دژەتیرۆر سەرکەوتووە.

## بەشی شەشەم

# بنبڕکردنی تیرۆر...

ئاڵۆزییەك لەنێوەندی پلانەكانمان هەیە لەو كاتەی ناباوەكان و پێشبینینەكراوەكان تێكەڵ بەیەكتر دەبن.

-تۆماس شفین

ئابووریناسێكی هارڤارد، لە ئاماژەیەك بە هێرشی ژاپۆنی بۆ سەر بیرل هاربیۆر.

لە ساڵی ١٩٩٨ بارەگای سەرکردایەتی چەند راسپاردەیەکی ئاراستەم کرد تا لەدەرەوەی وڵاتدا نەمێنم و بگەڕێمەوە تا کار لە لیژنەی هەڵسەنگاندنی ئەفسەران بکەم سەبارەت ریزبەندی مووچە و سەرمووچە و راسپاردە تا بێنە ریزی گەورە ئەفسەرەکانی هەواڵگری، ئەمەش وەرچەخانێکی گەورە بوو بۆ ئەو ئەفسەرانە کە پلەکانیان دەگەیشتە کۆلۆنێلی سوپا تا دەگاتە پلەی عەمید، لە ساڵی پێشتریش منیش پلەم بەرزکرایەوە بۆ ریزی گەورە ئەفسەرانی هەواڵگری، دەزانم گرنگی ئەو لیژنەیە لەچی دایە، تەنیاش بۆ ئەفسەرەکان نا بەڵکو بۆ داهاتووی دەزگای شاراوە و ئاسایشی دەوڵەتەکەمان، دیارە ئەوانەشی کە پلەیان بەرز دەکرێتەوە کۆمەڵەیەکی بچووکن لەو سەکردانەی بەرپرسن لە سیخوڕی ئەمریکی و کاری شاراوە.

لیژنەکە بۆ ماوەی مانگێك لەکاردابوو، ئەمەو لەپاش خوێندنەوە دەیان دۆسییە، بڕیار درا تەنیا شەش ئەفسەر پلەیان بەرزگرایەوە، پێکهێنانی ئەو لیژنەیە جگە لەوەی جۆرێك لە رۆشنبیرییە، هەروا کارێکە بۆ داهاتووی خودی دەزگای شاراو، سەرسام بووم بە فراوانبوونی دەزگاکە، لەگەڵ ئەوەی خۆم کارم لە پێکهێنانی ئۆپراسیۆنەکانی نهێنی کردووە لە ئاسیا و ئەفریقیا و ئەورووپا، زۆربەی ئەو دۆسیانەی دەخرانە پێشمان لەنێوەندی ئۆپراسیۆنەکان چەندین ترسناکی و ئاڵۆزی تیادا بوو، بەتایبەت کاتێك بەرومالی بازرگانییەوە کارێکی قووڵمان لەنێوەندی رژێمە ترسناکەکانی جیهاندا دەکرد، کارەکان گەیشتبووە ئەو رادەیەی هەندێك ئۆپراسیۆن ئەوەندە هەستیار بوون، هەندێکجار بانگ دەکراین و بەزارەکی پرسیاریان لێدەکردین، لەپێشتریشدا وەك باسمان کرد هەندێك لە ئەفسەرەکان دەستیان خستبووە نێو هەوڵگرییەك کارە نهێنییەکانیان دژ بە

چەندین دەوڵەت و بازرگانی تلیاك و چەك و تیرۆر بوو، بۆیە لەوێدا هەندێك ئامانج بەدەردەکەوت کە لەنێوەندی ئامانجەکانمان بوونی نەبوو.

لێژنەکەمان سەیری هەموو ئەو دۆسیانەی دەکرد کە بە فەرمانی ئەو ئەفسەرانە کار دەکەن، یان فەرمانیان پێ دەکرێ، تا بزانین جۆری هەواڵگرییەکەی چییە و ئاستی کار و سەرکردایەتیان چۆنە، زۆرجاریش کاری هەواڵگری ئاڵۆز دەبێ بە هۆی چوونەناو ئۆپراسیۆنە سەربازییەکان و چەسپاندنی یاسا و دیبلۆماسیەت، هەروا توانیان چەندە کاتێك لەنێو کێڵگەیەکی چیندراوی مین دەبن، هەروا تا چەند دەتوانن لەگەڵ دەزگای هەواڵگری وڵاتان کار بکەن.

لێرەدا بۆم روون بۆوە تەنیا ئەو دە سەرکەوتووە لەو ئاستەدان، بەڵام ٧٠ لەسەدا پلەیان لە زۆرباشە بۆ پەسەند دەڕوات، تەنیاش بیست لەسەدیان دەکرێ پلەیان بەرز بکرێتەوە، لەوانەیە هەندێکیان پەیوەندییەکی وایان بەسی ئای ئەی نەبوو، بۆیە ئەوانەم بەرزکردەوە بۆ جایمس بافیت، ئەو رازی بوو لەسەر زۆری ئەو شتانەی ئێمە بڕیارمان لەسەردابوو، بەڵام دوو کەسی لابرد و دوو کەسی دیکەی دانا، کە لەلای خۆیەوە تەزکییە کرابوون.

بافێت داوای کرد لە نهۆمی حەوتەم سەردانی بکەم کە لەوێدا بەڕێوەبەر و جێگرەکانی کار دەکەن، زۆرجاریش وا ئاماژە دەکەین، کە نهۆمی حەوتەم سەر بە سی ئای ئەیە، پرسیارم کرد بۆچی بانگم دەکات، بەڵام ئەو دەویست گفتوگۆی کارەکەمان بکات لە لێژنەی پلە بەرزکردنەوە، یان دەیەوێ کارێکی دیکەم پێ بسپێرێ، لەپێشتریش داوام کردبوو کاری مەیدانیم درێژ بکرێتەوە، بەڵام داواکەم رەت کرایەوە، هاوکات لەپاش شانزدە ساڵ لە کاری نهێنی و لەمەیدانی دەرەکی ئێستا کاتی هاتووە بگەڕێمەوە بارەگای سەرکردایەتی.

بافێت وەك پێشتر پێشوازیەکی گەرمی لێ کردم، لە شوێنەکەی خۆی هەڵسایەوە و بەرەو لای من هات، نووسینگەکەی گەورە بوو جێگەی چەندین کورسی و مێزێك دەبۆوە.

بافێت خۆشی لە پۆستەکەی دەبینیێ، ئەو بەردەوام جلوبەرگی رێك دەپۆشێ لەگەڵ چەندین رەنگی جیاجیای بۆینباخ، هەروا زۆر ئاگاداری ژینگەکەیەتی لە واشنتنی پایتەخت، لەپێشتریشدا کاری لە بنبڕکردنی پەرشوبڵاوی چەك کردووە لە بارەگای سەرکردایەتی، لەپێش ئەمەش لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دانمەزرێندرا، لەدوا پۆستیشی لەدەرەوەدا تەنیا سەرۆکایەتی وێستگەیەکی بچووك دەکرد لە ئەورووپا.

لەبەرامبەریدا دانیشتبووم و پێنووسەکەی لەدەستدا بوو و چەندین جار پێنووسەکەی سوڕاند پرسیارەکانی سەبارەت بە لێژنەکە و هیوا و ئاواتەکانی من بوو لەرووی پیشەییەوە، منیش پێم ڕاگەیاند دەمەوێ کارێکی دیکە دەکەم و دەمەوێ بیروهزرەکانم بەرەو ئاسۆ هەڵبکشێت، هەروا زۆر گرنگی بەگەڕانەوە بۆ خوێندن دەدەم لە ماوە ساڵێك یان دوو ساڵ.

"ئەی چی سەبارەت بە دامەزراندت لە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالی؟ لەوێدا دەبیتە یاریدەری بەشەکەیان کە پەیوەستە بەدژەتیرۆری نێودەوڵەتی، هەروا دەسەڵاتی ئەوەت دەبێ فەرمان دەربکەی، تۆ جێگەی جێف دەگریتەوە.

هیچ شتێکم سەبارەت بەو پۆستە نەدەزانی، بەڵام دەمزانی گرنگی دژەتیرۆر (ساتۆلا) چییە، "سوپاسی ئەو هەلەتان دەکەم کە بۆمنتان رەخساندووە".

"زۆر باشە، کار لەسەر ئەو بابەتە دەکەین".

کاتێك لە نووسینگەکە چوومە دەرەوە پرسیارم لە خۆم دەکرد، دەبێ تا چەند راست بم لەسەر ئەو بڕیارەم، کە بەناکاوی دام، لەوانەیە ئەو پشتگیری کردبم، لەپاشان زانیم من راسپێردراوم وەك ئەلتەرناتیفێك، ئەمەش نیشانەیەکی باشە، هەروا زانیم کە بافیت و ئەوانی دیکە پێیان وایە من گونجاویکی باشم، چونکە سەرکردایەتی سی ئای ئەی وا داناوم یەکێك لە دڵسۆزەکانم، " ئەو کورەی کە هاوبەشی کەسانی دیکە لە کاتی نانخواردنیدا". یان بە واتایەکی دیکە من لەگەڵ هەمووان دەگونجێم واتە لەگەڵ کارمەندانی "ئیف بی ئای" واشم دانا ئەوان ئەوەی ویستوویانە پێکاویانە.

سی ئای ئەی لەو کاتەدا بەپێی راپۆرتی زانیارییەکانی هەواڵگری بەوردی کاری لەسەر ئوسامە بنلادن و قاعیدە دەکرد، هەروا ئاژانسەکە چەندین کاری پیلانگێری قاعیدەی پەکخستووە، جارێکیان پیلانی هێرشکردنی سەر یەکێك لە دەزگا ئەمریکییەکانیان پوچەڵ کردۆتەوە، لەتەك ئەوەی ئۆپراسیۆن و هەڕەشەکانی دوژمن بەرەو فراوانی دەڕۆیشت، هاوکات لەپێش دوو مانگدا واتە لەشوباتی ١٩٩٨ ئوسامە بنلادن فەتوایەکی دەرکرد تیایدا جەنگی دژ بەرۆژئاوا راگەیاند، رێڕەوەکە زۆر روون بوو، بەوەی قاعیدە هەڕەشەیەکی بەردەوامە بۆ سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەرژەوەندییەکانی.

کاتێك لەلیژنەی پلەبەرزکردنەوە بووم، بۆم رەخسا زانیارییەکان کۆ بکەمەوە بەتایبەتی قەبارەی کاری دژەتیرۆر لەتەك ئاڵۆزییەکانی، وام دانا بەرەو زیاتر بوون هەنگاو دەنێ، ئەمەش گرنگییەکی بەرچاوە، لە کاتێکدا جۆرج تنیتی بەڕێوەبەر جەنگی دژ بەقاعیدە راگەیاند، بەڵام من بیرۆکە ئەوەم نەبوو دژەتیرۆر لەم نزیکانە زاڵ دەبێ بەسەر ئەجندایی ئاسایشی نەتەوەیی.

گەڕانەوە نووسینگەکەم لەدەرەوە، ماوەی ئەرکەکانم بەجێ گەیاند کاتێکیش گەڕامەوە وڵات زانیم دوو هێرش کراوەتە سەر باڵیۆزخانەکەمان لە نایرۆبی و کینیا و دار سەلام لەتەنزانتنیا، ئەم هێرش لە حەوتی ئابی ١٩٩٨ هاتە ئارا.

من و سیندی و منداڵەکان لەرێڕەوەکە وەستابووین و چاوەڕێی ئەو پاسەمان دەکرد تا بمانگەیەنێتە فرۆکەخانە، کاتێکی زۆرمان بەسەر برد لەنێو ئەو باخچە فراوانانە و هەروا منداڵەکانیشم ئەو شوێنەیان خۆش دەویست، هەروا سەگەکەشیان (لابرادور) بە هەمان شێوە ئەو شوێنەی خۆش دەویست، واتە شوێنی درختە بەرزەکان و بەردە گەورەکان و خۆشاردنەوە لەو شوێنەدا، بێگومان کەشە وەك جاران نیمچە نموونەیی بوو، لەو کاتەدا زانیمان ئێمە بیری ئێرە دەکەین بیری ئەفریقیا دەکەین، من و هاوسەرەکەم لەسەر کەنارێك یەکترمان ناسی، هەروا هەر سێ کوڕەکەم لەوێدا پەروەردە بوون، واتە هەر یەکێکیان لە دەوڵەتێك لەدایکبوونە، ئەوان فێری مەلەوانی و گەشت و تیرهاوێژتن و وەرزشەکان فێر بووبوون، وەك یاری رەکبی، جگە لەمە وانەی زمانەکانی کەنار و فەرەنسی و زمانی خێڵەکان فێر بوو بوون، حەزیان بەوە نەبوو ئەو شوێنە جێ بهێڵن.

لە ماڵەوەدا زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا، کاتێك چوومە ژوورەوە وام دانا ئەوەی پەیوەندی دەکا سەبارەت بە بابەتێکی کارگێڕی قسەم لەگەڵ دەکا کە پەیوەستە بەرۆیشتنمان، چونکە زۆر جاران کێشەیەك هەیە لە کاتی گواستنەوەدا.

پەیوەندی وێستکەکە بوو "لە باڵیۆوخانەی نیرۆبی و دارسەلامان داوە، دوو ئۆتۆمبیلی بۆمبرێژکراو هێرشیان کردووە، کارەکە زۆر خراپە بەراستی خراپە".

"ئایا کەس زانیاری هەیە لەسەر کوژراو و بریندار؟ هیچ رێنمایەك هەیە لە بارەگای سەرکردایەتییەوە هاتبێ؟" لە خۆم پرسی ئایا بمێنمەوە یان وەك

هاوڵاتییەك پشتگیری دابین بکەم، من هاوڵاتییانم بەتەواوی دەناسی و چەندین هاوڕێی ئەمریکی و بیانیمان هەیە، لە هەردوو باڵیۆزخانە، بیرم لە کوژراوەکان دەکردەوە، لە خۆم دەپرسی ئایا هاوڕێیەکانم کوژراون.

" نا تا ئێستا هیچ دیار نییە، ئێستا رووی داوە".

"باشە، لەگەڵ خێزانەکەم دەڕۆم، ئەو کاتە پەیوەندیتان پێوە دەکەم، کاتێك خاڵی تێپەڕبوونی ئەووپام بڕی".

گەڕامەوە ڕێڕەوەکە، لەو کاتەی چاوەڕوانی پاسەکەمان دەکرد، هەواڵەکەم بۆ خێزانەکەم باسکرد، ئەوان چەندین پرسیاریان کرد: چەند کەس کوژراوە؟ ئایا هاوڕێیەکانی ئێمەی تیادایە؟ ئایا هێرشی دیکە دەکەن؟ بۆچی؟ کی بەرپرسیارە؟

لە ڕێگەی فرۆکەخانە بیرم لە چەند هۆکار و بەرپرسی پێشبینیکراو کردەوە، لەپێشتردا حزبی ئەڵلا چەندین هاوڵاتی ئەمریکیان کوشتووە، کە هیچ ڕێکخستنێکی دیکە وەك ئەوان وای نەکردووە، بەڵام قاعیدە لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا کار دەکات واتە لە سەرەتای حەفتاکانەوە لە سۆماڵ ئەو کارانە دەکات، هاوکات سی ئای ئەی هەردەم لەدوایانە و چەندین پیلانی نەگریسیان پوچەڵ کردۆتەوە، لە زۆربەی دەوڵەتەکانی جیهان بەتایبەتیش لە ئەفریقیا، بەڵام ئایا قاعیدە گەڕاونەتەوە و خۆیان کۆکردۆتەوە تا ئەو دوو هێرشە بکەن؟

لە ئەمستردامەوە پەیوەندیم بە بارەگای سەرکردایەتی کرد، پێشنیارم کرد خێزانەکەم بەردەوام بن لە سەفەرەکەیان بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، منیش بگەڕێمەوە بۆ نایرۆبی، بەڵام سەرکردایەتی ئەمەی ڕەت کردەوە و فەرمانی پێ کردم بگەڕێمەوە بۆ وڵات تا بچمە سەر کارەکەم لە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالی ئیف بی ئای، ئەمەش جیاوازیەك دروست دەکات بۆ گۆڕەپانی هەردوو

تاوان تا لێکۆڵینەوەی فراوانتر بکەینەوە، چونکە بەشێکی کەمیان سەردانی کینیا یان تەنزانیا یاخود ئەفریقیایان کردووە.

ئێستاش من بەرەو کارێکی قورس و کوشتێنەر دەچم کە کـاری دژەتـیرۆر و چوار ساڵ دەخایەنێت.

## بەشی حەفتەم

# نووسینگەی لێکۆڵینەوەی نیشتمانی...

لەو کاتەی لەنێو ئیف بی ئای نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالی دەست
بەکار دەکەی، راسپاردەکان بۆ ئەوەن چ لە زانیارییەکان دەکەی.
یەکسەر دەگۆڕێ بۆ "گیستابو".

-ج.ئەدگار هوفر

هەموو بابەتێکی پەیوەستی هەردوو هێرشەکەم کۆکردەوە، چ باسکردنەکانی رۆژنامەگەری و پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانم لەگەڵ بارەگای سی ئای ئەی، زۆری پێ نەچوو کە قاعیدە بەرپرسی ئەو هێرشەیە.

لە بەیانی رۆژی حەوتی ئابی ١٩٩٨، دوو کەسی قاعیدە دوو بارهەڵگری پڕ لە بۆمبیان لێ دەخوڕی و توانیان دیوارەکانی ئاسایشی هەردوو باڵیۆزخانەی دارسەلام و لە نایرۆبی ببڕن، لە کاتێکدا پاسەوانێکی کینی سەرەڕایی ئەوەی بەچەك هەڕەشەیان لێ کردبوو کەچی ئامێری دانا بۆ رێگری، کە رێگرییەکی کانزایی بوو لە نهۆمی خوارەوە، ئەوەش ئامانجی تەقینەوەکە بووە، پاسەوانەکە بەشێوەیەکی پاڵەوانانە توانی گیانی زۆر کەس رزگار بکات، لەپاشاندا تیرۆرستەکە دوای ئەوەی کشابۆوە بۆ دواوەی باڵەخانەکە لەوێدا خۆی و بارهەڵگرەکەی تەقاندەوە، ئەمەش بووە هۆی کوشتنی زیاتر لە دووسەد کەس و نزیکەی چوارسەد کەسی دیکەش بریندار بوو، لەنێو قوربانییەکانیش چەندین هاوڕێ و هاوکارم هەبوون.

یەکێك لە بەرپرسانی باڵیۆزخانە هاوڕێم ستیف نولن بوو، کە زۆر ئازایانە کاری کردبوو و بەشێکی زۆری بریندارەکانی بۆ لای خۆی راکێشابوو بۆ دەرەوەی باڵیۆزخانەکە، سەرەڕایی ئەوەی خۆشی بریندار بووبوو، زۆر بەخێرایی توانی بووی ئامادەیی دیبلۆماسی کارا بکاتەوە، هەروا نۆلن پلەی بەرز دەکرێتەوە بۆ پلەکانی وەزارەتی دەرەوە و وەك باڵیۆزێك دادەنرێ و لە ئەفریقیا دادەمەزرێ، واتە ئەو شوێنەی خۆشی دەوێ و بۆ چەند ساڵێکی دیکە تیایدا دەمینێتەوە.

لەهەمانکاتدا خۆکوژەکە توانی بووی بگاتە دەروازەی باڵیۆزخانەکە لە دارسەلامدا، بەڵام لەلایەن پاسەوانێکی تەنزانی بەرپەچی درایەوە، بەمەش خۆکوژەکە شکستی هێنابوو تا بچێتە نێو کۆمەڵگەی باڵیۆزخانەکە، ئەمەو ئەو تەقینەوە گەورەیە یازدە کەسی کوشت و هەشتاوپێنج کەسیشی بریندار کرد.

بەرپرسێك لەنێو باڵیۆزخانەکە لەسەر کورسییەکی پلاستیکی دانیشتبوو، ماوەی چەند ساڵێکە ئەو دەناسم، کاتێك تەقینەوەکە رووی دابوو بە هۆی توندی تەقینەوەکە لایەکی نووسینگەکە رووخا ئەو زۆر بەسەرسوڕمان رزگای بوو، بەبێ ئەوەی هیچ ئازارێکی پێ بگات، لەپاشاندا هەموو بەرپرسانی باڵیۆزخانەکە کۆبوونەوە هەموو لایەنە نهێنییەکانیان تاوتۆی کرد، هەموو شتێکیان بەوردی دانا و هەر یەك لە شوێنی خۆیدا هەموو تۆڕەکانیان کارا کرد، لەم دوو تەقینەوەیەدا یانزدە ئەمریکی کوژران.

سی ئای ئەی بەخێرایی تیمی نارد بۆ کۆکردنەوەی زانیاری تا پشتگیری لێکۆڵەرانی ئیف بی ئای بکەن، بۆ ئەوەش جۆف ئۆکونل وەك سەرۆکی دژەتیرۆر دەستنیشان کرا، هەروا گاری برنتسن بەرەو دارسەلام چوو، هاوکات یەکێك لە دەرکراوەکانی ئیف بی ئای نێردرا بۆ نایرۆبی، بەو سیفەتەی سەرۆکی هەردوو تیمە، جۆف درکی بەوە کرد کە گرنگی سەرکردایەتی لەچی دایە، بۆیە کەسە باشەکانی هەڵبژارد تا کارمەندانی ئیف بی ئای کە ژمارەیەکی زۆر بوون بەشداری بکەن.

تەقینەوەکە بۆ ماوەی دوومانگ وەك رووداوێکی گرنگ بەسەر ئەفریقیادا زاڵ بوو، لە مانگی یەکەمەوە ئیف بی ئای کارەکانی بەشێوەیەکی رێکخراو دەکرد و لەوێدا من وەك جێگری سەرۆکی بەشی ئۆپراسیۆنەکانی دژەتیرۆر دامەزرام وەك

بەرپرسێکی دژەتیرۆر لە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالی لەناو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دەرەوەدا، هەروا بەشێکی دیکە کە مامەڵە لەگەڵ تیرۆرستەکانی نەتەوەی ئاری و توندڕەوەکانی ژینگە.

کارەکەی من لە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالی جەختی لەسەر چەمێکی سانا دەکردەوە بۆ چارەسەرکردنی ئاڵنگارییەکی گەورەی ئاڵۆز، هەردوو لای ئیف بی ئای و سی ئای ئەی و گەورە ئەفسەرانی هەموو باسەکانیان بۆ یەکتر دەخستە روو تا بیخەینە بەردەم سەرۆکبەشەکانی دژەتیرۆر، ئەمەش وای کرد لێکتێگەیشتن لەلایەن هەردوو لاوە دروست ببێ و هەردوو ئاژانسیش لەرووی کار و تەکنیکەوە، لەمەوەش وەك نوکتەیەك باسیان لێوە دەکرد، کە هەردوو لا بارمەتە ئاڵوگۆڕ دەکەن.

بەشی یەکەم ملکەچی ئاڵوگۆڕییەکان بوون لە ئاستێکی بەرز، وەك ئەفسەرانی سی ئای ئەی کە جۆف ئاوکونل بوو، هەروا لەلایەن ئیف بی ئایەوە دایلی واتسۆن، لەپێش چەندساڵێکیش بەرنامە دانرابوو، ئەمەو جۆف بوو بە سەرۆکی دژەتیرۆر لە سی ئای ئەی و دایلیش بوو بەجێگری کە بەڕێوەبەری ئیف بی ئای بوو، هەردوو لا پشتگیرییەکی بەهێزی سیاسی بوون بۆ ئاڵوگۆڕکردن و بەمەش تێگەیشتن کە بەهای یەکگرتن چۆنە، بۆ ئەمەش بە هۆی ئاڵوگۆڕکردنەکە هەندێك سوودیان لە پلەبەرزکردنەوە بینی، بۆیە کارمەندانی هەردوو لا درکیان بەوە کرد ئەم هاوکارییە دەبێتە هاندەرێك بۆ رەوڕەوەی پیشەکەیان، لە هەمووشی گرنگتر ئاڵوگۆڕکردن دەرگایەکی دیکەی کردەوە سەبارەت بە زانیاری و شارەزابوون.

ژمارەیەکی زۆر لە کارمەندانی ئیف بی ئای بەپێی بۆچوونی من نایاب بوون، بەمەش لویس فریــەی بەڕێوەبــەر بەتونـدی پشــتگیری لــە بەرنامــە و کارەکـانی دەکردم، بەهەمان شێوەش خاتوو تۆم بیکارد کە پێش چەند ساڵێك کارم لەگەڵـدا کردبوو سەبارەت بە کێشەیەکی سیخوڕی پشتگیری کـردم، بـەو شـێوەیە یـەکێك بووم گەورەترین پشتگیریم لێ دەکرا لەنێوان هەموویان ئەمەش وای کـرد هــەموو رێگرە بیرۆکراتییەکان لابچێ.

مایك رۆلینس سەرۆکی ئۆپراسیۆنی تیرۆری نێودەوڵەتی وەك کەسـێکی نـوێ لەناو بارەگای سەکردایەتی ئیف بی ئای بوو، لە کۆتاییدا پـاش دوو دەیــە مــن و ئەو لە بارەگای سەکردایەتیدا بووین هەتا لەرووی نووسینگە مەیدانییەکانیشـدا، ئەو سەرۆك و منیش جێگر.

مایك وا دەهاتە بەرچاو بەڕێوەبەری جێبەجێکار بێ لەنێو ئیف بی ئای، ئـەو کەسێك باڵای مامناوەندی بوو و ماسولکەکانی بەهێز بوون و گەنجێکی قۆز بوو و قژێکی نموونـەیی هــەبوو، ئــەو جلانــەی دەپۆشـی کــە کڵاویـان هــەبێ، ئــەو لــە خانەوادەیەکی کاسۆلیکی زەحمەتکێش بوو، ماتماتیکی تەواو کردبـوو، کەسـێکی زیرەك بوو و دەیتوانی هەموو راستی و رووداوەکان وەك خۆی باس بکات لە کاتی داواکاریدا، دەیتــوانی وتــاری گشــتیی بـدات، خۆشـی دەبینـی کاتێـك دەنگـی دەگەیشتە جەماوەر، بەو پێیەی کارمەندێکی ئیف بی ئایە جۆشوخرۆشـێکی زۆر هەبوو لە خزمەتی نەتەوەکەیدا.

مایك وەك جێگر مامەڵەی لەگەڵمدا دەکرد نەك وەك کەسێك پەیوەنـدی بــە سی ئای ئەیەوە هەبێ، هــەموو کـارە نوێیــەکان بەیەکــەوە بەدواداچــوونمان بــۆی دەکرد، فێری ئەوە بــووین هــەردووکمان پشــت بەیــەکتر ببەسـتین، بــەو شـێوەیە

بەخێرایی بووین بە هاوڕێ، ئێستاش هەر لێك نـزیکین سـەرەڕایی تێپـەڕبوونی دە ساڵ.

متمانەی مایکم بەدەست هێنا و فەرمانەکانیم جێ بەجێ دەکرد، هەتا ئەگەر ئەو کارە لەسەر حسێبی بیرۆکراتییەتی سی ئای ئەیش بوایـە، ئەمــەش وای کـرد رەنگدانەوەیەکی ئەرێنی هەبێ، چونکە دەبوایە وەك ئیف بی ئای کار بکـەم ئـەو کاتەی پێویست بوو، بە شێوەیەك بیانەوێ متمانەم پێ بکەن.

ئەم متمانە و رێزگرتنــە وای لــە سـەکردایەتی کـرد هـەردەم رێـزم بگـرن و ئامۆژگاریم بکەن، چونکە زیاتر لە سەد کەسی ئیف بی ئای بـەپێی رێنمایەکـەی ئێمە دەجووڵانەوە، ئەمەش وەك وەرچەخانێکی کـارگێڕی وابـوو، چـونکە پێشـتر سەرپەرشتیی ئەو خەڵکە زۆرەم نەدەکرد، بۆیە کارەکـانم ئاڵنگارییــەکی هـزری و رۆشنبیری گەورە بوو.

ئەم کارە یەکێك لە کارە قورسـەکان بـوو، لـەوێ فێـری ئـەوە دەبیـت چـۆن جیاوازی لەنێوان چەسپاندنی یاسا و هەواڵگری دەکەیت ئەو کاتەی لە مەیدانیت، لەو کاتەی چەندین بۆچـوونی هاوبـەشمان هـەبوو و بۆچـوونەکانم لــە نووسـینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالیدا دەخرایە روو، بەڵام ئەوەی قورس بوو چۆن مامەڵە هەندێك دەستخستن و کارە نیوە چلەکان دەکەیت چ لە کار و دەسەلاتەکانی هەردوو دەزگا.

سەرەتا ئارەزووەکانم لە رۆژی یەکەمدا دەستی پـێ کـرد واتــە لــە سـەرەتای ئەیلولی ١٩٩٨، بەتایبەتی ئـەو کاتـەی بروسـکەیەك لەلایـەن بنکـەی زانیـاری ستراتیژی و ئۆپراسیۆنەکان گەیشت بۆ ئەوەی کارمەندانی ئیف بی ئای لە کینیا و تەنزانیا بڵاوە پێ بکرێن.

بنکەی زانیاری ستراتیژی و ئۆپراسیۆنەکان لەژوورێکی بچووك پێکهاتبوو، کە سیستەمەکانی تەلەفۆنی سەرەتایی و تەکنیکی گوێگرتن و بینین بوو، ئەو ژوورە پڕ لەو کەسانە بوون کە هەموویان شانیان بەیەکەوە بوو بەدوای لیستەکان دەگەڕان تا ئەو تۆمەتبارە بدۆزنەوە، کە لەوانەیە ئەو کارەی کردبێ، زیاتریش گفتوگۆکان سەبارەت بە ژمارەی ئەو تەلەفۆنە بوو، کە بەرچاو نەدەوکەت، لە کاتی سەفەری یەکێك لە گومانلێکراوەکان.

ژووری بنکەی زانیاری ستراتیژی زۆر جەنجاڵ بوو وەك ئەوە وابوو ئەکتەرانی فیلمێك هەموویان دەیانەوێ دەستکەوتێك بەدەست بێنن، یەکێك لە نوێنەرانی شیکەرەوەی ئیف بی ئای وتارێکی پێشکەش کرد و پێی وابوو گومانلێکراوەکە رای کردبێ بەرەو رۆژهەڵاتی ئەفریقیا، بەمەش هەموو رێوشوێنەکان دانرا، لەپاشاندا یەکێك لە زانایانی زانیاری نوێی پێ داین سەبارەت بەو کارە دڕندەیە و بەجێهێشتنی شتێك لە گۆڕەپانی تاوانەکەیدا، هەروەها یەکێکی دیکە ستراتیژیەتی ئیف بی ئای واتە لەرووی راگەیاندنەوە خستە روو، وەك ئەوەی دوا بڕیار لەسەر تۆمەتبار بدەین، تاقیگەیەکی دروست کرد؟ راگەیاندن" خستنەرووی تۆمەتەکان؟

بەڕادەیەك لە زارەوەکانی ئیف بی ئای تێ نەدەگەیشتم هەروا زۆرجار کارمەندان وشەیەکیان بەکار دەهێنا وەك جیم برنزانی وەك وەسفێك بۆ هەردوو خۆکوژەکە، هەروا وشەیەك هەبوو تێ نەدەگەیشتم و نەم دەویست خۆم شەرمەزار بکەم، بەڵام سەیرم کرد بەشێك لەوانەش تووشی نیگەرانی بوونەتەوە سەبارەت بەو وشەیە، لەدواتردا بزانی بەشێوەزاری بۆستن گوتی "هەردوو شەهید" لێرەوەش هەموومان دامانە قای قای پێکەنین.

خاتوو جانێت رینۆ داواکاری گشتی، فران ناونستد وەك نوێنەری خـۆی نـارد بەتایبەتی لە کۆبوونەوەکانی بەیانیان، تاونستج کەسێکی چالاکی بالاکورت بـوو، بەهیچ شێوەیەك شتی پڕوپووچی قبوڵ نـەدەکرد، سـەرەتای ژیـانی پیشـەیی لـە نیۆریوك دەست پێ کردووە، ئێستاش بەو پێیەی راوێژکاری سیاسی هەواڵگرییە و نوێنەری داواکاری گشتییە سەبارەت بەهەردوو تەقینەوە لە رۆژهەڵاتی ئـەفریقیا، هەروا نەوەك بابەتەکان تێکەڵ بکات بەیەکتری واتـە لەگـەڵ فیترجیرالـد بەپرسـی راونـانی تۆمـەتباری تەقینـەوەکان بـوو تـا بیانهێنێتـە بـەردەم دادگـا، هـەروا بەڕێوەبەری ئیف بی ئای تۆم بیکـاردی نـارد وەك نوێنـەری خـۆی، چـونکە ئـەو ئافرەتە کەسێکی زۆر بەجۆشوخرۆش و زیرەك بوو، لەلایەکی دیکەوە دایل واتسۆن لەنێو بنکەی زانیاری ستراتیژی و ئۆپراسـیۆنەکان بـەدەنگی بـەرزی فەرمانـەکانی دەردەکرد و زنجیرەیەك پرسیاری لەدوای یەکتر دەکرد.

بۆ خۆم لە شوێنێك دانیشتم وەك ئەوەی شتێکی وای لەسەر نەزانم و چاودێری رۆشنبیرییە نوێیەکەم دەکرد، لە کاتێکدا بەشدار بووان لەو ژوورە بچووکە راسـتی و ژمارە و پێوانەکانیان باس دەکرد، بەشێك لەوانە تێبینییەکانیان تۆمـار دەکـرد، هەروا ئاماژەیان بە چەندین بەڵگەنامەی کارگێڕیدا بەڵام شتێکی وای لێی پەیـدا نەبوو تا ئاماژەکە بەراستی بسـەلمێنێ، تـەنیاش چـەند راپـۆرتێکی هـەواڵگریان لەبەردستدا بوو، لەوێدا تێگەیشتم کە دایـل و مایـك و فـران و چـەندانی دیکـە بیرێکی پێشکەوتوویان داناوە بۆ ناوەڕۆکـەکان، کـە زۆرجـاران بـەرزارەکی دەیـان گوت، ئەوانە لەو کۆمـەڵەیەن بەها بۆ هەواڵەکانی سەر زارەکی دادەنێن و مـنـیش لە کۆمەڵەیەکەوە هاتووم تیایدا نرخ بۆ راپۆرتی نووسراوی هەواڵگری دادەنێن.

لە چەند هەفتەی داهاتوودا هەموو ئەو شتانە فێـردەبم کـە بۆتـە هـۆی بـێ ئومێدیم تا لەبەردەم رێڕەوی لێکۆڵینەوەیەکی نێودەوڵەتیدا بین، چونکە رووداوەکە

زۆر بەهێز بوو، هاوکات ئیف بی ئای لەگەڵ سەدان کەسدا لێکۆڵینەوەیان کردووە و زۆر شوێنی قاعیدەیان پشکنیوە، لەنێو ئەمانەشدا ئاوەڕۆییەکی خانوویێك لە دارسەلام، تا بەدوای بەڵگەدا بگەڕێن، هەروا هەردوو شوێنی تاوانەکەیان شی کردەوە، جگە لەوەش بەبێ سڵەمینەوە کاریان کرد تا ناسنامەی کەسانی ناو قاعیدە بزانن و راودویان نێن.

لە سەرەتای ئەیلولدا دوو کەس لەقاعیدە دەستبەسەرکران و یەکسەر گوازرانەوە بۆ نیویۆرك و بەرامبەر بە دادگای فیدرالی کرانەوە، یەکێکیان بە ناوی محەمەد راشد داود ئەلعوهلی و ئەوی دیکەش فەڵەستینیەك بوو بەناوی محەمەد سادق عۆدە، هەروا تا کانوونی یەکەم تومەت خرایە پاڵ پێنج کەسی دیکە، کە لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری ئاسیا و دوورگەکانی قەمەر هاتبوون.

ئیف بی نای و سی ئای ئەی بەیەکەوە کارێکی باشیان کرد بەتایبەتی لە مەیداندا، بەگشتی ئەو کار و بەڵگانەی زانرا بوونە بەڵگەیەکی باش بۆ نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالی و هەواڵگری، هەمووشی بۆ ئاژانسی هەواڵگری ناوەند نێردرا، ئەمەش وای کرد لەدواترد هەموەو ئەوانەی بەو کارە هەڵسابوون دەستبەسەر بکرێن یان بکوژرێن، ئەمەو پۆلیس لە باشووری ئەفریقیا و پاکستان و کینیا لەگەڵ ئیف بی ئای و سی ئای ئەی بەشێك لەراکردووەکانیان دەستگیر کرد، لەپاشاندا سی ئای ئەی و هاوپەیمانەکانی لەم ساڵانەدا چەندین کەسیان لە ئەفغانستان و وڵاتی دیکە کوشت، کە هەڵسابوون بەو پیلانگێڕییە.

لەمەوە زیاتر جەختم لە ئیف بی ئای دەکردەوە بەشێوەیەك تەنیا یاسا بچەسپێ لە کاتێکدا دەستگیری بکەین و ئەو تاوانبارانە دادگایی بکەین،

بەتایبەتی ئەوانەی تاوانی دیاریکراویان هەبووە، ئەمەو نووسینگەی فیدرالی دەیەویت دادپەروەری بێتەکایەوە نەك خۆپاریزی، هاوکات زانیارییەکانیان دەبوایە بەهەر شێوەیەك بێت بپارێزرێت تا داواکارییە گشتییەکان لە دادگا بەکاری بێنن، لە کاتێکدا ئەوا وادەزانن هەموو شتێك هەر لەلای وەزارەتی دادە، کاتێکیش شتێك بە شێوەی هەواڵگری وەربگیرێت ئەوا لەلای ئەوان قەدەغەیە.

لە کاتێکدا نووسینگەی ئیف بی ئای لە نیۆریوك هیچ هاوکارییەکی هاوبەشی نەدا بە بارەگای سەرکردایەتی، ئەوەی زانیاری بەو شێوەیە بدات ئەوا لە گەڕەکی باشووری وەزارەتی داد لەو شارەدا خۆی دەبینێتەوە، سەرەتا ئەمەم لەلا سەیر بوو و تووشی دڵەڕاوکێی کردم، بەڵام لە کۆتاییدا تێگەیشتم بەچ شێوە پەیڕەوێك کار دەکەن، لەنێوەندی چەسپاندنی یاسادا کاتێك پەیوەست دەبێ بە هەواڵگری، ئەمە نهێنی نییە، هەروا ئیف بی ئای ئاماژەیان بە دیواری چین کرد، بەوە لێ ناگەڕێن بەڵگەکانیان تووشی پیسی ببێتەوە لەتەك کۆمەڵگەی هەواڵگری یان لەگەڵ یەکێك لەدەرەوەی نووسینگەی داواکاری گشتی، ئەمکارە لەلای من جۆرێك لە شێتی بوو، بەڵام ئەوەی زانیم ئەم چەمکە لە بەرد هەڵکەنراوە، بۆیە هیچ شتێکم نەکرد سەبارەت بەو ئاڵنگارییە، چونکە ئەو دیوارە پیرۆزە و نابێ ڕووبەڕووی ببیتەوە.

هەروا بێ ئومێد بووم لەلایەنی سیاسی نەوەك شکست بێنێ، بەتایبەت لە چارەسەرکردنی ڕاگەیاندنی جەنگ دژ بە قاعیدە، ئەمە و سەرۆك کلینتۆن لە ٢٠ ئابی ١٩٩٨ فەرمانی دا تا بە مووشەکەکانی کرۆز لە شەش شوێنی قاعیدە بدەین لە ئەفغانستاندا، هاوکات هێرش بکەینە سەر کارگەی دەرمان لە خەرتوومی پایتەختی سۆدان، دوژمن بە هۆی ئەو هێراشانە هەندێك زەرەر و زیانی پێ گەیشت لەرووی ژێرخانەوە، هەروا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ

ماوەی چەند هەفتەیەك هیچ هێرشێكی سەربازی نەكرد بەمەش قاعیدە زیاتر متمانەی بەخۆی هەبوو، پێی وابوو شتێكی وای نییە لەدەستی بدات، ئەو راستی دەكرد، چونكە هیچ بەرپەرچدانەوەیەكی سەربازی ئەمریكی نەبوو تا جێی پەنجەی دیار بێ، تەنیا ئەوە نەبێ ئەمریكا راوی ئەوانەی دەنا، كە تێوەگلابوون لە هەردوو تەقینەوەكە تەنیاش چەند جارێك ئۆپراسیۆنی شاراوەی دیاریكراوی ئەنجام دەدا، بۆیە كۆشكی سپی و كۆنگریش پێیان وابوو هەردوو هێرشەكەی سەر باڵیۆزخانەكانمان بابەتێك بوو بە چەسپاندنی یاسا نەك راگەیاندنی جەنگ.

ئەمەم لەگەڵ مایك رۆلینس باس كرد، ئەویش بەگشتی پشتگیری تەواوی لە راگەیاندنی جەنگ كرد، بەڵام نیگەران بوو لە جۆری ئەو ململانێیە، ئەمەو لەلایەن ئیف بی ئای بێ ئومێد بوون، چونكە هیچ بابەتێكی دادگایی لە ئەفغانستان نەهاتە ئارا، هەروا ناتوانن هیچ كارێك بكەن تا ئەم هێرشانە بووەستێنن، راستە یاداشتی گرتنی ئوسامە بنلادن و ئەوانی دیكەیان هەبوو، بەڵام سوودی چییە؟

ئەمە جاری یەكەم بوو دركم بەوە كرد، كە ئەم جەنگە گۆڕانكاری بەخۆیەوە دەبینێ، هەروا حكومەتی ئەمەریكی ئامادە نییە تا لەدوژمن تێ بگات و بكەوێتە جەنگ لەگەڵیدا بەتایبەت لەو ژینگەیە نوێیەدا، چونكە چەسپاندنی یاسا و كاری شاراوە و هێزی سەربازی وەڵام نییە و بەتەنیا سەرناكەوێ، سزای ئابووریش كاریگەریەكی ساكاری دەبێ، هاوكات دیبلۆماسیەتیش لەگەڵ قاعیدە مەحاڵە.

ئەی رۆڵی هەواڵگری؟ پێویستە پەرەی پێ بدرێ، هەروا هەڕەشەكان دیاری بكات و بزانێ هێزەكانی دوژمن چین بەرامبەر بە هێزی ئەمریكا، بەتایبەتی هێرشكردن بۆ ناو وڵاتەكەمان.

خەونەکانم لەگەڵ هاتنی تشرینی دووەمی ١٩٩٨ پەرشوبڵاوەیان کرد، کاتێك لە سیخوڕێکی تاکلایەنەی سی ئای ئەی بووم بە بەڕێوەبەری جێبەجێکار لە ئیف بی ئای، هەروا پرسیارم لە یەکێك لە شیکەرەوەکانی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالی کرد و گوتم "دۆخی لێکۆڵینەوەکانی ئێف بی ئای چۆنە سەبارەت بە هێرشی قاعیدە لەناو ئەمریکادا؟".

-نازانم

-ئەی کێ دەزانێ؟

-تەواو دڵنیا نیم یەکێك بزانێ.

-بۆچی دڵنیا نیت؟

-چونکە ئێمە دەزانین هەموو نووسینگە مەیدانییەکان چی دەکەن.

-چۆن بزانین؟

"ساسال" بەبێ دوودڵی وەڵامی دامەوە.

لەپاش هەفتەیەك هاتەوە و گوتی "پێم وایە لەنێو ویلایەتە یەکگرتووەکان پێنج سەرەداومان هەیە، بەڵام دڵنیا نیم".

بەرەو نووسینگەکەی مایك ڕۆیشتین و هەموو شتێکمان پێ ڕاگەیاند، هەروا باسی هەموو هەوڵەکانی ئەو چەند مانگەمان کرد، کە کارەکان زۆر بەلاوازی بەڕێوە دەچێ بەتایبەتی نووسینگەکانی ئیف بی ئای شکستی هێناوە سەبارەت بە کۆکردنەوەی زانیارییەکان، بە شێوەیەك ئێف بی ئای بۆتە گاڵتەجاڕێك لە وەڵامدانەوەی هەر تاوانێك، پێویستە ئاژانسەکە کارا بکرێتەوە، هەروا قاعیدە هیچ تاوانێکی لەناو ئەمریکادا ئەنجام نەداوە، واتە گۆڕەپانی تاوان بوونی نییە یان قوربانییەك نییە بۆیە هیچ لێکۆڵینەوەیەك نییە، کاتێکیش لێکۆڵینەوە نەبوو،

هیچ تۆمارێکی نووسراو نییە، واتە شتێك نییە ئیف بی ئای بەشدار بێ لەگەڵیدا، بێگومان ئەمەش جیایە لەگەڵ کۆمەڵگەی هەواڵگریدا.

ئێف بی ئای لە رۆژی یەکەمدا ئەو قسە زارەکیانەی بەرز نرخاند بەتایبەتی لەو کاتەی لە بنکەی زانیاری ستراتیژی و ئۆپراسیۆنەکان بووم، چونکە بەزارەکی قسەم کرد و لەلایان زۆر گرنگتربوو لەوەی بینووسم، هۆکارەکان زۆرن، یەکێك لە کارمەندە تایبەتەکان لاری هەبوو لە نووسین، پێی وابوو بە نووسین لەوانەیە ئاشکرا بێ، لەلایەن هەر پارێزەرێك کە لە داهاتوودا بەرگری دەکات، دەتوانن لێکۆڵینەوەکە نەرمتر بکەن، بەتایبەتی ئەگەر نەنووسێ، واتە هیچ رەشنووسێکی فەرمیان نییە تا بەرزی بکەینەوە بۆ سیستەمی داتاکان، ئەوانە بۆ ئەوە دانەنرابوون راهێنانیان پێ بکرێ بۆ نووسین، ئەو رۆشنبیری کارمەندەکان لەنێوەندی لێکۆڵینەوەکان و پێشبینیەکان بەرزترە لە نووسین و شیکردنەوە، کاتێك باسی نووسینت دەکرد پێیان وابوو ئەمە کاری شیکەرەوەکانە بەشێوەیەکی گشتی بۆیە نووسین با بۆ خەڵکی دیکە بێ.

لەبەرامبەر ئەمەدا بەشێکی کەمی ئەفسەرانی ئۆپراسیۆنی سی ئای ئەی خۆیان دەدزنەوە لە نووسینی راپۆرتەکان، بەڵام زۆربەیان لەسەریانە بەخێرایی بنووسن، چونکە بابەتە پیرۆزەکە ئەوەیە بەسەرۆکی رابگەیەنیت لەتەك گەورە پیاوانی سیاسەت، بەتایبەتیش راپۆرتە شاراوەکان، هەروا کاتێك ئەفسەرانی سی ئەی ئای نووسینەکانیان روون بێ ئەوا بەرز دەنرخێندرێ.

جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان سی ئای ئەی و ئیف بی ئای بەتایبەتی بەپێی سیستەمەکتانیان، هاوکات شیکەرەوەی ئیف بی ئای دەتوانێ هەموو شتێکی کارمەندەکان وەك خۆی وەربگرێ، تەنیا ئەگەر سەفەر بکات بۆ

نووسینگەکەی دیکە و لەگەڵ هاوڕێیەکانی لەکاردا بێ، بۆیە هیچ بژاردەیەکی نییە تەنیا ئەوە نەبێ لەبەرامبەریدا قسە بکات، بۆیە ناکرێ ئیف بی ئای ئاژانسێکی کارا بهێنێتە کایەوە، ئەگەر بەو شێوەیە بێ؟ لەبەرامبەر ئەمەشدا سی ئای ئەی هەموو شتێك دەنووسێ، هیچ شتێك نییە بەبێ راپۆرتی نووسراو، لەپاش ئەوەی دەنێردرێ ئەو کات شیکەرەوەکان کاری لەسەر دەکەن یان دەگاتە دەست یەکێك لە سیاسییەکان، چونکە سی ئای ئەی لەبنەڕەتدا سیستەمی زانیاری خێرای بەخۆیەوە گرتووە، هەردەم ئەو سیستەمەش بەرەو نوێبوونەوەی بەردەوام هەنگاو دەنێ.

جیاوازی سێیەم پەیوەستە بە قەبارەوە، ئەمەو ئیف بی ئای قەبارەیەکی گەورەی هەیە، کەچی سی ئای ئەی چەندین کەسی ناردووە بۆ لێکۆڵینەوە لە هەردوو تەقینەوەکەی ئەفریقیا، ژمارەی ئەفسەرانی تۆپراسیۆنی سی ئای ئەی زۆر نین لە هەموو کیشوەری ئەفریقیادا، کەچی نووسینگەی ئێف بی ئای لە نیۆریۆرك ژمارەیان زۆر زیاترە لە سی ئای ئەی کەچی ئەمەی دواتریان لە هەموو جیهاندا پەرتوبڵاوەیان لێ کردووە، لەتەك ئەمەدا ئێف بی ئای تەنیا دوو کارمەند دەنێرێ بۆ کارێك ئەمەش وەك هاوبەشی یەکتر، کەچی ئەفسەرانی سی ئای ئەی بەتەنیا خۆیان کار دەکەن و دەتوانن هەموو سەرچاوەکانیان بپارێزن و جوولەیان پێ بکەن.

جیاوازی چوارەم سەبارەت بە گرنگی سەرچاوەکانە و هەڵوێستوەرگرتنە، هەرودوو لایان بەهایەك بۆ سەرچاوەی باش دادەنێن، ئەمەو ئێف بی ئای چاودێری سەرچاوەکانی دەکات بەبێ ئەوەی لێکۆڵینەوە هەبێ و دەیەوێ دەستی بگاتە سەرەداوەکان تا بگات بە شایەد ئەمانەش زۆرجاران هەواڵدەرن و ناچاردەکرێن تا هاوکاری لەگەڵ دەزگاکە بکات زۆرجاریش بەشێوەیەکی خراپ

کارەکـان دەکـەن، بـەڵام گفتوگـۆی بـەردەوام دەکـەن بەشـێوەیەکی درێژخایـەن، زۆرجاریش سەرچاوە و گۆمانلێکراوەکە یەك شتن لەنێو ئێف بی ئای.

کەچی ئەفسەرانی سی ئای ئەی لەلایـەن خۆیانـەوە وەك رۆتینێـك بۆچـوونی خۆیان دەردەبڕن سەبارەت بە دۆزینەوەی سەرچاوەیەك و چۆنیەتیی هەڵسەنگاندنی و لەپاشـاندا جوولـەی پـێ دەکـەن، نـرخیش بـۆ کارەکانیـان دادەنـێن، بـەهیچ شێوەیەکیش سەرچاوە دیاریکراوەکان ئاشکرا ناکرێن، کـاری ئـەو ئەفسـەرانە لـە ئۆپراسیۆنەکانیان هەست بە دەسکەوت دەکەن، بەڵام کارمەندانی ئێـف بـی ئـای بەڵگە و شایەدیان دەوێ، بۆیە زۆرجـار ئـەو شـایەدانە رێگریـان لـێ دەکـرێ تـا کۆنفرانسی رۆژنامەوانی ئەنجام بدەن.

جیاوازی پێنجەم پەیوەستە بە پارەوە، لەلای ئێف بی ئـای کارەکـان قورسـە سەبارەت بەو پارەیەی کە خەرجی دەکەن یان چـۆن خـەرجی دەکـەن، رەزامەنـدی پارەپێدان کارێکی قورسی دەوێ بەتایبەتی ئەگەر هەواڵدەرەکە بیەوێ سـەفەر بـۆ شوێنێك بکات لەپێناو بەدەستکەوتنی زانیاری و یان هەر بابەتێك پەیوەسـت بـێ بە کێشەیەکەوە، من وەك ئەفسەرێك لـە سـی ئـای ئـەی بەشـێوەیەکی رۆتینـی هەزاران دۆلارم لەلایە بەو پێیەی پێویسـتییەکی هەنووکەییـە بەتایبـەتی کاتێـك دەمـەوێ ئامـانجێکی پێشـبینکراو تەجنیـد بکـەم، هـەروا قـەرەبووی هـەموو سەرچاوەکان دەکەمەوە وەك کڕینی کەرەستە و بەکرێگرتنی ئۆتۆمبێـل و فڕۆکـە، هەروا بەرتیلدان بەبیانییـەکان تـا ئاسـانکاری لەلایـەن بەرپەرسـەکانەوە بکـرێ، کاتێك ئەو شتانەم بە ئێف بی ئای گوت سەیریان پێ هـات بـەوەی ئـەم شـێوازە یاسایی نییە، زۆرجاریشس ناچار دەبووم شیکردنەوە بۆ کارەکانی سـی ئـای ئـەی بکەم بەوە پێشـێلی هـیچ یاسـایەکی ئـەمریکی ناکـات، بـەڵکو پێشـێلی یاسـا بیانییەکان دەکات.

له جیاوازی شەشەم ئێف بی ئای پێی وایە دەسەڵاتی یاسایی لەدەست دایە زیاترە لەوەی سی ئای ئەی لەدەستی دایە، چونکە لەژێر دەسەڵاتی وەزارەتی داد دایە، هەروا هەندێك لە کارمەندانەکانیان لەپاش خواردنەوەی چەند پێکێك کاری سی ئای ئەیان بە نارەوەشتی دادنا بەتایبەتی سەبارەت بەشاراوەیی و فرتوفێڵەکان رەنگدانەوەی دەبێ لەسەر بۆچوونی کۆمەڵگەی ئەمریکی، پێیان وابوو دەبێ سەرۆك رەزامەند بێ و لە کۆنگرس بەشێوەیەکی یاسایی، ئەمەو بیرۆکەی پێشێلی یاسا بیانییەکان لەلای هەندێك لە هاوکارەکانی ئێف بی ئای نموونەیی بوو، هەروا لە گفتوگۆیەکدا باسم لە سوێندخواردنەکەم کرد لە دەستوور، وەك بەهای سوێندخواردنی کارمەندانی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالییە.

حەوتەم ئێف بی ئای حەزی بە رۆژنامەگەرییە و هەردەم هەوڵ دەدات سۆزی بۆ لای خۆی رابکێشێ، بەڵام راگەیاندن لەلای سی ئای ئەی قەدەغەیە، بەشێك لە ئەفەسەران رقیان لە رۆژنامەگەرییە، چونکە زۆرێك لە کارەکان لە رێگەی رۆژنامەگەرییەوە ئاشکرا بووە، زۆرجار سەرچاوەکان بە هۆی گەمەی رۆژنامەگەری مردوون، پێدەچێ رۆژنامەگەری لەسەرووەی ئەمانەوە بێ، هەردەم وێنەیەکی خراپی سەبارەت بە سی ئای ئەی هەیە، ئەمەو ئەفسەرانی ئۆپۆراسیۆن رۆژنامەگەری وەك پەتا دەبینن.

کەچی کارەکان لەلای ئێف بی ئای زۆر جیاوازە، پێیان وایە رۆژنامەگەری لایەنی ئەرێنی هەبێ لە نەهێشتنی تاوان و بەجۆشوخرۆشکردنی بەها و سەرچاوەکان، هەموو نووسینگەیەکی ئێف بی ئای راگەیاندنی هەیە.

هەشتەم بەڵگەکانی ئێف بی ئای بەتایبەت بەکاری دێنێ تا تاوانبارەکە بخاتە بەردەم دادگاوە، کەچی سی ئای ئەی زانیار و بەڵگەکان لەپێناو کەسانی دیکە کۆ

دەکاتەوە، ئەگەر بۆ سیاسییەکان بێ یان بۆ جەنگەوەرانی شەڕ و دیبۆماسییەکان یان بۆ ئەفسەرانی چەسپاندنی یاسا، بۆ ئەمەش ئێف بی ئای رۆشنبیری ئەوەی نییە خزمەت بەکڕیارەکانی بکات تەنیاش هەمووی بۆ وەزارەتی دادە، بەڵام سی ئای ئەی کڕیاری هەیە بۆ هەواڵگرییەکانی.

نۆیەم نووسینگەکانی ئێف بی ئای مەیدانی بەتایبەتی نیۆریوك بەو پێیەی بنکەی دەسەڵاتە تایبەتییەکەیەتی دەست بەسەر بەڵگە و هەواڵگرییە پێشبینیکراوە دادەنێ بە هۆی پەیوەندی بە داواکاری گشتییەوە، بەمەش داواکاری گشتی یاریزانی سیاسین لەو شاردا و کاریگەریەکی زۆریان دەبێ لەسەر لێکۆڵینەوەکان، کەچی وێستگەی سی ئای ئەی هەموو شتەکانی دەنێرێ بۆ بارەگای سەرکردایەتی، چونکە هەموو هاندانەکان لەوێوە دێن بەتایبەتی کۆشکی سپی.

دەیەم ئێف بی ئای کۆنگرس بەکار دێنێ بۆ هەموو نووسینگە مەیدانییەکانیان، ئەمانەش نوێنەری تایبەتیان هەیە بۆ پشتگیری ئەندامانی کۆنگرس، هەروا ئێف بی ئای دەسەڵاتی لێکۆڵینەوەی هەیە بۆ چالاکییەکی نایاسای ئەندامانی کۆنگرس، واتە لە هەردوو لاوە گۆچانەکەی لەدەست دایە لە مامەڵەکردن بەرامبەر نوێنەران و پیران، بەڵام سی ئای ئەی لەبەرامبەردا بەتایبەتی دەزگای شاراوە بەڕادەیەکی کەم دەسەڵاتی هەیە لەناو کۆنگرسدا، زۆرجار ئەفسەران سی ئای ئەی مامەڵەیان لەتەك ناکەن کاتێك بانگ دەکرێن وەك شایەدێك، پێم باش نەبوو ئێف بی ئای ئەم جۆرە هێزە سیاسیەی هەبێ، لەبەرامبەردا سی ئای ئەی زۆر لاوازە.

گەیشتن بەو پوختەیە لە ساڵی ١٩٩٨دا بوو، لەو کاتەی سەفەرم کرد بۆ نووسینگەکانی ئێف بی ئای مەیدانی، بۆیە ناچار بووم خۆم فێر بکەم بەتایبەت

لەرووی لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی تیرۆرستی، بۆیە هیچ روویەکی دیکەم نەبوو لەو کاتەی سیستەمی زانیارییەکانم لەم رووەوە زۆر کەم بوو.

لێکۆڵینەوەکانی ئێف بی ئای پەیوەستە بەو کار و تاوانانەی کە لە رابردوودا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان رووی داوە، ئەمەش کەموکورتییەك نییە لە کاردا بەڵکو جەختکردنەوەیە لە شوێنێکی تەسکی لێکۆڵینەوەکە، بۆ ئەمەش حەماس لە رێگەی دەزگا خێزخوازیەکانەوە پارەی کۆکردوتەوە، بەکاریشی هێناوە بۆ هێرشەکانی دژ بە ئیسرائیل، هەروا حزبی ئەڵڵا هەمان کاری کردووە، کاتێك چوومە یەکێك لە شارۆچکەکانی دیترۆیت شوشەیەکی گەورە نەخشێندرابوو بە دروشمەکانی حزبی ئەڵڵا هەمووی وێنە بوو، باسیش لەوە دەکەن حزبی ئەڵڵا چەندین ئۆپۆراسیۆنی نایاسایی کردووە لە زۆر شوێنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك فرۆشتنی شیر و بەقاچاخبردنی جگەرە.

تەنیا چەند زانیاریەکی دەگمەن هەیە سەبارەت بە قاعیدە، تەنیاش ئەو زانیاریانەی لە نووسینگەی نیۆریوك کۆکراوەتەوە ئەمەش بۆ لێکۆڵینەوە لە تاوانکاری، ژمارەیەکی کەم لە کارمەندانی ئێف بی ئای سەبارەت بە تیرۆرستی نێودەوڵەتی و چوارچێوەی جیۆسیاسی جیهانی دەزانن.

ئەوانەی ئەم شتانەیان دەزانی بە هۆی ئەوەوە بوو کە بەرپرسیاریەتی ناوچەی باشووری ئەمریکا دەتوانن لەرووی یاسا ییەوە راوی قاعیدە بنێن، ئەمەش پەیوەندی بەکارمەندی تایبەت جۆن ئۆنیلەوە بوو، چونکە هەتا کۆتایی لەگەڵ ئەو باسانە دابوو ئەو هەردەم حەزی بە زیاتر خەرجکردنی پارە هەبوو لەبەرامبەر ئەو هەڕەشەیەی قاعیدە دەی کرد، بۆیە بەجۆشوخرۆشەوە راوی دوژمنەکانی دەنا بەتایبەتی شێوازە بیرۆکراتییەکانی بۆ دەست بەسەرداگرتن و هێرشبردن دژ

بەدوژمنەکان، بۆیە ئەمە وای کرد جۆن لەنێو حکومەتی ئەمریکیدا بەرامبەر دوژمن ببێتەوە.

لەنێوان دوو هەفتەدا زۆرجار بەرانبەر یەکتر هاوارمان دەکرد سەبارت بەو باسانە، کارەکە پێکەنیناوی بوو کاتێك بەراستی لەیەکتر تورە دەبووین، ئەمەی خوارەوەش گفتوگۆیەکی نموونەییە:

جۆن لە رێگەی تەلەفۆنەوە گوتی : تۆ ئەی کوڕی سی ئای ئەی، بەنەفرەت بیت بەڵگەکانمان لێ دەشاریتەوە، دەبێ دەستگیرت بکەم، بەتاوانی رێگریکردن لە دادپەوەری.

"من بۆ ئێف بی ئای کار دەکەم نەك بۆ سی ئای ئەی، ئایا دەتەوێ دەستگیرم بکەی؟ وەرە ئێرە و هەوڵ بدە، ئەو کات نیشانە و دەمانچەکەت لەناو دەمە نەفرەتییەکەت دەکەم".

"بەنەفرەت بیت، من دەزانم تۆ سەرچاوە و ماددەی هەواڵگریت هەیە، کە پەیوەستە بە کێشەکەم".

"هەر زانیاریەکی سی ئای ئەی هەبێ بۆ تۆم ناردووە، تۆش چەندین ئەفسەرت هەیە لە ئاژانسەکەتدا کار دەکەن، بۆچی ئەو شتانەم بۆ نانێریت کە لەلاتە؟ ئەمەش شیکردنەوەیەکی هاوبەش دروست دەکات، لەوانەیە باشتر بێ لە هەواڵگری، زۆر پەیوەندی بەبابەتەکەوە هەبێ و وردتریش بێت".

"ناتوانم ئەو کارە بکەم، ناتوانم رێگە بدەم دادگا لێم بپرسێتەوە، پێویستە پشتگیریم بکەن".

"ئێمە پشتگیریت دەکەیت، ئەی کەرە".

"بەپێی پێویست نییە".

"جۆن، هیچ کاتێك بەتەواوی بەپێی پێویست نییە".

"ئەمە راستە، ئەها لە کۆتاییدا درکی پێ دەکەیت".

"بەراستی تۆ بەڵایەکی گەورەی".

"بەڵێ، ئەوە منم، وەرە نیۆریوك، داوەتی پارچەیەك گۆشتت دەکەم، تەنیا شتێکی بەسوود لەگەڵ خۆتدا بێنیت".

"بە مەرجێك شتێکم پێ ببەخشیت".

"بەڵێ، پارچە گۆشتێکی باش".

ئێف بی ئای چەندین پاشکۆی یاساییان هەیە بەتایبەت لە وڵاتە ئەوروپییەکان، لەوێدا دەتوانن هاوکاری بکەن لەگەڵ ئاژانسەکانی چەسپاندنی یاسا، کە زیاتر ئاراستەیان رۆژئاواییە، بۆ ئەمەش واتسۆن و رۆلینس درکیان بەوە کرد کارەکانیان فراوان بکەن بۆ ناوچەکانی دیکە، هانم دان، چونکە باشترین هەواڵگریمان هەیە و باشترین رێبەرمان لەوێدایە، ئەمەش لەلایەن هاوپەیمانەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیایە، بۆ ئەمەش دەزگای کینی و تەنزانی لەکاتی هەردوو تەقینەوەی ١٩٩٨ خۆیان سەپاند.

لە کاتێکدا ئێف بی ئای هەردەم هەوڵی داوە هاوبەشییەکانی توندتر بکات لەگەڵ دەزگاکانی چەسپاندنی یاسای بیانییەکان، بەڵام دەیویست سەرچاوە تایبەتییەکانی بجولێنێ، هەندێکجار بەشێوەیەکی نهێنی، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە پیشەکەیان، بۆ ئەمەش بەشێوەیەکی رۆتینی هێڵی کراوەی تەلەفۆنیان بەکار هێنا، هاوکات نووسینگە مکوڕ بوو لەوەەی هەر باسێك پشتگیری کێشەکەی

کرد، ئەوا بە هیچ شێوەیەك ناکرێ ئۆپراسیۆنێکی هەواڵگری بێت، هەروا ناکرێ هیچ هەماهەنگییەك لەگەڵ کەسدا بکرێ، بەو شێوەیە چارەنووسم بەردەوام بوو، لەنێوەند ئەو قوڕاوەدا.

چەند گرفتێك لەگەڵ هاوبەشەکانمان لەدەرەوە رووی دا، ئەمەش لەلایەن مایکەوە ئاشکرا بوو کاتێك لە ساڵی ١٩٩٩گەشتێکی بۆ ئیسرائیل کرد وەك نوێکردنەوەیەك بۆ زانیارییەکانی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا و هەڵسەنگاندنی هەڕەشە یەك لەدوا یەکەکان کە قاعیدە دەیهێنێتە ئارا بەتایبەتیش لە رۆژهەڵات، زیاتر ئیسرائیلییەکان هەواڵگرییە سەربازییەکانیان دژ بە حزب ئەڵڵا بوو، نەوەك قاعیدە، ئەمەش هەڕەشەیەکی راستەقینەیە، مایك ئەمەی بە چاوی خۆی بینیووە کاتێك بەدەوری سنووری باکووری لوبناندا سوڕابۆوە، ئەمەو "شین بت" کە دەزگای هەواڵگری ناوخۆییانە زیاتر ترسی لە حەماس هەبوو، هاوکات قاعیدە زۆر لەلا گرنگ نەبوو.

بەریتانییەکان کارەکانیان بەکوالیتییە، بەڵام ئەو کوالیتییە نییە، کە مامەڵەی پێوە دەکەن، یەکێك لەو کێشانەی هەیانە هەڕەشەی رادیکالییە لەنێو سنوورەکەیان، هەروا ئێستا ناتوانم بیژمێرم کە چەند جار بەریتانییەکان سەبارەت بەدژەتیرۆر وانەیان گوتەوە، ئەوەی کە تیایدا سەرکەوتوون لە ئێرلەندای باکوورە، لەگەڵ مایك گەیشتینە ئەو بۆچوونەی کە ئێف بی ئای مەیدانی نیۆریۆك و بنکەی دژەتیرۆر هاوکارمانە، ئامانجی بەریتانییەکان تەنیا گەیشتنیان بە هەواڵگرییە و گوتنەوەی وانە سەبارەت بە رێگەکانی جێبەجێکردنی ئۆپراسیۆنەکانە، نەك هاوبەشیمان بکەن لە زانیارییەکان، هەروا لەتەك هەوڵی هاوبەش نەبوو، هەروا بە مایکم گوت ئینگلیزەکان تەنیا نەخشەیەکی دانراویان هەیە تا هەرچۆنێك بێ پەیوەندیان لەگەڵ ئەمریکییەکان هەبێ، تەنیاش

توێژینەوەی دۆخی خۆیان باس دەکەن، کـە چـۆن لـە هـەردوو جـەنگی جیهانیـدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، کە چۆن توانیویانە کاریگـەریان لەسـەر کۆشـکی سپیسش هەبێ.

بە مایکم ڕاگەیاند من کارێکی باشت بۆ دەکەم، دۆخم باشـە ئەگـەر لەگـەڵ ئەفریقی و عەرەب و لاتینی و ئاسییەکاندا کار بکەم، ئـەوان زیـاتر گرنگـی بـەو بابەتە دەدەن و لەتەك ئەو باسەن لە زۆر حاڵەتەکاندا و هاوکاریمان دەکەن، هـەروا خواردنی ئەوان خۆشترە.

مایك و چەند کەسێکی دیکە پێیان ڕاگەیاندم تەنیا کارەکە چەسپاندنی یاسا نییە، بەڵکو ئاژانسەکەم سی ئای ئەیش دەگرێتەوە، چـونکە سـی ئـای ئـەی بـە بۆچوونی ئێف بی ئای کەسانی لووتبەرزن، زۆر بەکەمی ئەفسەرانی سی ئای ئـەی شکست دەهێنێ لە درکپێکردنی بەڵگەیەك، بـۆ ئەمـەش جارێکیـان یـەکێك لـە سەرۆکەکانی وێستگەکان ماددەیەکی بەهاداری دەستکەوتبوو لە یەکێك لـەدەزگا ناوخۆیەکانی وڵاتێك، کەچی فرێی دابووە ناو لۆکەڵێك چەند مانگێك وا مـابۆوە، لەدواتردا شیکەرەوەیەك ئەوەی بۆ ئاشکرا بوو بـوو کـە دانەیـەکی لـەو بابەتـەی ناردووە بۆ ئێف بی ئای، پێیانی ڕاگەیاند بوو کە زانیارییەکی هـەواڵگریمان بـۆت ناردبوو، هەموو ئەمانە کێشەی دروست کرد، بەڵام من خۆم خستە ناوباسـەکەوە، بـەو مانایـەی ئەگـەر بەدروسـتی کارەکـان نەکـەیت، ئـەوا زۆرێـك لـە دەزگـا دەرەکییەکان یاری بەململانێی نێوان ئێف بی ئای و سی ئای ئەی دەکەن هـەموو ئەمانەش بۆ بەرژەوەندی خۆیان، نموونەش لەمبارەیەوە بەریتانی و ئیسـرائیلیەکان ئەم گۆشەیان بەشێوەیەکی ڕێکخراو وەك هەلێك قۆزتەوە.

ئێف بی ئای زۆر شتی فێر کردم بەتایبەتی ئاوێتە بوون لەگەڵ ئاژانسەکانی دیکە، زۆرجاریش ئەو ئاژانسە کۆمەڵە ئاسایشێکی هەیە بۆ دژەتیرۆر، پشتیشیان هەیە لەناو ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، ئەمەو پێکهاتەی کۆمەڵەی ئاسایش بۆ دژەتیرۆر لە بەرێوەبەرە جێبەجێکارن لە نێو کۆمەڵگەی دژەتیرۆردا، ئەمانەش هەماهەنگی لەمەڕ سیاسەت دەکەن، کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دایدەنێ و جێبەجێی دەکات، هاوکات لەلایەن ریچارد کلارك راوێژکاری سەرۆك بۆ کاروباری دژەتیرۆر سەرۆکایەتی دەکرێ، ئەو هەڕەشەکەی وەکخۆی وەرگرتبوو بۆیە داوای کرد هاوکارییەکی زیاتر لەنێو ئاژانسەکاندا بێتەکایەوە، هەروا دژ بەهەموو ئەوانە بوەستنەوە کە بێ ئومێدتان دەکات، بۆیە کارەکان هەموو جۆرێك لە بێ ئومێدی بەخۆیەوە بینیووە، لەوانەشە هەموو ئەمانە تەنیا لەدروستبوونی هێزێکی لابەلا دێتەکایەوە، هاتنەکایەوەی ئەم بابەتەش بە هۆی هەڕەشەی گەورە و بیرۆکراتیەتیەتە دەبێ گۆڕانکاری بەسەردا بێ.

لە ئێف بی ئای بەوە گەیشتم خۆیان لەسەرووی یاساوە دەزانن چونکە خۆیان بە چەسپاندنی یاسا و سیستەمی سیاسی فراوان دەزانن، ئەمەو دەسەڵاتی یاسا بەردەوامە، بەڵام ئەوەیان لەبیر چووە کە کۆمەڵگەی چەسپاندنی یاسا لە ئێف بی ئای تا دەگاتە پۆلیسی ناوخۆیی، پەیوەستە بە کۆمەڵگەی مەدەنیەوە لەتەك کۆمەڵگەی هەواڵگری.

پێدەچێ بەکەمی سەیری کۆمەڵگەی مەدەنی و کۆمەڵگەی هەواڵگریم کردبێ، هەروا پەیکەری ئاسایشیی نەتەوەیی و گۆڕانکاریەکانم بەکەم زانیبێ، چونکە ئێمە تەنیا لەنێو سنووری خۆمانین، بەڵام ئایا بەخێرایی خۆمان دەگونجێنین؟ ئایا جارێکی دیکە هێرشێکی دیکە دەکرێتە سەرمان؟ ئایا دەتوانین رێگری بکەین لە کارەساتێکی دیکە لەسەر خاکی ئەمریکادا؟

## هونەری سیخوڕی

به رۆلینسم راگەیاند دوای ئەوەی دوای ساڵێك لە ئێف بی ئای مامەوە، لەو کاتەی من دەچووم بۆ بنکـەی دژەتـیرۆر، چـونکە لەوێـدا بـە سـیفەتی جێگـری سەرۆکی بنکەکە کار دەکەم، لەوێدا باسی ئەوەم کرد کە بەرپرسیاریەتی دژەتـیرۆر لەئەستۆ دەگرم، هەروا باسی ئەو بەهایەم کرد کە لە داهـاتوودا بەدەسـتی دێنـیٚ لەگەڵ مندا، لەوێدا سوپاسـم کـرد چـونکە ئـەو و ئێـف بـی ئـای زۆر بـەجوانی مامەڵەیان لەگەڵدا کردووم.

بەشێك لە هاوکـارانی ئێـف بـی ئـای باسـیان لـەوە کـرد کـە لێـرە درێـژە بەخزمەتکردن دەدەم، بۆیە زۆر لەوانە راهێنانیان پیٚ کردم، زۆر بەباشیش گوێیـان بۆ ئامۆژگارییەکانم دەگرت، کە زۆربەیان هاندان بوو.

کاتێك ویستم بچم بۆ بنکەی دژەتیرۆر رۆلیسن پێی خۆش نەبوو، پێی وابـوو ساڵێکی دیکە لەگەڵیدا دەمێنمەوە، بەڵام کاتێك فەرمانی بەرێکردنم درا لە ئێف بی ئای بەگەرمییەوە ماڵئاواڵاویان لیٚ کردم و دیاریەکیان پێشـکەش کـردم، کـە ئێستا لەلام ماوە، هەروا پۆستەرێکی پێکەنیاویان پیٚ دام، کە باس لە تۆمەتەکان دەکەم و نووسرابوو "پیلانگێران بۆ رووخاندنی بیرۆکراتی و کوشتنی هـەموو ئـەو بۆچوونانەی، کە لەمێژە کۆتاییان پیٚ هاتووە".

هەر لەنێو ئەو پۆستەرەدا ئاماژە بەوە کرابوو کە کەسێکی چەتوونم و قژم پڕە و چاوەکانم چاوی شێتەکانە.

هەروا چەندین سەرنجیان نووسی بوو بۆ ئاگادار کردنەوە، کە دەبێتـە مایـەی تووڕەبوون، بۆیە دووبارە مەیلێنەوە، تا ئەو کاتەی وەڵام وەردەگرن.

لەلایەکی دیکەوەش پاداشتی دەستگیرکردنم دەگەیشتە پێنج ملیۆن روپیـەی پاکستانی.

## بەشی هەشتەم

# بنکەی دژەتیرۆر

پێداویستییەکان، هۆیەکە بۆ تووشبوون بە ترسناکییەکان...

-مارتن توین- ژیانی قورس

بنكەی دژەتیرۆر لە كۆتایی نەوەدەكان بەشێك بوو لە سی ئای ئـەی، لـەپاش دە ساڵ لە بوونی، تەنیا پشتی بە هـەواڵگری نەدەبەسـت بـەڵكو بەشـێكی زۆری پەیوەندی بە كاری شاراوە بوو، منیش لـەو كـارەدا شـارەزاییەكی باشـم هـەبوو، بەتایبەت لە كاتی كار و راهێنانم لە ئەفریقیا، چونكە لەو سەردەمەدا ئەمریكا و یەكێتیی سۆفیەت جەنگی گەورەیان لەنێوەندی جەنگی سارد ئەنجام دابوو، كەچی من شارەزایەكی ئـەوتۆم لـە جـەنگی سـاردا نـەبوو، چـونكە لەوێـدا ئەفسـەری ئۆپۆراسۆنی زانیارییەكان و ئەفسەرێكی نیمچە سەربازی نەبووم.

لە هاوینی ١٩٩٩ لە ئێف بی ئای سەبارەت بە سیاسەتی دژەتیرۆر زانیـاریم بەدەستكەوت، زیاتر لەوەی لە سی ئای ئەی فێری بوو بووم، بەتایبەتی سـەبارەت بە چەسپاندنی یاسا و كاری شاراوەی نێو دژەتیرۆردا هەروا چۆنیەتی هاوكاریكردن لەنێوان ئاژانسەكان، بەڵام من زیاتر جەختم لە كاری مەیدانی دەكردەوە بەتایبەتی پەیوەندی نێوان هەواڵگری و كاری شـاراوەیی، كـاتێكیش بـەرێ كـرام بـۆ كـارە نوێیەكەم بە هۆی چڕی توێژینەوە بوو سەبارەت بە مێژووی تیرۆرستی نوێ و كاری شاراوە و بنكەی دژەتیرۆر.

لە ساڵانی نەوەدەكاندا چەندین رەوتی چـەپی فەلەسـتنی هاتنەكایـەوە، كـە لەلایەن لیبیا و سۆفیەت و هەندێك دەوڵەتی هاوپـەیمانی وارسـۆ پشـتگیریان لـێ دەكرا، بۆ ئەمەش چەندین فڕۆكەیان رفاند و هێرشیان كردە سەر فڕۆكەخانـەكان و سەدانیان كوشت، زۆرجاریش هەندێك كۆمەڵەی ئەورووپی رادیكـالی پشـتگیریان لەگەڵ سوپای سووری ژاپۆنی دەكرد، بۆ ئەمەش چەندین پیشـەوەری پیشەسـازیی

ئەورووپیان رفاند، جگە لەوەی چەندین هاوولاتی ئـەمریکی لەسـەر دەسـتی ئـەو کۆمەلانە کوژران.

لە سالی ۱۹۷۹ ئێران تۆمەتبار کرا بـەوەی لـە رێگـەی بـەکرێگیراوی وەك حزبی ئەللا تیرۆر دەهێننە ئاراوە، لە نیسانی ۱۹۸۳ حزبی ئـەللا تۆمـەتبار کـرا بەوەی بالیۆزخانەی ئەمریکی لە بەیرووت تەقاندۆتەوە و لەوێدا ٦٠ کەس کوژرا، زیاتریش وێستگەی سی ئای ئەی زۆری نـەمابوو بەتـەواوی بڕوخێـت و هـەموان بکوژرێن، بەرکەوتیش یەکێك لە رزگاربووەکان هاوکاری خولم بوو لـە "کێلگـە"، پێشتر لە بالەخانەکە چووبووە دەرەوە، زۆر بەباشـی لەبیرمـە چـۆنی دەگێڕایـەوە، کاتێك بەخێرایی گەڕابۆوە بەدوای تەرمەکاندا دەگەڕا، لەتـەك ئـەوەی دەیویسـت هەموو ئەو شتانە هەلبگرێتەوە، کە بابەتی نهێنین، لەلایەکی دیکەوە حزبی ئەللا لە تشرینی یەکەمدا دەزگایەکی ئەمریکی لـە لوبنـان تەقانـدەوە و لەوێـدا ٢٤١ سەربازی ئەمریکی کوژران و لەنێویاندا ٢٢٠ سەربازی مارێنز.

تیرۆری نێودەولەتی بەرەو زیـادبوون هـەنگاوی دەنـا، بـۆ ئەمـەش دەبوایـە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەوالگرییـەکی باشـتری هـەبێ تـا بەباشـتر بەرپەچـیان بدرێتەوە، ئەمەو لە سالی ۱۹۸٥ سەرۆك رێگـن داوای کـرد کارێـك بکـرێ، بـۆ ئەمەش جێگرەکەی سەرۆك بۆش دەبلیو بۆش بوو، کردی بـە سەرپەشـتیاری سـی ئای ئەی تا هەموو دەستپێشخەرییەکانی لەدەستدا بێ.

بۆش لێژنەیەکی بە سەرۆکایەتی خۆی دامەزراند لەوێـدا ئـەو لێژنـە بالایـە چۆنیەتی لاوازی هەوالگریان دەستنیشان نـەکرد، وەك چـۆنیەتیی تێگەیشـتن لـە دوژمن و بەرپەرچدانەوەی، ئەمەش هیچ جیاوازییەکی نەهێنا کایەوە، واتە تـەنیا یەك کیان لەنێو حکومەتێك تا بەرپرس بێ بۆ رووبەڕووبوونەوەی تیرۆر، لەپاشاندا

بنکەیـــەکیان دامەزرانـــد بـــۆ کۆکردنـــەوەی زانیارییـــەکان و شـــیکردنەوەی هەواڵگرییەکان، بەڵام کاری شاراوە ڕێگەیەك بوو تا بەهێز وەڵامیان بدرێتەوە.

سی ئای ئەی لەسەر ئەو بنەمایانە مامەڵـەی دەکـرد، ئەمـەو لـە شـوباتی ١٩٨٦ بنکەی دژەتیرۆریـان دامەزرانـد، ئـەویش دەبێتـە تـەوەرێکی بـەهێز بـۆ بنبڕکردنی تیرۆر، بنکەی دژەتیرۆر و کارمەند و شـیکەرەوەکانیان هـەموو تێکـەڵ کرد، تا بەتەواوی لە هەڕەشەکە تێ بگەن، تـا هەرهـەموویان دوژمنەکـە دیـاری بکەن و ڕاودویان بنـێن تـا شکسـت دەهێـنن، دیـارە هـەر هـەموو ئـەو کارانـە مکوڕبوونی وەزارەتی دەرەوە بوو ئەمەش بە هەماهەنگی لەگەڵ وێستگەکانی سی ئای ئەی، زۆرجارانش لەگەڵ هاوبەشە دەرەکییەکان لە هەموو جیهاندا.

لە سەرەتادا بەشەکانی دەزگـای شـاراوەی جـوگرافی بەرامبـەر بـەم کارانـە بوونەوە، وەك ڕەتکردنەوەیەك بۆ بیرۆکراتی لەنێو ململانێیەکی لەسەر کەرەستە و کارەکـان، بـەڵام زۆری نـەبرد راهـاتن، چـونکە کەسـانێك هـەبوون شـارەزایان لەمبارەیەوە کەم بوو کەچی دەنێردران بۆ دەرەوە، بۆیە بنکەی دژەتیرۆر تەنیا وەك نووسینگەیەك وابوو و ئەنجامی کەم بوو، بـەڵام لـەدوای سـێ سـاڵدا ئـەو پـەردە ئاسنینە لابرا، بۆ ئەمەش جەنگە ساردەکان بەگوڕتر بوون بۆ من و زۆربـەی ئـەو کەسانەی لە سی ئـای ئـەی دابـوون، بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی سـوپای سـوور یـان شۆڕشگێرە ئێرانییەکان.

لەلایەکی دیکەوە هەموو ئـەو کۆمەڵـە سیاسـانەی مەبەسـتیان تـیرۆر بـوو چەندین پلانی نوێیان داهێنا و لە جیهاندا بـەرەو فراوانـی هـەنگاویان نـا، بۆیـە بنکەی دژەتیرۆریش بەرەو پەرەپێدان ڕۆیشت بۆ هاوشانبوونی ئەو هەڕەشـەیە، بـۆ ئەمـەش چـەندین پرۆگرامـی دانـا بـۆ ناسـینی کەسـانی تیرۆرسـت و چـۆنیەتی

دۆزینەوەیان، لەو ماوەیەدا هەر یەك لەلای خۆیەوە زانیـاری کـۆدەکردەوە و شـی دەکردەوە، لەمەوەش بنکەی کاری شـاراوە زیـاتر کارەکـانی فـراوان کـرد، بۆیـە دەبوایە تیمێکی تایبەت بەشارەزایان هەبێ بۆ تەنگەوەهاتنی هەر رووداوێك، وەك شارەزایانی بۆمب و دانوستکار کاتێك رفێنەران بارمەتە دەستگیر دەکـەن، جگـە لە شارەزایانی هێرشە تەکتیکەکان، کە بۆ کاتی خۆی بەکار دێ.

نووسینگەی دژەتیرۆر، بەرەو پێشکەوتن هەنگاوی نا بە هـۆی هەرەشـەکانی تیرۆر، کە پێکهاتەکەی بە هۆی سەرکەوتنی یەکەم بوو، بە شێوەیەك هێدی هێدی پەرەی دەسەند ئەمەش بـە هـۆی چـەندین سـەرکردەی شـارەزا و پیشـەگەر وەك ونستۆن وایلی و جۆف ئاوکونل و چەندین ئەفسەری دیکەی ئەفسەرانی چەسپاندنی یاسا و پارێزەر و پسپۆڕانی ریکلام و زمانزان، بە پەیوەنـدیکردنیان بـە هاوبەشـە بیانیەکانیان تا تواناکانیان باشتر بێ.

لەپاشاندا بودجەی دژەتیرۆر بەرەو زیادبوون رۆیشـت، بەمـەش دژەتـیرۆر بـە هۆی دەسەڵات و شارەزایی و پارە دەسەڵاتی لەناو سی ئای ئەی پەیـدا کـرد، بـۆ ئەمەش چەندین ئۆپراسیۆن بەقووڵایی بەشە جوگرافییەکان ئەنجام دەدا، زۆرجاریش بنکەی دژەتیرۆر رقی لەوە بوو بە فەرمانی سـەرۆکی وێسـتگەیەك لـەکار دابـێ، بەڵام ئۆپراسیۆنەکان ئەنجام دەدرا چونکە پێیـان وابـوو ئامـانجێکی تـیرۆرە دەبـێ لەناوی ببەن.

کەچی بنکەی دژەتیرۆر و کاری شاراوە بەشێك لەئاڵنگارییەکانیان چارەسـەر نەکرد، چونکە کاری هەواڵگری و شاراوە نابێت ببێتـە ئەلتـەرناتیفی سیاسـەت، چونکە هەر کاتێك شکست بێنێ دەبێتە بیانوویەك بۆ نەپێکانی سیاسەت.

رۆی گۆدسۆن لە نووسینە جوانەکەی سەبارەت "فرتوفێڵی پیس یان کارتی براوە" باس لەوە کات کە" کاری شاراوە کاریگەری لە دۆخ و شێوازەکان دەکات، بۆیە ناکرێ پیشەوەرانی مامەڵەی پێوە بکەن، لەنێو سیاسەتدا"، هەروا دەڵێت بنەمای سەرەکی بۆ کاری شاراوە چەند خاڵێکە وەك : بەکارایی کار بکات و ببێتە بەشێك لە سیاسەت، بەڵام بە هەماهەنگیەکی باش. هەروا کاری شاراوە وا وەسف دەکات، کە خزمەتکاری سیاسەتە، بەڵام زۆر جاریش ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە، چونکە ئەلتەرناتفی سیاسەت نییە، زۆر جاریش حکومەت هێشتا بڕیاری نەداوە چی بکات، هەروا کاری شاراوە گولەیەکی سیحری نییە، لەو کاتەی دەیەوێ هەموو شتەکان بەرەو شکست بێنێ، بۆیە دەبێ هەماهەنگ بێ لەگەڵ هەموو رێکارە سیاسی و سەربازی و ئابوورییەکان، لەوشەوە پشتگیری بکرێ".

حکومەتەکان کاتێك لە کاری نهێنی تێوە دەگلێن، تا بەنهێنی کاریگەریان لەسەر خەڵك هەبێ لەنێوەندی رووداوەکانی تەواوکاری سیاسی دەرەکی فراوان، کەچی لەمبارەیەوە شتێکی وا باش نییە، ئەمەو لە سەدەی سێیەمی پ.ز لە فیلپ پاشای دووەمی مەکدۆنی باوکی ئەسکەندەر گێڕدراوەتەوە کە "کەرێك دەتوانێ بارە زێڕێك هەڵگرێ و چیایەکان ببڕێ، بەڵام سوپاکان ناتوانن ئەو چیایانە ببڕن".

بەپێی لێکۆڵینەوە و شارەزایم گەیشتمە ئەو بۆچوونەی کە کاری شاراوە ئەلتەرناتیفی سیاسەت نییە وەك جێگرەوەیەکی درێژخایەن، هەروا نابێ ناکرێ قەرەبووی سیاسەت بکاتەوە، بەڵکو وەك ئەلتەرناتیفێك کارەکە بەگوڕتر بکات، هەروا سەرکردە سیاسییەکان و دانەری ستراتیژیەت وای دانەنێن کاری شاراوە چارسەرێکە سیاسەتی دەرەوەدا، بەڵام ئامێرێکی پێشکەوتووی هونەرییە بۆ

فەرمانڕەوایی، ئەو کاتەی هەماهەنگی دەکرێ لەگەڵ توخمەکانی سیاسەتی دەرەوەدا.

هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکان مێژوویەکی درێژخایەنی هەیە لە پەراوێزکردنی کاری شاراوە بەتایبەتی لە دۆخە ئاڵۆزەکاندا، لە هەندێك کاتدا قەیرانەکانی داڕشتنی سیاسەتی دەرەوە بە شێوەیەکی لاواز دەبینرێ، هاوکات سیاسەتمەدارەکانی نابێ لە هەموو شتێك پشت بە کاری شاراوە ببەستن، چونکە زۆر جار ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە وەك سەرنەکەوتنی ساڵی ١٩٦١ لە دوورگەی بەرازەکانی کوبا یان شکستهێنانی کودەتای ١٩٧٣ لەسەر سەرۆك لەندی لە چیلیدا، لەبەرامبەر ئەمەش سی ئای ئەی لەهەشتاکان کارێکی شکست پێهێنا بەتایبەت لە ئەمریکای ناوەڕاست کە سۆفیت و کوبا زاڵ بوون بەسەر ئەو ناوچانەدا، بەڵام تێوەگلانی کۆشکی سپی لە هەندێك ئۆپراسیۆنی ناشەرعی بووە هۆیەك کە چەندین ئەفسەری سی ئای ئەی رووبەڕووی گرفتی یاسایی ببەنەوە و رووماڵە رۆژنامەگەرییەکانیش لەمبارەیەوە زۆر خراپ بوون.

وەك باوە هەواڵگری و دەزگاکانی ئاسایش سەرۆکایەتی کاری شاراوە دەکەن، بەڵام لە ویلایەتە یەکگرتووەکان سی ئای ئەی ئەو بەرپرسیاریەتییە کەوتۆتە سەرشان، ئەمەش بۆ چەندین هۆ دەگەڕێتەوە بۆ کاری شاراوە کە خۆی لەچەند خاڵێکدا دەبینێتەوە، وەك کاری شاراوە زۆر نهێنییە بەپێی پێناسەکەی هەموو دەزگاکانی نەخشێندراوە بۆ کاری شاراوە، هەروا کاری شاراوە پێویستی بە هەواڵگرییەکی دیاریکراو هەیە، دەزگاکەش لەسەریەتی هەموو شتەکان کۆ بکاتەوە، لەخاڵێکی دیکەدا پێویستە لەسەر دەزگاکانی شاراوە جوولە بە ئەو بیانیانە بکات کە جێگەی متمانەی ئەون و کاریگەریان هەیە بۆ جێبەجێکردنی کاری شاراوە، لەلایەکی دیکەوە لەسەر دەزگاکانی هەواڵگری و ئاسایسە هیچ

کاتێك نەخشەیەکیان نەبێ بۆ کـارە سیاسـیەکانی دەرەکـی ( سـەرەڕایی ئـەوەی هەندێکیان ئەو کارە دەکەن)، چونکە هەواڵگری تەنیا بەسیاسـەت رادەگەیـەنێ و دروستی ناکات، هەروا هەواڵگری دەکرێ کارێك جێبەجێ بکـات بگـونجێ لەگـەڵ سیاسەتدا.

بەشێك لە مێژووی دەیان ساڵە لەبیرکراوە، بۆ ئەمەش چەندین نموونەی قورس هەن، بۆ دووبارە من لێی فێر بووم، سی ئـای ئـەی لـە کـاری شـاراوەدا لەپێشـە کاتێك سیاسەت رۆڵێکی لاواز دەبینـێ لـە کاتێکـدا دەیـەوێ رووبـەڕووی تـیرۆر ببێتەوە، ئەوەش لەنێوەندی شەڕە سیاسی و یاساییەکاندا، کـاتێکیش خـەڵکانێك لەنێو هەواڵگریدا دان و شتێکی وای لێ نازانن، ئەوا دەبێتە بارگرانی بەسەر سـی ئای ئەی و حکومەتدا، چونکە زۆرێك لەوانـە تـەنیا کـار بـۆ بەرژەوەندییـەکانی خۆیان دەکەن، بۆ ئەمەش سەرۆك جۆرج بۆش فەرمان دەدا تا بەشێوەیەکی شاراوە کەسانێك دادگایی بکرێن، یان کاتێك جەنگاوەرە تیرۆرستەکان دەستگیر دەکـرێن، کەچی لەپاشاندا سەرۆك ئۆباما دێ باس لەوە دەکا لێکۆڵینەوەکانی سی ئای ئەی بەشێوەیەکی نایاسایی بووە.

لە سەرەتای رۆشنبیری و زانین سەبارەت بەیەکگەیشـتنی سیاسـەت و کـاری شاراوە، ئەمەو لە ئەیلوولی ١٩٩٩ چووم بۆ بنکەی دژەتیرۆر، بەو پێیەی یـەکێك لە نوێنەرەکانی کوفر بلاك بووم، ئەمەو کۆچکردووە بن بۆنك یاریـدەری سـەرەکی بوو، ئەو وەك توێژەر و بەرپرس لە هەموو شیکردنەوەکان و کۆمەڵگەی سیاسـەت بوو، کەچی نوێنەرێکی دیکـەی تایبـەت بـە ئێـف بـی ئـای زیـاتر جـەختی لـە چەسپاندنی یاسا دەکردەوە، ئەو کەسێکی گونجاو بوو، کەچی بەشداریەکی بەهێزی نەکرد لە کاتێکدا دایل واتسۆن لەپێش دوو ساڵ کاری مەزنی ئـەنجام دا، منـیش هەموو بەرپرسیارییەکانی سی ئای ئەیم گرتە ئەستۆ، بەتایبەت ئەو کارانـەی کـە

پەیوەست بوو بە دژەتیرۆر، بۆ ئەمەش کۆفر هەموو رێنمایی و پێداچوونەوەی ئۆراسیۆنەکانی خستە بەر دەستم منیش بۆچوونە سەرەتاییەکانم خستە روو.

ئەو گوتی: ماوەی هەفتەیەکت لەبەردەستە.

-(بەڵێ گەورەم). زۆرجاریش ئەو وەڵامەم هەبوو بۆ کۆفر لە ماوەی سێ ساڵی لەدوای یەکدا.

لەلایەکی دیکەوە فەرمانی تینیتی بەڕێوەبەرم خوێندەوە کە سەبارەت بە ستراتیژیەتی نوێ بوو دژ بەقاعیدە، ئەمەو ساڵێك پێشتر واتە لە دوای هەردوو تەقینەوەکەی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا دەبویست کاراتر بم، لەو کاتەی لەگەڵ کۆفر و تیمە سەرکردایەتییەکەی بووم لە بنکەی دژەتیرۆردا تا زیاتر پاڵەپەستۆ بخەینە سەر قاعیدە.

داوی چەندین نەخشەی جۆراوجۆی کیشوەری باشووری ئاسیام کرد وەك نەخشەی دەوڵەتەکانی سۆدان و چەندین شارێکی دیاریکراوی ئەفغانستان و شاروچکەکانی بەیرووت، هەروا هەموو شوێنە شاراوەکانی سی ئای ئەیم لە جیهان تۆمار کرد، لەپاشاندا وێنەی ئەو شوێنانەم کێشا کە قاعیدەی لێیە، لەدواتردا ئەوەی ویستمان شتێکی روونە و دەمەوێ بنکەی دژەتیرۆر لەهەر شوێنکدا هەبێ لەگەڵ ئەوانە بێتە دەست و شەڕ بکات تا دەگاتە ئەو شوێنانەی خۆیان تیادا شاردۆتەوە، هەروا شەش شوێنی جوگرافی بنەڕەتیم

تۆمار کرد، تا بنکەی دژەتیرۆر وەبەرهێنانی تیادا بکات وەك ئەمانەی خوارەوە:

١- باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا، بەتایبەت لەسەر سنووری نیوان مالیزیا و ئەندەنووسیا و فلیپین.

٢- لوبنان و چەند شوێنێکی دیکە لە رۆژهەڵات وەك فەلەستین.

٣- چەند هەرێمێك لەسەر کەنار و ئەفریقیا، بەڵام سۆدان بەشێوەیەکی سەرەکی.

٤- ناوچەی هەر سێ سنووری پاراگوای و بەرازیل و ئەرجەنتین.

٥- نیمچەدوورگەی عەرەبی بەتایبەتی یەمەن.

٦- ئەفغانستان وەك داڵدەیەکی قاعیدە و بەشێك لە خاکی پاکستان.

لەپاش پێنج رۆژ پوختەیەکم دات بە کۆفر و بن، بۆ ئەمەش سەبوورەی سپی و قەڵەمی رەنگاورەنگم بەکارهێنا، کارەکەم ئاسان کرد، ئەگەر دژەتیرۆر بیەوێ کارێك بکات لەگەڵ دەزگا شاراوەکانی دیکە، بەو شێوەیەش دەتوانین بگەین بە داڵدەکانی دوژمن و گۆڕەپانێك دروست بکەین بۆ کاری شاراوە، هاوکات ئەفغانستان ئامانجی یەکەمم بوو و زۆریش مکوڕ بووم لەسەری.

ریچ ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان، کە گەنجێکی باڵابەرز بوو، سەرۆکایەتی یەکەکەی دژ بە قاعیدە گرتە ئەستۆ، لەناو بنکەی دژەتیرۆردا، وێستگەکەی بە ناوی "ئالیك" بوو، بەڵام لەژێر فەرمانی مندا بوون، ریچیش سەرەتای کاری پیشەیی لە ئەفریقیا بووە و زۆربەی کاتەکانی لە کارە ترسناکەکاندا ئەنجام داوە، پێم وابوو کەسێکە شارەزایی زۆرە، بەڵام کەسێکە کەمێك غروری هەیە و وا هەست دەکات کەسانێك بە کاریزمای دادەنێن، هەروا ئەو وای دەزانی منیش کەسێکی کارام بەڵام هیچ حسێبێك بۆ کەسانی دیکە دانانێم.

هەردووکمان درکمان بەوە کرد کارەکە لەدەرەوە هەموو رەنگدانەوە خراپەکانە، بۆیە هەردوولامان داوامان لەوانە کرد کە لەژێر فەرمانی ئێمەدان بە سڵکردنەوە کارەکانیان بکەن، چونکە بۆ چەند ساڵێك من و ریچ بە جۆرێك سەیری یەکترمان دەکرد، بەڵام تیم گەیاند بە هۆی جۆشوخرۆشی بەو کارە پاڵەوانییە

کارێکی مەزن ئەنجام دەدەی، بۆ رێزگرتن لەنێوانمان زیاتر بوو، بەشێوەیەك ببین بەدوو برای جەنگاوەر.

بەکورتی لەگەڵ ریچ گفتوگۆم کرد سەبارەت بە ئەفغانستان، ئەویش خۆبەخش بوو تا تیمەکەی بباتە ئەوێ بۆ زیندووکرنەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەحمەد شا مەسعوودی سەرۆکی بەرەی یەککگرتوو، هەر ئەویش دەزانێ چۆن هاوپەیمانی لەگەڵ باکوور بکات، خۆزگەشم دەخواست حکومەتی پاکستانی دەربڕینی هاوپەیمانی باکووری بەکار بهێنابوایە، من وام وێنا کرد کە ئەوان رێکخستنێکن لەژێر رکێفی تاجیکییەکانن لە باکووردا گۆشەگیر بوونە، دەستیان ناگاتە هەموو شوێنێکی وڵات، شا مەسعوود کە رەچەڵەکی تاجیکییە، لەراستیدا دەیویست بە هۆی تۆڕەکانی دەست بەسەر هەموو ئەفغانستاندا بگرێ، دەیویست تاڵیبان برووخێنێ و قاعیدەش دەر بکات، چونکە قاعیدە زۆربەیان بیانی بوون و بە شێوەیەکی پیلانگێڕانە کاریان دەکرد.

من و کۆفر و بن پلانی ریچمان خستە بەرباس لەپاش ئەوەی تیمەکەی کۆکردەوە، ریچ درکی بەوە کرد ئەم هەنگاوەی زۆر ئاڵۆزە لەنێوەندی دەستپێشخەری پێکانی داڵدە سەقامگیرەکانی دوژمن، ئەفغانستانیش یەکێکە لەو داڵدانە، جگە لەو شوێنانەی کە تیایدا میوانداری کراون.

کۆفر بە هۆی ترسناکیی سیاسی و سروشتی ئەو کارە، داوای رەزامەندی لە یاریدەری بەڕێوەبەری ئۆپراسیۆنەکان کرد تا لە هەموو روویەکەوە هاوکاری بکرێن بەتایبەت دەزگای شاراوە، چونکە لە سەرەتادا تیمەکەی ریچ لە تاجیکستانەوە هەنگاو دەنێ ئەمەش بە چاودێری بەشی ئاسیای ناوەڕاست بێ، سەرەڕایی ئەوەی ئەفغانستان لەرووی بیرۆکراتییەوە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی بەشی رۆژهەڵاتی

خواروو، بۆ ئەمەش بنکەی دژەتیرۆر کار و پارەی لەدەست دایە و بەڵام بەشە جوگرافییەکانی دیکە شوێن و گۆڕەپانەکانیان لەدەستدا بێت.

من و کفر و ریچ چووین بۆ لای جیم بافیتی نووسینگەی یاریدەری بەڕێوەبەری ئۆپراسیۆنەکان، بۆ ئەمەش گاری شرۆن لە بەشی رۆژهەڵاتی خوارووبەشداری کۆبوونەکانی کرد، گاری لەپێشتردا توانیویەتی هاوکاری هاوپەیمانەکانمان بکات لە ئەفغانستان لە کاتی داگیرکاری سۆفیەتدا، ئەو ئەحمەد شا مەسعوود و زۆر کەسی دیکە لە بەرەکانی ئەفغانستان دەناسیّ، بافیت گوێی لە هەموو پوختەکان گرت، بەڵام گاری وەك شارەزایەکی پشتگیر باسی لەوە کرد کە ترسناکییەکەی گەورە لەرێدایە سەبارەت بە دەستکەوتێك کە دڵنیانین لێی.

بەتوندی هاواری کرد "لە هۆڵدا ئامادە دەبم، لەوێدا ناچار دەبم بەرامبەر خێزانی ئەفسەرە کوژراوەکان ببمەوە".

ریچ گوتی"بێگومان منیش لەنێو کوژراوەکان دەبم، چونکە من سەرکردایەتیان دەکەم".

لەم کاتەدا بێدەنگییەك لەنێو دڵەڕاوکێدا باڵی بەسەر کۆبوونەوەکەدا گرت.

کەچی بۆشاییەك دێتەکایەوە ئەگەر نەچین بۆ ئەفغانستان، ئەمەو بنلادن شەڕی دژ بە ویلایەتە یەکگرتووەکان راگەیاندووە، هێشتاش ساڵێك بەسەر هێرشکردنە سەر هەردوو باڵیۆزخانەی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا نەبووە، بۆیە پێدەچیّ تواناکانی زۆر روونە، ئەگەر نەتوانین بە هۆی هەواڵگرییەوە شکستیان پیّ نەهێنین، ئەوا هێرشی دیکە دەکات، ئەمەش شکستێکە بۆ سی ئای ئەی، دیارە بافێت مەبەستی لەمە هەموو ترسناکییە بیرۆکراتییەکان بووە.

هاوكات بافێت پرسیاری سەبارەت بە سەركەوتنی پەیوەندیكردن كرد لەگەڵ هاوپەیمانە ئەفغانییەكان، بەو مانای دەتواندرێ لە ئەفغانستان خۆمان لە ترسناكی بپارێزین.

منیش جەختم لەوە كردەوە "پێویستە بوونمان لەوێدا هەبێ، پێویستە هاوبەشی خۆمان لەگەڵ ئەواندا بسەلمێنین، كارەكەش پەیوەستە بە رێزگرتن، تەنیا دەبێ لەگەڵیان دانیشین و نانیان لەگەڵدا بخۆین، پێویستە لەناو خاكەكەیان لەگەڵیاندا بین".

ئێستا كارە بنەڕەتییەكە زۆر روون دیارە، پێشتر لە ئەفریقیادا خزمەتم كردووە هەموو رۆژێك ژیان و مردنم بینیووە، كاتێك پەیوەندیمان هەبوو لەگەڵ كەسەكان و یاخیبووەكان، دەبوایە بەشداری هەموو ترسناكییەكان بكەین، پێویست ناكات ئەوان بە دوژمن بزانین لەو كاتەی جەخت لە هاوپەیمانەكانمان دەكەینەوە، ئەمەش لە خزمەتی یەكەمدا بۆم روون بۆتەوە.

بافێت بەردەوام بەرگریی لە قسەكانی دەكرد، بەڵام گاری شرۆن ترسناكییەكی وا لە كارەكەدا نەدەبینی، بەڵام خۆی دوور دەخست كاتێك پشتگیری لە بڵاوبوونەوەی تیمەكە دەكرد، لەگەڵ ئەوەی نارازیش نەبوو.

كۆفر یەكسەر سەیرێكی بافێتی كرد و گوتی " گەورەم تۆ هەڵەی، چونكە دەبێ ئێمە بچینە ئەفغانستان".

زۆر بەروونیش باسیان لە رێڕەوی كارەكە نەدەكرد، بەتایبەت ترسیان لە هەڕەشە سیاسییەكان هەبوو، بەڵام ئەگەر راستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ بەڕێوەبەری دژەتیرۆر هەبێ پێویست بەرەزامەندییەكان ناكات، لەلایەكی دیكەوە كۆفر پەیوەندی بە هەموو تۆڕەكانی ناو پایتەختی كردبوو وەك كۆشكی سپی و گردی

کاپیتۆل، هاوکات بەهایەکی مەزنی هەبوو لە گۆڕەپانی دژەتیرۆردا، هەر ئـەویش بوو توانی کارلۆس رامریز شانسێز بدۆزێتـەوە کـە ناسـرابوو بـە چـەقەڵ، هـەروا بنلادنی لەو وڵاتـە دەر کـرد، بـەو پێیـەی سـەرۆکی نـوێی دژەتـیرۆرە، هـەردەم کارەکـانی کردەیـی و سیاسـی بـوو و هـەردەم لەپێشـڕەوی دابـووە و دەنگیشـی هاوارێکە دوای چاوەڕوانی پێشڕەوی دەکات.

بافێت لەم کاتەدا چەند پرسیارێکی دیکەی کرد، بەڵام تا ئێستا زۆر خۆشحاڵ نییە. کاتێك ریچ کە بەرەو دەرەوە بەهێمنی هەنگاوی دەنا، نەیتوانی خـۆی دوور بخاتەوە لەوەی بڵێت " سەرۆك ئەمە زۆر جوان بوو، کارێکی مەزنە".

لەمکاتەدا کوفر ئاوڕی دایەوە و هـاواری کـردە سـەرمان "جـارێکی دیکـە پێشـبینی ئەمـە مەکەنـەوە، مـن نـاتوانم ئەمـە بـە یاریـدەری بەڕێوەبـەری ئۆپراسیۆنەکان بکەم و خۆمی لێ دوور بخەمەوە، من ناتوانم".

بـەهێمنی گەڕاینـەوە بنکـەی دژەتـیرۆر، لـە خەیاڵمانـدا ترسـناکییەکانی ئەفغانستانمان تاوتۆ دەکرد لەنێوەندی حکومەت و ئاژانسەکەمان.

لەپاش دە رۆژ ریچ و تیمەکەی گەیشتنە دۆشەنبێ، شاری دوشەنبێ شارێکی بچووکە و پایتەختی تاجیکستانە، ئـەم شـارە لـەرووی ئەنـدازەیی و سیاسـییەوە دەگەڕێتەوە سەردەمی سۆفیەت، هەردەمیش دەکەوێتە ژێـر توندوتیـژی تـاوان و سیاسەتدا، لەوێدا بەشێوەیەکی ئاشکرا چەتەکان دەیانەوێ زاڵ بن بەسەر بازرگانی تلیاکدا، جگە لە چەندین تاوانکاری، باڵیۆزخانەی ئەمریکای تیادا نییە، چـونکە لە ئەیلوولی ١٩٩٩ بۆچوونی وابوو، تاجیکستان تەنیا شوێنەکە و گـرنگ نییـە، تەنیا خاکێکی چیاییە لەتەك ئەفغانستاندایە و هیچ بەهایەکی وای نییە.

ریچ و هەر پێنج پیاوەکەی لە ماڵێکدا بوون، کە سی ئای ئەی بۆی گرتبوون، هەر لەوێدا پەیوەندیان بە پیاوانی ئەحمەد شا مەسعوود کردبوو، هەر ئەوانیش لەو شارەدا نیشتەجێ بووبوون، ئەوێ کەشێکی زۆر ناخۆشی هەبوو، ئەمەش ئاڵنگارییەکە بۆ ئەوەی بە هەلیکۆپتەر بگوازرێنەوە، بەڵام لە رۆژی دواتردا بە هەلیکۆپتەرێکی سۆفیەتی لە جۆری می ١٧ ی سەر بە ئەحمەد شاد مەسعوود رۆیشتن بەرەو باشوور، بەسەر ئەو بەرزاییانە رۆیشتن کە بەرزییەکەی دەگاتە هەشت هەزار پێ، هاوکات بەرامبەر بایەکی توند دەبوونەوە و بەرزاییەکانی دۆڵی تەسکی پنجشیری ئەفغانیان بڕی.

کاتێك دابەزین یەکسەر ئەفغانییەکان بەخێرایی ئەوانیان بردە خانووی میوانداری، کە لە خانوویەکی ساکار و کۆن پێکهاتبوو، دیوارەکانی لەبەردی لایەکیی چیایەکان دورستکرابوون، ئەمەش بە پێوەری ئەمریکی خانوویەکی زۆر سەرەتاییە.

ئەفغانییەکان گرنگیان بە میوانەکانیان دەدا، نایانەوێ کوڕانی سی ئای ئەی بەبێ چاودێریکردنیان بە هیچ لایەکدا بڕۆن، ئەوان چەندین بیرەوەریان هەبوو سەبارەت بە بەزاندنی بەڵێنەکانیان بۆیان، لەو کاتەی ویلایەتە یەکگرتووەکان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی وازیان لێ هێنا، بەتایبەت ئەو کاتەی یەکێتیی سۆفیەت ئەو وڵاتەی جێ هێشت، بۆیە دۆخی ئەفغانستان بەجارێ تێکچوو، لە نەبوونی پشتگیری نێودەوڵەتی بەشێوەیەکی دڕاندانە شەڕی ناوخۆیی دەستی پێ کرد، هەموو ئەمانەش کەڵەکەبووی داگیرکاری دەرەکی بوو، بۆیە ئەمجارە پرسیاری ئەوەیان دەکرد، کە سی ئای ئەی چی دەوێ.

ئەحمەد شا مەسعوود پێشوازیکی گەرمی لە ریچ و تیمەکەی کرد، لەپاش ئەوەی چەند قسەیەکی خۆشیان بۆ یەکتر کرد، لەپاشاندا ریچ باسی کارەکەی کرد کە پەیوەستە بە بە قاعیدەوە تەنیاش پەیوەستە بە قاعیدەوە، هەروا هیچ شتێك بۆ بەرەو یەکگرتووە نانێردرێ و پێشبینی هاوکاری نەکەن بۆ رووخاندنی دەسەڵاتی تاڵیبان، ئەمەو وەك ریچ باسی لێوە کرد، سەرۆك کلینتۆن رەزامەندی دەربڕیووە تا بەشێوەیەکی دیاریکراو زانیاری هەواڵگری کۆ بکرێتەوە، تا بەردەوام بن لە دەستگیرکردنی بنلادن، ریچ جەختی لەوە کردەوە شتێکی زیاتر نییە.

ئەحمەد شا مەسعوود ئاماژەی بەوە دا کە بەردەوا بن لە قسەکان، ئەمەو ریچ یەکێك لە نەخشەکانی واڵا کرد و پرسیاری سەبارەت بە قاعیدە کرد، لەتەك ئەمەد شا مەسعوود سەیرێکی نەخشەکانی کرد و گوتی بۆ ماوەی کاتژمێرێکی دیکە هەواڵگری سەبارەت بە هەموو شتێکی دوژمن پێتان رادەگەیەندرێ، لەتەك ئەوەش باسی لە تواناکانی بەرەی یەکگرتوو کرد، ئەوەشی گوت کە بەرەکەیان دەتوانێ لە بەرزاییەکانی دەشتاییەکانی باکوورەوە دەتوانێ دەست بەسەر ینچشیر دابگرێ، کە دەکەوێتە باکووری کابۆل، هەروا ئەو بەرەیە لەململانێدایە لەسەر ناوچەکانی باشووری مەزار شەریف، جەختیشی لەوە کردەوە کە بە هۆی سەرچاوەکانیان دەتوانن هەموو شتێك بزانن تا دەگاتە ناوچەی پاشتۆنییەکان، ئاماژەشی بەوە دا کە پشتگیری ماددی و جەنگیان دیاریکراوە و ئەو جەنگە تەنیا خۆیان دەیکەن.

ریچ و شا مەسعوود باسیان لە گۆڕانکاریی دۆخەکان کرد، لەتەك گرنگیدان بۆ هاوپەیمانییبەستن لەگەڵ سی ئای ئەی و بەرەی یەکگرتووە، بۆیە دەبێ هەر لایەنێك هەلەکان بۆ خۆی بقۆزتەوە.

زۆری نەبرد تاکەکانی ئەو تیمە تووشی گرفتی تدروستی جۆراوجۆر بوون و دەستیان بە خواردنی حەبەکانی (سیپرۆ) کرد، کەچی یەکێك لەوانە تووشی نەخۆشییەك بوو لە گەدەیدا وای لێ کرد نەتوانێ کار بکات، چونکە چەندین جار دەڕشایەوە، لەمکاتەدا ریچ نیگەران بوو بۆیە داوای کرد پزیشکێکی ئەو ناوچەیە چارەسەری بکات، کاتێك پزیشکەکە گەیشت پێخاوس بوو و جانتایەکی لە دەستدابوو، بەڵام ئەفسەرەکەمانی چارەسەر کرد.

ریچ درکی بەوە کرد کە هاوپەیمانەکەی توانایەکی زۆری هەواڵگریان نییە، چونکە ئەفغانییەکان شتێکی وایان نەبوو، بەڵام تەنیا زانیاری ناوچەییان هەبوو، کە جەختی لە بەها و ئازایەتی دەکردەوە.

ریچ و تیمەکەی بۆ ماوەی هەفتەیەك مانەوە تیایدا چەندین زانیاری هەواڵگریان ئاڵوگۆڕ کرد، بەمەش دەرکەوت باشترین رێگەن بۆ هاوکاریکردن، بەمەش ریچ و تیمەکەی توانیان پەیوەندییەکان بژێننەوە.

ئەمەو شا مەسعوود، ئەندازێك بە ناوی عارلفی دامەزراند وەك سەرۆکی هەواڵگری و نوێنەری تایبەتی خۆی تا پەیوەندییەکان فراوانتر بێت، بەڵام ئەو کەسە زۆربلێ و گەندەڵ بوو، کەچی لە بواری هەواڵگریدا کەسێکی باش بوو و پشتی پێ دەبەسترا.

هەروا ئەمرللا ساڵح بە فەرمانی عارف کاری دەکرد، ئەمەش دەبێتە خاڵی سەرەکی پەیوەندیکردن لەگەڵ ریچدا، ئەو گەنجێکی قۆز و راستگۆ بوو، هەردەم دەیویست ئەفغانستان ئازاد بێ، ئینگلیزیی دەزانی و کارایی تەکنیکی هەبوو و هەردەم وەك سەرۆکێك دیار بوو، کاتێك عارف و شا مەسعوود دەسەڵاتی زیاتریان پێ دا بەخێرایی رۆڵەکانی بەدەرکەوت، زۆریشی نەبرد ریچ و تیمەکەی

پەیوەندییەکی کۆدکراویان لەناو ئەفغانستاندا بەدەست گەیشت، ئەمەش وای کرد هەماهەنگیمان لەگەڵ شا مەسعوود و عارف زیاتر ببێت.

کارەکەمان لەو ساتەوە دژ بە قاعیدە و تالیبان بۆ ماوەی چەند مانگێك بوو، بەمەش جۆشوخرۆشی شا مەسعوود و لایەنگرانی زیاتر بوو، چونکە سی ئای ئەی چەندین ئـامێری هـەواڵگری و داتـای بنـەڕەتی و پێداویسـتییەکانی هـەواڵگری پارەیان وەرگرت، بۆیە هەردەم شا مەسعوود و بەرەی یـەکگرتووە زیـاتر راپـۆرتی هەواڵگریان پێ داین، ئەوەش لەپاش پەیوەندی و متمانەوە هاتەکایەوە.

هەموو ئەمانە رێگەخۆشـکەر بـوون زۆرێـك لـە هاوکـاری و هـەواڵگری و تیمەکانی دیکە بڵاوببنەوە، لە ماوەی هەشت مانگدا چوار تیمی دیکە زیاتر بوو، بۆیە چەندین کۆبوونەوەی زیاترمان لەگەڵ هاوبەشە ئەفغانییەکانی وڵاتی دەوروبەر ئەنجام دا.

## ئۆپراسیۆنە جیهانییەکان...

تەنیا ریچ و تیمەکەی لە بنکـەی دژەتـیرۆردا دژ بـە قاعیـدە و هـەوادارانی کاریان نەدەکرد، بەڵکو هەموو جیهانیش لەمکارە بەشدار بوون، ریچ و تیمەکـەی بەشێکی بچووکی کەرەستەکانی دژەتیرۆر بوون، هاوکات لەلایەن پیاوان و پارەیان بۆ دەهات، بۆیە من و کۆفر و بن چەندین لقی دیکەمان دانا دژ بە حزبی ئـەڵڵا و پڵنگەکانی تامیل، لەتەك بیست رێکخراوی دیکە، کە لەریزبەندی تیرۆریسـتیدا بوون.[1]

[1] - بەپێی ریزبەندی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەرامبەر بە رێکخراوە تیرۆریسـتیـەکان، ئەمەش لەرێککەوتی ٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٩ بریاری لەسـەر درا.

بەشێك لە لقەكان دڵەڕاوكێ كەوتە نێوانیان ئەمەش شتێكی سروشتییە، تا هەر لقێك ئەنجامی زیاتر بەدەست بێنن، بۆ نموونە یەكەی تایبەت بە حزبی ئەڵڵا چەندین پاساویان هێنایەوە، بەوە ئەو حزبە بۆ ماوەی چەندین ساڵ سەدان لە ئەمریكی و مارێنز و سەرباز و دیبلۆماسییەكانی كوشتووە، ئەو خۆی بە بریكاری سەرەكی رژێمی ئێران دادنێ وەك سەرپەشتیارێكی گەورەی تیرۆرستی نێودەوڵەتی لە جیهاندا و لەناو ویلایەتە یەكگرتووەكاندا، لەلایەكی دیكەوە هێزی شۆڕشگێڕی كۆلۆمبیا یاخیبوونێكی گەورەی ئەنجام دا زیاتریش پەیوەستبوو بە تلیاك، ئەمەش وای كرد سەقامگیری ناوچەكە بخانە مەترسییەوە، هەروا پڵنگەكانی تامیل پێشەنگبوون لە تەقینەوە و خۆكوژیدا، بەتایبەتی ئەوانەی بە بۆمبەكانەوە خۆیان دەتەقاندەوە و هێرشی دەریاییان دەكرد، لەلایەكی دیكەوە بنكەی دژەتیرۆر چەندین كاری دیكەشی كەوتبووە ئەستۆ، وەك بڵاوەیان پێ كرد بۆ ئۆپراسیۆنی چاودێرییە هەستیارەكان، هەروا راهێنانیان سەبارەت بە پەرچدانەوەی رووداوەكان.

بەشی هەرە گەورەی كارەكانمان لەنێوەندی ئەو یەكانەدا كار و ململانێ و هەوڵدان بۆ ئەوەی ئاوێتەبوون لەنێوانمان بێتە ئاراوە، ئەمەو كۆكردنەوەی زانیاری و شیكردنەوەی بنەمای هەموو كارەكانی بنكەی دژەتیرۆر بوو، گرنگ نەبوو ئەگەر نەمان توانیایە دوژمن دەستنیشان نەكەین لەوەی چ پیلانێك و مەبەستێكی هەیە و هەردەم هەموو پێشبینیەكانی دەوروبەرمان دەستنیشان دەكرد تا زانیاریی هەواڵگری بدەین بە كریارەكانمان.

بە گەیشتنم بە بنكەی دژەتیرۆر، نیوەەی هەواڵگرییەكانمان لە سەرچاوە تاكلایەنەكانەوە دەهات، بۆیە ژمارەیەكی بەرچاومان لە راپۆرت بەدەست كەوت سەبارەت بە چۆنیەتیی دژبوونی تیرۆر، هەموو ئەمانەش لە سەرچاوە دەرەكییەكان بۆمان دەهات، ئەمەش شتێكی پەسەندە بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ هاوپەیمانەكان،

تەنیا پشتمان بەسەرچاوە دەرەکییەکان نەدەکرد، چونکە بنکەی دژەتیرۆر پێویستی بە سەرچاوەی زیاتری تاکلایەنە بوو تا هەواڵگرییەکانمان بەهێزتر بێت.

ئەفسەرانی ئۆپراسیۆنەکان راوی زۆرێك لە ئامانجەکانی ناوە لە پانتایی جیهاندا، سەرچاوەکانی دژەتیرۆریش تەنیا وا پۆلین دەکرێ بەکردەیی کارەکانیان ئەنجام بدەن، داوام لە هەموو ئەفسەرانی بەشەکانی جوگرافیا کرد، بتوانم تۆڕەکانی کۆمەڵە تیرۆریستیەکان بشکێنن، ئەمکارەش پێویستی بە پاداشت و هاندانێکی زۆری ئەفسەران هەیە، لەگەڵ ئەوەش بنکە داتای زۆرێك لە ئامانجە گرنگەکانی بۆ ناردن، لێرەش باسەکە دەگۆڕێ، ئێمە چۆن بتوانین یەکێك لە تیرۆرستەکان بکەینە بەرکرێگیراوی خۆمان، ئەمکارەش زۆر جیاوازە لە راوکردنی دیبلۆماسییەکی بیانی یان بەرپرسێکی بازرگانی، لەوانەیە ترسناکییەکەی زۆر گەورەتر بێ، لەوانەیە بە هۆی کێشەیەکی دیبلۆماسی بتوانیت یەکێك لە دیبلۆماسییەکان بکەیتە ئامانج، بەڵام لەوانەیە تیرۆرستێك گولەیەك لە یەکێك لە ئەفسەران بدات کاتێك ئەو باسەی بۆ دەکەیتەوە، شتێکی وا رووی دا، لەو کاتەی ئەفسەرێکمان بەجۆرێك رای کرد، چونکە بۆمبێك لەپشتییەوە تەقییەوە.

تەنیا ژمارەیەکی کەم توانیویەتی یەکێك لە تیرۆرستەکان بەکرێ بگرێ، کارەکە زۆر قورسە و پێویستی بەئازایەتییەکی دەگمەن هەیە، هەروا پێویست دەکات بەشێوەیەکی باشتر ئەو ئەفسەرانە راهێنانیان پێ بکەیت.

گرفتی ئەوەمان هەبوو چۆن ئەوانە لەلای خۆمان دامەزرێنین کە خەڵکیان کوشتووە یان پشتگیری لەوانە دەکەن، کە خەڵکیان کوشتووە، چونکە لە کارەکانمان جۆرێك لە سنووری رەوشت پەیڕەو دەکەین، هیچ کاتێك کەسێك تەجنید ناکەین کە پشتگیری لە کوشتنی خەڵك دەکات، بەڵام چی لەو تیرۆرستانە

بکەین کە لەرابردوودا خەڵکیان کوشتووە، کەچی ئێستا دەیانەوێ هاوکاریمان بکەن؟ هەر حاڵەتێکمان وەکخۆی سەیر کرد، چونکە هەندێکجار ئەو تیرۆرستانەی هاوکاریمان دەکەن کێ دەڵێ بەشدارنەبوونە لە کوشتنی هاووڵاتی ئەمریکی؟ بۆیە ئەمە دەخەینە بەردەم وەزارەتی داد تا ڕێنمایمان بکەن، بەتایبەتی ئەوانەی تەنیا پشتگیریی ماددی کردووە بۆ کارێکی تیرۆرستی کەچی خۆی گولەیەکی تەتەقاندووە؟ زۆرجاران ئەو کەسانە تەجنید دەکەین بە مەبەستی جوولاندنیان بۆ گەیشتن بە زانیاری هەواڵگری، بەڵام ئەگەر ئەو سەرچاوەیە ڕۆڵی سەرەکی بینیبێ بۆ کوشتنی بەرپرسێکی بیانی؟ بۆ ئەمەش یەکێك لەبەرپرسە بیانیەکانمان ئاگادارکردەوە تا ئاگاداری خۆی بێت، تا بتوانین سەرچاوەکەمان بهێڵینەوە و لە داهاتوودا سوودی لێ وەربگرین، ئەگەر ئەو جیاکارنەمان کرد بۆ بەکرێگرتنی کەسانێك بۆ زانیاری کۆکردنەوە، ئەوا کارێکی قورسە، بۆیە تەنیا ئەوانە دەهێڵینەوە کە زۆر باشن بۆ کارەکان.

لە ساڵی ١٩٩٩ زۆرێك لە ئەفسەرانی ئۆپراسیۆنی سی ئای ئەی خۆیان تاقی کردەوە، هەندێکیان بەتەواوی ترسناکییەکانیان نەدەزانی و هەندێکی دیکە پاداشت و هاندانیان کەم بوو تا بتوانن ئەو ئامانجە ترسناکانە چارەسەر بکەن، بۆیە کارەکانمان لە بنکەی دژەتیرۆر دەگۆڕا.

لە هەنگاوی یەکەمدا کارمان لەسەر ئەوە کرد چۆن ئەفسەران فێر بکەین تا تیرۆرستەکان تەجنید بکەین، ڕاهێنانەکە چەندین زانایانی دەروونناسی و سەربازگیری لەخۆ گرتبوو، هەر لە سەرەتادا زانیم کەموکورتییەکمان هەیە، بۆیە پێویستیمان بە شارەزاییەکی قووڵتر هەیە، داوام لە دەزگایەکی عەرەبی کرد ڕاهێنەرێکمان بۆ بنێرێ، هەندێك لە هاورێیەکانمان بەشێوەیەك پێیان ناخۆش بوو، چونکە وا دەزانن گومان لە تواناکانیان دەکرێ، بەڵام بیانووم بەوە هێنایەوە

کە ئێمە چەندین کەسمان لە زۆرلای جیهانەوە راهێنان پێ کردووە، ئەی بۆ ئێستا سوودیان لێ وەرنەگرین؟

ئەمەو هاوپەیمانە عەرەبەکەمان یەکێك لە شارەزاترین ئەفسەری دژەتیرۆری بۆمان نارد تا بەپێی ئەزموونەکانی هاوکاریمان بکات لە پێشکەوتنی پەیڕەو و پرۆگرامەکانمان، بۆیە دەیان ئەفسەری ئۆپراسیۆنی فێر کرد، بەتایبەتیش لەنێوەندی دەزگای شاراوەدا، راستە تەجنیدی تیرۆرستەکان قورسە، بەڵام دەکرێ.

لەتەك کۆفر باسی دروستکردنی کادری بەهێزم کرد لەنێو ئەفسەرانی ئۆپراسیۆن تا بەردەوام بن لەنێو بنکەی دژەتیرۆردا، بۆ ئەمەش هەر لقێکی سی ئای ئەی چەندین کەس دابمەزرێندرێ، بەڵام کارەکانیان دیاریکراو بێ بۆ فەرمانەکانی بنکەی سەرکردایەتی، وەك ئەفەسەری دەرچووی "کێڵگە"، بۆ ئەمەش دوای چەند مانگێك لە گفتوگۆ ئینجا توانرا چەند هەلێك دیاری بکرێ بۆ ئەو ئەفسەرانەی دەیانەوێ بێنە ناو دژەتیرۆر، بۆیە بەشێك لەو ئەفسەرانەی لە سەرەتادا دەستیان پێ کرد داوای دامەزراندیان کرد، بەتایبەتیش ئەو کەسانە دەشتنیشان کران کە عەرەبیان دەزانی، لە هەمانکاتدا هەندێك کەسمان ناردە خولێك بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا فێری زمان ببن، لەپاشاندا پارەکی زۆر دابین کرا بۆ ئەوەی کەسانی دیکە دابمەزرێنین و ئەفسەری زیاتر هەبێ بۆ کارەکانی دژەتیرۆر.

لەلایەکی دیکەوە کۆفر دەستپێشخەریەکی دیکەی کرد و لەپێشتریشدا باسی ئەو بابەتەمان کردبوو، بەتایبەتی سەبارەت بەو سنوورانەی تیایدا تووشی تەنگوچەڵەمە دەبین، هاوکات من و کۆفر سپیپێست بووین لەگەڵ ئەوەی توانایەکی کەممان هەبوو بۆ فێربوونی زمانێکی بیانی، زۆرێك لە ئەورووپییەکانیش هەمان کێشەیان هەبوو، بۆیە بنکەکەمان پێویستی بەو کەسانە بوو کە لە

ڕەچەڵەکی عەرەبی و فارسی و پشتۆ و تاجیکی و تورکین، هەروا ئەوانەی زمـانی دایك دەزانن و کلتووری ئەو شوێنە بەتەواوی دەزانن، ئەمکارەش قورس بـوو بـۆ کەسانێك وەربگرین مووسڵمان بن و کارمەندی سی ئای ئەی بن، چونکە ئەفسەری وەك من لەو شوێنانە هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەدەهێنا.

کۆفر داوای کرد گاری برنتس ببینێ کە یەکێك لە ئەفسەرە گەورەکانی سـی ئای ئەی بوو و دەیتوانی دیواری کۆمەڵە تیرۆرستەکان بشکێنێ، ئەو لـەو کاتـەدا لە ئامادەیدا بوو تا بۆ کارێك بچێتە دەرەوەی وڵات لەپاش ئـەوەی بـۆ ماوەیـەك کاری لەسەر حزبی ئەڵلا کردبوو، لەپاشاندا گاری توانی هەڵمەتێکی بـاش بکـات تا بتوانێ کەسانێك دامەزرێنێ کە لە ڕەچەڵەکدا خەڵکی ئەوێن.

لەلایەکی دیکەوە نووسینگەی ئاسایشی سی ئای ئەی ڕووبەڕووی کێشـەیەك بۆوە، چونکە زۆربەی کاندیدەکانمان خانەوادەی فراوانیان هەیـە لـەنێو ئـەفریقیا و ئاسیا، هاوکات هەمووشیان دەرچوون لە ئامێری پشکنینی درۆ، بـەڵام هـەموان داوایان کرد مووچەکەیان ڕێکبخرێ بەپێی کارە نوێیەکەیان، بۆ ئەمەش گاری بـە هۆی کێشە ڕۆتینییەکان زۆر تووڕە بوو، بەڵام هەر بەردەوام بوو لەکارەکان، بۆیە من و کۆفر دەستمان خستە ناو کارەکان بۆ هەموو کێشە ڕۆتینیەکانی سی ئای ئەی .

هەموو ئەمانە وای کرد بنکەی دژەتیرۆر ژمارەیەك لە ئەفسـەرە بـەتواناکان لەخۆ بگرێ، کارەکانیش دوای چەندساڵێکی دیکە بـەدیار دەکـەوێ، کـە چـییان کردووە، یەکێك لەوانە سەرەچاوەیەکی سەرەکی تەجنید کردبوو کە لەیـەکێك لـە مزگەوتەکان کاری دەکرد، یەکێکی دیکە خۆی بە بزنسمان لەقەڵەم دابـوو تـوانی تۆڕێکی لۆجستی تیرۆر دابنێ، لەمەوەش توانی زۆرێك لە پەیوەندییەکانی یەکێك لە خانەکانی قاعیدە بکاتە ئامانج.

بەردەوام مکوڕ بووین لەسەر سەرچاوە تاکلایەنەکان، چونکە گرنگییەکی زۆری هەیە لەنێوەندی پەیوەندییە دەرەکییەکاندا، بۆیەش هەموو دیاریکراوە دەرەکییەکانمان دەستنیشان کرد لەپاش ئەوەی بەشێك لە بابەتەکانمان هەموار کرد، ئەمەش وەك پاراستنی سەرچاوەکەمان، ئەمەش شتێکی نوێ نییە لەنێوەندی دژەتیرۆردا لەوەتەی دامەزراوە.

یەکێك لە وێستگەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست توانی راپۆرتی لەسەر یەکێك لە تیرۆرستەکان کۆبکاتەوە کە دەیویست سەفەر بکات بۆ وڵاتێکی ئەفریقی، تیایدا پیلانی بۆ ئەوە رێکخستبوو بە مووشەك و چەکی رەشاش هێرش بکاتە سەر یەکێك لە دەزگاکانی ئەمریکی، بۆ ئەمە وێستگە بەخێرایی رەوانەی بارەگای سەکردایەتی سی ئای ئەی کرد، لە کاتێکدا هەمان وێستگە لە وڵاتێکی ئەفریقی دابوو، ئەو وڵاتە رێگەیەك بوو بۆ چوونە ناو هەموو وڵاتەکانی دیکە، لە سەرەتادا بنکەی دژەتیرۆر بە شێوەی هێما زانیارییەکانی رەوانە کرد، هەروا کۆمەڵەی شیکەرەوەکان زۆر بەخێرایی کاریان کرد، ئەمەش بە هەماهەنگی وێستگەکانی هەردوو کیشوەر تا وەڵامی هەندێکی پرسیاری سەرەکی بدەنەوە.

ئایا تیرۆرستەکان ناسنامەکانیان دەگۆڕن کاتێك ئەوان لە رێگەدان، ئایا ئەو گۆڕینە لە چوارچێوەیەکی کاتێکی دیاریکراوی وردات دەبێ؟ ئەگەر بۆ ماوەی هەفتەیەك دواکەوت، ئایا تۆڕێکی ئەفریقی هەیە چاوەڕوانیان بکات؟ ئایا ئەو دەوڵەتە تێوەگلاوە لەو بابەتە؟ بەڵێ، ئەگەر دۆزرایەوە کامەیانە؟ هاوکات دەوڵەتەکە دیاری کرا بە هۆی کارێکی نەگونجاوەوە کاتێك دەست بەسەر چەند تیرۆرستێکدا گیرابوو، هەموو ژمارەی پاسەپۆرتەکانیان لێك نزیك بوون، کە لەو ماوەیەدا بڵاوکرایەوە لە کاتی رووداوەکاندا، واتە ئەو دەوڵەتەی تێوەگلاوە لەو

کاره تیرۆرسته بالیۆزخانەی هەیە لە ولاتێکی ئەفریقی؟ بەڵی ئەگەر هەبوو، ئایا پشتگیری لەو ئۆپراسیۆنە دەکات؟ بەڵێ.

وێستگەی سی ئای ئەی هەموو ئەو راپۆرتە هەواڵگریانەی لە دەزگایەکی ئەفریقی ناوخۆیی وەرگرتبوو، بەمەش کاریچکی هاوبەش ئەنجام درا وەك وێستگەی هەواڵگری هەموو پێداویستییە تەکنیکیەکانی پێشکەش کرد، بەمەش دەزگا ئەفریقییەکە بە هۆی کارمەندانی خۆی ئۆپراسیۆنەکەی ئەنجام دا، بەگەیشتنی تیمە تیرۆریستەکەش دەزگا ناوخۆییە چاودێرییەکی توندی کردن لە ماوەی هەفتەیەکدا، بەمەش چاودێری و گوێگرتنی لەسەر تەلەفۆنەکان ئەنجام دا، هەروا هەر شتێك لەژوورەکەیان بجوولێ وێنەی دەگرن، بەمەش سەدان وێنە گیرا.

لەلایەکی دیکەوە دەزگا ناوخۆییەکان لەگەڵ بنکەی دژەتیرۆر چاودێری دەیان ئۆپراسیۆنیان کردووە لە هەموو جیهاندا، هەموو تیمە تیرۆریستییەکان لە زۆر شوێن دەستگیر کران بەتایبەتی ئەوانەی لەنێوەندی بالیۆزخانەکانی خۆیاندا خۆیان شاردبۆوە، دوای دەرچوونیان دەست بەسەر هەموو چەکەکانیاندا گیرا، بۆ ئەمەش زۆرێك لە وێستگەکان چەندین ئۆپراسیۆنی تیرۆریستیان شکست پێ هێنا چ لە ناو ئەفریقیا یان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەم ئۆپۆراسیۆنانەش هۆیەك بوو کەمکردنەوەی بەشێکی زۆری هێرشەکان.

لە زۆر ولات بەشێوەیەکی دیکە کارمان دەکرد، بەڵام زۆرێك لەو ولاتانە بنکەیەکیان نەبوو بۆ کۆکردنەوەی داتاکان یان توانای ئەوەیان نەبوو هەموو بابەتەکان شی بکەنەوە بەپێی پێوەری جیهانی، بەڵام رۆڵی دژەتیرۆر رۆژ بەرۆژ بەهاکەی زیاتر دەبوو، بەمەش رۆڵێکی بەرچاوی بینی بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و شیکردنەوە و بڵاوکردنەوە و چاودێریکردنی تۆڕە فراوانەکان، بۆیە رۆڵی کاری

شاراوەی بنکەی دژەتیرۆر ئەگەر لەگەڵ دەزگا ناوخۆییەکان یان سەرچاوە تاکلایەنەکان بێ ئەوا مەزن و بەنرخە و بەپارە ناکڕدرێ.

پەیوەندی دەرەکی و دەزگا ناوخۆییەکان و تۆڕە تاکلایەنەکان زۆر جار کاری یەکلاکەرەوەیان ئەنجام دەدا و زۆر جاریش دەکەوتنە ناو چەندین گرفتی ئاڵۆز.

یەکێك لە کارە شاراوەکان راودونانی گومانلێکراوان و دەستگیرکردنیان و رەوانەکردنەوەیان بوو بۆ ئەو وڵاتانەی کە دەیویست دەستگیریان بکات و لەپاشاندا دادگایی بکرێن، ئەمکارەش لەلایەن بنکەی دژەتیرۆر لەپێش ساڵێکدا ئەنجام درا، لەگەڵ ئەوەی وڵاتەکە هیچ یاداشتێکی دەستگیرکردنی دەرنەکردبوو، بەڵام هاوکار بووین بۆ راودوونانی تیرۆر، زۆرجاریش زۆرێك لە دەزگاکان هاوکاری یەکتر دەکەن بۆ گەیشتن بە ئامانجێك، ئێستا ئەمکارە زۆر پەرەی سەندووە بە هۆی ئەنتەرنێت، کاتێك بنکەکە شوێنی راکردووەکە دەستنیشان دەکات وێستگە پەیوەندی بە حکومەتی میواندار دەکات و هەڵوێستەکە روون دەکاتەوە: تیرۆرستێك لە وڵاتەکەتاندایە، هەروا بە هۆی وێستگەکەوە دەتواندرێ بەخێرایی دەستگیر بکرێ و رەوانەی وڵاتی سێیەم بکرێ کە یاداشتی دەستگیرکردنی دەرکردووە، هەندێك وڵاتیش هەیە ترسی لەوە هەیە کاتێك تیرۆرستەکەی رادەست دەکرێ بە هۆی بڵاوکردنەوە، زۆرێك لە وڵاتانیش خۆیان دوور دەخەنەوە لە رادەستکردن، ئەگەر ئەو وڵاتانەش هەبوو ئەوا ئامرازەکانی گواستنەوەی نییە.

بنکەی دژەتیرۆر بە هۆی ئامراز و دەسەڵاتەوە لەپێشەنگدایە، دەزگا ناوخۆییەکانیش زۆر بەهێمنی و ئاسانی راکردووەکە رادەست دەکەن و دەنێردرێتەوە ئەو وڵاتەی یاداشتی دەستگیرکردنی دەرکردووە، ئەمەش رۆڵێکی کردەیی و گواستنەوەیە.

لەلایەکی دیکەوە پارێزەرەکانی سەر بە بنکە بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی داد هەموو رووە یاساییەکان روون دەکەنەوە، چونکە پێشبینی دەکرێ کەسەکە ئەشکەنجە بدرێ لەلایەن ئەو دەوڵەتەی رادەستی کراوە، بۆ ئەمەش کۆمەڵەی ئاسایشی دژەتیرۆری نیشتمانی هەموو ئۆپراسیۆنەکانی رادەستکردنەوە بە هەماهەنگی کۆشکی سپی دەبێ، جگە لەوەی بنکەی دژەتیرۆر دەیان تیرۆرستی دەستگیر کردوە و بەرامبەری دادگایی کردوونەتەوە، بە هۆی رادەستکردنەوەی ئەو تیرۆرستانەش دەیان هێرش پووچەڵ کراوەتەوە.

رۆڵی سەرکردایەتی بنکەی دژەتیرۆر لە هەموو جیهاندا، بۆتە هۆی پەیوەندی و هاوکاریکردنی زۆرێك لە وڵاتان، چونکە زۆرجاران دەزگاکانی چەسپاندنی یاسا و سوپا و هەواڵگری بۆ زۆرێك لە وڵاتان بردووە ئەمەش هاوکاریەکانی پەرەپێداوە، ئەمەش هەنگاوێکی باشە.

هەرزوو زانیم زۆربەی داڵدەکانی دوژمن بەشێوەیەکی باو لەسەر سنوورە نێودەوڵەتییەکانە، بۆیە هەردەم وێنای ئەوەم دەکرد هاوکارییە هەرێمییەکان کارێکی سەرەکییە بۆ ستراتیژیەتێك بتواندرێ دەست بەسەر ئەو ناوچانە دابگیرێ، زۆرجاریش دەزگای هەواڵگریی شوێنێك وردە هاوکارییەکی هاوسێیەکەی دەکات بەتایبەتی ئەگەر هەڕەشەیەکی تیرۆرستی بێ، بەڵام بنکەی دژەتیرۆر دەتوانێ هاوکارییەکی زیاتر بکات بۆ بنبڕکردنی تیرۆر ئەمەش لەنێوەندی کۆنگرەی هەرێمایەتی تا بتواندرێ متمانەی زیاتر لەلایەن هاوبەشەکانمانەوە دروست بێ.

یەکەم کۆنگرەمان لە باشووری ئاسیا ئەنجام دا، ئەمەو هاوبەشەکانمان هاوکاریان کردین لە پووچەڵکردنەوەی هەڕەشەیەکی حزبی ئەڵڵا، بەڵام نیگەران بووین کاتێك زانیمان قاعیدە پەیوەندی هەیە لە فلیپین و ئەندونیسیا و مالیزیا و

سەنگافورە، ئەمەو خالید شێخ محەمەد سەرپەشتی هێرشەکانی لە مانیلا دەکـرد، کۆمەڵی ئیسلامی ئەندونیسا لقێك بوون لـە قاعیـدە و پـەرەی دەسـەند، هـەروا قاعیدە مالیزیای وەك گۆڕەپانێك دانابوو بۆ تەجنیدکردن و شوێنی بەیەکگەیشتن، هەمان کاریش بانکۆك و تایلندی دەگرتەوە، نیگەرانیش بووین لەوەی سەنگاپوورە کە ناسراوە بەشاری دەوڵەت و دەسەڵاتی باش قاعیدە تیایدا هاتووچۆ بکات.

سەرۆکایەتیی تیمی بنکەی دژەتیرۆرم کرد لەکۆنگرەی یەکەمـدا، لەپاشـاندا بنکە زۆرێك لە کۆنگرەی بەست لە ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئـەمریکای لاتینی، بەمەش زۆر لایەنمان بەرەو پێشەوە برد لەرووی زانیارییەکانـەوە، هـەموو ئەمانەش هەستێك بوو لەلایەن زۆرێك لە وڵاتان هەمان هەست هـەبوو، بەمـەش هاوکاریمان بۆ هەرێمایەتی و هاوپەیمانەکانمان ئاسانتر کرد.

## پیلانگێڕی هەزارە

لە بنکەی دژەتیرۆردا ڕۆژانە ڕاپۆرتی کاری شاراوە و هـەواڵگریمان بەدەسـت دەکەوت ئەمـەش ئاسانکاری بوو تا بڕیارەکانم بدەم، دیارە ئەمەش بە هۆی ئاوێتە بوونێکی چڕی ڕاهێنانەکان بوو، لە شوێنی کار و لە سـەرکردایەتی جێبـەجێکار، گوێم لە هەموو ئەفسەرەکان دەگرت چ لەناو بنکەی سەرکردایەتی دژەتـیرۆر یـان لەدەرەوەدا، لەوان فێری زۆر شت بووم وەکچۆن لەو هاوبەشـە بیانییـەکانیش فێـر بووم، بۆیە هەر ئەفسەرێکی سی ئای ئـەی لـە هـەر شـوێنێکی جیهانـدا هـەبێ لەلایەن ئێمەوە بەڕێوە دەبرا، شەو و ڕۆژ کاریان دەکرد بـۆ کۆکردنـەوەی زانیـاری هەواڵگری و جێبەجێکردنی ئۆپراسیۆنی شاراوە دژ بە ئامانجە تیرۆریستیەکان.

لەنێوەندی کارکردنم بنکەی دژەتیرۆر، سی ئای ئەی گـەورەترین سـەرکەوتنی بەدەست هێنا دژ بە قاعیدە و پیلانگێڕی هەزارە، قاعیدە پیلانی بۆ زۆرێك هێرش دانابوو بۆ کوشتنی هەزاران کەس لە زۆرێك لە وڵاتان، بەتایبـەتی کاتێـك سـاڵی ۲۰۰۰ تەواو دەبێ، بۆیـە هـەموو کارەکانمـان وەسـتاند لـەپێش ئـەوەی دەسـت بەجێبەجێکردنی بکەن.

لە کۆتایی هاوینی ۱۹۹۹ زۆرێك لە زانیارییەکانمان بەدەست کەوت سەبارەت بە قاعیدە و نیەتەکانی لـە هـەموو جیهانـدا، بۆیـە تیمـەکانی شـیکردنەوە بـە هاوکاری کەسانی کۆکردنەوەی زاینیاری بەیەکەوە دانیشاند، تا ئاگـاداری هـەموو شتێك بن بەیەکەوە بەتایبەتی سەبارەت بەئامانجی هێرشکردن بۆ سەر ئیسرائیل و ئوردن و چەند شوێنێکی دیکە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەروا چەندین راپۆرتمـان بەدەست گەیشت سەبارەت بە وڵاتەکەمان و هەموو ئەمانەشمان پێشکەش بە ئێف بی ئای و کۆشکی سپی کرد.

لە کۆتایی تشرینی دووەمی ۱۹۹۹ دەیان کەسمان بـۆ نێـردرا کـە سـەر بـە زۆرێك لە بەشەکان بووین، کاتێك چوومە کۆگاکە سەیری ئـەو هـەموو راپۆرتـەم کرد، کە بەسەریەکەوەن، لە کاتێکـدا ئێمـە لـە سـەردەمی زانیاریـداین، کەچـی هەموو بابەتەکان زۆر بەسەرەتاییان پۆلینکرابوون، کەچی ئێمە لە پێشـەنگەکانی تەکنەلۆجیا و زانیاریداین، کەچی زۆرێك لە کاغەزەکان لەسـەر زەوی کـەوتبوون، هەموو ئەو کارانەش تێکوشانی شەو و رۆژی ویستووە.

کۆفر و ریچم ئاگادار کردەوە، کـە پێویسـتە کارگێڕییـەکانمان بـەرەو باشـتر هەنگاو بنێن، بۆ دووبـارە گواسـتنەوەی هـەموو ئـەو زانیاریانـە، بـەڵام ئێسـتا کاتەکەی بەسەر چووە، چونکە لەنێوەندی قەیرانێکی گـەورەداین، بـەڵام تیمـێکم

کۆکردەوە بۆ پۆلینکردنی راپۆرت و شیکردنەوە، ئەمکارەش بەبێ وەستان ئـەنجام بدرێ.

قەیرانەکە بەردەوام بوو، ئەمـەو بنکـەی دژەتـیرۆر تـا ناوەڕاسـتی کـانوونی یەکەمی ١٩٩٩ بە هاوکاری لەگەڵ هەواڵگری دەرەکی و دەزگاکانی پۆلیس لە چڵ وڵات هێرشمان بردە سەر مۆڵگەی تیرۆرستان، واتە لە چـوار کیشـوەردا، سـەرەتا هاوپەیمانەکانمان دوودڵ بوو بەڵام بە هۆی هاندانمان زۆرێك لە هاوپـەیمانی دیکـەش پەیدا بوو، ئۆردونییەکان لەپێشەنگی ئەمکارە بوون، بەمەش تیتیتـی بەڕێوەبـەر رۆڵێکی بەرچاوی گێڕ کاتێك هانی دان و سوپاسی کردن.

قاعیدە پیلانی دانابوو سەدان کەس بکوژێ بە هـۆی سـازدانی ئاهـەنگێکی ئاینی لە ئوردندا کە نزیك لە یـەکێك لـە خاڵـەکانی ئیسـرائیل بـوو، ئامانجیـان هوتێلی رادیسۆن بوو لە عەمان و چیای نبو، ئەمەش شـوێنێکی مەسـیحییەکانە بەدرێژایی زێی ئوردندا، ئەمەو دەسەڵاتی ئۆردونی لـە سـێزدەی کـانوونی یەکـەم شانە تیرۆریستیەکەی بەتەواوی گرت، لە کۆتاییدا بیست کـەس تۆمـەتبار کـرا و لەنێویانیشدا رائد حجازی بوو، کە لە بۆستندا شوفێری تاکسی بووە.

تووشی رووخان و دڵـەڕاوکێ بـووین کاتێـك چـەندین راپـۆرت گەیشـت بـە هێرشکردنە سەر شوێنە ئەمریکییەکان لەناو ئەمریکادا، بەڵام چۆن و کەی؟ ئایـا هێرش دەکەنە سەر واشتنتۆنی پایتـەخت؟ یـان هێـرش دەکـەن سـەر دەزگاکـانی حکومەتی ئەمریکی؟ یان هێرش دەکەنە سەر شوێنی گواسـتنەوەی گشـتی؟ یـان مۆڵە گەورەکان؟ کێن ئەوانەی بەشدار دەبن؟ چۆن بیانناسین؟

لە١٤ی کانوونی یەکەم ئەفسەری کۆچ و کومرگ لە بۆرت ئەنجلسی واشنتۆن، جەزائیریەك بە ناوی ئەحمەد رەسامی دۆزییەوە، کە لەکەنداوە هاتبووە ناو وڵـات،

## هینری ا.کرامبتۆن

لەپاشاندا سەدان تەنی کەرەستەی کیماویی و تەقینەوەیان دۆزییەوە لە یەکێك لـە کۆگاکانی تایەی ئۆتۆمبیـل، هـەروا چـوار ئـامێری دانانـەوەیان دۆزییـەوە، کـە دەتواندرا کاری پێ بکرێ، رەسامی تاوانکار لەلایەن کەنداوە داواکراوە، هاوکـات لـە ئەفغانسـتان راهێنـانی لەسـەر تەقاندنـەوەی بـۆمبێکی گـەورە کردبـوو تـا لەفرۆکەخانەی لۆس ئەنجلۆس بیتەقێنێتەوە، بـەڵام دەسـتگیرکردنی لـە ئـەنجامی ئاگـایی دەزگـای چەسـپاندنی یاسـاوە بـوو، نـەوەك لـە ئـەنجامی زانیارییـەکی هەواڵگرییەوە بێ.

نەمان دەتوانی لەو حاڵەتانە بزانین قەبارەی پیلانگێڕییەکانی قاعیدە چـەندە، بۆیە تیمەکەمان لەنێوەندی جەژنی لـەدایکبوون و سـەری سـاڵدا بیسـت و چـوار کاتژمێر لە رۆژێکدا لەکاردابوون.

لە بنکەی دژەتیرۆردا هەناسەیەکی قووڵمان هەڵکێشا، چونکە لە یەکەم رۆژی کانوونی دووەمی ٢٠٠٠ هیچ هێرشێك نەهاتە ئـاراوە، هـەروا نـەمانزانی چـەند هێرشمان شکست پێ هێنا و چەند کەسمان لە کوشتن رزگار کردووە.

لـەپاش ماوەیـەکی زۆر زانـیم قاعیـدە هـەوڵی داوە هێـرش بکاتـە سـەر کەشتییەکی ئەمریکی بە ناوی (زا سولیفان) لـە کـەناری عـەدەنی یەمـەن، وەك بەشێك لە پیلانگێڕی هەزارە، بەڵام بەلەمەکـەیان نغـرۆ بـووە، چـونکە بـارێکی زۆریان لەناو دانابوو، کاتێك لە ئامانجەکەیان نزیـك دەبنـەوە، لـەپاش دە مـانگ قاعیدە ریزەکانی خۆی رێکدەخاتەوە و هێرش دەکاتە سەر کەشی جـەنگی کـۆلی ئەمریکی لە کەنارەکانی عەدەن.

بە هۆی پیلانگێڕی هەزارە و دەزانم کە هەواڵگری ئێف بی ئای لاوازە لە نێو وڵاتدا هانی ئەوەم دا تا کارمەندەکان ئاڵوگۆڕ بکەین لەنێوان بنکـەی دژەتـیرۆر و

ئێف بی ئای، تا نووسینگەی ریــچ بتــوانن هاوکــاری نووســینگەی لێکۆڵینــەوەی فیدرالی بکەن و تێ بگەن لەوەی هەڕەشەکان چەندن بەرامبەر بە وڵاتەکەمان، لــە کۆتاییدا ئیف بی ئای لە نیۆریوك کارمەندێکی دانا لە بارەگــای ریــچ، تــا هــیچ رێگرییەك نەکرێ لەنێوان ئاژانسەکان لە گۆڕەپانی شەڕی دەرەکی و ناخۆیی.

## گریگ...

سەرکەوتنی سی ئای ئەی تەنیا پەیوەست نەبوو بە بنکەی دژەتیرۆر، بــەڵکو سەدان کارمەند و پشتگیری و شیکرەوە لەنێو ئاژانس و حکومەتدا هاوکار بــوون، هەروا دەزگای کاری شاراوە و بەشەکانی جوگرافی کارمەندی شارەزایی بۆ هــات، بەمەش پێداویستی لە ئەفسەر و سەرکردایەتی مەیــدانی پــڕ کرایــەوە، ئەمــەش بەشێوەیەکی گشتی باڵێکی بەهێزی نیمچە سەربازیی سی ئای ئەیە.

لەنێو هەموو ئەوانە هیچ کامە لە سەرکردەکان نموونەی گــریگ نــەبوو، کــە لەدوی ١١-٩ رۆڵێکی بەرچاو دەبینێ، بۆ ئەمەش لە تشــرینی یەکــەمی ٢٠٠١ دەستنیشــانی دەکــەم وەك ســەرۆکی تیمــی بڵــاوپێکردنی ترســناك لــەناو خــاکی تالیباندا ئەمەش هاوکارییەکە بــۆ تەجنیــدکردنی ملیشــیاتە ئەفغانییــەکان، تــا سەرکردایەتی جەنگێك بکات و سەرکەوتنی گەورە بەدەست بێنێ.

گریگ هەروا بەئاسانی ناخەوێ، ئــەو پــەروەردەی قووڵــایی باشــوو و کــوڕی خانەوادەیەکە ریشەیان هەیە لەنێو سەربازیدا و گیانێکی جەنگی لــەخۆ دەگــرێ، ئەمەش هاوبەشی نێوان من و ئەوە، لــە مــارێنز خزمــەتی کــردووە و لەپاشــاندا پەیوەندی بە چالاکییە تایبەتییەکان کردووە لە سی ئای ئەی، ئەمەو بــۆ مــاوەی

بیست ساڵ لەئەفریقیا و بەلکان و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست خزمەتی کردووە، ئەو باشترین کەسە لە ئەفسەرە نیمچەسەربازییەکانی سی ئای ئەی.

زۆرجاران من و گریگ گفتوگۆمان کردووە بەپێی ئەوەی من یاریدەری سەرۆکی دژەتیرۆر و بەرپرسم لە هەواڵە نێودەوڵەتییەکان دژ بە کۆمەڵە تیرۆریستەکان، ئەویش لە بارەگای سەرکردایەتی خزمەت دەکات، هەروا ئەو یەکێکە لەو سەرکردانەی بەشی چالاکییە تایبەتییەکان و بەرپرسی هێزە مەیدانییەکانە، بەمەش بنکەکەمان پێویستی بەوە بوو پەیوەندییەکی توندی هەبێ لەگەڵ بەشی چالاکییە تایبەتییەکان، دیارە هەموو ئەو پەیوەندیانە بنکەمانی بەهێزکردووە لەرووی ئۆپراسیۆنە هاویەش و پرۆژە و راهێنان بەتایبەت ئەوەی پەیوەست بوو بە بڵاوەپێکردن لە ئەفغانستان، هەروا ئەو بەشە چەکی و تەکنەلۆژیای پێشکەوتوویی پێ بەخشین، هەردەم خۆشیم دەبینی لە وتەی گریگ چونکە زۆربەی قسەکانی فراوان و گاڵتەیی بەخۆیەوە دەبینی.

ئەو باڵایەکی مامناوەندی هەیە لاوازە بەڵام بەهێزە وەك پۆڵا، هەردەم مۆدیلی قژی دەگۆڕی، ئەو کەسێکە پڕە لە وزە و توانا، هەر کاتێك هەستی بە دڵەڕاوکی بکردبوایە سەبارەت بەبابەتێك یەکسەر وەرزشی راکردنی دەکرد بۆ ماوەی چەند میلێك، زۆرجاریش وەرزشی راکردنی لە گەرمای نیوەڕۆیان دەکرد.

جارێکیان یەکێك لەپێیەکانی بریندار بووبوو، بەڵام هەر بەردەوام بوو لە راکردن، بەڵام بەشێوەیەك لەشێوەکان چاك بوو بۆوە، بەبیرم دێ جارێکیان هاتە ژوورەکەم واتە دوای رووداوەکانی ١١-٩.

-سڵاو سەرۆك، ئایا تۆ سەرقاڵی، (بینیم سەری لەدەرگا هێنا ژوورەوە).

-بێگومان من سەرقاڵم، ئێمە لە هەموو شوێنێکدا ڕاوی ئەو تیرۆریستانە دەنێین، دەمەوێ کاری زیاتر بکەین ئەگەر پێمان کرا.

هاتە ژوورەوە و لەسەر ئەو تاکە کورسییە دانیشت کە لە ژوورەکەمدا هەبوو.

وەك پێشتر جلوبەرگەکانی بەتەواوی ئوتوو کرابوو، ماسولکەکانیشی وەك تەلی نەخشێندراو وابوو، دانیشتنەکەمان لەنهۆمی خوارەوەی ژوورێك بوو بەبێ ئەوەی پەنجەرەی هەبێ.

ئێمە لە کۆتایی کانوونی دووەمی ٢٠٠٠ دابووین، لەو کاتەی توانیمان زۆرێك لە پیلانگێڕییەکان شکست پێ بهێنین هەردەم هەستمان بە شانازی دەکرد، بۆ ئەمەش ساندی برگری ڕاوێژکاری ئاسایشیی نەتەوەیی وا وەسفی کرد کە ئۆپراسیۆنەکانمان سەرکەوتنی بەدەست هێناوە لەنێوەندی مێژوویی بەرپەرچدانەوەی تیرۆر و سوپاسی کردین، کەچی کۆشکی سپی و جەماوەر وەك ئەوەی ئاگاداری هیچ نەبن بەرامبەر بە هەوڵەکانی دوژمن، ئێمەش چۆن ئەو پیلانگێڕییە تیرۆریستیەمان شکست پێ هێناوە، دڵتەنگ بووین لەوەی کۆشکی سپی ناتوانێ گەورەیی ئەو هەڕەشەیە حسێب بکات.

گریگ بەو جۆرە بابەتانە دڵتەنگ دەبوو بەتایبەتی دڵتەنگ لەوەی حکومەتی ئەمریکی لەپاش ئەو هەموو بەڵگەیە و دەرخستنی نیەتی قاعیدە وەك ئەوەی هیچ نەبوو بێ، واتە بڕیاردەرەکان بە چاوی ڕەزامەندییەوە ناڕواننە کارەکانمان.

لێی پرسیم: ئەوانە لەوێدا چی دەکەن؟

-لە وەڵامدا گوتی: لەڕاستیدا پێویستە ئێمە لەجەنگدا بین، لەو کاتەی سەرۆك و نەتەوەکەمان نازانن ئێمە لەجەنگداین.

" ئەوان خەڵك لە نایرۆبی و دارسەلام دەكوژن، لەپاشاندا پیلانگێڕی هـەزارە ڕێكدەخەن، ئەوانە بەگاڵتەوە باس لە دەستگیركردنی و دۆزینەوەی بنلادەن دەكەن، ئەمە مانای چییە؟ ئایا ناتوانین بیكوژین یان دەستگیری بكەین؟ پێویستە خۆمان گلۆپی سەوز داگیرسێنین، هەروا پشت بە پیاوانی خێڵـە ئەفغانییـەكان ببەسـتین، بەڵام ناكرێ زۆربەیان هەتا ناشتوانن بخوێننەوە، ناتوانین زاڵ بین بەسەریاندا، هـەتا كەس لەنێو ئەم باڵەخانەیە درك بەو بابەتە ناكات".

-من لەو باڵەخانەیەم.

-تۆ و كۆفر درك بەوە دەكەن، هەروا بەڕێوەبەریش، بەڵام نازانم چەندی دیكە درك بەو بابەتە دەكات... بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە تۆش ئاگاداری.

-سوپاس

-سەرچاوان.

"گوێبگرە ئەو كاتە دێ، بەڵام ئەو كاتە زۆر نـاخۆش و قورسـە، ئـەو كـات دەبێ لەناو شاردا وەڵامیان بدەینەوە و ئەمەش دەبێتە ڕشتنی خوێنێكی زۆر".

لەپێشتردا ئەم داڕشتنە میلودرامیەم لەگەڵ سەرۆك بەشەكانی سی ئای ئـەی باس كردووە، هاندان لە ئامادەباشیدا بن، لەوانەیە بەرپرسانی بەشی جـوگرافی وا تێگەیشتوون من بانگـەوازی شـەڕ دەكـەم یـان بیرۆكراتیـەكی فێـڵ زانم، یـان وا تێگەیشتبن تا كەرەستەیەكی زیاتر بۆ دژەتـیرۆر بەدەسـت بێـنم و دەسـتم بخەمـە دەسـتی دەسـەڵاتەكانەوە تـا كارەكانـان بكـەین، تێگەیشـتنی ئـەوان لەوانەیـە لەجێگەی خۆیدا بێ چونكە بەشێك لـە سـەركردەكانی سـی ئـای ئـەی دەسـتیان خستبووە كاری دەوڵەتەكانی دیكەی نێو ئەفغانستان، لە كاتێكـدا كارەبـا تـەنیا شەش لەسەدا گەیشتۆتە ئەوێ، ئەمەش هەڕەشەیەكی گەورەیە بۆ هەموو جیهان و

هێزە زەبەلاحەکان، ئێمە لە جەنگدابووین، بەڵام لـە زۆر حاڵەتـدا درکمـان بـەوە نەدەکرد، چونکە هیچ کاتێك رووبەڕووی شتی وا نەبووبووینەوە.

زۆر بەبێزاییەوە گوتم" گوێبگرە تۆ لە هەموو کەسێك زیاتر ئـەوە دەزانیـت، تەنیا کۆمەڵێك ئەفسەر هەن ئامادەن بۆ جەنگ لەبەرامبەر قاعیدەدا، ئەو کـارە دەخەینە سەر ئەستۆی خۆمان، تەنیا ئێمە هەین، بەڵام ئەم کارە زۆر قورس دەبێ، زۆر کـەس هـەن نـاتوانن درك بـەوە بکـەن، بـەجۆرێك یاریـدەری بەڕێوەبـەری ئۆپراسـیۆنەکان دەیـەوێ راهێنـانی نیمچەسـەربازی ئەفسـەرەکان بوەسـتێنێ، بەبیانووی ئەوەی پێویست ناکات".

گریگ بەهێواشی گوتی" بەڵێ گوێم لەوە بووە، چۆن بەرگری هەیە، زۆربەیان شێتەکانی پنتاگۆنن".

لەپاش بێدەنگییەك گوتم " پێویست ناکـات خۆمـان لـەو بابەتـە بـەهیلاك بـدەین، ئێمـە نەتەوەیـەکی مـەزنین، هـەروا پیـاو و ئـافرەتی مـەزنمان هەیـە و لەخزمەتدایە، بەڵام ئێمە هەڵەکە دەقۆزینـەوە، پێویسـتە لەئامادەباشـیدا بـین و هانیان بدەین، تەنیاش ئەوەندەمان پێ دەکرێ، نـاتوانین کەرەسـتەی زیـاتر دابـین بکەین، ئێمە سیاسەت دانانێین.

بەو قسانە بێزار بوو و لەپاش چەند چرکەیەك لەسەر کورسییەکە هەڵسـایە و بەرەو دەرگاکە رۆیشت و گوتی "من دەچم کەمێك رادەکەم".

## ئەحمەد شا مەسعوود

پیلانگێڕی هەزارە جەخت لەوە دەکاتەوە چۆن تێ بگەین لە پیلانی قاعیدە، ئەمەش وەك سەرەتایەك بۆ کۆکردنەوەی هەواڵگرییەکان واتە شکاندنی ئاسایشی سیاسی لە ئەفغانستاندا.

بنکەی دژەتیرۆر چەندین ئۆپراسیۆنی لە ئەفغانستاندا ئەنجام دا و دەستکەوتیشی هەبوو، ئەم ئۆپراسیۆنانەش هەواڵگری مرۆڤایەتی و تەکنیکی بوو، بۆ هەر یەك لە تۆڕەکانی تاکلایەن و دەزگا ناوخۆییەکان، پێویستم بەو بوو سەردانی ئەو ناوچەیە بکەم کە ئەحمەد شا مەسعوود و یەکێك لە ئەفسەرە هاوبەشەکانی دەزگای ناوخۆیی و سەرۆکی بەرەی یەکگرتوو بکەم، لەپێشتریشدا تیمێکمان بۆ ئەفغانستان نارد تا پشتگیری لە شا مەسعوود بکات، ئێمە ئێستا پلان دادنێین ئەو هاوکارییە فراوان بکەین.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠ لەگەڵ مایك سەفەرمان کرد، بۆ ئاسیای ناوەڕاست، مایك بەڕێوەبەری بنکەی دووەمە لە سەرکردایەتیی بەشی ئاسیای ناوەڕاست، لەگەڵ دەزگا ناوخۆییەکان دانیشتین و بەدواداچوونمان بۆ بەرنامە هاوبەشەکانمان کرد بۆ بنبڕکردنی تیرۆر، بۆ ماوەی دوو ڕۆژ سەیری سنووری ئەفغانستانمان کرد و لەگەڵ بەرپرسی ناوچەکە کۆ بووینەوە، ئەو کاتە لەسەر زێی ئامۆ داریا بوو و لەوێوە سەیری دالدەی تیرۆریستە ئەفغانییەکانم کرد، کە دوورییەکەی تەنیا چەند مەترێك بوو، بێ ئومێد بووم لەوەی سی ئای ئەی بتوانێ لێرە بەردەوام بێ، بۆیە تاکە بژاردەم بەرەی یەکگرتوو بوو لەگەڵ شا مەسعوود، بۆ ئەمەش من و مایك بۆ لای شا مەسعوود ڕۆیشتین.

## هونەری سیخوڕی

ئەفسەرێکی ناوچەیی لەگەڵمان هات ئەو کەسێکی زۆربلێ بوو، بە هیچ شێوەیەك لەناو دەزگای شاراوە جێگەی نابێتەوە، چەندین کاتژمێر بەرێگاوە بووین و دەم نادەم قسەی قۆڕ و بێ مانای دەکرد، هەتا وام بیرکردەوە لە شوێنێکی دوورەدەست جێ بهێلین، بە مایکم گوت هەر هیچ نەبێ ئەو ئەفسەرە دەربکەین، کەچی مایك گوتی سەرەتا دەبێ کارەکەمان تەواو بکەین.

یەکێك لە سنوورەکانمان تێ پەڕاند و لەپاشاندا سواری فرۆکەی یاك ٤٠ بووین و چیایەکانمان بڕی و گەیشتینە دۆشنبێی تاجیکستان، شارێکی زۆر ناخۆش و پیس بوو لە هەموو لایەکەوە چیایەکان دەوری دابوو، بەڵام بەفرەکەی دەبریسکایەوە، هەروەها ئەو شوێنە بنکەیەکی زۆر گرنگە بۆ بەرەی یەکگرتووە و بنکەی دژەتیرۆر بەرامبەر بە ئەفغنستان.

لە یەکێك لە بنکە گرنگەکانی چاوەڕوانی شا مەسعوودمان کرد، بە مایکم گوت تەنیا ئێمە بەشداری ئەو کۆبوونەوەیە دەکەین.

ئەحمەد شا مەسعوود جەنگاوەرێکی ئەفغانییە، زۆر جاریش بەزیی بە هیچ نایەتەوە، هاوکات بەدرێژایی دە ساڵ نەی هێشت سۆفیەت بچێتە ناو دۆڵی بنجشیر و وەك پاڵەوانێك نازناوی "شێری بنجشیر"م پێ بەخشیووە، ئەو پێکهاتەیەکە لە حکومەتی ئەفغانی لێکترازاو کە لەپاش پاشەکشەی سۆفیەت دەسەڵاتی گرتە دەست، بەڵام زۆری نەبرد شەڕی ناوخۆیی دەستی پێ کرد ئەمەش وای کرد تاڵیبان بەدەربکەوێ، شا مەسعوودیش چووە نیشتمانەکەی خۆی لە بنچشیر و بووە سەرکردەی بەرگریکاری ئەفغانی دژ بە تاڵیبان، ئەم چاوپێکەوتنە یەکەم و دوا چاوپێکەوتن دەبێ لەو کاتەدا.

## هینری ا. کرامبتۆن

ئۆتۆمبیلەکـەمان بـەرەو شـەقامێکی تەسـك رۆیشـت و ئـەولا و ئـەولای شەقامەکە دارودرەخت بوو، مایك سەیری دەرگاکـەی کـرد، کەشـەکە لـەژوورەوە تاریك بوو، بـەرەو ژوورێکـی بچـووك رۆیشـتین کـە چـەندین دار دانراوبـوون بـۆ سووتاندن و بۆنی سووتانم کرد، لەژوورەوە مێزێکی نـزم دانـراو بـوو لەسەریشـیدا چەندین چەرەز و زەڵاتە دانرابوو و چەرەزەکەش لۆز بوو، لەتەکیشدا کتلییەکی چا، کە لەدەوریدا چەندین پیاڵەی نەخشێندراو بەسیرامیك دانرابوو.

شا مەسعوودی باڵابەرز و بەهێز بە خەندەیەکی گەرم پێشوازی لـێ کـردین، تەوقە کردنەی بەتونـدی نـەبوو و بـەهێمنی جوولـەی کـرد، هـەروا عەبـدوڵڵاش پێشوازی لێ کردین، کە وەزیری دەرەوەی بەرەی یەکگرتوو بوو، هاوکات ئـەمرلڵا رۆڵی وەرگێڕانی دەبینی، شا مەسعوود بە زمانی تـاجیکی قسـەی کـرد، لەگـەڵ کەمێك فەرەنسی.

من و مایك سڵاو و ریـزی تینیتـی بەڕێوەبـەرمان پـێ گەیانـد، هـەروا شـا مەسعوود پرسیاری سەبارەت بە ریچ کرد و کەمێك قسەی خۆشمان کرد.

لەپاشـاندا گفتوگۆیـەکی دوورودرێـژمان سـەبارەت بـە تاڵیبـان و خێڵـە ئەفغانییەکان کرد لەتەك ئەو دەرزە هەواڵگریانەی کە لەلایـەن سـی ئـای ئەیـەوە هاتۆتە کایەوە، هەروا باسی پێداویستە هەواڵگرییەکان و تێکـدان و وێرانکـردن و سیاسەت کرد، شا مەسعوود چاودێرێکی سیاسی زیرەك بـوو، چـەندین پرسـیاری گرنگی سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا کرد، پرسیاری سەبارەت بە ئێران و پاکستان و ئۆزپاکستان کرد، هەروا لە هـەموو شـتێك زیـاتر دەیویسـت زیـاتر سەبارەت بە قاعیدە زانیاری هەبێ، واتە چۆن و کەی دەتوانێ هێرش بکاتـە سـەر ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەرژەوەندیەکانمان؟ چۆن دەتوانین بیوەستێنین؟

نزیکەی دوو کاتژمێر قسەمان کرد و بەردەوام چامان دەخواردەوە و لۆزمان دەخوارد و لەبەرامبەر ئاگرەکە دانیشتبووین، لەو کاتەی لەدەرەوەدا بەفر دەباری، نزیکەی تەواوبوونی کۆبوونەوەکانمان شا مەسعوود پرسیارێکی دیکەی کرد و زۆر بەهێمنی و بەڕێزەوە و بەدەنگێکی قورس و پڕ لە ناوەڕۆك گوتی:

"ئایا حکومەتی ئەمریکی گرنگی بەبنبڕکردنی قاعیدە دەدا و دەیەوێ بنلادن بکوژێ، زیاتر لەوەی گرنگی بە گەلی ئەفغانستان بدات؟".

سەیرێکیم کرد بە روونی پێم گوت :قاعیدە.

وەڵامێکی ئاساییە چونکە سی ئای ئەی کارەکەی بەپێی فەرمانی کۆشکی سپییە، هیچ گفتوگۆیەك نییە سەبارەت بە هاوکاری مرۆڤایەتی و داهاتووی ئەفغانستان یان کارێك بکرێ سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە، هەردەم شا مەسعوود درکی بەوە دەکرد کە هەردەم دوو رێگە هەیە یەکەمیان شەڕکردن لەگەڵ دوژمن، دووەمیان تێگەیشتن لەگەل و راکێشانی تا دەستکەوت بەدەست بێنێ، ئەوەش هیچ پاساوێك نییە، بەڵکو سەرەتای سیاسەتی هەر سەرکەوتنێکی بەردەوامە.

هەردەم لەبیرمە چۆن وەڵامی دامەوە کاتێك سەر لەقاند و خەندیەکی بێ ئومێدی نواند.

لەپاش ئەمە لەپێش ١٨ مانگ هەروا لەپێش دوو رۆژ لە رووداوەکەی ١١-٩ چەکدارەکانی قاعیدە شا مەسعوودیان کوشت لەپاش ئەوەی بەجلوبەرگی رۆژنامەنووس چووبوونە لای، ئەمەو بۆمبە شاراوەکە لەنێو کامیرای ڤیدیۆیەکەدا تەقییەوە، دوژمن دەیزانی بەهای شا مەسعوود چەندە لەلای ئێمە بۆیە کوشتیان، دەشکرێ هاوپەیمانە ئەفغانییەکان بەبێ سەرۆك بمێنەوە، لەپاش ئەوەی هێرشیان بۆ ناو ئەمریکا کرد.

پێدەچێ دوژمن کەسی وەك شا مەسعوود بەکەمزانبێ، کاتێك بەردەوام هاوبەشمان بوو.

## بریداتۆر

سەرەڕایی هەموو سکاڵاکانمان سەبارەت بە وەڵامنەدانەوەی حکومەتەکەمان دەربارەی قاعیدە، دەستپێشخەریەکی نوێ وای کرد پێداویستی بڕیاردەرە سیاسییەکان بهێنێتە پێشەوە، ئیدارەی ئەمریکی دەویست زانیاری کۆبکەینەوە لەمەڕ ئەوەی ئوسامە بنلادن لەوانەیە لە شوێنێکی چەسپاو بێ، بۆ ئەمەش دژەتیرۆر بۆ ماوەی چەند ساڵێك چەندین زانیاریی وردی لە سەرچاوەکانی هەواڵگرییەوە دەستکەوتبوو سەبارەت بە بوونی ئوسامە بنلادن لە شوێنێکی چەسپاو ئەمەش پاساوی دا بەدەستەوە تا کارێکی کوژێنەر ئەنجام بدەین، بەڵام بڕیاردەرە سیاسییەکان گومانیان لە تۆڕی هەواڵگریمان هەبوو، بۆیە دەیان ویست چاویی ئەمریکییەکان زیاتر لەسەر ئامانجەکە بێت.

لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٠ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی یاداشتێکی دەر کرد تیایدا چەند ڕێنمایەك ئاراستەی سی ئای ئەی کرابوو، ئەویش بە دۆزینەوە ئامرازێك بۆ دۆزینەوەی بنلادن بە بەڵگە، تا ببێتە تاکە بەڵگە، بۆ ئەمەش وەزارەتی بەرگری ڕەتی کردەوە سەربازەکانی بنێرێت بۆ گۆڕەپانی شەڕ، بۆیە پێویستی دەکرد پرۆسەی گەڕان بەردەوام بێ، هاوکات جەختیش لەوە کرایەوە کە بنکەی دژەتیرۆر چەند تیمێکی ناردووە بۆ ئەفغانستان بۆ گەڕان، تا لەدواتردا ئەوەی سووپا پێی دەکرێ بیکا، دیارە ئەمەش ڕەت کرایەوە لە ئێستادا، چونکە پرۆسەی چوونە ژووری سووپا زۆر ئاسانە، بەڵام ترسناکییەکەی قورسترە.

## هونەری سیخوڕی

لەپاشاندا قسە لەسەر ئەوە کرا، کە دەتوانین بنکەیەك لەناو ئەفغانستاندا دابنێین، بەتایبەت لە دۆڵی بنجشیر، وەك شوێنێك بۆ ناردنی کارمەندانی سی ئای ئەی کاتێك لە پرۆسەی گەڕاندان، بەڵام ئەمە لەلایەن هاوپەیمانە ئەفغانییەکانمانەوە رەت کرایەوە، لەپاشاندا سەرکردەکانی سی ئای ئەی بەهەمان شێوە ئەمەیان رەت کردەوە، چونکە ئەم پرۆسەیە ترسناکە و خەرجییەکی زۆری دەوێ.

بۆیە دەبوایە ئامرازێکی دیکە بدۆزینەوە.

ئەنجوومەنی ئاسایشیی نەتەوەیی لە یاداشتەکەی سی ئای ئەی دەستنیشان کرد، بەدیاریکراویش بنکەی دژەتیرۆر، چونکە خودی هەواڵگری ئەو ئۆپراسیۆنە ئەنجام دەدات، لە کاتێکدا کارایی و دەسەڵاتی بەدەستهێناوە بە هۆی ئەو یاداشتەوە فراوانی کردووە، لەمەوەش بنکەی کردەییەکان بەتەنیا دەوامی تەواویان دەکرد بۆ ئەوەی هەموو رووییەکی پلانی قاعیدە بزانن، لە کاتێکدا ئێمە تاکە کیان بووین لە هەموو حکومەتی ئەمریکی کە لەسەر بنلادن و قاعیدە کار دەکەن، ئەمەش بەتایبەتی لە ئۆفیسەکەی ریچدا.

من و ریچ پەیوەندییەکی کاری نوێمان پەیدا کرد، ئەو هەردەم سکاڵای لەوە دەکرد، کە کەرەستە و ماددەکانی کەمن، هەردەمیش داوام لێ دەکرد کاری مەحاڵ بکات، بۆیە نزیکبوونەوەی ئێمە لەیەکتری بووە هۆی پاڵەپەستۆیەکەی زیاتر.

ریچ هیچ کاتێك ماندوو نابێ، ئەو کەسێکی راستگۆ و زیرەکە، هەردەمیش تیمەکەی بەرەو بەهێزتر دەبات، هەردەم سەرۆکەکانی بەدەنگ سەرۆکایەتی ئەوەوە دەهاتن، بەڵام ئەو زیاتری دەویست، هاوکات زۆرێك لەوانەی تەجنید کرد، کە

کەسانی ئازا و هەردەم گرفت دەنێنەوە، هەموو ئەوانەش هەر کاتێك داواکاری زیاتریان هەبوایە بۆی جێ بەجێ دەکردن، هەموو ئەمانەش هۆیەکە تا سەرۆکەکانی باشتر بەدەربکەون.

ریچ لە مانگەکانی داهاتوو بە هۆی ئاستە باشەکانی دەبێتە جێگەی سەرسوڕمان، لەو کاتەی سیستەمی گەڕانی بەهێزتر، ئەمەش وەك شۆڕشێك وابوو لە کۆکردنەوەی هەواڵگریدا، هەروا وەرچەرخانێك دەبێ لە هەموو بوارەکانی جەنگ.

ریچ کاری لەسەر هەموو ئەو گرفتانە کرد، کە ئاڵنگارین لەپێش تەکنیك و ئەو گرفتانەی لەنێوان ئاژانسەکاندا هەیە، هەموو ئەمانەش لە یاداشتی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی هاتبوو، لەسەرەتادا رووی لە ئەفسەرێکی گەنج بەتوانا کرد، ئلیك پسپۆڕ بوو لە نێو هەواڵگری پنتاگۆندا و رەوانەی تیمی ری کرابوو، ئەو وەك خۆبەخشێك چوو بووە ناو سووپا و شایستەی ئەوە بوو پلەی بەرز بکرێتەوە لە کاتێکدا لە کۆریا خزمەتی کردبوو، لەپاشاندا هەواڵگری وەك شیکرەوەی پنتاگۆن بەکاری هێنابوو، هاوکات کرابووە سەرۆکی ئۆپراسیۆنەکان لەپاش تەقینەوەکانی خوبەری ١٩٩٦ وەك شانەیەکی ئامانجگیری هاوبەش، ئلیك لەو شانەیە کارکرد تا هەردوو تەقینەوەی ١٩٩٨ لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا، دواتر لەدەستبەکاربوونی من و ریچ لە ئابی ١٩٩٩ هاتە نێو بنکەی دژەتیرۆر.

یاداشتەکەی کانوونی دووەمی ٢٠٠٠ داوایکردبوو لە ماوەی نۆ مانگدا چارسەرێك بدۆزنەوە، ریچ و ئلیك لەو کاتەی گفتوگۆیان لەو بابەتە دەکرد، یاداشتەکەیان لەدەست دا بوو، بۆ ئەمەش بەدوای وەڵامدا دەگەڕان، چەندین تاقیکردنەوەیان لەسەر ئامێری بینینی چەسپاو ئەنجام دا، بیریان لە بەرزکردنەوەی

بالۆنی گەورە کردەوە، بەڵام شارەزایان پێیان ڕاگەیاندن کە بایەکە بالۆنەکە بەرەو چین دەبا، ئەمەش کارێکی باش نییە، لە کۆتاییدا بیرمان لە فرۆکەی بێ فرۆکەوان کردەوە، هەموو لایەك ڕازی بوون بەوەی ئەمکارە سەردەکەوێ.

کۆمەڵەیەکی زۆر لە بەرپرسان ئەم دەستپێشخەریەیان پێ باشبوو بۆیە لەڕووی سیاسییەوە جوولەیان پێ کرد، ریچارد کلارك ڕۆڵی سەرکردایەتی دەبینی سەبارەت بەو یاداشتەی کە ئەنجوومەنی ئاسایش دەری کردبوو، هەروا چارلی ئالن یاریدەری بەڕێوەبەری کۆکردنەوەی هەواڵگری لەگەڵ ئەمیرال فرای لە ئۆپراسیۆنی پنتاگۆن ڕۆڵێکی بەرچاویان گێڕا لەمبارەیەوە، کلارك توانی هەموو گرفتە بیرۆکراتییەکان لابەری لەلایەن ئاژانسەکان و وەزارەتی بەرگری، بەتایبەتیش یەکەی فرۆکەوانی، بەتایبەتی ئەوانەی رقیان لەوە بوو فرۆکە بێ فرۆکەوان بفڕێ، لە کاتێکدا لە سی ئای ئەی تینتی بەڕێوەبەر لەوە تێگەیشتبوو کە ئەو کارە پێویستە، بەڵام دڵنیا نەبوو لە ترسناکیی ئەو پرۆسەیە، دیار بوو بافێت لەگەڵ هەموو هەوڵەکاندا بوو، بەڵام من و کوفر هەردووکمان لەڕووی تەکنیکییەوە گومانمان هەبوو، پێمان وابوو پێویستە تاقی بکرێتەوە، چونکە پیلانگێڕی هەزارە کارەساتێکە بۆ خۆی، هەردەبێ لەبار ببرێ، قاعیدە دەیەوێ هێرشی زیاتر بکات، بۆ ئەمەش کۆفر پێنج ملیۆن دۆلاری لە بودجەکەی تەرخان کرد بۆ پرۆگرامی فرۆکەی بێ فرۆکەوان، ئەمەش پێکهاتەیەکی گەورە بوو، لەڕووی ناوخۆییەوە باسی فرۆکە بەکارێکی گونجاو سەیر دەکرا، لە کاتێکدا بەبێ فرۆکەوان دەفڕێ، هەروا پێویستی بە مانگی دەستکرد نییە، لەلایەکدا سەرۆکی بەش ویستی ئەو بەرنامەیە پەسەند بکات، بەو شێوەیە ریچ و ئلیك چوونە دەزگای فرۆکەوانی تا "بریداتۆر"یان دۆزیەوە، ئەو فرۆکەیە بە شێوەیەکی گونجاو کارەکانی لە بەلکان ئەنجام دابوو، بۆیە شێوەیە تەکنەلۆژیایەکی چەسپێندراو بوو، لەپاشاندا ریچ و

ئلیك چوونە ناو یەکێك لە دەزگاکانی هێزی ئاسمانی تا ئەو فرۆکەیە لە یەکێك لەمۆڵگەکان بدۆزنەوە، لەوێش بینیان تۆز هەموو لایەکی فرۆکەکەی داگرتبوو.

"بریداتۆر" ئامێرێکی ساکارە وەك فرۆکە شیراعییەکان بوو، دوو مەکینەی هەبوو کە پانکەیەکی پێ دەخولێتەوە، هەردوو لاباڵی ٥٥ پێ بوو، درێژییەکەشی ٢٧ پێ بوو، بارەکەی ٤٥٠ رەتلە، بەبەرزی ٢٥ هەزار پێ بەرز دەبێتەوە بەشێوەیەکی خێرا دەگاتە ١٣٨ میل لە کاتژمێرێکدا، بۆ ماوەی چل کاتژمێر لە ئاسماندا دەمێنێتەوە، هەموو ئەو توانایانە لەگەڵ پێویستییەکان هاوشان بوو، بەتایبەتی توانای مانەوەی بۆ چەندین کاتژمێر و زۆریش بەرزدبێتەوە و زۆریش زەحمەتە رادار ببینێ، ساکارییەکەشی هۆیەکە بۆ دڵنیایی و بەهێزی.

ئێمە لەبنکەکەدا بە شتێکی ساکارمان زانی، بەڵام سیستەمی فڕین بەبێ فرۆکەوان کارێکی ئاڵۆزە، بۆیە سەرکردایەتی پەیوەستی کرد بە کەشتی ئاسمانی، لە سەرەتادا گفتوگۆیەکی زۆری لەسەر کرا، چونکە دەبێ هەموو ئامادەکارییەکانی لۆجیستی دابین بکرێ بۆ گەڕانەوەی بۆ سەر زەوی، لەوانەیە ببێتە ئالنگارییەکی دیکە سەبارەت بەبواری ئاسمانیی نێودەوڵەتی و پەیوەندییە هاوبەشەکان و ئەو بابەتانەی پەیوەستە بەسەروەری نیشتمانی.

جگە لەوەی ئەم سیستەمە چەندین پرسیار لەخۆی دەگرێ چ لەرووی سروشتی جەنگ، لەوانەشە مووشەکی هلفایەر لە فرۆکەکە بخرێ.

تیمی ریچ پێویستیان بەوە بوو تا فرۆکەی بێ فرۆکەوان پەیوەست بکەن بە سیستەمی فرۆکەوانی، لەدواتریشدا دەچنە ناو سیستەمێکی ئاڵۆزتر بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان لە هەموو سەرچاوەکانەوە، لە سەرەتا ویستمان بنکەیە بۆ بریداتۆر دابنێین، لەپاشاندا لەچ شوێنێك بەکاری بێنین، بۆ ئەمە ئامرازەکانی

بینین چەندین وێنەی شوێنە بەرزەکانی نیشان دایـن، لەتـەك ئـەوەی بیـنین هـەر بەتەسکی مایەوە، کارەکە وای لێ هاتبوو لەئاسماندا لوولەکی کۆکـاکۆلا ببیـنین، هەروا دەبوایە بە هەموو سەرچاوەکانی هەواڵگری رابگەیەندرێ کـە بریـداتۆر لـە شوێنێکدا دەفڕێ، یاخود چۆن بەرەو چ لایەکی بنێرین.

ریچ و تیمەکەی لە ساڵی ٢٠٠٠ بەبێ وەستان کاریان کرد بـۆ دروسـتکردنی سیسـتەمێك بـۆ کۆکردنـەوەی زانیاریـیـەکان، بـۆ ئەمـەش هـەموو هـەواڵگرە مرۆڤەکانی سی ئای ئەی چ تاکلایەنە و پەیوەندیدارەکانیان نارد تـا بگـەڕێن بـە دوای سەرکردەکانی قاعیـدە لـە ئەفغانسـتان، هـەموو ئەمانـەش لەتـەك تیمـی بریداتۆر، ئەم ئۆپراسیۆنە بە شێوەیەکی راستەوخۆ ئـەنجام درا، سـەرەڕایی ئـەوەی ریچ بەرپرسی کۆکردنەوەی زانیارییەکان بوو لە دژەتیرۆردا، هاوکات هـەواڵگریش هاتە ناو ئەم بابەتە وەك پەیوەندییەك لەگەڵ تیمەکەدا، ئەمەش کارەکەی ئاسـان کرد ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی هەموو دەسەڵاتەکانی دا بە بنکـەی دژەتـیرۆر، بەشـێوەیەك سەرپەرشـتی گـەڕانی نیشـمانی دەکـرد لـەرووی وێنـەی کەشـتییە ئاسمانییەکان، هەروا چارلز یاریدەری بەڕێوەبەری سی ئای ئەی هاوڕێیەکی نارد بۆ هاوکاریکردنمان، چونکە ئەو درکی بە هەڕەشەکان کردبوو، بۆیە هەردەم هاوکـاری دەکردین.

یەکێك لە تیمی فرۆکە بێ فرۆکەوانەکان کە سەر بـە ریـچ بـوو لـە بنکـەی سەرکردایەتی لەتەك شاشە ڤیدیۆیەکاندا، کە لە شوێنێکی بەرزی دیوارەکە دانراو هەروا لەخوارەوەش چەندین وێستگەی کۆمپیوتەریش دانرابوو، واتە ئـەو شـوێنە هەموو بوو بـە ئـەلیکترۆن و چـالاکی مێشـکێکی خـام، بـەو شـێوەیە هـەموو هەواڵگرییەکانی جیهان چووە نێوەنـدی کۆمپیوتـەرەکان، هـەروا ریـچ هـەوڵی دا

سیستەمی فرۆکەی بێ فرۆکەوان دروست بکات، لەم نزیکانەش بریدانۆر لە ئامادەباشیدا دەبێ بۆ فڕین و وێنەکێشانی نەخشەیەك لە ئەفغانستاندا.

زۆر بەئاسانی توانیمان پەیکەری فرۆکەکەمان دەست بکەوێ، چونکە کەس نەی دەویست، هەموو لایەکیش چاوەڕوانی ئەوە بوون چۆن بریداتۆر لەسەر ئەفغانستاندا دەبێ تا کارێکی سەرەکی لە ئاسمانی ئەفغانستاندا ئەنجام بدا، کلارك و فرای و کۆفر دەیانویست بەرەو لووتکە هەنگاو بنێن، لەتەك وردە گاڵتەکانی کلارك، لە کاتێکدا رۆجر کریسی جێگری رۆڵێکی بەرچاوی گێڕا وەك ئاسانکارییەك، لەو کاتەدا ریچ و ئلیك پەیوەندییان بە هاوپەیمانەکان سەبارەت بە بۆچوونە لێکچووەکان، سەبارەت بە پلە و سەرمووچەی ئەوانەی خوارەوە، هەروا بۆ ئاستە پێشکەوتووەکان لە ناو هەموو کۆمەڵگەی ئاسایشی نەتەوەیی.

راستە کارەکە لەژێر سەرکردایەتی بنکەی دژەتیرۆر بوو، بەڵام زۆرێك لە ئاژانسەکان رۆڵی سیاسیان دەبینی سەبارەت گرفتی تیمەکە لەرووی پسپۆڕییەوە، چونکە ئلیك و ریچ هیچ یاداشتێکیان مۆر نەکردبوو لەگەڵ هێزی ئاسمانی، بەشێوەیەك تۆڕێکی دانابوو زۆر بە متمانەوە لەنێوەندی دەزگاکانی هەواڵگری و ئاسایشی ئەمریکی دەسوڕایەوە، بۆ ئەمەش وەزارەتی بەرگری لە پشتگیرییەکانی بەردەوام بوو، لە کاتێکدا هێزی ئاسمانی تەکنەلۆژیایەکی فرە پێشکەوتوویی لەدەستدا بوو بۆیە هاوکاری هەواڵگری کرد بە دابینکردنی شیکەرەوەکان، هاوکات ئاژانسی نیشتمانی وێنەگرتن و رووبەر هاوکاریکردین لەرووی جوگرافیای شوێن و وەبەرهێنان تیایدا، هەروا سەرکردایەتی ناوەندی ئەفسەرێکی پەیوەندی بۆ ناردین، جگە لەوەی زۆرێك لە ئاژانسەکان بەڕێوەبەری ئۆپراسیۆنەکانیان بۆ دابین کردین، بەمەش بنکەی دژەتیرۆر لە هەموو روویەوە بەهێز بوو سەبارەت بە کۆکردنەوەی زانیاری لە هەموو بەشەکانی سی ئای ئەی.

لەلایەکی دیکەوە چەکی کەشتییە ئاسمانییەکان بابەتێکی زۆر ئالۆز بوو، چونکە دەگمەنە و نرخەکەشی بەرزە، من و کۆفر زۆربەی کاتەکانمان باسمان لەو بابەتە دەکرد، لەو کاتەی دەبوایە بنکەکەمان لە ئۆزپاکستان چاك بکەینەوە، بۆیە ریچ ئلیك لەو رۆژگارەدا سەرکردایەتی هەموو تیمە جۆراوجۆرەکانیان دەکرد بەتایبەتی ئەو ئاژانسانەی کە گرێبەستی لەگەڵیاندا واژوو کردووە.

تۆڕێکی دینامیکیمان لە هەموو ئەفغانستاندا پێشخست، بەو شێوەیە هەواڵگرە مرۆڤەکان تەواوکەری هەواڵگری ئاماژە و ئەو هەواڵگریانەی پشتی بە وێنە دەبەست، دوژمنمان ناسی و زانیمان بریداتۆر بۆ کوێ بنێرین، ئەمەش کارێکی یەکلارەوەیە بۆ بینینی تەسکی کامیرا، لە کاتێکدا کە وێنەکانمان گەورە دەکرد شتێکی شاکار بوو، بۆ ئەمەش شیکەرەوەکانی ئاژانسی نیشتمانی وێنەگری و رووبەر توانیان هەموو مارکە و مۆدیلێکی ئۆتومبیلەکان و پێوانەی کەسەکان بزانن، وێنەکان زۆر روون بوون، هەردەمیش هاوێنەکان دەسوڕانەوە و بە ئارەزووی خۆمان دوور و نزیکمان دەکرد، فرۆکەکە زۆربەی کاتەکان بەهێمنی بەئاسمانەوە بوو بەتایبەتی لەو بەرزیانەدا، هیچ کەس نەی دەتوانی هەست بەوە بکات کە لەو ئاسمانە شتێك هەیە و دەست بخاتە ناوباسەکانەوە.

بریداتۆر لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا لەسەرووی پێشبینیەکانی ئێمەوە بوو، لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا جوولەی دوژمنمان لەنێو ئەفغانستاندا زانی، سەرچاوەکان زۆر بوون لەتەك پێدانی زانیاری هەواڵگری بە هەواڵگرە مرۆڤەکان، واتە بریداتۆر هەموو پێداویستییەکانی هەواڵگری تەواو کرد و بەرەو باشتری برد.

لە کاتێکدا هەماهەنگییەکان لە یەکێك لە رۆژەکانی هاوین و لەنزیك کێڵگەکانی ترتاکی قەندەهار ئەمەی سەلماند.

## هینری ا.کرامبتۆن

هەموومان لەتەك تیمی بریداتۆر کۆبووینەوە کە سەر بەریچ بوو، هەمووان لە شاشە گەورەکەوە سەیری ڤیدیۆی راستەوخۆمان دەکرد، لەپێشتریشدا هەواڵگرییە مرۆییەکان پێیان راگەیاند بووین بنلادن لەو شوێنانەی تیایدا دەمینێتەوە لە چوارچێوەی چەند رۆژێکدایە، ویستمان تیمێکی کاری شاراوە بڵاوە پێ بکەین تا رووبەرووی بنلادن ببینەوە چ بەکوشتنی یان بەدیلگرتنی، بەڵام گرێمانە یاساییەکان بەردەوام بوون، بۆیە نەمان توانی رەزامەندی لە سەرکردایەتییەکەمان وەربگرین، بەڵام ئەمجارە بریداتۆرمان لەدەستدا بوو و دەیتوانی بەبازنەیی بسورێتەوە و ئێمەش لەسەر شاشەی ڤیدیۆیەکەدا سەیری بکەین.

هاوکات یەکێك لە مۆڵگەکانی قاعیدەمان دەستنیشان کرد، بە هیوای ئەوە بووین کاتێك یەکێك لە کاروانەکان بەرەو مۆڵگەکە دەچوو، کاتێك دەرگاکە کرایەوە پیاوێکی درێژ جلوبەرگێکی سپی لەبەردا بوو، ئەوە ئوسامە بنلادنە و چاودێریمان کرد کاتێك بەرەو ژوورەوە دەچوو، بەشێك لەوانە لە پێشوازی ئەواندا بوو، کەمێك وەستا و سەیری کردن بەڵام لەدواتردا بەردەوام بوو لە هەنگاوەکانی، ئەو کات ئاسمان ساف و بێگەرد بوو بۆیە وێنەکانیش ساف بوون، لەوێدا هیچ ژن و منداڵێك دیار نەبوو، کەواتە ئەو ئێستا لەژێر دەستماندایە.

یەکێك گوتی: ئەی مەریەمی پیرۆز.

-یەکێکی دیکە گوتی : هێشتا هیچ نەبووە.

سێیەمیش هاواری کرد: ئەمە ئەوە ئەوە ئوسامە بنلادنە.

لە ماوەی چەند چرکەیەکدا لەپێش ئەوەی بچێتە ناو خانووەکە دیوارە ئەستوورەکە وێنەی ئەو لەسەر شاشەکە بوو.

شیکەرەوەکان پێیان باشبوو ئاگاداری کۆشکی سپی و وەزارەتی بەرگری بکرێتەوە، بەڵام مووشەکی کرۆز ماوەی شەش کاتژمێر لەسەر کەشتییە دەریاییەکان دەخایەنێ کاتێك لە زەریای هیندییەوە لە ئامانجەکە دەدەن.

کۆشکی سپی بڕیاری دا ئەو ماوەیە زۆر دوورودرێژە، داوای کرد کە ئایا بنلادن بۆ ماوەی شەش کاتژمێر دەمینێتەوە، ئێمە ئەوەمان نەدەزانی، هەروا جێگەی ڕەزامەندی نەبوو، بەڵام کوا مووشەکی کرۆزمان هەیە لەم کاتەدا.

ئێمە بڕوامان نەکرد.

کوفر و ریچ باسەکەیان بۆ کۆشکی سپی کورت کردەوە، هاوکات کلارك و ئالن زۆر بێزار بوون، بەڵام هیچ گۆڕانکارییەك لە پێشبینیەکانی کۆشکی سپی ڕووی نەدا، پێویستە لەسەر بنکەی دژەتیرۆر پێشبینی شوێنەکانی دیکەی بنلادن بکان لە داهاتوودا، یان ڕێگەیەك بدۆزنەوە تا لەگەڵ ئامانجەکە بجەنگن ئەمەش لەنێوەندی چەند چرکەیەکدا نەك چەند کاتژمێرێك.

وێنەی بنلادنمان گرت بە هۆی دووربینە کارۆ-بینییەکان، بەڵام سیاسەتێکی واقیعیمان لەدەستدا نەبوو، هەروا کەرەستەی گرنگمان نەبوو بۆ جەنگ تا بەو شێوەیە ورد بێ، هەموو ئەمانە جێگەی دڵخۆشی نەبوون.

لەلایەکی دیکەوە ریچ و تیمەکەی لە ساڵانی ١٩٩٩-٢٠٠٠ بۆ ئەوەی بەرهەمی وردی هەواڵگریان هەبێ شەش شوێنی گرنگی قاعیدەیان لە ئەفغانستاندا دیاری کرد، دەکرا بڕیاردەرانی سیاسی گڵۆپی سەوز داگیرسێنن تا بکوژرێن، لەلایەکی دیکەوە تۆڕی هەواڵگری مرۆییەکان توانیان هەواڵگرییەکی زۆر بەدەست بێنن لەناو ئەفغانستان تا بەوردی شوێنی ئوسامە بنلادن دیاری بکرێ، جگە لەوەی بەشێك لەو هەواڵگرییانە لە خەڵکی ئەوێ وەرگیرابوون بۆیە

کۆشکی سپی گومانی هەبوو لێی، ئەمەو یەکەم هەوڵ بۆ دانانی بۆسەیەك بۆ بن مقۆمقۆیەکی گەورەی نایەوە نەوەك هان بدرێن، بۆیە سەرکردایەتیی سی ئای ئەی و کۆشکی سپی داوایان کرد بەشێوەیەکی جەختبوون بتوانن کارەکە ئەنجام بدەن هەروەها ترسناکییەکان کەم بێ، سەرەڕایی ئەو روونییە تا ئێستا ئیدارەی کلینتۆن هیچ کارێك ناکات، زیاتریش لە ترسناکییەکان دەترسان نەوەك لە ئۆپراسیۆنەکە.

دەکرێ کاری شاراوە بکوژ بێ وەکچۆن مێژوو ئەمەی سەلماندووە، لەوانەیە ببێتە کێشەیەکی سیاسی زۆر خراپ، بەڵام ئەمە هەڕەشەیەکی گەورەیە، هەردەم سەرۆك ئاگاداری دەکردینەوە، باسیش لەوە دەکرا ئێمە تەنیا هەوڵ بدەین ئوسامە بنلادن بکوژین، کێشە نییە ئەگەر بە مووشەکێکی کرۆز بکوژرێ، کەچی ئوسامە بنلادن جەنگی راگەیاند دژ بە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەمەشی بەکردەیی کرد، لە ئابی ١٩٩٨ لایەکی هەردوو باڵیۆزخانەی لە نایرۆبی و دارسەلام رووخاند، هەروەها لە تشرینی یەکەم هێرشی کردە سەر کۆلی کەشتیی دەریایی، هەروا پلانی بۆ کوشتنی هەزاران کەس دابوو لە کاتی ئاودیوو بوونی سەدەکەدا، بەڵام شکستی هێنا بە هۆی کارەکانی بنکەی دژەتیرۆر و وێستگەکانی سی ئای ئەی و هاوبەشەکانمان لە دەزگا هەواڵگرییە بیانییەکان، بنلادن پشتگیری ئەو کۆمەڵانەی دەکەن کە خۆی دروستی کردبوون و بۆیە نیەتێکی زۆری هەبوو کاری تیرۆری زیاتر بکات، بۆیە تا چەند خەڵك بکوژێ تا هەڕەشەکەی دیار بێ؟

پێ دەچوو سەرۆك کلینتۆن و راوێژکارەکانی وا سەیری کارەکان بکەن ئەمەش تەنیا چەسپاندنی یاسایە و جەنگ نییە، زیاتریش لە بەهای سیاسی خۆیان دەگەڕان نەك بەهای نەتەوە، سەرەڕایی ئەوەی شارەزایەکی وام نییە بە واشنتنی پایتەخت، بۆیە زۆرجار کۆفر پێی ڕاگەیاندووم زیاتر ئەوانە گرنگی بە سیاسەت دەدەن نەك بە ئۆپراسیۆنەکان، گوێم بۆ فەرمانەکانی راگرت بەڵام جۆرێك لە

رووخانم بەدی دەکرد لەنێوەندی سیاسەتیی ستراتیژیدا، لە کاتێکدا ریچ و تیمەکەی جەخت لەسەر قاعیدە دەکەنەوە، بۆیە هەردەم ریچ جەخت لە بەرهەمی زیاتر دەکرد تا کاری زیاتر بکەین.

جارێکی دیکە قسەم لەگەڵ کۆفر کردەوە سەبارەت بە ناردنی تیمی ئۆپراسیۆنە تایبەتییەکانی ئەمریکی و کۆمۆندۆسی سی ئای ئەی بۆ ناو قووڵایی ئەفغانستان تا لەگەڵ قاعیدەدا بجولێنەوە، بۆ ئەمەش هەواڵگرەکانمان زیاتر وردتر دەبن، دیارە ئەو بڵاوەپێکردنە دەبێتە هۆی بەئامانجگرتنی ئوسامە بنلادن بەشێوەیەکی بکوژانە، زۆر بەئاسانیش دەتوانین ئەو بڵاوپێکردنە فراوان بکەین، لەمەوەش شەڕی راستەوخۆ روودەدات، هەروا دەتوانین بڵێین ئێمە بریداتۆرمان هەیە وەك بنکەیەکی هەواڵگری بۆ پشتگیری ئەوانەی لەسەر زەویدان.

کۆفر بەگاڵتەوە باسی ئەمەی بۆ کردم و گوتی ئەمە روونادا ئەگەر ئیدارە بەو شێوەیە سیاسیانە بێ، چونکە ترسناکییەکان زۆر بەرزە بەپێی بۆچوونی سیاسەتی گشتی، سەیری مانشێتەکانی پاش ١١-٩ بکە: باس لەوە دەکەن سی ئای ئەی موجاهیدێکی سعودی لە ئەفغانستان دەکوژێ، بۆیە هیچ زامینێك نییە ئەگەر هەواڵگرییەکانمان بەتەواویش جێگەی بنلادنیش بزانن.

درکم بەوە کرد کە پێویست دەکات بریداتۆر پڕ چەك بکەین، لەوانەیە ئەمە تاکە هەلمان بێ، بۆیە کلارك و ئالن و کۆفرم هاندا بۆ ئەو بۆچوونە.

کەچی شەڕە بیرۆکراتییەکان زۆر خراپ بوون، زۆرێك پێیان باش نەبوو سی ئای ئەی ئەو جۆرە هێزە بکوژە و دەسەڵاتەی هەبێ، بەشێوەیەك وایان دادەنا ئەمە ترسناکییەکی سیاسیی بۆ سەر سی ئای ئەی، هاوکات زۆرێك لە پارێزەرانی کۆشکی سپی و وەزارەتی بەرگری سەبارەت بەمە چەندین پرسیار دەکەن.

له کۆتاییدا کـلارك و تینیـت و ئـالن و بـلاك سـەرکەوتن، مـن و ریچـیش ئاسووده بووین کاتێك چوونه نێوەندی کاری سیاسی شاراوه له واشنتتندا، بەمەش پاره و دەسـەڵات و هێزمـان بـەدی هێنـا، هـەموو ئـەو شـتانەی پەیوەنـدی بـە ترسناکییەکانەوه هەبوو، له کۆتاییدا بڕیاردرا بریدانۆر پڕ چەك بکرێ.

ئێسـتا کـاری ریـچ و ئلیـك و تیمەکـەی بـەئامانج گەیشـت ئەمـەش بـۆ پێشخستنی ئامرازێکی دیکەی جەنگ ئایا چ چەکێك لەنێوەندی بریداتۆر بـێ؟ چ شـتێك هەیـە زۆر بـەوردی بیهاوێـژێت؟ چـۆن بتـوانین هـەموو شـتەکان لەیـەك سیستەمدا رێك بخەین؟ چۆن دەتواندرێ هەواڵگری و جەنگ بەیەکتر ببەستینەوه؟

ئلیك باسی له بۆمبێك دەکردەوه هاوشانی مووشەکی کرۆز بـێ تـا بـەوزه و تواناکانی بتوانێ ئەو شوێنانه وێران بکات که بنکـەی دژەتـیرۆر دەسـت نیشـانی کردبوو، بەڵام ئەمه لەرووی تەکنیکەوه ناکرێ، لەلایەکی دیکەوه هێـزی ئاسمـانی سیستەمێکی وای نییه داواکارییەکانی بنکەی دژەتیرۆر دابین بکـات، بەتایبـەت سەبارەت به بریداتۆر.

ریچ و ئلیك لەگەڵ پسپۆڕانی سی ئای ئەی گفتوگۆیان کرد، بەتایبـەت ئـەو خانمه بەتەمەنه هێمنه، لەوانەیه داپیرەی یەکێك بـێ، ئـەو پسـپۆڕه لـە شـێوازی مووشەکەکان کاتێك له ئامانجه دەکەوێ، زور بەهێمنی باسی پاڵەپەسـتۆی زۆری دەکرد کاتێك به پاوەر پۆینت پیی نیشـان دەدایـن، وێنـەی هەنـدێك مووشـەکی جەنگی نیشان داین، ئەمەو ئلیك و تیمەکەی ناویان لـەو وێنانـە نـابوو کوشـتی مێش و مەگەز، ئەمەش لەلای ئەو بیۆژنه رەشه ناونیشانێکی جوان بوو.

هەموو بژاردەکان هاته سەر مووشەکی "هلفایر" که له پێشتردا رێکخرا بوو تا له هەلیکۆپتەر بخرێ بەتایبەت دژ به زرێپۆشەکان لەکاتی جەنگدا، هەروا ئـەو

مووشەکە خۆی چەسپاندبوو لەماوەی جەنگی پانزدە ساڵەی رابردوودا، کێشەکەی زیاتر لە سەد رەتلە، دەتواندرێ لە هەردوو لا باڵی برایداتۆر دابندرێ، هەروا سەرە جەنگییەکەی کێشەکەی ٢٠ رەتلە زۆر گونجاوە بۆ ئامانجە چەسپاوەکان وەك ژوور و زرێپۆشەکان.

کەچی هلفایر چەکی هێزە ئاسمانییەکان نییە، بەڵکو موڵکی سوپاسە، ئەمەش زۆرێك لە ئاڵنگاری تووش کردین.

لەو رۆژانەدا لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠ زریانەکانی زستان وای کرد کەمتر فرۆکەکان بتوانن بفڕن، بۆیە چەندین پسپۆڕمان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بانگ کرد تا لەگەڵ مووشەکی هلفایر رێکی بخەن.

ئێستا سوپا ئەو چەکەی هەیە، ریچ و ئلیك چوون بۆ بارەگای ریدستۆن ئەرسنال کە سەر بە سوپایە، لەوێدا ئەندازیارێکی میکانیکیمان دەست کەوت ئارەزووی لە تەقینەوە بوو، ئەو ناوی چالك فملز بوو لەدواتردا ناونرا "بووم بووم" ئەوەش تەنیا جۆشوخرۆشی پێ دەدا، لە زانکۆی تەکنەلۆجی مینیسوتا (ئێم ئەی تی) دەرچووە، هەروا بڕوانامەی ماستەری لە کارگێڕیی زانستی و کارگێڕی کاری وەرگرتوو لەلایەن "سلۆن فیلۆ".

بووم بووم لەگەڵ هێزی ئاسمانی ئەمریکی کاری کردووە زۆر بە ئاسانی باسی ئامادەکردنی هلفایری کرد، پێم وابوو بۆ یەکەمجار ئەو تەکنیکە بەکار دەهێندرێ، بەپێی ئەوەی حەز بە تەقینەوە دەکات، زۆر بە روونی باسی لێوەدەکرد، هەستم کرد لەرووی روشنبیرییەوە زۆر بەرز نییە، بەڵام لەرووی تەکنیکەوە زۆر ورد بوو، هەستم کرد زۆر متمانەی بەخۆ هەیە، بێگومان هلفایر کار دەکات بەتایبەتی ئەو

کاتەی بووم بووم هیچ گرفتێکی وای نەبووە بەڵکو بەهەندێك تەقینەوە چارەسەری دەکات.

لەپێشتردا هێزی ئاسمانی لە ساڵانی ٢٠٠٤-٢٠٠٥ پرۆگرامێکی دانا بۆ دانانی مووشەك بۆ ئەو فرۆکانەی بێ فرۆکەوانن، کەچی لە پرۆگرامی سی ئای ئەی زیانر بەرەو پێشەوە برا، بۆ ئەمەش جەنەرال جون جامبر رۆڵی هە بوو لە پشتگیریکردنی ئەو تەکنەلۆژیایە بۆ چەکی ئاسمانی، بۆ ئەمەش رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی هەبوو بۆ بەرەوپێشبردنی پرۆگرامەکەمان، ئەمەو لە ١٦ و ٢١ی شوباتی ٢٠٠١ هاوێژتنە ئەزموونەکانمان یەکەم ئامانجی گرت بۆ سەر یەکێك لە بنکە نهێنییەکانی هێزی ئاسمانی.

سیستەمی فرۆکەوانی بێ فرۆکەوان لەدەیەی دواتردا پێشکەوت بەو پێیەی هۆکارێکە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و زۆرجاریشس وەك ستچێك بوو بۆ چەك، بەهاتنی ساڵی ٢٠١١ بەشێك لە رۆشنبیران بەرگریەکی تەواویان لە بەکارهێنانی سەرۆك ئۆباما دەکرد بەوەی بریداتۆردا، لەپاشاندا هێرشکردن بەو جۆرە فرۆکەیە بووە خاڵێك لە سیاسەتی ئاسایشی نیشتمانی، بەشێك لە شارەزایان رایانگەیان بریداتۆری پڕ چەك تاکە چەکە لە مێژووی جەنگدا، لە ٢٠١١ بیرمان لەوەنەکردبۆوە دۆخەکە چی لێ دێ، ئەوەی دەمانویست تەنیا هەواڵگری بوو بە هۆی مرۆڤەکانەوە، تا بەهەر شێوەیەك بێ بنلادن لەناو ببەین.

ریچ و ئلیك و کۆمەڵە بیرۆکراتی و تێکدەران و کارمەندانی دەزگا ئاسایشەکانی ئەمریکی هەستیان بەوە کرد لە ماوەی چەند مانگێکی دی فرۆکەیەکی بێ فرۆکەوان دروست دەکەن، هەمووان سەرکەوتنەکانیان پەیوەست بوو بە سەرکردایەتی و ئاژانسەکانی جەنەرال رۆیوی لە هێزی ئاسمانی، لەتەك

## هونەری سیخوڕی

پاڵەوانی بارەگای دژەتیرۆری کۆشکی سپی و ئەمیرال مناکس لە پنتاگۆن، لەتەك زۆر کەسی دیکەی بەڕێوەبەرانی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی و سەرۆکی دژە تیرۆی سی ئای ئەی. هەمووان چەکێکیان دروست کرد بۆ رێکخستنی لەگەڵ فرۆکەی بێ فرۆکەوان، بەشێوەیەك لەژێر سەرکردایەتی سی ئای ئەی بێ.

بەڵام جەنگ بەو خێراییە ناکرێ دوای ئەوەی وەزارەتی بەرگری و سەرکردایەتی سی ئای ئەی درکیان بەوەکرد جەنگ کارێکی قورسە، کەچی کارەکان ئێستا لەلای بنکەی دژەتیرۆرە، هاوکات وەزارەتی بەرگری ویستی خۆی زاڵ بکات، پێیانوایوو شەڕ لەنێوەندی پسپۆڕی ئەواندایە، هەروا بەشێك لە سەکردایەتی سی ئای ئەی وەك بافێت دەیویست وەزارەتی بەرگری دەستی لە کارپێکردنی فرۆکە پڕ چەکەکە بکات. واتە بۆچی سی ئای ئەی ئەو ترسناکییە بخاتە سەر ئەستۆی خۆی؟ ئەمەو بافێت لە یەکێك لە کۆبوونەوەکان باسی لەوە کرد کاری ئێمە کوشتن نییە و نایەوێ هیچ پەیوەندییەکی بەبریداتۆرەوە هەبێ.

من و ئالن و کۆفر مکۆڕ بووین لەسەر ئەوەی مانەوەی ئەم فرۆکەیە لەلای هەواڵگرییەکانمان بێ تا بتوانین سیستەمەکە بپارێزین. بەروونی دەمانویست ئێمە قاعیدە لەناو بەین، ئەوە کاری ئێمەیە، کارێك بوو کەس نەی دەویست تەنیا دەمانەوێ ئامرازێکمان هەبێ.

کۆشکی سپی ئەمەی یەکلاکردەوە، ئەمەو سیستەمەکە لەلای بنکەی دژەتیرۆر دەبێ، بەڵام ئەوە مابوو کێ پەنجەی لەسەر پەلاپیتکەکە دادەنێ، بۆ ئەمەش سی ئای ئەی دەسەڵاتی بکوژی هەبوو، لەلایەن سەرۆکەوە ئەو دەسەڵاتەی پێ درابوو، بەڵام وەزارەتی بەرگری رای گەیاند کە ئەوان دەسەڵاتی گەورەتریان هەیە، بۆ ئەمەش مقۆ مقۆ کەوتە نێو پارێزەران، لە کۆتاییدا سەرکردە

سیاسـیەکان بڕیاریـان دا پێویسـتە لەسـەر ئەفسـەرانی سـی ئـای ئـەی بڕیـاری پەلاپیتکەکە بدەن، بۆ گەیشتن بەو توانایە ئلیك راهێنانی کرد تا ببێتە ئەفسـەری روکن لە سی ئای ئەی، لەتەك چەندین کەسی دیکـە لـە بنکـەی دژەتـیرۆردا تـا هەموو پرۆتۆکۆلەکانی ئامانجگرتن بـزانن، راهێنانەکـەش لەسـەر مێـزی تینتـی بەڕێوەبەر بوو، لەوێدا فێر بوون چۆنە باڵاکان دادەگیرسێنن کە مووشەکی هلفایری هەڵگرتووە، ناویـان لـە لاباڵـەکان نـابوو کلیلـی مـەیموون، چـونکە مـەیموونیش دەیتوانی دای گیرسێنێ.

ململانێیەکە لەسەر کلیلی مەیموونەکە تا ١١-٩ بەردەوام لەو کاتەی سەرۆك بۆش سی ئای ئەی گرتە دەست.

لە کاتێکدا بریداتۆر بەردەوام بوو لە سوڕانەوە لە ئاسمانی ئەفغانستان کەچی لە بەهار و هـاوینی ٢٠٠١ بینـی ئوسـامە بـنلادن زۆر روون نـەبوو، لەپاشـاندا بریداتۆریان زیاتر بـەرەو پێشـەوە بـرد بـەدانانی چـەندین هاوێنـە، بـۆ ئەمـەش هەواڵگریان سەبارەت بە قاعیـدە و تاڵیبـان بـەردەوام بـوو یـاخود چـۆن بتـوانین بجەنگین لەگەڵیاندا و چۆن زاڵ بین بەسەر پەیوەندییەکانیان، هەموو ئەمانـەش بـە هۆی هەواڵگری مرۆیی بوو، کە زۆر بەفراوانی پەرشوبڵاو بووبوون.

لەگەڵ مانگی ئەیلوولی ٢٠٠١ بنکەی دژەتیرۆر زیاتر لـە سـەد سەرچـاوەی مرۆیی هەبوو و لە ئەفغانستاندا کاریان دەکرد، بەشێوەیەك لەنێو هەموو هەرێم و خێڵێك هەواڵگرێکمان هەبوو، بەو شێوەیەش توانیمان بچینە نێو تۆڕەکانی تاڵیبان و هێزی پشتگیریی قاعیدە، بۆ ئەمەش چەندین فرۆکەی بریداتۆری پڕ چەك و بـێ چەك لە ئاسماندا بوونیان هەبوو، جگە لە تەکنیکی کۆکردنەوەی زانیارییـەکان لـە شوێنەکاندا، لەو کاتەوە دوژمن و هاوڕێی خۆمـان لـە ئەفغانسـتاندا ناسـی، بـۆ

ئەمەش لە ئامادەباشیدابن بە هۆی قەبارەی سەرچاوە تەکنیکی و مرۆییەکانمان، کە هەمووی تەواوکەری یەکترن.

## رادەیەك ... بۆ بڵاوبوونەوە

من و کۆفر و ریچ هەر لە ئەیلوولی ١٩٩٩ زنجیرەیەك کارمان لە دۆڵی پنحشیری ئەفغانی ئەنجام دا، لەوێدا نەخشەی هەموو چیایە بەرزەکانمان نەخشاند کە لەلایەن ئەحمەد شا مەسعوودی هاوپەیمانمان دەپارێزرا، ئەمەو دۆڵی پنشیر لەدووری چل میل لەباشووری کابولدا بوو، ریچ یەکەم تیمی بردە پنچشیر، چونکە پێویستمان بەوە بوو تۆڕەکانمان بچنە قووڵایی ئەفغانستان، چونکە هەر بڵاوبوونەوەیەك هۆکارێك بوو بۆ یارمەتیدانمان، ئەمەش لە رێگەی ئۆپراسیۆنی هەواڵگری مرۆیی و هەواڵگری هێما.

گەشتێکم کرد بۆ ناوەڕاستی ئاسیا ئەمەش بەدرێژایی سنووری ئەفغانستان بوو هەر لە باکوور و رۆژهەڵات، بەڵام هیچ کات نەچوومە ناو ئەفغانستان، بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لەگەڵ هاوپەیمانەکانمان لەنێو قەڵەمڕەوەکەیان کۆببینەوە تا تێ بگەین لەوەی هەموومان پێویستیمان بەیەکترە، من لەو کاتە بەرزترین ئەفسەی سی ئای ئەیم سەردانی ئەفغانستان دەکەم، دەمویست گریگ یاوەرم بێ بە هۆی کاراییە نیمچە سەربازییەکانی، ئەمەو لە ئەیلوولی ٢٠٠٠ پلانمان دانا بۆ سەفەرکردن.

گریگ لە سەرەتای ئاب تیمێکی کۆکردەوە دوای ئەوەی هەشت هەفتە راهێنانێکی چڕی تەکتیکیان ئەنجام دا، هەروا هەموو لایەنەکانی راکردن لە دەشتاییەکان فێر بووین لەتەك هەموو فریاکەوتنە سەرەتاییەکان لە کاتی جەنگدا،

هەروا ئاشنایەتیمان لەگەڵ چەکی بیانی پەیدا کـرد، کاتێـك رووبـەڕووی جـەنگ دەبینەوە.

زۆربەی راهێنانەکانمان دوورکەوتنەوە بوو لە ململانێیەکان و تـەنیا بـەرگریی لە خۆمان بکەین لەو کاتەی رووبەڕووی هێرشێك بووینەوە یـان گـەمارۆ درایـن. زیاتریش جەختمان لـە خۆشـاردنەوە دەکـردەوە کاتێـك شکسـتمان هێنـا و دوور بکەوینەوە لە گرفتەکان، بەشێوەیەك راهێنانمـان کـرد وەك هێزێکـی بکـوژ وابـین ئەمەش بۆ پاراستنی خۆمان و رێگەیەك بدۆزینەوە تا رابکەین لەو ناوچەیەی شەڕ لێی دێتە ئاراوە، واتە لەناوچەی ترسناکی بێینە دەرەوە، ئێمە هێرشی کۆماندۆس ناکەین، بەڵکو تەنیا کارمان هەواڵگرییە لە ژینگەیـەکی زۆر ترسـناکدا، ئەگـەر دۆخەکە پێویستی بەوە بوو تەقە بکەین ئەوا خۆمان دوور دەخەینەوە لە گرفـت و تەڵەزگەکان، دروشمان ئەوە بوو: لێ دە و راکە.

هاوکات راهێنمان کرد لەسەر ئەو ئامرازانەی کـە ئامرازێکـە بـۆ راکـردن، بەتایبەتی ئەوکاتەی دەکەوینە نێو ئۆتۆمبیل و ئامرازەکانی دیکەی جەنگ چـۆن بتوانین رێگەی خۆمـان بدۆزینـەوە، هـەروەها سـەرکردایەتی و تەکتیکـە چـەکی ئاگرینمان بەرجەستەی یەکتر کرد، هەروا چۆن بتـوانین هـەموو ئامرازەکانمـان بـۆ خۆپاراستن بەکار بێنین، بەتایبەتی ئەو کاتەی لـەناو ئۆتۆمبیلـەکانمان دابـەزین و دەستمان بە تەقەکردن کرد.

لەسەر چەندین جۆر چەکی ئاگرین راهێنانمان کرد بەتایبەتی نموونە بیانییەکان وەکو کلاشینکۆف "ئاك-٤٧" و تفەنگی "ئاس کا ئاس"، بۆ ئەمەش تیمەکانمان لە ئەفغانستان کلاشینکۆفی بەکار دەهێنا بە هۆی زۆری گولەی کە دەتواندرا لەو ناوچەیە بۆمان دابین بکرێ، چونکە کاتێك پیاوێك لـە ئێمـە تفـەنگی "ئـێم ٤"

بەکار بێنیێ یەکسەر دەزانن ئەو تەقەیە لەلایەن کەسێکی ناوچەکەوە نەتەقێندراوە، نەمان دەویست لەلایەن خەڵکی ناوچەکە بپارێزرێن، چونکە ئەوان بزانن واتــە زۆر بەئاسانی لەلایەن دوژمنەوە ئاشکرا دەبین.

لەلایەکی دیکەوە راهێنانمان لەسەر چەکە سووکەکان کرد وەك دەمانچــە کــە زۆر بەکەمی لە ماوەی کارەکەم لەئاژانس هەڵم گرتووە، دەمانچەکەش لە جــۆری "براونیگ های —پاوەری ۹ میلم بوو" یان دەمانچەی تایبەت ئــەویش بــراونیگ ۳۸۰. بوو بەڵام بچووکترە، زۆر بەئاسانی لە شوێنێکی جلوبەرگەکــەت داینێــت، لەو خولە چەندین دەمانچەم تاقی کردەوە، بەڵام "گلۆکی ۹ ملیم هەڵبژارد، ئــەو دەمانچەیەش لە نەمسا دروســت کــراوە، لەگــەڵ ئــەوەی دەمانچــەکە کــانزا زۆر بەکەمی تیادا دارێژرابوو، لە مــاوەی پێــنج رۆژدا ســەد گولــەم تەقانــد، هــەموو ئامانجەکانم پیێ کا.

توانیم سەرکردایەتی بکەم و گولە بتــەقێنم، ئەمــەش شــتێکی ســەیر نییــە چونکە لە هەرزەکارییەوە حــەزم بــەو کارەیــە، هــەروا دەمتــوانی زۆر بەئاســانی نەخشەکان بخوێنمەوە، بــەڵام کاراییــەکانمان ســەرەتاین بۆیــە هــەردەم شــریتێکی لەزگەی رەشم لەلایە تا زۆر بەئاسانی هەموو شتێك چاك بکەمەوە.

ئەم خولە کارێکی مەزن بوو بۆ من، چــونکە هــەردەم لــە دڵەڕاوکێــدا بــووم سەبارەت ژینگەی راهێنانەکە، تەنیا لــەلای ســنوبەرەکانەوە راهێنانمــان کــردووە، واتە بۆچی لە رۆژهەڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان راهێنانمان نەکرد یان لەســەرووی بیابانی رۆکی ماونتەر نەبوو، شوێنێك لە ئەفغانستان بچیێ و هەســتی پێبکــەین؟ ئەم شوێنە واقیعی نییە ئەمەش هاوسەنگی دروست ناکات.

ئەمەم بەکۆفر راگەیاند و ئەویش وەك من رەزامەندی دەربڕی بەوەی شـوێنی ڕاهێنانەکە گونجاو نییە، لەدواتردا دوای لەمن کرد چیتر ئەوەندە سکاڵا نەکات.

لە کۆتایی مانگی ئاب بافێت کارەکانی رەت کردەوە و بڕیاری دا پشکنین بۆ تەکنیکەکان بکرێ، هەروا من گومانم هەبوو لە هەلیکۆپتەرەکانی می -١٧ کـە سـەر بـە هاوپـەیمانی بـاکووری ئەفغانسـتان بـوو، بـۆ ئەمــەش ترسـناکییەکان لەوپەڕیدایە، چونکە ئەو هەلیکۆپتەرانە زۆر کۆنن، زۆریش سەیرە کاتێـك ریـچ و تیمەکەی سواری بوونە ئەو هەلیکۆپتەرە تێك نەشکاوە، بۆیە پێویستە ئامرازێکی دیکە بدۆزینەوە بۆ گواستنەوە لەو کاتەدا.

من هەوڵ بۆ بژاردەی دیکە نادەم، هەروا گوتم دەتوانین یـەکێك لـە ئـامرازە ئاسمانییەکانمان بەکار بێنین، لەجیاتی ئەوەی پشت بە هاوپەیمانی باکوور ببەستین. هەروا بافێت ئـەوەی راگەیانـد: بـەهیچ شـێوەیەك وا ناکـەین دەسـتی ویلایەتـە یەکگرتووەکان ئاشکرا بێ، بۆیە زیاتر جەختی لەوە کردەوە لە رێگەی وشکانییەوە بچنە ناو ئەفغانستان، ئێمە ئێستا لە وەرزی هاویندایین رێڕەوی چیا بەرزەکان بـۆ ماوەی چەند هەفتەیەکی دیکەدا هەر بەکراوەیی دەمێننەوە، هـەروا باسـی لـەوە کرد، کە رێکخراوە ناحکومییەکانی وەك پزیشکانی بێ سـنوور بەرێگـەی خۆڵـدا دەڕۆن کە لە تاجیکستانەوە تا پنجشیرە، بەپێی نەخشەیەکی تۆپـۆگرافی هـەموو لایەنـەکانی شـی کـردەوە بـۆ چـۆنیەتیی چـوونەژوورەوە، هـەروا ئامـاژەەی بـە ترسـناکییەکاندا بـۆ سـەر بەرژەوەندییـەکانی ئـەمریکی بۆیـە پێویسـتە ئێمـە لێپرسراوی پاراستنی نەتەوەکەمان بـین، جەختیشـی لـەوە کـردەوە کـە هاوڕێیـە ئەفغانییەکانمان پێشبینی هاتنی ئێمە دەکەن، بۆیە دەبێ پابەند بین بە قسەکانمان. لەلایەکی دیکەوە من زۆر قسەم کرد بەڵام پاساوەکانم گوێی بۆ رانەگیرا و رێگەیان

نەدام من بچم، زۆری نەمابوو بە هـۆی پاسـاوەکانم لـە قسـەکردن تێپـەڕێنم بـە شێوەیەك یاخی ببم، بەڵام هاوسەنگی خۆم بەدەستهێنایەوە و سەلامێکم کرد.

هاوکات من و گریگ و کۆفر و ریچ هەردەم لەنێو خۆماندا پرسیاری ئەوەمان دەکرد، چۆن کارمەندانی فریاکەوتن کەسانێك لەلای خۆیان گل دەدەنەوە، کە سەر بە سی ئای ئەی بێ.

سەفەرکردنمان بـۆ ئەفغانسـتان و نـەبوونی توانایـەك لەمباریـەوە شـتێکی ناپەسەند بوو، لە کۆتاییدا کۆفرم رازی کرد تا هەلیکۆپتەری می -١٧ بکڕێ، ئەو کاتە بە فرۆکەی خۆمان ئەوەی بمانەوێ بەنەرمونیانی دەیکەین، قورس بوو بتوانین نهۆمی حەوتەم رازی بکەین، بەڵام لە کۆتاییدا سەرکەوتین.

کڕینی می -١٧ قورس نەبوو، بەڵام کارەکانی لۆجیستی هەلیکۆپتەرەکـە و هێنانی بۆ ناو شانۆ کارێکی قورس بـوو و چـەند مـانگێکی خایانـد، کـاتێکیش قاعیدە لە ئەیلوولی ٢٠٠١ هێرشی کردە سـەر ئـەمریکا، ئـەو کـات مـی -١٧ ئامادە بوو، بۆیە لەو کاتەدا ژمارەیەکی نوێمان لە کلکیـدا نووسـی: ١١-٩ ئـەم هەلیکۆپتەرە ئەوا دەگوازێتەوە تا سەرانی یەکەمی ئەفغانستان بشکێنێ.

## "کۆل" کەشتی جەنگ

لەپاش دوو مانگ لە رەتکردنەوە چوونمان بۆ ئەفغانستان لەلایـەن بەڕێوەبـەر ئۆپراسیۆنەکان، قاعیدە هێرشی کردە سەر کەشتییەکی ئەمریکی بە نـاوی کـۆل، ئەم هێرشەش لە کەناری عـەدەنی یەمـەن بـوو، زۆری نـەمابوو نغـرۆی بکـات، رێککەوتی ئەم هێرشەش لە ١٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٠ بوو، لە رۆژێکدا خـۆ بەدەرەوە بوو، دوو کەسی قاعیدە بەهێمنی بە بە لەمێك بەرەو ئامانجەکەیان کرد،

هەردوو تیرۆرست خۆیان ئامادەکردبوو لە کاتێکدا بەلەمە پڕ لە تەقەمەنییەکەیان تەقییەوە، لەتەنیشتەوە لێیان دا، زۆری نەمابوو خۆیان بەناوەندی بتەقێننەوە، بۆ ئەمەش کونێکی لە کەشتییە کرد کە قوولێییەکەی چل پێ بوو، بە هۆی پرۆشکی تەقینەوەکە حەڤدە دەریاوان کوژرا، لەتەك بریندار بوونی سی و نۆ کەسی دیکە.

ئەو کاتەی زانیم هێرشەکە کراوە بەرەو نووسینگەی کۆفر چووم و گوتم "تیمێك لەگەڵ خۆم دەبەمە یەمەن"، ئەو لە وەڵامدا گوتی : زۆر باشە چیت پێویستە لەگەڵ خۆتدا بیبە.

لە بنکەی دژەتیرۆردا تیمێکی بچووکی بەرپەرچدانەوەمان ئامادە کرد کە پێکهاتبوو لە پسپۆڕانی سی ئای ئەی و لەنێویاندا یەکێك لەهێزی ئۆپراسیۆنی تایبەتی دەریاوانی بە خوازراو وەرمان گرت، جگە لە کارەکانی، کار لەگەڵ تیمەشدا دەکات، من پاسەوانێکم هەبوو و هەروا تیمەکە دوو ئەفسەری جوولەمان لەگەڵدا بوو کە عەرەبیان دەزانی، یەکەمیان بە رەچەڵەك عەرەب بوو، کارامە بوو لە پەیوەندیبەستن لەگەڵ کەسەکان، ئەوی تر بۆ ماوەیەك کاری کردووە و بەماوەی کەمتر لە ساڵێکدا عەرەبی فێر بوو بوو. هەر لەپاش دوو ساڵ دەبێتە یاریدەری سەرۆکی دەزگای شاراوە، هەروا لەتەك تیمەکەماندا دوو ئەفسەری تەکنیکی دانرا بوون بۆ بەرپەرچدانەوە لە کاتی قەیرانەکان.

کۆفر پێی ڕاگەیاندم، کە جۆن ئۆنێل سەرۆکایەتی تیمێکی گەورەی ئێف بی ئای دەکات و هەروا داواکاری گشتی ناوچەی باشووری نیۆریۆرکیشیان لەگەڵدایە، لەلایەکی دیکەوە گاری هاریل لە سەرکردایەتیی ئەمریکای ناوەڕاست پەیوەندی دەکات، ئەی دوایی فەرماندەی تیپی "دلتا"بووە لەو کاتەی لەساڵی ٢٠٠٣ چۆتە ناو سۆماڵ.

باڵیۆزخانــەی ئــەمریکا لــە ســەنعایە، هــیچ کونســلگەریەکی دیکــە یــان دەزگایەکی ئەمریکی لە عەدەن نییە، ئەو شـارەش ڕێگەوبانـەکانی زۆر خراپـە و کەنارەکەش دەکەوێتە سەرووی باشووری نیمچەدوورگەی عەرەبی درێژ دەبێتـە بـۆ کەنـداوی عــەدەن، بــەخێرایی وەزارەتــی دەرەوە بنکەیــەکی ســەرکردایەتی لــە هوتێلێکی لۆکاڵی دانا، ئەمەو باربرا بـودین بـاڵیۆز بـوو، ئـەو دیبلۆماسـیەکی بەتوانا بوو و لەچەند سەردەمێك کاری باڵیۆزی کردووە.

هەموومان لەیەککاتدا گەیشتینە سەنعا و لەدوو نهۆمی هوتێلەکەدا بووین، لەگەڵ کارکردنی ئاژانسێکی ئەمریکی بۆ چاودێریکردنی ئەجنداکەی، لەو کاتــەدا بەشێك لە دەسەڵاتی یەمەنی سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوو لەگەڵ ســەدان لێکۆڵــەری ئێف بی ئای، واتە ئەوان زیاتر بە ئێمەوە سەرقاڵ بوون نەوەك بــە قاعیــدە، زۆری نەبرد بۆمان دەرکەوت یەمەنییەکان ئامێری گوێگرتن و سیخوڕیان لە چواردەوری ئێف بی ئای دانابوو، بە ئۆنێلم ڕاگەیاند زۆر هەستی بە شــەرمەزاری کــرد، بۆیــە داوای کرد هێمن بینەوە، سەرنجی ئەوەشی دا کە ئێف بی ئای هەمان کار دەکات.

لەلایەکی دیکەوە خاتوو ئۆدینی باڵیۆز ڕووبەڕووی شــەڕێکی سیاســی بــۆوە لەگەڵ ئۆنێل سەبارەت بە دەسەڵاتەکان، ئەمەم بۆ ئۆنێل شی کردەوە و پێم گــوت ئێرە نیۆیۆریوك نییە بەئارەزووی خۆت هەڵسوکەوت بکەی، واتە خاتوونی بــاڵیۆز نوێنــەری ســەرۆکە و دەتــوانێ لــە وڵــات دەرمــان بکــات، لەپاشــاندا بەئاشــکرا ململانێیەکە چووە سەر ڕۆژنامەکان، لە کۆتاییدا خاتوو بۆدین باسی ڕۆڵــی ئێــف بی ئای کرد لە یەمەندا.

زۆری نەبرد کــاری تیمــە کردییــەکان زۆر بــوون بــۆ مــاوەی بیســت و چــوار کاتژمێردا لەنێو کەشێکی سیاسی خراپدا کاریان دەکرد و بۆ ئەمەش زانیاریمان دا

بەبەشێك لە یەمەنییەكان، بۆیە زانیان كاركردن بەو جۆرە لە بەرژەوەندی وڵاتەكەیاندایە، زۆربەی باسەكان لەلایەن ئەوانەوە بەڕێوە دەبرا كە بەعەرەبی قسەیان دەكرد، لەنێویاندا كارمەندێكی تایبەتی ئێف بی ئای، بەو شێوەیە هەموو لایەنەكانی هێرشەكانمان زانی و هەموو ئەمانەش پەیوەستكرا بە ئەفغانستان.

لەنێوەندی رووپێوكردنمان بۆ ناوچەی بنكەی چاودێری كە قاعیدە بە ڤیدیۆ وێنەی گرتبوو، كاتێك شوێنەكەمان پشكنی كە ڤیدیۆیەكەی تیادا پەخشكرابوو بینیمان خانوویەكی چەند نهۆمی تەواو نەكراو بوو.

خانووەكە لەبەرد دروستكرابوو، هەموو شیشەكانی بۆگەن بوو بوون، ئەوانەی كارەكەیان كردبوو لە نهۆمی سەرەوە ژەمێكیان خواردبوو، هەموو پاشماوەكانیشیان فڕێدابووە سەر زەوی، بۆنێكی ناخۆشی هەبوو، بینین لەسەر نهۆمی سەرەوە زۆر باش بوو، دوژمنەكان چاودێری ئەو شوێنەیان كردبوو، كە دەڕوانێتە سەر كەنارەكە، لەو كاتەی كە دەریاوانەكانمان دەكوژرێن.

لەپاشاندا بۆ ماوەی دوو رۆژ لەگەڵ كاپتن كێرك لیۆلد لەسەر كەشتییەكە وەستام، كاریگەری بۆمبەكانم بینی كە بەر كەشتییەكە كەوتبوو لەناو ئەو ئاوە شینە جوانەدا، لیبۆلد باسیشی لەوە كرد كە تیمەكەی چۆن وەك پاڵەوان بەرەنگاری هێرشەكە بوونەتەوە، توانیان زۆرێك لە هاوڕێیەكانیان لە خنكان رزگار بكەن و هەموو تەرمەكان لەناو دەریا بهێننە دەرەوە و توانیان كەشتییەكە هاوسەنگ بكەنەوە، هەموو خوێنە رژاوەكان پاكبكەنەوە، هەروا ئێستا چەندین پاسەوانیان داناوە لەسەر كەشتییەكە و چەكی ئۆتۆماتیكیان لەدەستدایە تا ئاگاداری هەموو شتێك بن,

لە رۆژی هێرشەکەدا کەس دانەنرابوو بۆ پاسەوانی ئەمەش بەو واتایەی هیچ جۆرە ئاگادارکردنەوەیەك نەبوو، هەروا بە هیچ شێوەیەك بنەما دانەنرابوو بۆ بەرپەردانەوەی نزیکبوونەوەی دوژمن، لەپێش هێرشەکەدا وایانزانی ئەوانەی ناو بەلەمەکە خەڵکی ناوچەکەن، هیچ جۆرە هێرشێکیان پێوە دیار نەبوو بۆ هێرشبردن بۆ سەر کەشتییەکە.

دوژمن لە هەموو لایەنەکانی جەنگ تێ گەیشتووە، بەڵام ئێمە تێ نەگەیشتبووین.

کاتێك سەیری شوێنەواری بۆمبەکەم کرد، لەوێدا بۆم دەرکەوت ئەو جۆرە کارانە ناچارمان دەکات بە جۆرێکی گونجاو بەرپەچیان بدەینەوە، هاوکات حکومەتی ئەمریکی شکستی هێنابوو لەوەی بەرپەچی هێرشەکانی قاعیدە بداتەوە وەك بەرپەرچدانەوەی هەردوو هێرشی سەر باڵیۆزخانەکەی کینیا و تەنزانیا، بۆ ئەمەش سەرۆك کلینتۆن بڕیاری نەدابوو بە مووشەکی کرۆز لە ئەفغانستان و سۆدان بدات، وەڵامنەدانەوەش هۆیە کە بۆ بەهێزبوونی دوژمن و هاندانیان، ئەی چی بڵێن سەبارەت ئۆپراسیۆنەکانی دیکەی قاعیدە کە حکومەتی ئەمریکی توانی شکستی پێ بێنێ؟ نیەتەکانی دوژمن کەم نەبۆوە بەڵکو ئێستا زۆر بەروونی بەدەردەکەوێ، لەلایەکی دیکەوە بودجەی هەواڵگری بەرزبۆوە، هەروا سەرۆك رێگەی دا هەندێك کاری شاراوە ئەنجام بدرێ، بەڵام لەسەر ئاستی حکومەت بەشێوەیەکی زۆر لاواز بەدەردەکەوت، سەرکردە سیاسییەکان نەیاندەزانی چ کارێك بکەن، ئەمەو جۆرج تینیت لەو یاداشتەی لە ساڵی ۱۹۹۸ی دەریکرد، پێی وابوو ئەمجارەیان کارەکە زۆر جیاوازە، بۆ ئەمەش ویلایەتە یەکگرتووەکان هێرشێکی بەرپەچدانەوە دەکات، هاوکات راوی قاعیدە دەنێ لەنێو داڵدەکانی لە ئەفغانستاندا.

له ماوەیەکی دیکەدا ئێوارەیەك گەڕامەوە بنکەی سەرکردایەتی له عەدەن و بروسکەیەکم بۆ بارەگای سەرکردایەتی سی ئای ئەی نارد، بەو پێیەی ئەفسەرێکی گەورەم، پێم وابوو بەرپرسیاریەتیی داواکردنی پشتگیری هەواڵگری لـه وەزارەتـی دەرەوە و ئێف بی ئای و سووپای ئەمریکی بکەم، هەروا بەراستەوخۆیی بۆ بافێت و کۆفرم نووسی سەبارەت بە کارەساتە سیاسییەکانی ئەو کارە تیرۆریستییە، ئەمە جەنگە، تاکە بژاردە هەیە ئەویش راونانی دوژمنە، هەروا سـی ئـای ئـەی دەبـێ خۆی ئامادە بکات بۆ پشتگیری سەرۆك و سووپا و ئێمەش له ئامادەباشیدا دەبین بۆ هێرشکردن.

هەڵە نەبووم لەوەی کەسانێك لەناو قاعیدەدان تا ئێستا پەنجەیەکیان برینـدار نەبووە لەنێو ئەفغانستاندا.

## ئیدارەی بۆش

ئیدارەی بـۆش لـه کـانوونی دووەمـی ۲۰۰۱ دەسـەڵاتی گرتـه دەسـت، زیاتریش جەختیان لەو هێرشانە کرد، کە دەوڵەتە نەتەوەییـەکان ئـەنجامی دەدەن، ئەمەش وەك دیبلۆماسیەتی جەنگی سارد وابوو، جیـا لـەوەی شـەڕ لەگـەڵ ئـەو یاریزانانە بکـرێ کـه هێـرش دەبـەن، کەچـی بـاس لـه بـەرگریی مووشـەکەکان دەکەنەوە، هاوکات باس لـه سیسـتەمەکانی بـەرگری دەکـەن، لـەجیاتی ئـەوەی بەکلاکەرەوە باس له بنبڕکردنی تیرۆر بکەنەوە، دەتوانم بڵـێم جیاوازییـەکی وایـان نەبوو لەگەڵ ئیدارەی کلینتۆن، تاکە جیاوازیش ئەوەیە ئیدارەی نوێ لـه کۆشـکی سپی کەمتر گرنگی بە قاعیدە دەدەن.

بەرپرسەکان ئەوەیان ڕاگەیاند بەدواداچوون بەستراتیژییەکانمان دەکەن دژ بە قاعیدە، پێش دەچوو کاری دیکەیان هەبێ، چونکە کەس پرسیاری لێ نەکردم سەبارەت بە بۆچوونەکانم لەمەڕ ستراتیژییە نوێیەکان، تاکە پرسیاریش ئەوە بوو هەموو بابەتەکانی قاعیدەیان بەستەوە بە عێراق، ئەم بۆچوونەش لەلایەن شیکەرەوەی بنکەی دژەتیرۆر لە بەهاری ۲۰۰۱ پێیان ڕاگەیاندم.

گوتی: "نووسینگەی جێگری سەرۆك دەیەوێ بزانێ ئایا هاوپەیمانی هەیە لەنێوان ئوسامە بنلادن و سەدام حسێن".

پرسیم: "چ هاوپەیمانییەك".

"جێگری سەرۆك پرسیاری ئەوەی کردووە ئایا هاوپەیمانی هەیە لەنێوان قاعیدە و عێرقدا، ئایا پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردای هەیە، یان هاوکاری یەکتردەکەن، چی دەبێ ئەگەر هەبێ؟".

"ئەمە پرسیارێکی زۆر گێلانەیە، لەم هەفتەیە گوێم لێ بوو بێ".

"دەتەوێ ئەمە بە جێگری سەرۆك ڕابگەیەنم؟".

"ئا...لەوانەیە نەخێر".

لە هاوینەدا و لەپاش سێ ساڵ کارکردن لە دژەتیرۆر و ئێف بی ئای، واتە سەرەتا لەوێ و دواتر لە بنکەی دژەتیرۆردا، بێزار بووم لە سیاسەتەکانی واشنتن، کەچی بەجۆشوخرۆش بووم بۆ ئۆپراسیۆنی مەیدانی، ڕازیبووم بە ڕاسپاردەی یەکێك لە باشترین وێستگەکانی سی ئای ئەی لە جیهان، لەو کاتەشدا گریگ پەیوەندیی بە کارەکانی کرد، لە باشووری ئەفریقیا، کەچری کۆفر و بن و ریچ لە بنکەی دژەتیرۆردا مانەوە.

## بەشی نۆیەم

# ستراتیژیەتیی ئەفغانی.

له هەموو جەنگەکاندا، دەتوانیت شێوازی راستەوخۆ بۆ چوونە ناو شەڕە بەکار بێنیت، بەڵام کارەکە پێویستی بە شێوازی ناراستەوخۆ هەیە، بۆ زامینکردنی سەرکەوتن.

**-سەن-تزو-هونەری جەنگ**

کارە نوێیەکەم، لەسەرووی هەموو پێشبینییەکانمەوە بوو، سەبارەت بە کار و خانەوادەکەم.

ماوەیەکی کەمە لەو باڵەخانەیە گواستمانەوە، چووین بۆ خانووە نوێیەکەمان، کە نزیکی قوتابخانەی منداڵەکانم بوو، ئەو خانووە نموونەیی بوو، رووبەرەکەی فراوان بوو و رووناکییەکی زۆور دەهاتە ژوورەوە، باخچەیەکی جوانمان هەبوو لەتەك نافوورەیەکی بچووك، ناندینەکەمان فراوان و سەردەمییانە بوو، لەگەڵ هاوڕێی نوێ بۆ منداڵەکانمان، هەر بەزوویی هەستیان بە باشیی خواردنەکان کرد، جگە لە بوونی دوو سەگە خۆشەویستەکەم.

دوو سەگەکەمان بردە داڵدەی سەگەکان دوای ئەوەی چل رۆژ دەستی بەسەرداگیرابوو، ئەمەو لە پێش شەش ساڵدا لە یەکێك لە گێلگەکانی ئەفریقیا هەر یەکەو بە بیست و پێنج دۆلارم کڕیبوو، کەچی چەندین هەزار دۆلارمدا ئەو لە کاتی سەفەرەکانمدا، ئەوانیش زۆربەی شوێنەکانی دونیایان بینووە، بەڵام شایستە بوو، چونکە کوڕەکانم خۆشیان دەویست.

هەموو پێداویستییەکانی ماڵەکەمان بەدوو رۆژ گەیشت، لەم کاتەدا سندووقەکان لەنێو ماڵەکەمان پەرشوبڵاو بوو بۆوە، تەنیا کەمێکیان بەتاڵ کرابوو، پێشبینی ئەوە دەکەم ئۆتۆمبیلەکانمان لە هەفتەی داهاتوو بگات، لێرەش سەقامگیر دەبین بۆ ماوەی چوار ساڵ.

خەوتبووم ئەو کاتەی برای هاوسەرەکەم لە نیۆبیۆرکەوە تەلەفۆنی کرد.

گوتی: تەلەفزیۆنەکە داگیرسێنە.

"باشه، تۆ باشی؟ " کاتێك ئەو پرسیارەم لێ کرد کۆنترۆلی تەلەفزیۆنەکەم لەدەستدابوو، سیندیش لەتەکمدا بوو.

"پێدەچێ کارەکە ناخۆش بێ، ئایا بینیت".

"بەلێ لەپاشاندا پەیوەندیت پێوە دەکەم".

سیندی گوتی "چی بووە؟"

"براکەت تەلەفۆنی کرد و ئاماژەشم بە تەلەفزیۆنەکە دا".

بینیمان گڕ و دوکەڵ لەسەر یەکێك لە تاوەرەکانی بنکەی بازرگانی جیهانی بەرزدەبێتەوە، ئێمە ئێستا لەلایەکی سیسەمەکە دانیشتووین و چەند هەنگاوێك لە شاشە دوورین، چەند چرکەیەکی دیکەی پێ چوو، فڕۆکەی دووەم خۆی بە باڵەخانەکانەکەدا دا.

"ئۆ ..نا نا"

لە وەڵامدا گوتم "قاعیدە".

هەردووکمان سەیرمان دەکرد، سەرمان سوڕ مابوو، لەپاش چەند خولەکێك هەردوو تاوەر رووخان.

هەوڵم دا ژمارەی ئەو کەسانە بزانم کە لە هەردوو باڵەخانەکەدان، چەندیان مردوون، پرسیارم سەبارەت بە جۆن ئۆنێلی یاریدەری بەڕێوەبەر کرد، کە بەرپرسی نیۆیۆرکە، کە لەم ماوەیەدا لە ئێف بی ئای خانەنشینکراوە، ئێستاش سەرۆکی ئاسایشە لە هەردوو باڵەخانەکەدا، لەپاشاندا زانیم ئەو سەرپەرشتیاری رزگاریکردن بووە، لەو کاتەی کە باڵەخانەکە دەڕوخا.

تەلەفزیرن چەندین راپۆرتە هەواڵی دیکەی بڵاوکردەوە سەبارەت بە چەندین هێرشی دیکە بۆ سەر پنتاگۆن و سەبارەت بە فرۆکە رفێندراوەکە، کە لە دێهاتەکانی بنسلفانیا تێك شکا.

چۆن قاعیدە ئەو ئۆپراسیۆنەی ئەنجام دا؟ کەی هێرشی دیکە دەکات؟

هاوسەرەکەم کە لە چەندین خولی دەرەوەی ولاتدا لەگەڵمدا بووە، یەکسەر هەستی بەوە کرد ئەم کارە زۆر جیاوازە، چونکە دیمەنە ترسناکییەکە لەوپەڕی دابوو و لە هەموو دونیا هەستی پێ کرا، کارەکە وەك بوومەلەرزەیەك وابوو، لە کاتێکدا بوو بە شەڕێکی جیۆسیاسی، سیندی لێی پرسیم "تۆ چی دەکەی؟".

سەرکردە سیاسییەکانمان گوێیان بۆ رانەگرتین ئەو کاتەی ئاگادارە ستراتیژییەکانمان لەلایەن سی ئای ئەی خستە روو، ئێستاش تاکە بژاردە ئەوەیە بەرپەرچ بدرێتەوە لەلایەن حکومەتی ئەمریکی، ئەمەو بنکەی بوومەلەرزەکە روونە، کە قاعیدەیە.

لە وەڵامدا گوتم "دەچین بۆ ئەفغانستان".

جلوبەرگم پۆشی و سەیری منداڵەکانم کرد بینیم لە خەوێکی قووڵدان، هەردوو سەگەکە جوولان، منیش بەهێمنییەوە دەستم بەسەریاندا هێنا.

بەئۆتۆمبیل بەرەو وێستگە رۆیشتم، هەروەها سەیری ئەو راپۆرتانەم دەکرد، کە بەخێرایی دەگات، ئەمەو لە پاش دوو کاتژمێردا چەند راپۆرت و سەرچاوە گەیشت، هەروا بنکەی دژەتیرۆر رایسپاردین بۆ کارێك لە وێستگەکە، بۆ ئەمەش ئاگاداری هەموو ئەو لایەنەمان دەکردەوە تا تۆڕەکەنیان بجوولێنین، ئەمەش وای کرد لەرووی هەواڵگرییەوە هەموو جیهان بگرێتەوە، سەبارەت بەوەی لێدانی دووەم

بەکام لا دەکەوێ، چونکە هەموو لایەك جۆرێك لە نەزانیمان هەبوو، لەبارەی ئـەو پیلانگێڕییە ترسناکەدا.

لە رۆژی دواتردا باڵیۆزی ئەمریکی نوێ هاتە نووسینگەکەم، کە لەپاش چەند رۆژێك بەگەیشتنم ئەو پۆستەی وەرگرتووە.

لێی پرسێم "کێ لەپشت ئەم کارەوەیە؟".

"قاعیدە، دەیەوێ ئەمریکا هان بدا دژ بە مووسڵمانەکان، دەیـەوێ بمانخاتـە ناو ئەو شەڕە، دەیەوێ رامان کێشێتە ناو جەنگێك دژ بە رژێمـە ئیسـلامییەکان، کە پێیان وایە گەندەڵن، زۆر شتی دیکەش، دەیەوێ خەلافەتی ئیسـلامی زینـدوو بکاتـەوە، کـە لـە مەغریبـەوە دەسـت پـێ بکـات تـا ئەندەنووسـیا، لەوانەشـە فەڵەمرەوەکەی دوورتر بێ".

لێی پرسیم : "چۆن هێرشەکانی ئێمە دەیانگەیەنێتە ئەو ئامانجە؟".

"کێشمەکێشمێك لەنێوان قاعیـدە و لقەکانیـدا هاتۆتـە ئـارا، بەتایبـەتیش جیهادی ئیسلامی لە میسر، سەبارەت بە هێرشبردنە سـەر "دوژمنێکـی نزیـك" واتە رژێمە ئیسلامییە گەندەڵەکان، یاخود هێرشبردن بۆ سەر "دوژمنە دوورەکان" واتە رۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکان بـەجۆرێکی تایبـەت، وەك ئامرازێـك بـۆ هێنانە ئارای توندوتیژییەکی توند و راکێشانێکی بەهێز، دەیەوێ ختۆکەمان بـدا، دەیەوێ ویلایەتە یەکگرتووەکان لەناو خاکی ئیسـلامدا بجـەنگێ، بـە نەتـەوەمان دادەنێ، واتە جەماوەری مووسـڵمانان وای دادەنـێن داگیرکـەر ئێمـە هاوپـەیمانی رژێمە ئیسلامییە گەندەڵەکانین، هەروا ئوسامە بنلادن پێی وایە گەلی مووسـڵمان هـەمووی لەدەوریـدا کۆدەبنـەوە، بەپشـتگیرییەکی میللـی دژ بـە رۆژئـاوا و دژ بەحکومەتـەکانی سـعودیە و یەمـەن و میسـر و چـەندین وڵـاتی دیکـە، ئەمـە

ستراتیژییەکی کلاسیکسسە: پێکهێنانی دوژمنێکی دەرەکی، بۆ بنیاتنانی هێز و سیاسەتێکی ناوخۆیی".

تەنیا ویستم وانەکەم تەواو بکەم، چونکە لە ماوەی سێ ساڵدا تووشی رووخان بوومەتەوە "پێویستە دژ بەو ستراتیژیەتە ببینەوە، دەبێ جەخت لە قاعیدە و لقەکانی بکەینەوە، پێویستە دوژمنەکانمان بناسین بەشێوەیەکی دیاریکراو، ئەمە جەنگێك نییە مووسڵمانەکان دەیهێننە ئارا، بەڵکو ئەمە پێچەوانەیە، هاوپەیمانە مووسڵمانەکانمان باشترین هاوپەیمانن، پێویستە دەستی یارمەتیان بۆ رابکێشین و دڵنیایان بکەینەوە لە رێگەی ئاینی ئیسلامەوە، تەنیا کارەکەش حکومەت ئیسلامیەکان نەگرێتەوە، بەڵکو دەزگا ئیسلامی و سەرکردەی هەموو کەرتەکان بگرێتەوە، ململانێیەکە پەیوەستە بە قاعیدە و ئەویش یاریزانێکی ناحکومییە، پێویستە هاوپەیمانی رێکبخەین لەگەڵ یاریزانەکانی دیکەی ناحکومی، پێویستە ئێمە و هاوپەیمانە مووسڵمانەکانمان پێکەوە شکست بە قاعیدە بهێنین".

پرسی : "ئایا ئەمە پیاوانی ئاینی مووسڵمانانیش دەگرێتەوە".

"بەڵێ، قوربان زۆربەی سەرکردە ناحکومییە مووسڵمانەکانیش، پێویستمان بەوانە وەکچۆن ئەوان پێویستیان بە ئێمەیە".

بۆ ماوەی دوو خولەك بێدەنگ بووین.

بەردەوام بووم : "وڵاتەکەمان تووشی هێرش بۆتەوە، وڵاتیان پێشێل کردووە، بەڵام کارەکە تەنیا پەیوەست نییە بە ئێمەوە، هەروا ناتوانین بەتەنیا ئەو کارە بکەین".

بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە دژەتیرۆردا كارم كردووە، هەموو كۆكراوە هەواڵگریی و شاراوەكانمان لەسەر هاوپەیمانە موسڵمانەكان وەستاوە، هەروا كارە تاكلایەنەكانمان تەواوكەری یەكلاكەرەوەن، كارەكە تەنیا ئەم و ئەو نییە، بەڵكو ئاوێتەی چەندین لایەنە دوو لایەنە و یەكلایەنە بۆ كۆكردنەوەی زانیاری و كار، هەروا پێویستە ئاوێتەیەك بدۆزینەوە بۆ ئەو جۆرە جەنگە.

باڵیۆز لە جێگەی خۆیدا رەق بۆوە، هەروا بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو، سەیرێكی نووسینگە بچووكەكەی كردم، لەپاشاندا سەیرێكی كردمەوە، یەكسەر تێگەیشتنی هەبوو بۆ بۆچوونەكانم، وەك ئەوەی مێشكم بخوێنێتەوە: " تێگەیشتم، سوپاس".

"بەڵێ، قوربان".

باڵیۆز لە ماوەی دوو رۆژدا لەگەڵ سەركردە سەرەكییەكانی موسڵمانانی وڵاتی میوان كۆبۆوە، هەروا لەگەڵ زۆرێك لە سیاسییە نیشتمانییەكان قسەی كردبوو، پەیوەندییەكی پتەوی بۆ پەیوەندیی نەتەوەیی بەستبوو، لەتەك هاوپەیمانەكانمان، كارەكەی سەركەوتوو بوو بە ئاستێكی باش.

هاوپەیمانەكەمان لە ئەیلوولی ٢٠٠١ سوپای رێكخست و ئێمەش هەموو یارمەتییەكمان دا: هەواڵگری ئاماژە و تۆڕی سەرچاوە مرۆییەكان، پەیوەندییە دەرەكییەكان و سوپا و هێزی تایبەت كە زۆر ئازایانە لە ئەفغانستاندا دەجەنگێ، ئەوان بوونە هاورێیەكی خۆشەویست، هەروا سەرۆكی هەواڵگری رۆڵێكی یەكلاكەرەوەی هەبوو زۆر زانیاری پێ دام.

جەماوەری ئەو ناوچەیەی لێی بـووین بەجۆشـوخرۆش بـوو. ئەمـەو دیـواری باڵێۆزخانەکە داپۆشرا بە گوڵ، کە لەلایەن هاوڵاتیانی هاوپەیمان بۆمـان هـاتبوو، وەك پێشکەشکردنی پرسە.

لە ماوەی چەند رۆژی رابردوودا کاتێك لەگەڵ پەیوەندییـەکان کـارم دەکـرد، پرسیاری ئەوەم لە خۆم دەکرد، ئایا بارەگـای سـەرکردایەتی داوای هاوکـاریم لـێ دەکـات، هـەروا بـیرم لـەوە کـردەوە خۆیەخشـانە بچـمەوە بارەگـا یـان بچـمە ئەفغانستان، بەڵام هەستم بەوە کرد ئەمە جۆرێك لە شتێتییە، چـونکە زۆر نییـە گەیشـتوومەتە وێسـتگەکەم، لەگـەڵ یـەکێك لـە هاوپەیمانـە بـەهاکان، شـوێنی راسپێردرام ئێرەیە، باڵێۆزەکەشم سەرۆکێکی باشە.

هیوای ئەوەم دەخواست کۆفر پەیوەندیم پێوە بکات، هەروا پێم وابوو تینیتی بەڕێوەبەر لەنێوەندی مقۆمقۆدا داوای یارمەتی لە بنکەی دژەتیرۆر بکات، چونکە بنکە بەتەواوی قاعیدە دەناسێ زیاتر لە هەموو کەسێك هەر حکومـەتێك، رۆڵـی یەکلاکەرەوەشی هەبوو.

لە شەودا کاتێك لە ماڵەوە بووم تەلەفۆنێکم بۆ کرا.

ئەو ئەنریکی برادۆ بوو، کە شوێنی منی گرتبۆوە لە بنکەی دژەتیرۆر، ئەو لەساڵی ١٩٥٧ لە کوباوە هاتبووە ویلایەتە یەکگرتووەکان، لەپاش ماوەیـەکی کـەم لە هێزی ئاسمانی چووبووە سی ئای ئەی شاراوە، هەروا زۆر ئازایانە بەشاراوەیی لە جەنگدا بـووە، کـە ئاژانسـەکە لـە هەشـتاکاندا ئـەنجامی دابـوو بەتایبـەت لـە ئەمریکای ناوەڕاست، ئەمەو لە ساڵی ١٩٩٦ کاری کـردووە دژ بەقاعیـدە، ئـەو کەسێکی هەڵپەرست نییە، زۆر بەجۆشوخرۆشەوە خزمەتی بە وڵاتەکەی کردووە.

گوتی" من ریکم، برۆ نووسینگەکە لەسەر هێڵی ئەوێ پەیوەندیم پێوە بکە".

پێنج خولەکی ویست تا بە ئۆتۆمبێل گەیشتمە نووسینگە، هەروا پێنج خولەك تا پاسەوانەکانم بڕی، هەروا پەیوەندیکردن لەوێدا زۆر روون بوو.

"کۆفر داوای لێ کردم پەیوەندیت پێوە بکەم، ئەمە فەرمان نییە، بەڵکو داواکارییە، دەچینە ئەفغانستان، ئەو دەیەوێ سەرکردایەتی ئەو جەنگە بکەیت، تینیتی بەڕێوەبەر رازییە، یەکسەر وەڵامم ناوێ، بەڵام با لەو نزیکانە بێ، بیر لەکارەکە بکەوە". ریك بەکورتی و بەروونی باسی لێوە کرد، ئەو وا قسەی کرد کاتێك ئۆپراسیۆنەکانی بەڕێکوپێکی بەڕێوە دەبات.

"کەی دەتەوێ بگەڕێمەوە".

"دەتوانی بیر لە کارەکە بکەیتەوە".

"بیرم کردەوە کەی؟"

"باشە بەخێرایی بگەڕێوە ئێرە، بەڵام سەرەتا گرنگی بە خانەوادەکەت بدە".

"باشە، تکت دەبڕم و پێت راگەدەگەینم، لەلایەن منەوە سوپاسی کۆفر بکە".

"بەڵی هانك... هەموومان دەمانزانی تۆ چۆن وەڵام دەدەیەوە".

نووسینگەکەم داخست و بەرەو دەرەوە رۆیشتم، زۆر سارد بوو، سەیری ئاڵای وڵاتەکەمان کرد چۆن دەشەکێتەوە، بە هۆی رووناکییەکان زۆ بەجوانی دیار بوو، سەیری ئاڵاکەم کرد و لەپاشاندا سەیری ئاسمانی سافم کرد کە ئەستێرەکان تیایدا

دەبریسکێنەوە، سەیری گەردوونم کرد، هەستم کرد لەناکاوێکدا قەبارەی گەورەتر بووە.

دووبارە سەیری ئاڵاکەم کردەوە، نوێژم کرد و لە دڵی خۆمدا گوتم:

"ئەی خودا، پیرۆزبایی لە قوربانییەکان بکە، کە لەو کارەساتەدا لەناوچوون، داواکارم دانایم پێ بەخشی، من پێویستم پێتە، تۆ رێبەرم بە، خانەوادەکەم بپارێزە، ئەو پیاوانە بپارێزە کە سەرکردایەتیان دەکەم، یارمەتیمان بدە دژ بەو دوژمنە دڕندەیە، ئامین".

تاکە شت کە باوەڕی بۆ هێنامەوە لەو کاتەدا، رقبوونەوەم بوو دژ بە قاعیدە، دەمویست هەموویان بکوژم.

سی ئای ئەی و سەرۆك، ئەم هەلەیان پێ بەخشم تا لە خزمەت نەتەوەکەمان دابم، تا دژ بە دوژمنان بوەستمەوە، ئەمە خەونی سەردەمی هەرزەکاریم بوو.

## بارەگای سەرکردایەتی

دوای چەند رۆژێك لە فرۆکەخانەی داڵاس دابەزیم، ئۆتۆمبیلێکم بەگرێ گرت تا یەکسەر بچمە بارەگای سەرکردایەتی، لەنزیك دەروازەی سەرەکی رام گرت، لە دەروازەکە خۆم ناساند، یەکسەر بەرەو بنکەی دژەتیرۆر چووم.

ئەو کات بنکەی سەرکردایەتی سی ئەی ئای لە ئەفغانستان، لە ژوورێکی بچووك پێکهاتبوو، پەنجەرەی نەبوو، بەڵام هەمووی نەخشێندرابوو، بە نەخشە و وێنە و چەندین بەند کاغەز نووسراو، بە نووسینگەی یاریدەری قوتابخانەی هونەرە جوانەکان دەچوو، هیچ پارەیەکی بۆ خەرج ناکرێ، کەچی هۆڵێك بوو بۆ جەنگی

کـاری شـاراوه، چـوار کـەسمان خۆمـان خـەریك کردبـوو و سـەیری نەخشـەی ئەفغانستانمان دەکرد، فرانك ستراتیژ بوو، جاکیش وەك شیکەرەوە و جـۆن جێگـر بوو، هەروەها منیش لەوێدا بووم.

لە هەفتەیەك پێشتردا جۆن ماسیم وەك جێگـر دەستنیشـان کـرد، ئەمـەش باشترین بڕیارم بوو لە کاتی جەنگدا، داوام لە برادۆ کرد، لەو کاتەی تا ئەو کاتەی لەدەرەوە دابـووم، داوام کـرد یـەکێك لـە یاریـدەرەکان پێشـبینیکراوە، ئـەویش ئاماژەی بەوەدا کە جۆن ماسی لەبەردەستدایە.

لە پەیوەندییە روونەکەدا بە برادۆم گوت "جۆن دەناسم گـەنجێکی بەتوانایـە، تا ئێستا ئەو خانەنشین نەبووە؟".

"ئەو بۆچوونی گۆڕیبوو، گواستنەوەی بارەگای سەرەکی پێشتگوێ خستبوو، بۆیە هات بۆ بنکەی دژەتیرۆر وەك هاوکارییەك، لەو کاتەی لەنێوەندی کـەلاوەکان لە نیۆریوکدا پشکنینی دەکرد و بەدوای تەرمەکاندا دەگەڕا".

لەدوای هێرشەکان بەڕێوەبەر فەرمانی دەرکرد تا هـەموو شـتێکی بارەگـای سەرکردایەتی بگوازرێتەوە، کەچی کۆفر رووبەڕووی بۆوە و بەبەڕێوەبەری راگەیاند بنکەی دژەتیرۆر لەمە جیادەکرێتەوە بۆیە هەمووان لە شوێنی خۆیان دەمێننـەوە، هەروا جۆنیش فەرمانی بەڕێوەبەری پشتگوێ خست، لەپاشاندا لە خانەنشینەکەی پاشگەزبۆوە و وەك خۆبەخشێك هاتە ناو بنکەی دژەتیرۆر.

لە ماوەی ئەمسالّدا من و جۆن لەپێشتردا گفتوگۆمان کردووە کاتێك لە سی ئای ئەی بووین، ئەو باسی پلانەکانی دەکرد دوای ئەوەی واز لـە کـاری حکـومی دەهێنێ، خۆی و لیندای هاوسەری دەچـنە باشـووری رۆژئـاوا لەوێـدا کێڵگەیـەك دەکڕن، هەروا ئەو لە کاتی گەنجیەتیدا وەك پاسەوانی باخچە ئەمریکییەکان کاری

کــردووە، جگــە لــەوەی هاوســەرەکەی ئەسپســوارێکی بــەتوانا بــوو، هــەردەم ویستوویەتی لەسەر ئەسپەکەیەوە ژیانی خۆی دابین بکات.

برادۆ گوتی "هەردەم پشکنین لەنێو باڵەخانە رووخاوەکەدا دەکات ؟".

هەروا برادۆ گوتی "ئەوت دەوێ؟".

لەنێو مێشــك و هەســتمدا بــەخێرایی ســەیری دۆســییەی جــۆنم کــرد، ئــەو دەرچووی کۆلیــژی دەریــاوانی بــوو، وەرزشــوان، هــەردەم وەك پاڵــەوان بەشــداری ململانێیەکانی هاوبەندی وەرزشی نیشتمانی کردووە بەتایبەت بــۆ وەرزش لــەنێو زانکۆکانــدا، جگــە لــەوەی ئەفســەرێکی دەریاوانییــە، ئەنــدازیارێکی بــەتوانای ئەتۆمە، بڕوانامەی ماستەری هەیە لە کارگێڕیدا، لەپێشتردا لە کــەرتی تایبــەت کاری کردووە، لەپاشاندا پەیوەندی بە سی ئای ئەی کــردووە، ئــەو زۆ بەتوانایــە و زۆر بەخێرایی توانی دیواری هەواڵگریی کۆمەڵە تیرۆریستەکان بشــکێنێ، هــەروا هاوڕێیەتی لەگــەڵ خێڵەکییــەکان کــردووە تــا بــەدوای تیرۆریســتەکاندا بگــەڕێ، بەشێوەیەکی تایبەت ئەو بکوژی تیرۆریستەکانە و ســەرکەوتوو بــووە، لەپاشــاندا ئۆپراسیۆنێکی شاراوەی کردووە، زۆربەی جیهان گەڕاوە و بەرزترین مەدالیای سی ئای ئەییان پێ بەخشیووە، سەرکەوتنەکەی وابووە، بــێ ئــەوەی کــەس بیزانێــت، زۆربەی کارەکانیشی بەتەنیا ئــەنجام داوە، چــونکە کارەکــانی زۆر نهێنــی بوونــە، تەنیاش چەند ئەفسەرێکی پلەبەرز دەزانن دەستکەوتەکانی چین.

جۆن پلەی بەرزکرایەوە تا بێتە ناو شــوێنە مەیدانییــەکان، ئــەو پێکهاتــەی قەبارەیەکی بچــووکی ماســوولکە بــوو، جگــە لــەوەی کەســێکی بەڕەوشــت بــوو ئەندازیارێکی وردە لە کارەکانی و ئارەزوویەتی هەموو بابەتەکان بەتەواوی بزانێ،

زۆر بەکەمی تورە دەبێ و گرنگی بە هەمووان دەدا، ئەو زۆر خەسڵەتی هەیە، لە منداڵ نییە، ئەو تەواوکەری نموونەیی و جێگرێکی نموونەییە.

"ئەو گەنجە بەتوانایە، بەڵێ، دەمەوێ".

برادۆ گوتی "باشە، ئەوە بەدەستت هێنا".

تەنیا بە تەلەفۆن گفتوگۆمان کرد لە هەفتەی رابردوودا قسەمان کرد، ئێستاش وا سەیری دەکەم زۆر بەوردی دەڕوانێتە نەخشەکە، هەروا سەیری جاکی هێمن و لەسەرخۆ و ئەکادیمیم کرد، کە لە نەهێشتنی مادده هۆشبەرەکان هاتووە بۆ هاوکاریکردنمان، ئەو لە تۆڕ و شیکردنەوەکان باش تێ دەگات، هەروا ئەو لەتەك ئەوەی کەسێکی بلیمەتە، بەڵام شەرمنە و بێ سڵکردنەوە لەکاردایە.

کاتێك سەیری فرانکم کرد بینیم بەچوارگۆشەیی سەیری کارەکانی دەکات، ئەو زۆر باش لە کاری شاراوە دەزانێ، هەروا لەرووی ستراتیژییەوە لە هەموان باشترە لەنێو ئاژانسەکەدا، ئەوەی سەیریشە بەتوڕەیی کارەکانی دەکات بەڵام زۆر بەوردی دەڕوانێتە شتەکان و زۆر بەئاکادیمیانە لەدوای کارەکانی خۆیەوە، هەردەم وەك منداڵێك وایە، هەموو کاتیش رەتی دەکاتەوە باس لە کارە پیشییەکانی بکات، خۆی و ئەفسەرێکی رزگار کردووە کاتێك لەمارێنز کاری کردووە و لە ئەفریقیا کاتێك دانوساتی کردووە سەبارەت بە خۆبەدەستەوەدانی سوپایەکی گەندەڵ بەرامبەر هێزێکی یاخیبووی داگیرکەر، هەردەم فرانك رێزێکی تایبەتی هەیە لەنێو دەزگای شاراوە، چونکە چەندین کاری پاڵەوانیەتی ئەنجامداوە.

بە هۆی ئەو ئەزموونە فرانك پرۆگرامێکی سەبارەت بە کاری شاراوە داناوە، بەشێوەیەك زۆر ئاڵۆزە و زۆر بەزەحمەت رێك دەخرێ، هەروەها پشکنینی لەنێوان هەواڵگری و سیاسەت کردووە لەنێو کاری شاراوەدا، تاقی کردۆتەوە و لە هەموو

ئەنجامــەکانی کۆڵیوەتــەوە، لــەو کاتــەی قوتــابی بــووە لــە کۆلیــژی جــەنگ لێکۆڵینەوەیەکی کردووە لەبارەی مێــژوویی کــاری شــاراوە ئــەمریکی و خــەڵاتی ئەکادیمیای وەرگرتووە، ناوی دەکردووە، کە توانا ستراتیژییەکانی زۆر بەرزە.

من و فرانك هەر کاتێك یەکترمان بینی بێ هەردەم سەرنجەکانمان سەبارەت بە هەواڵگری و کاری شاراوە و جەنگ گفتوگۆمان کردووە، بەڵام تا ئێســتا کارمــان لەگەڵ یەکتردا نەکردووە، ئێستا ئەو راوێژکاری ستراتیژی و رێبەری کاری شاراوە و بەڕێوەبەری هەموو ئۆپراسیۆنەکانە لە ئەفغانستاندا واتە لەدوای ١١-٩.

لە فرانکم پرسی : "ئامانجە ستراتیژییەکانمان چین؟".

ئەو گوتی " سێ خاڵ هەیە: یەکــەمیان لــەناوبردنی هــەموو ســەرکردەکانی قاعیدەیە، دووەم رێگری بکەین لەوەی داڵدەیەکی سەقامگیریان هەبێ، لــە خــاڵی سێیەمیشدا لە هەموو ئەو دۆخە سیاسی-کۆمەڵایــەتی-ئابوورییانــە بــدەین، کــە دوژمن سوودی لێ دەبینێ". ئەمەش شــتێکی نموونەییــە، بــەو واتایــەی هــەموو بابەتە ئالۆزەکانی لە چەند رستەیەکی ساکاردا کۆکردەوە.

پرسیارم لێ کرد ئــەو کاتــەی ئامــاژەم بــە نەخشــەکە دا" هاوپەیمانــەکانمان لەکوێن؟" بیرۆکەیەکی جوانی هەبوو، من پێش سێ ساڵ کارم لەسەر ئــەو گرفتــە کردووە، بەڵام من پێویستیم بە داتای نوێ هــەبوو، دەمویســت بڵــێم تیمــەکانمان لەکوێدا دابەزێنین و لەکوێدا دەست پێ بکەین، لەپاشاندا بۆ کوێ بچین، دەمویست پلانی ئەفغانییە هاوپەیمانەکانمان بزانم، سەرەڕایی ئەوەی توانایــان دیــاریکراوە، لــە زۆر کاتیشدا ناتوانن هاوکاری یەکتر بکەن.

لێرەدا فرانك ئاماژە بە دۆڵی پنچشیر کرد و گوتی "ئێرە، لە باشووری مەزار شەریف، لەوانەیە لە رۆژهــەڵاتی هــیرات بــێ، لەوانەشــە شــیعە دەســتی بەســەر

هەزارەدا گرتبێ لە هەرێمی بامیانی رۆژئاوای کابوول، ئەوان لێرەدان، زۆر رقیـان لە تالیبان دەبێتەوە".

"باشوور زۆر خراپە، ئەی وانییە؟" ئاماژەم بە قەندەهار و دەوروبەرەکەی دا، ئەو ناوچەیەش دڵی تالیبانە.

"بەڵێ، بەڵام گریگ قسە لەگەڵ کارزای دەکات، کە بـە ڕەچـەڵەك خـەڵکی ئەوێیە". لەم کاتەدا جۆن سەرنجی دایە شاری تارین کوت کە دەکەوێتە بـاکووری قەندەهار.

زانیم گریگ لەنێوەندی مقومقۆدایە، پرسیاری ئەوەشم کرد چـۆن پەیوەنـدی هەیە بە کارزای سەرۆکی خێڵی پشتۆنی، لە کاتێکدا تالیبان باوکیـان کوشـتووە، ئەو رۆڵێکی بەرچاو دەبینێ لەبارەی ستراتیژیەتیی باشوور، نـەمزانیبوو گـریگ و کارزای بەکردەیی ناوەڕۆکی بڵاوپێکردنیان داناوە.

"لەوانەیە هاوپەیمانەکانمان توانیویانە لەلای بـاکوورەوە بەتـەواوی زاڵبوونـە، بەڵام ئێمە پێویستیمان بەباشوورە، دەبێ وابکـەین جـەنگی نـاوخۆیی لەنێویانـدا روونەدات، لە کاتێکدا تالیبانەکانی پشتۆن دژ بـەوانی دیکـەن، واتـە ململانێـی نێوان باکوور و باشوور".

هاوپەیمانەکانمان توانیبوویان دە لەسەدا دەستی بەسەر رووبەری ئەفغانستاندا بگرن، لەوانەشە بتوانن دە لەسەدایەکی دیکە بەدەسـت بێـنن، کەچـی تالیبـان و هاوپەیمانە خێڵەکییـەکانیان رۆژ بـەرۆژ سـەرکەوتن بەدەسـت دێـنن، جـەختم لـە هاوپەیمانە ئەفغانییەکان کردەوە، هەستم بەوە کرد ئەوان کلیلی سەرکەوتنن، تەنیا ئەوان لە سروشتیی ئەو خاکە دەزانن، هەروا دەتـوانن ئـەفغانی دیکـە بکـەن بـە هاوڕێی خۆیان و هەر ئـەوانیش دەتـوانن دیـواری ئەسـتووری تالیبـان بشـکێنن،

چونکە تەنیا ئەوان دەتوانن یەکسەر بجوولێن، سووپای ئەمریکی زانیارییەکی کەمیان هەیە سەبارەت بە ئەفغانستان، بە چەند مانگێك دەتوانن سووپاکەیان جوولە پێ بکەن، هەروا فەیلەقی سەربازی سی ئای ئەی کەمێکیان ماون، هەروا هەموویان گونجاو نین بۆ ئەو کارە، بۆیە پێویستە بەخێرایی بجوولێن نەوەك هەڕەشەیەکی دیکە سەر هەڵبداتەوە و هێرش بکەنە ناو ئەمریکا، دیارە جوولە خێراکانمان پەیوەستە بە سەرکەوتنی هاوپەیمانە ئەفغانییەکانمان.

پرسیاری ئەوەم کرد "ئێستا شرۆن و تیمی شکاندنی سەرەکان لەپنچشیرن، ئایا ئەوان پێویستیان بە چییە؟".

جۆن گوتی "بەڵێ ئێستا گەیشتوون، تا ئێستا باشن، بەڵام لەو ماوەیەدا پێویستیان بە پارە و چەك و پیاو هەیە، هەموو شتێك، پێویستە ئێمە لە بارەگای سەرکردایەتی تیمێکی کارگێڕی و پشتگیری دامەزرێنین، بەشێك بۆ ئامانجگترین، بۆ ئەو تیمانەی بڵاوەدەکەن".

"تۆ ئەو کارە بکە، من و جۆن ڕەزامەندی دەردەبڕین بۆ هەر سەرۆکی تیمێك و جێگری تیمەکانی مەیدان یان لە بارەگای سەرکردایەتی، پێویستە تەواوکەری یەکتر بم، هەروا بەخێرایی بتوانن بڕیار بدەن، بڕیارە ڕاستەکان، ئەوەندەی کارەکە پەیوەستە بەخێرایی وردی ئەوەندە پەیوەست نییە بە سەرکردەکان، بۆیە ئەو تۆڕە دەبێ ئاستی بەرز بێ و دینامیکی بێ".

هەستم بەوە کرد تیمەکان شکست دەهێنن ئەگەر ئەفسەر گونجاو دانەنرێ، لەوانەشە تووشی گێژاوە ببنەوە.

لە شەوی یەکەمدا، لەبەیانی ڕۆژی دواتر، لەپاش دوو کاتژمێر لە خەوتن، لە نووسینگەی کۆفر دابووم، ئەوێ گەورە بوو، هەروا کۆفر بە هێزەوە دەستەکانی

دەجوولاند وەك ئەوەی لە هەوادا جەخت لە بیرۆکەیەك بکاتـەوە، چـەند جـارێکی هەردوو دەستی لەسەر مێزەکە دانا.

باسی لەوە کرد کە چۆن خۆی و ریچ لـە تـەمووزدا لـەلای کۆنـدەلیزا رایـس راوێـژکاری ئاسایشـی نەتـەوەیی بـاس لـە هەڕەشـەیەکی دیکـە کـراوە لەلایـەن قاعیدەوە، بەبێ ئەوەی هیچ وەڵامێك لەلای ئەو و کۆشکی سپیدا هـەبێ، هـەروا ئاماژەی بە وتارێکی پوختکراوەی سەرۆك دا کـە لـە٨ ی ئـابی ٢٠٠١ ئامـاژەی بەوە داوە، کە "بنلادن مکورە لە لێدانی ویلایەتە یەکگرتووەکان"، ئەمە لەلایەن بنکەی دژەتیرۆر نووسرا و درایە کۆشکی سپی، هەروا ئاماژەی بـەوەدا لـە سـاڵی ١٩٩٣ زۆر بەروونی باس لە هێرشکردن دەکات بۆ سەر بنکەی بازرگانی جیهانی، هەروا بنلادن مکورە لەسەر ئەوەی "جەنگ دەگوازێتەوە بۆ ئـەمریکا، لەلایـەکی دیکەوە ئاگادارکردنەوەکە ئەوەشی تیادا بوو، کە بـنلادن دەیـەوێ هێـرش بکاتـە سەر واشنتن، لێرەش پرسیارەکە لەوەدایە دەبێ سـەرۆك فـرانکلین ورۆزفێلـت چـی بکەن لەبارەی پیلانی ژاپۆن لەو کاتەی دەیانەوێ هێرش بکەنە سەر بـێرل هـالربۆر بەتایبەت لە کانوونی یەکەمی ١٩٤١.

کۆفر باسی لەوە کـرد کـە لـەپاش ١١-٩ پوختـەی سـەرۆك و ئەنجوومـەنی ئاسایشی نەتەوەیی چی تیایدا وتراوە، بەتایبەت ئەو کاتەی داواکرا خودی سەرۆك بۆش سەرکردایەتی سی ئای ئەی بکات تا "سەری بنلادن" بێنێتەوە، لە کاتێکدا سەرۆك هانی سەرۆك ئاسایشەکەی دا، لەو کاتەی هەموو کاغەزەکانی ناو دەستی پەرشوبڵاوە پێ کرد، ئەو زۆر بەرێزە، ئالنگاریان بوو تـا رووبـەڕوو بەرامبـەر بـە دوژمن ببنەوە، هەروەها کۆفر تینیت هەموو شتێکیان داوا کـرد بـۆ بـەرپاکردنی جەنگ، سەرۆکیش هەموو شتێکی پێ بەخشین.

## هونەری سیخوڕی

کۆفر ئەوەی بۆ باس کردم کە " جگە لەوانەی بەرامبەر بە مێزەکە دانیشتبوون، کەسی دیکە بیر لە جەنگ نەکردبۆوە لە ئەفغانستان، جگە لە ئێمەش کەسی دیکە لەوێدا نەبوو".

توانیم لەوە تێ بگەم ئازایەتی نییە کۆفر داواکارییەکان پێشکەش بکات، بەڵام دەبێ بە پشتگیری تینیت بێ، تا بەرپرسیاریەتییەکە بگرێتە ئەستۆی، لەلایەکی دیکەوە کلاوسفیتر لە کتێبەکەی بە ناونیشانی "لە جەنگدا" باسی لەئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەتی کردووە، ئەمەی لەسەرووی ئازایەتی داناوە، هاوکات سەرکردەیەك نییە بەبێ ئەو جۆرە پاڵەوانەتییە، باشترین نموونەش نەم بینیووە بەرامبەرم بێتەوە، بەڵام شەرفمەندم جارێکی کار لەگەڵدا دەکەم.

لەڕاستیدا بەرپەرچدانەوەی ئاسایش بەشێوەیەکی جیا بوو، کۆشکی سپی پەنای بردە ئەفسەری ئۆپراسیۆنی سی ئای ئەی تیایدا داوای کرد ڕێنمایی و سەرکردایەتی بکات لە یەکێك لە قەیرانە نیشتمانییەکان هەر لە بیرل هاربۆرەوە، لێرەدا بیرم لە چۆنیەتی پێشکەوتنی شەڕەکان کرد، واتە یاریزانەکان لە وڵاتانی دیکە دێنە ناو گۆڕەپانی جەنگەکە، بەمەش هەموو چەمکەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان سەراوخوون دەکاتەوە، چونکە هیچ بوونێکی سوپای نیشتمانی بوونی نییە تا پنتاگۆن دژایەتیی بکات، هەروا هیچ دەزگایەکی تاوانکاری نییە تا ئێف بی ئای مامەڵەیان لەتەکدا ئەنجام بدا و بیانوەستێنێ، هیچ وەزارەتێکی دەرەوە نییە هاوشانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بێ تا پەیوەندی پێوە بکات، یان هیچ دەزگایەکی نێودەوڵەتی نییە تا دەسەڵات و هێزێك ڕووبەڕووی ئەو ئاڵنگارییە ببێتەوە، تەنیا چەند ئەفسەرێکی سی ئای هەیە سەبارەت بەو گرفتە دەزانن و چەند ساڵێکە خۆیان تەرخان کردووە بەرامبەر بەو کێشەیە، بۆ ئەمەش کۆفر ڕۆڵی سەرکردایەتی دەبینێ کاتێك هیچ خۆبەخشێك نییە ئەو کارە بکات.

پرسبارم لە کۆفر "ئایا دەزانن تۆ بەرامبەر چ کێشەیەك بوویتەوە".

"لەوە دڵنیا نیم، لەوانەشە سەرۆك زۆر زیرەك بێ، بەپێی ئەوەی هەندێك پێیان وایە و ئەو دەیەوێ ئیستا هێرش بکرێ، کەچی رامسفێڵد کەسێکی گەمژەیە، لە هەموو شتێك زیاتر تەنیا گرنگی بە دەسەڵاتە تایبەتییەکەی دەدا، بەڵام ئێستا ئێمە باشین تا ئەو کاتەی سەرۆك پشتگیرمان دەکات، کەسی دیکەی نییە، تەنیاش ئێمەی هەیە".

"سوپاس بۆ بانگکردنم، من چاوەڕوان بووم". وەك دانپیانانێك وام گوت.

کۆفر بەرقەوە سەیری کردم گوتی "لە دوو ساڵی رابردوودا گوێم بۆ راگرتی، تۆ سکاڵا دەکەی سەبارەت بە داڵدەدانی دوژمنەکان لە ئەفغانستان، ئێستا کارێکت هەیە، دەستکێشەکانم لەدەست کردەوە و بە شرۆنم راگەیاندن من سەری بنلادنم دەوێ، من سەری ئەو دایکسۆزانییەم دەوێ، پێویستە قاعیدە وێران بکەین".

هەموو پلانە ئامادەکراوەکانم پێ ڕاگەیاند، کە لە شەوی رابردوو کارمان لەسەر کردبوو، ئەمەش پەیوەندییەکی تەواوی هەبوو بە کارەکانی پێشترمان، بەتایبەتی ئەو هەوڵانەی ریچ دای بوو لە "وێستگەی ئلیك".

بەترسەوە گوتم " دەبێ بەخێرایی ئەو کارە بکەین، پیاوێکی زۆر لەدەست دەدەین، زۆربەیان".

"دەتوانیت گرەو بکەیت، یان تۆ دەزانیت؟ هەنگاو باوێ و بەردەوام بە، بەرامبەر هیچ کەسێك مەوەستە، ئایا تێ دەگەیت؟ ئایا تۆ ئامادەی بۆ ئەمە؟".

ئەمانە تەنیا پرسیار نەبوو، بەڵکو ئاگادارکردنەوە بوو بەبێ ئەوەی ئارەزووی لێ بێ، زانیشم نابێ قسەکانی پێ ببڕم.

"هەموو ئەو شتانە دەخەمە بەردەستت، یان هەر شتێکمان هەبێ، پێویست جەخت لە جەنگ و پیاوانمان بکەیتەوە، بۆ دۆڵی مردن دەچیت و چەند ئەفسەرێکت لەگەڵدا دەبێ، هەموو شتەکانی دیکە لەبیر بکە، تەنیا جەخت لە دوژمن بکەوە، تا پێت دەکرێ بیان کوژە، بە شرۆنم راگەیاند سەری بنلادنم دەوێ، تێ دەگەی؟ لە بووندا رەشیان بکەوە، منیش گرنگی بە کردەوەی سیاسییەکان دەدەم"، نەم توانی پێی بڵێم ئەو تەنیا خۆی دووبارە دەکاتەوە.

"هیچ کاتێك گرنگی بە ناوە رەمزییەکان مەدە، یان گرنگی بە پەرچەمەکانی جەنگ و ئاهەنگەکان مەدە، ئەمانە شتی ساکارن، ئایا تێ دەگەی؟".

وەك ئەوەی هاوار بکات، بەڵام بەهاتوهاوار نەبوو، رووخساری بەتەواوی گۆڕا بوو، رەنگی سوور بوو بوو، بەڵام جۆشوخرۆشێکی مەحاڵ لە رووخساری دەبیندرا، دەی توانی هاوار بکات و شتەکانی دەوروبەری هەمووی فڕێ بدا، نەمزانی بۆ وادەکا، تا ئێستاش باسی لە مەبەستە ڕاستەقینەکەی نەکردووە، کاتێك لەلای ئەو کارم دەکرد فێری ئەوە بوو بووم بەگرنگییەوە گوێی بۆ راگرم، چونکە هەستونەستە سیاسییەکانی زۆر توند بوون، ئەو ئاوێتەیەکی دەگمەنی هەیە لەنێوان ترس و ئازایەتی، لە کاتێکدا خۆی دوور دەخاتەوە لە ململانێیەکە و لەلایەکی دیکەوە بەسەر دیوار دوژمنی کەوتووە.

"بەڵێ قوربان تێ دەگەم".

بێدەنگ بوو

"پێی ڕاگەیاندم داوا بکە، ئەگەر هەر شتێکت ویست".

"دەتوانیت گرەو لەسەر هەموو ئەمانە بکەیت".

کاتێك ڕۆیشتم لە نووسینگەکەی بەتەنیا جێم هێشت.

گەڕامەوە نووسینگەکەم، سەیری یەکێك لە نەخشەکانی ئەفغانستانم کرد، ترسم لەوە بوو قاعیدە بۆ جارێکی دیکە هێرشمان بکاتە سەر، لەوانەیە لە هەر کاتێك بێ هێرش بکاتە سەر وڵاتەکەمان، بۆیە پێویستە بەخێرایی بکەوینە جوولە، تا ڕووبەڕووی دوژمن ببینەوە و تێکی بشکێنین، ئەمەش باشترین بەرگرییە لە خۆمان، واتە بەخێرایی ڕووبەڕوویان ببینەوە، بەشێوەیەك لەو شوێنانە بدەین کە قاعیدە و تاڵیبانی تیادا کۆبوونەتەوە، دەبێ لە ڕێگەی تاڵیبانەوە بگەین بە هەموو ئەوانەی دەیانەوێ بگەن بە قاعیدە.

ئەگەر ئێمە داگیرکەر نەبین بە هیچ شێوەیەك سەرکەوتوو نابین، لە کاتێکدا ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی یاخیبوون بێتە کایەوە، بەمەش دەتوانین بنکەی سەرکردایەتی قاعیدە وێران بکەین و نەتوانن بچنە نێو داڵدە سەقامگیرەکانیان لەناو ئەفغانستان، ئێمەش دەبێ بە یاخیبوو و هاوکاری یاخیبووەکان دەکەن، ئامانجی سەرەکیشمان سەرکردایەتی قاعیدە و بنلادنە بەتایبەتی.

کاتێك ماسی هات بەکورتی هەموو ئەو شتانەم بۆ باس کرد، کە لەگەڵ کۆفردا باسمان لێوە کرد، ئەو بابەتە نوێیەکانی پێ ڕاگەیاندم، هەروا بەخێرایش ناوی فەرمانەکانی پێ گوتم کە لە ئەستۆی کێ دایە.

لێم پرسی: "ئایا ئەوانە پیاوانی ڕاستەقینەن بۆ ئەم کارە".

"بەڵێ، پیاوانێکت دەست کەوێ، ناتوانیت بڵێین ڕاستەقینەن".

"ئەمە مانای چییە؟".

"زۆربەیان خۆبەخشن، زۆرن، بەڵام زۆربەیان کارایی تەواویان نییە، بەڵام دەتوانین پێکهاتەیەك لە بەهرەکان لەیەکتر نزیك بکەینەوە بۆ سەرکەوتنی کارەکان، وەك دەزانیت ژمارەیەکی کەم لە ئەفسەران کارایی تەواویان هەیە بۆ ئەو جۆرە کارە، هەر چۆنێك بێ ژمارەیەکی کەم هەیە، ئینجا لە هەر شوێنێك بن".

ئەو راست دەکا، تەنیا لەرووی جیاکردنەوەی شتراتیژییەوە نەبێ، کێ زمانە ئەفغانییەکان دەزانێ و لە سروشتیی خاکەکەی تێ دەگا و رقی لە قاعیدەیە و ئارەزووی لە شەڕە؟ بێگومان ئەوانە ئەفغانییەکانن.

"ئەمەش هۆکارە بۆ هاوکاریکردنی هاوپەیمانە ئەفغانییەکان تا بگەین بە ئامانجی کۆتایمان، ئەوان دەزانن ئەمە کاتیانە لەپاش کوژرانی ئەحمەد شا مەسعوود لەپاش ١١-٩، شرۆن باسی لەوە کرد، هاوکات عەبدوڵڵا عەبدوڵڵا و عارفی ئەندازیار و ئەمرللا وایان گوت، ئێمە ئەفسەری سەکردەمان دەوێ، بتوانن لەگەڵ ئەفغانییەکان بن و هانیان بدەن کە ستراتیژییەکەی گونجاو هەیە بۆ هەماهەنگییەکی گونجاو، ئەوانیش هۆکاری خۆیان هەیە، ئێمەش تەنیا هاوکاری ئەوانمان دەوێ".

چۆن لە کاتی قسەکردندا سەری دەلەقاند، بەڵام نەڕۆیشت.

پرسیم :"ئایا شتێکی دیکە هەیە".

"لەوانەیە هەندێك تیمی هەماهەنگی گرفتیان هەبێ، تینیتی بەڕێوەبەر پشتگیریان دەکات، هەروا رۆب ریچر سەرۆکی کارمەندەکان پشتگیریان دەکات، بەڵام تیمی هەماهەنگی واز لە خەڵکە باشەکەی ناهێنێ، ئێستا سەرۆکی هەموو وێستگەکانی جیهان پەیوەندیمان پێوەدەکەن، ئەوانە ئەفسەری باشن، ناشکرێ هەموویان بنکەکانی خۆیان جێ بێڵن".

"ئەوانە وەرگرە کە ئێمە پێویستمان پێیانـە، لەگـەڵ رۆب کـار بکـە، هـەر کاتێکیش گرفتی گەورە هاتـە رێـت ئاگـادارم بکـەوە، لـەبارەی ئەوانـەی ئێمـە پێویستمانە، هەموو ئەو باسانەش لەگەڵ کۆفر دەخەمە روو".

ماسی بەگوماناوییەکەوە سەیرێکی کردم.

"جۆن، گـوێ بگـرە، ئەوانـە بەدەسـت دێنیـت، کـە پێویسـتتە، بـەرێزەوە سیستەمەکە دەخەینە بەردەستمان، بـەڵام تـەنیا بـۆ یـەکجار، ئەگـەر سیسـتەم نەیتوانی ئەو کارە بکات، هەوڵ دەدەین بیانکەین بە هاورێی خۆمان".

جۆن بەسەرسوڕمانییەکەوە گوتی "زۆر کەس لێمان وەڕس دەبن".

"لەراستیدا من دەتوانم ئەو کارە بکەم".

"بەڵێ، تۆ دەتوانیت".

## کامپ دێڤید

لـە بەیانییـەکی رۆژی شـەممەی کۆتـایی مـانگی ئـەیلوول لەگـەڵ تینیتـی بەڕێوەبەر سواری ئۆتۆمبیلێکی رەش بووین، بەرەو کامپ دێڤید رۆیشتین، پێشـتر نەچوومەتە ئەو شوێنە یان چاوم بە سەرۆك بـۆش کـەوتبێ، کـە مـاوەی هەشـت مانگە دەسەڵاتی گرتۆتە دەست.

سەرۆك بۆش پێشوازیەکی گەرمی لـێ کـردین، ئـەو جلوبـەرگێکی ئاسـایی لەبەردا بوو، تینتی بەڕێوەبەریش بەسەلقەیەکی باشەوە قسـەی دەکـرد، هاوکـات ئاندی کارد زۆر بەڕێزەوە باسی سیڤی منی کرد، هەر لەوێـدا رایسـی راوێـژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئامادەبوو، ئەو زریپۆشێکی هێمنـە بـۆ پاراسـتنی سـەرۆك،

چینی جێگری سەرۆك بەخەندەوە پێشـوازیەکی گـەرمی لـێ کـردم، ئـەوەش بـۆ یەکمجارە هەر یەك لەوانە ببینم.

هەموویان زۆر بەڕێزەوە قورسایەکی سیاسیم نەبوو، بـەڵام ئـەوەم خوێنـدەوە پێیـان وایـە بـەکردەیی بـەرەو سیاسـەت هـەنگاو دەنـێم، ئەمــەش پێچـەوانەی متمانەبوونە بە تینیت، لە ماوەی چەندین ساڵی رابردوودا خۆم سـەلماندووە لـەنێو هەواڵگری و کۆکردنەوەی زانیاری و کاری شـاراوە، بـەڵام ئـەو جیهانـەی ئێسـتا لەلای من نوێیە، لەپاش ماوەیەکیش ئەوەم بۆ دەرکەوت کە هێڵێکـی روون نییـە لەنێوان ئـەم دووانـەدا، تـەنیا رووبـەرێکی فـراوان هەیـە لـەنێوان ئۆپراسـیۆن و سیاسەتدا، دەتوانیت بچیتە نێو سنوورە تەماوییەکان، لە کاتێکدا یەکسەر لەپێش چاوت ون دەبێ.

دانیشتنەکە زیاتر گفتوگۆ بوو لەنێوان بەشداربووان، زیاتر لەوەی پوختەیەکی فەرمی بـێ، مـن بـە هـۆی چـەندین نەخشـەوە باسـم لـە پلانـەکانمان کـرد لـە ئەفغانستان، سەرۆك بۆشیش زۆربەی پرسـیارەکانی کـرد، کەچـی ئـەوانی دیکـە باسیان لەچوارچێوەی کات و زەمەنی پلانەکان کرد، بیرۆکەیەکی وام نەبوو کاتێـك جەنگ لە ئەفغانستان دەسـت پـێ دەکـات ئەنجامەکـەی دەگاتـە کـوێ، ئینجـا بەخێرایی بێ یان بەهێمنی، ئەمەو دەتوانین خێرایی یەکلاکـەرەوە ئـەنجام بـدەین، بەشێوەیەك ئەگەر هەواڵگرییەکی باشترمان هەبێ، بۆ ئەوەی وێنەکـە روونـتر بـێ زیاتر بابەتەکە پەیوەستە بەو بڕیارانەی لە کاری شاراوە دەدرێ، جگە لـە لێـدانی سەربازی و سیاسی ئاشکرا.

لەپاشاندا ئیمێل نەخلە وەك یەکێك لە باشترین شیکەرەوەکانی سی ئای ئەی دەستی کرد بە شیکردنەوەی ئایدۆلۆژیی قاعیدە لە جیهانی ئیسلامیدا، ئیمێل لە

فەلەستین پەروەردە بووە و لە زانستە سیاسییەکان دوکتۆرای بەدەست هێناوە، لەو کەسانەیە کە سەرچاوەی یەکەمە سەبارەت بە ئیسلامی سیاسی، مــن و ســەرۆك زۆر بەگرنگییەوە گوێمان لە پوختە سیاسییەکەی گرت.

ئەوەی لــەلام ســەیر بــوو بەشــداری نــەکردنی وەزارەتــی بــەرگری بــوو لــەو کۆبوونەوەیەدا، هیچ شتێکمان لە پنتاگۆن وەرنەگرتووە واتە ئەوەی پەیوەســتە بــە پلانەکانی، پرسیارەکەشم لەوەدایە دەبێ رامسفێڵدی وەزیر و ئەوانی دیکــە چ بــە سەرۆك بڵێن، لە کاتێکدا پنتاگۆن هیچ پلانێکی نییە، کۆفر راست دەکات، ئێمــە لە سی ئای ئەی هەنگاو دەنێن و ئێمە فەرماندەین.

لــەپاش کۆبوونەوەکــە ســەرۆك مــن و جــۆرجی بــەرێ کــرد تــا گەیشــتنینە ئۆتۆمبیلەکە، جۆرج کەمێك لەپێشتر بوو، بۆ چەند ساتێك سەرۆك دەستی لەسەر شانم دانا و بەهێمنی گوتی "برۆ لەناویان بەرە".

"بەڵێ، قوربان".

ئەم ئاماژە ساکارە، بۆ من بەشی هەرە گرنگــی کۆبوونەوەکــە بــوو، چــونکە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەراســتەوخۆیی و کەســی فــەرمانی پــێ کــردم، ئەمەش وەك خەیاڵ وایە، ئەم ئاماژانە بۆ ئەفسەری ئۆپراسیۆنەکان زۆر گرنگــە و پێویستیەتی یان شایستەیەتی، بۆیە هەستم بە مکورِبوون کرد.

نەم دەتوانێ خۆم دووربخەمەوە لــەو هەســت بەتایبــەتی لــەو کۆبوونەوەیــەدا هەستم بە خەیاڵی جەنگی داهاتوو دەکرد، کە بــەروونی لەبەرامبــەرمان ئاشــکرا بوو.

جۆرج لە نێو ئۆتۆمبیلەکەدا دەستی بە جگەرەکێشان کرد، بە چرپەوە گــوتی "شتێکی باش بوو".

منیش گوتم :" تەنیا ئێمەیان هەیە، ئەی وانییە؟"، لەوانەشە پلانێکی هاوسەنگ هەبێ، زۆر بەزەحمەتیش لەوە دەگەیشتم کە چۆن سی ئای ئەی رۆڵی سەرەکی دەبێ، منیش رۆڵی فەرماندەیی و سەرکردایەتی دەبینم.

"بەڵێ راستە". هەروا جۆرج گوتی "کۆفر تۆ و کوڕەکان".

سەیرێکی کردم و هەردوو برۆی بەرز بۆوە و سەری لەقاند، هەروا لەساڵی رابردوودا لەگەڵ بەڕێوەبەر گەشتێکی دوورودرێژمان بەدەریادا کرد، فێر بوو بووم دەربڕینەکانی چۆنە وەك ئەوەی بڵێت "خۆت گێل مەکە، ئێمە دەتوانین ئەو کارە بکەین".

زۆری نەمابوو جگەرەکە تەواو بێ، بەڵام سۆتەکەی نەکەوت، وامزانی ئەمە بەڵغەم بێ.

گوتم: " بەڵێ، قوربان".

کەچی من لەولاوە بیرم لە رۆڵی فەرماندەیی دەکردەوە واتە هەموو شتەکان دەکەوێتە ئەستۆی من و کۆفر، ئێمەش هیچ شارەزاییەکی سەربازیمان نییە، تەنیاش چەند جارێك چووینە باشووری ئاسیا، سەردانی ئەفغانستانمان نەکردووە، ئایا گاڵتە دەکەی؟ بەڵام سەرۆك بە تۆ و کۆفری گوتووە بڕۆن، ئێمەش دەڕۆین، لە کارەکە تێگەیشتم، تا دەتوانن بەخێرایی و بەهێزەوە بڕۆن.

زۆر جار وەڕس دەبووم کاتێك هێرش دەکرایە سەر وڵاتەکەکان، ئێستاش من متمانەم بە خۆمە هەیە، تەنیاش ترسم لە سیاسەت و سنوورەکان هەیە لەنێوان ئۆپراسیۆنی هەواڵگری و سیاسەت، ئەمەش وا دەکات زیاتر مکوڕ بم.

لەم چەند رۆژەدا پێم باش بوو لەگەڵ کۆفر قسە بکەم، چونکە سەرکێشیی سیاسی رەهەندێکی دوورە، دەم ویست گوێ لە بۆچوونەکانی بگرم، هەروا باسی ئاگایم بۆ بکات.

چوومە نووسینگەکەی و دەرگاکەم پێوە دا و لەسەر کورسییەك دانیشتم، ئەو هیچ قسەیەکی نەکرد و چاوەڕێ بوو.

"بیرم لەوە کردەوە کۆفر تۆ لەگەڵ ئێمەی، کەس لەگەڵ تۆ نییە، تۆ لەپشتەوە دەمان پارێزیت، بەڵام کەس نییە، پشتی تۆ بپارێزێت".

پێویست بەوە نەبوو تا ئاماژە بە سەرکێشیی سیاسی بکەم، هەروا هیچ ئاماژەیەکم بەوە نەدا من لە رێزی تینتی بەڕێوەبەر کەم دەکەمەوە، بەپێچەوانەی ئەمە کۆفر گڵۆپی سەوزی داگیرساند و پشتگیرییەکی نادیاریکراوی خستە روو، بەڵام من و کۆفر ئەوەمان دەزانی کە کارەکانی دیکە دەکەوێتە سەر شانی تینیتی بەڕێوەبەر، کە پێشتر فەرمانبەرێك بووە لە کۆنگرس و ئەویش توانایەکی سیاسی جیای هەیە، ئەو پێویستە ئاژانس و کردەوەکە بپارێزێ لەنێوەندی ئەو سیاسەتە قورسەدا، ئەو هیچ کاتێك بەشاراوەیی کاری نەکردووە.

بەردەوام بووم "کۆفر من سکاڵا ناکەم، من لە ئامادەباشیدام، هەموومان لە ئامادەباشیداین، دەزانم بیر لەو شتانە دەکەیتەوە، چونکە مێشکت گەورەیە".

وەك ئەوەی بەزیی پێم بێتەوە سەیرێکی کردم و بەهێمنی گوتی "دەزانیت ئێمە کۆتایمان هاتووە".

بیرم لەوە نەکردبۆوە دەڕوا، بۆیە بەهێمنی دانیشتبووم، بەڵام هیچی دیکەم نەگوت، بەڵام رووخساری گۆڕا و وا سەیری کردم کە من گەمژە بم.

"ئێمە کۆتایمان هات، ئەگەر شکست بهێنین ئەوا لۆمەمان دەکەن سەبارەت بە هەموو شتێك، ئەگەر سەرکەوتین ئەوانەی لەو باڵەخانەدا هەموویان رقیان لە ئێمە دەبێتەوە، لەپشتەوە گولەمان تێ دەگرن، رقمان لەیەکتر دەبۆوە، چونکە کەرەستە و دەسەڵاتمان نییە، بەشی رۆژهەڵاتی خوارو دەیویست زاڵ بێ بەسەر ئەو جەنگەدا، بەڵام بەرپێوەبەر پشتگیری کردین، بۆیە پێویستە ماڵئاوایی لە هەموو داهاتوویەکی پیشەیی بکەیت".

بەتوندی پێم گوت " تۆ پێت وایە من گوێ بە داهاتووی پیشەیی دەدەم؟ هەزاران کەسمان کوژراوە، ئەوەی دەمەوێ کارەکەیە، تۆ بە منت سپارد منیش بە گرنگی دەزانم".

کەمێك گەرم بوو و گوتی "کارەکە لە یەکێتیی سۆفیەت دەچێ کاتێك لە جەنگی جیهانی دووەمدا بوو، ئەو کاتەی شکستیان هێنا بەشێك لە جەنەراڵە سیاسیەکانیان لەسێدارە دا، ئەوان هەردەم دەمانچەکەیان پڕ لە گولە بوو، کارەکە ئاسانە، لە هەردوو حاڵەتەکە گولەیەك بەسەریان دەکەوێ"، وای دانا دەمانچەیەکی لەدەستدایە گولەیەك بەنێو چاوانم دەتەقێنێ، ئەو دەزانێ چۆن بۆچوونەکانی خۆی دەچەسپێنێ.

"دەتوانیت داهاتووت لە دەزگای شاراوە لەبیر بکەیت، ئەگەر دەتوانیت بە هەر شێوەیەك خۆت لەم باڵەخانەیە رزگار بکە، چونکە سیاسییەکان لەناو پایتەختدا خۆیان بۆت ئامادە کردووە، لەمە تێ دەگەیت؟ تۆ تەواو بوویت!".

رازی بووم بە قسەکانی :" بەڵێ، ئەوە دەزانم، کۆتایم هاتووە". لە بیرۆکەکەی گەیشتم ئەمەش وەك ئامۆژگارییەك وابوو کە زۆرجار باش و ناخۆشە،

وای دابنێ كۆتایت پێ هاتووه لەرووی سیاسی و پیشەییەوه، وا تێگەیشتم كارەكە وایە، بەڵام پێم باش بوو گوێ لە كۆفر راگرم، كە هەردەم ژیان دەداتە قسەكانی.

كۆفر هەناسەیەكی هەڵكێشا.

"بە ماسی جێگرەكەتم گوتووه دەبێ باش بێ وەك ئەوەی باسیان كردووه، دەنا با بڕوات"، منش دڵنیام كردەوه كە " ئەو زۆر باشە".

"باشە هیوام وایە، داوات لێ دەكەم بگەڕێتەوه بۆ كار".

## ژووری قەیرانەكان

لەپاش چەند رۆژێك من و تینیت ئامادەی ژووری قەیرانەكان بووین لەناو كۆشكی سپیدا، كۆندەلیزا رایش راوێژكاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆكایەتی كۆبوونەوەكەی دەكرد، ئەمەش بە ئامادەبوونی رامسفێلد و كارد و كۆڵن پاول وەزیری دەرەوه و پۆل ولفوفیتز جێگر و جەنەراڵ مایرز سەرۆكی ئەركانی هاوبەش، چەندین بەرپرسم لەو ژووره بچووكەدا بینی، من بۆ یەكەمجاره لەوێ دادەنیشم، من لەتەك جەنەراڵ واین داوینگی بەرپرسی دژەتیرۆری كۆشكی سپی، ئەمەو ئەم جەنەراڵە بۆ ماوەی چەندین ساڵ فەرماندەی هێزی تایبەتی ئەمریكی بووه، بێگومان چەند مانگێكی دیكە لەتەك ئەو جەنەراڵە دادەنیشم، سەرەڕایی ئەوەی ئەو سەرباز بوو، بەڵام من وا نەبوو، هیچمان پەیوەندیمان بەیەكەوه نییە لەرووی كاری شاراوەدا، بەڵام یەك میراتی هاوبەشمان هەیە لەرووی "ئا ئاس ئاس" لەنێوەندی جەنگی جیهانی دووەمدا، كە لەپاشاندا سی ئای ئەی و هێزی تایبەتی ئەمریكی لێ هاتۆتە كایەوه، لە سەرەتادا هەستم بەوه كرد دەتوانم متمانەی پێ بكەم، هەردوو لاشمان لەیەكتر نزیك دەبووینەوه، بەڵام ئەو وەك بەرد وابوو.

رایس داوای لە تینیت کرد زانیارییە نوێیەکان بخاتە روو، لەپاشاندا جەنـەراڵ تۆمی فرانك لە رێگەی ڤیدیۆیەکی راستەوخۆ لە بارەگای ناوەندی تامبـا قسـەی کرد، لەپاشاندا زۆربەیان بۆچوونی خۆیان گـوت، چـەند پرسـیارێك سـەبارەت بـە ئەفغانستان کرا و چەند وەڵامێکی پوختم دایـەوە، بەترسـەوە وەڵـامم دەدایـەوە، چونکە شارەزایی ئەو ژینگەیە نەبوو.

هەموو شتەکان بەپێی دڵی ئێمە بوو، هەر یەك لـە کەسـەکان رۆڵـی خۆیـان باس کرد، هەمووشیان هێمن و لەسەرخۆ و ئاقڵانە دەدوان.

لەناکاوێك کارەکە شێوا.

بەبێ پێشەکی یان خستنە رووی خاڵێك ولفۆفتیر دەستی بە قسان کرد.

"عێراق، پێویستە جەخت لە عێراق بکرێتەوە، ئەمە دەوڵەتە لەپشـت ١١-٩، بەڵام عێراق بنکەیەکە بۆ ستراتیژیمان لەرووی دژەتیرۆردا"، زۆر بەتوندی قسەی دەکرد، کەمێك وەستا بێ ئەوەی هیچ وەڵامێك وەربگـرێ، بۆیـە بـۆ مـاوەی دوو خولەکی دیکە دەستی بە قسەکردن کرد، بەڵام لەناکاوێك وەستا وەکچۆن دەسـتی پێ کرد.

هەموو لە بێدەنگییەکی قورسدا بوون.

سەیری ناو هەموو ژوورەکەی کرد، بەڵام کەس قسەیەکی نەکرد.

لە خۆم پرسی دەبێ ئەمە چ بکێشێ؟

هـەموو ئـەو شـتانەی لـەرووی هەواڵگرییـەوە کۆمانکردۆتـەوە یـان هـیچ شیکردنەوەیەك نییە باس لە عێراق بکات کە دەستی لە هێرشەکانی ١١-٩ بـێ، بەڵکو سەدام حسێن بەپێچەوانەوە دیکتاتۆرێکی عیلمانی بێ ئومێـد بـوو، هـیچ

## هینری ا.کرامبتۆن

کاتێك لەگەڵ ئایدۆلۆژیەتی قاعیدە نەبوو یان بە هاوپەیمانی بزانیێ، سەرەڕای ئەوەی سەدام کەسێکی تیرۆرست بوو و پشتگیری کۆمەڵە تیرۆریستییەکان دەکات، بەتایبەتی ئەو تۆڕانەی سەر رادیکاڵی فەلەستینین، هەروا پێی وایە قاعیدە هەڕەشەیە نەك هاوپەیمان لەلایەکی دیکەوە قاعیدە پلانی هێرشەکانی ١١-٩ لە ئەفغانستاندا داناوە نەك لە عێراق.

بەبێ دانیشتم، کارەکە لەوە سەیرتر بوو تا پێویست بکات وەڵامی بدەمەوە، بەتایبەتی من کوڕە نوێیەکە بووم لەتەك غرووڕێکی سیاسی و تارمایی مەیدانی، دیار بوو کەس بەرپەچی ولفوفیتزی نەدابۆوە منیش هیچ قسەیەکم بۆی نەبوو، بەو پێیەی بۆچوونێکی لۆژیکی کاتییە و لادانێکە لەلایەن سەرکردەیەکی سیاسی بەرپرس، نەم دەزانی ئەو بۆچوونانە چی لێ شین دەبێ.

یەکێکی دیکە بووە جێگەی سەرنجی من لەتەك هات و هاواری ولفۆفیتز کاتێك باسی عێراقی دەکرد، لە کاتێکدا پێویستە جەنەراڵ تۆمی فرانکس ببینێ، ئەو جەنگاوەرێکی جەنگە، هەردەم پێویست بەوە بوو ببێتە بڕیاردەری سیاسەت لە واشنتن، منیش پێویستیم بە هاوبەشێکی سەربازی هەبوو، وەکچۆن پێویستیم بە تیمەکەم هەیە لە ئەفغانستان، بۆیە دەکرێ هێزی تایبەت و هێزی سەربازی ئەمریکی لەوێدا بێ، بەتایبەتیش هێزی ئاسمانی، ئەمەو باڵە نیمچە سەربازییەکانی سی ئای ئەی بچووك و لاواز بوون ئەگەر بەراورد بکرێ هێزێکی خامە، ئەوەم دەزانی کارەکەمان شکست دەهێنێ بەبێ هاوکارە سەربازییەکانمان چ لەسەر ئاستی ستراتیژی لەویلایەتە یەکگرتووەکان و ئاستی کردەیی لە ئەفغانستان، هەروا لەسەر فەرماندەی ناوەندییە ببێتە هاوبەشێك لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، نەوەك خودی پنتاگۆن بێ.

دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆ نووسینگەکەم، داوام لە تیمەکەم کرد، کاتێك دیار بکەن بۆ بینینی جەنەڕاڵ فرانکس لەتامپا، کاتەکە زووتر بێ زۆرباشترە، لەگەڵ خۆشمدا عەقید کلارکی راوێژکاری سەربازی لە فەرماندەی ناوەندی دەبەم.

## کەندی کەرویشکەکان

لە ماوەی چەند رۆژێکدا کیانە نوێیەکەمان فراوان بوو، کە ناونراوە بنکەی دژەتیرۆر-ئۆپراسیۆنی تایبەت، زیاتر لە پەنجا ئەفسەری تیایدا بوو، جگە لەوەی پەنجا ئەفسەری دیکە لە خزمەتی بریداتۆر بوو، هەموو ئەمانەش گوازرایەوە ژێر فەرمانی من، دەمانویست هەرچۆنێك بێ تۆڵە بکەینەوە، لە کاتێکدا ئێمە گفتوگۆمان لەسەر هۆکارەکان نەکرد، بەڵام پێویستیمان بەوە نەبوو.

بوارەکەمان فراوان بوو، وای لێ هات ئەو نووسینگەیە بچووکە ببێتە کەندێك بۆ کەروێشکەکان، بەتایبەت بە هۆی چەندین نووسینگە لەتەك یەکەوە و هەموویان یەك سەربانیان هەیە، هەموو لایەکان پڕبوون لە وێستگەی کۆمپیوتەرەکان و لەتك چەندین وایەری بەیەکەوەبەستراو و ئامێری کۆپی و دانانی چەندین نەخشە بەپێی ئەو رووبەرەی لە دیوارەکەدا هەیە.

لە نووسینگەکەم دانەیەك لە بەیانی دۆزەرەوەی بەریتانی گەورە ئارنست شاکلتۆنم هەڵواسی لەو کاتەی هەڵمەتی تەجنید لە ١٩١٤ ئەنجامدرا بۆ نێردراوەکانی جەمسەری باشوور "داوای ئەو ئەفسەرانە دەکەین کە دەیانەوێ خۆیەخش بن بۆ گەشتێك پڕیەتی لە ترسناکی، مووچەی کەم، سەرماوسۆڵە، هەروا چەندین مانگ لە تاریکی، ترسناکیی بەردەوام، گەڕانەوەت زامین نەکراوە، بەڵام کاتێك سەرکەوتووی رێزت لێ دەنرێ".

## هینری ا.کرامبتۆن

وام دەبینی باشترین شت ئەوەیە ریکلامێکی راستگۆیانە بکەیت، بەتایبەتی کاتێك ویستمان کەسانی زۆر باش بۆ خۆمان رابکێشین.

ماسی کە شارەزایی رێکخستنەکان بوو، تا زانیاری هەبێ لەسەر جۆری کۆمەڵەکەمان، چەندین چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرکردەی تیمەکان ئەنجام دا، لەوەوە زانیمان ئەوانە کلیلی سەرکەوتنن، ئەمەو تیمە کردەییەکان لە چەندین سەرکردەی تیم و ئەفسەری بەتوانا پێکهاتبوو هەمووان شارەزایی تەواویان هەبوو لەتەك زماندا، لەگەڵ ئەوەی جێگری سەرۆك وەم باوە ئەفسەرێکی نیمچە سەربازییە لە بەشی چالاکییە گشتییەکان، لەگەڵ هەر تیمێکیش ئەفسەرێکی بێتەل و پزیشکێك و شارەزایەکی تەکنیکی یان دوانیان لەگەڵدا بوو، زۆرجاریش ئەفەسرێك هەبوو چەندین کارایی هەبوو لە زمان و دژەتیرۆردا، بۆ هەر تیمێکیش لە هەشت کەس زیاتر نەبوو.

هەموو ئەو کەسانە لەنێوەندی جەنگ گەورە بوونە و زۆربەیان تەمەنیان لە چل بەسەرەوە بوو، ئەمەو گاری شرۆن سەرۆکی تیمی شکاندنی سەرەکان کە ئێستا لە دۆڵی پنچشیرە تەمەنی لە شەست رەتداوە، ئێستاش لە ناوچەی بڵاوەپێکردنە، بەڵام کارەکەیان جەنگ نییە، ئەگەر رووشی دابێ ئەوا کارەکە پەیوەستە بە کۆکردنەوەی زانیارییەکان و سەرکردایەتیی کاری شاراوە، تیمەکانیش بەپێی پێوەری شارەزایی و هێزە لە دژەتیرۆردا، بۆیە تیمەکە هەموویان پلەیان بەرز بوو، زۆربەشیان پلەکەیان بەرامبەر بە پلەی عەقید بوو لە سووپادا، لە کاتێکدا شرۆن دانەیەك بوو لە سی ئای ئەی جەنەراڵێك بوو سێ ئەستێرەی هەڵگرتبوو و فەرماندەی تیمێکی کۆماندۆس بوو، ئەمەش مەحاڵە لەنێو سووپادا و نابێ بیری لێ بکەیتەوە.

پلانەکە وابوو بەپێی پێشکەوتنەکان بڕیاری کردەیی بدەن، هەروا جەختمان لەوە کردەوە بەبێ بەزەیی راوی دوژمن بنێین، کاری من داڕشتنی ستراتیژیەت و پشتگیری تیمەکان بکەم لە هەموو شتێکدا، دەمویست بڕیاری مەیدانی خێرا بدەم بەڵام ورد و دینامیکی بێ، داوای شارەزایانم دەکرد بەڵام سی ئای ئەی داوای یەکێکی دەستەبژێری دەکرد، واتە لەنێو سەد کەسدا یەکێك هەیە.

یەکێك لە سەرۆکی تیمەکان کە ئەفسەری پێشوو بووە لە سوپا و کارمەندێکی کۆنی سی ئای ئەی بووە قسەی بە فارسی و داری دەکرد (داری شێوەزارێکی فارسییە) ئەو شارەزایی ئەفغانستان بوو، کەسێکی باڵابەرز بوو و لەروەوی ئەکادیمیەوەش پسپۆڕی لە مرۆڤناسی هەبوو، ئەو پرسیاری سەبارەت بە کارەکانی من کرد.

منیش بەرەو نەخشەکە رۆیشتم و ئاماژەی بەپێنج هەرێم کرد کە دەکەوێتە بەشی باکووور لەو وڵاتەدا، "ئەمە بۆ تۆیە، تۆ بە پەڕەشووت لە باشووری مەزار دێیەخوارەوە، تۆ بەرەو باکوور دەڕۆیی و مەزار داگیر دەکەی، لەوێوە هەنگاو بنێ تا دەگەیتە باکوور تا سنووری ئۆزباکستان، دەمانەوێ بگەینە "پردی هاوڕێیەتی"، کە بەستراوەتەوە بە ئەفغانستان و بەشەکانی دیکەی ئاسیای ناوەڕاست، ئەمەش رێگەیەکی وشکانییە بۆ دابینکردن، لە لایەکی دیکەوە چەند تیمێکی دیکە رێگەکانی باشووری کابول دەبڕن لەلای تونێلی شالانگ، بەمەش دوژمن لەو ناوچانە گۆشەگیر دەبن، لەتەك ئەوەی شرۆن ئێستا دوو کەسی ناردووە بۆ بەرزاییەکانی رۆژهەڵاتی قەندوز، هاوپەیمانە ئەفغانییەکانیش لەوێوە لە رێگە چیاوە دێنە خواروە واتە بەدرێژایی زێی ئامۆ داریا، لەوێوەش پەیوەندی بە باکووری قندوز دەکەن بەمەش باشوورەکەی گەمارۆ دەدەین، لەپێشتریشدا هاوپەیمانە ئەفغانییەکان لە ١٩٩٧ تاڵیبانیان لەو ناوچانە گەمارۆداوە، بەهەمان

رێگە بووە، بەڵام نەیانتوانی بوو کارەکە تەواو بکەن، بەڵام ئێمە ئەو جارە ئەم کارە دەکەین".

لە وەڵامدا گوتی " بەڵێ قوربان".

هەندێك لە رۆشنبیرەکان وەك هەندێك لە بنکەی سەکردایەتی سی ئای ئەی باسیان لەوە دەکرد ئەمە هەمان کارەساتی بەریتانییە کە لە ساڵی ١٨٤٢ روویدا، جگە لەپاشەکشەی سۆفیەتی شەرمەزار لە ١٩٨٩. بەڵام ئێمە ئەوێ داگیر ناکەین، بەڵکو ئێمە پشتگیری لە یاخیبوونێکی لاواز و بەشبەشکراو دەکەین، جگە لەوەی مێژووی نوێی خێڵەکی و سەربازییە، تەنیا ئەمەش لەسەرمان پراکتیك دەکرێ، نەوەك وانەکانی داگیرکاری ئیمپریالیزم.

لە درێژەی قسەکانم گوتم "هەوڵ بدە هاوڕێیە ئەفغانییەکانمان یەکتر نەکوژن"، لە کاتێکدا تیمەکەی لەگەڵ سێ سەرکردە مامەڵە دەکات وەك: عەبدولرەشید دۆستەم کە ئۆزپاکستانییە، محەمەد محەقق ئەو لە هەزارەکانی شیعەیە، لەگەڵ مامۆستا عەتا محەمەدی تاجیکستانە، هەموو ئەوانە لەنێوەندی هاوپەیمانییەکی لەرزۆکدان.

هەموو سەرکردەی تیمەکان ئەوەیان زانی لەژێر فەرمانیان تەنیا چەند پیاوێك هەیە، مەبەستمان دارشتنی سەرکەوتنێکی ئەفغانی بوو بۆ سەر داگیرکەرە بیانییەکانی وەك "عەرەب و چیچانی و پاکستانی و کەسانی دیکەیە، ئەوانە لە ریزەکانی قاعیدەن، حکومەتی تالیبانیان بە مەبەستی ئارەزووەکانیان بەکاردەهێنن، ئەو کارەی ئێمەش بنەمای سەرکەوتنە، پێویستە ئەفغانییەکان وا سەیری قاعیدە بکەن کە پێکهاتەیەکی بیانین نەك ئێمە، دەبێ ئەفغانییەکان رازی بکەین، کە کێشەکەمان هاوبەشە دژ بە هەموو دوژمنە بیانییەکان، هەروا دەبێ

هاوکاری هاوپەیمانە ئەفغانییەکان بکەین بۆ تەجینیدکردن و هاندان تا بتوانین سەرۆك خێڵەکان بخەینە لای خۆمان.

سەیرێکی سەرۆکی تیمەکەم کرد، ئەو یەکێکە لە شارەزاییە بەتواناکان لەبارەی ئەفغانستان، بۆ ماوەی چەند ساڵێك پەیوەندی نەپچراوە لەگەڵ هاوڕێیە ئەفغانییەکان، ئەوان و وڵاتەکەیانی خۆشویستووە، ئەمەو تیمەکەی و چەند تیمێکی دیکە وەك کۆکەرەوەی زانیارییەکان و جێبەجێکاری کاری شاراوە و راوێژکاری سیاسی و نێوەندگیری سەرکردە نیمچە سەربازییەکانن، هەموو بابەتەکانیش لەلایەن ئەوانە و هەموو شتێك لەسەر ئەوان دەوەستێ.

"هەموو هەواڵگرەکان کۆبکەنەوە، لەنزیکەوە لەتەك سووپاکەمان کار بکەن، پشتگیری هاوپەیمانەکانمان بکەن و هەردەم رێنوێنیان بکەن، زیاتر هەوڵ بدەن هاوپەیمانیتان زیاتر بکەن، پێویستیمان بە پیاوانی زۆرترە تا چەك هەڵگرن، هەروا پێویستیمان بەتەجنیدی سووپاکان هەیە تا قاعیدە و تالیبان وێران بکەن، هەر لایەنێك ویستی پەیوەندیمان پێوە بکات بۆ راونانی دوژمن، دەنا گوناهەکە دەکەوێتە سەر خۆیان".

پرسیم "کەی هێزی تایبەت پەیوەندیمان پێوەدەکات".

"هیچ بیرۆکەیەکم نییە، ئەو کاتەی بتوانن پەیوەندیمان پێوە دەکەن، پێویستیمان پێیانە، بەڵام ناتوانین چاوەڕوانیان بکەین، ناتوانین چاوەڕێی کەس بکەین، نازانین ئایا قاعیدە بەیانی دەیەوێ هێرشمان بۆ بکات لەسەر خاکەکەمان، تا ١١-٩ ناتوانین چاوەڕوانین بین، ئایا پرسیاری دیکەتان هەیە؟".

"نەخێر قوربان".

"باشە، تیمی ئەلفا لەلای تۆیە، بەختێکی باش".

ئەم قسەکردنە گفتوگۆیەکی نموونەیی بوو، ئەمەو لە چەند خولەکێکدا چەند فەرمانێکی گرنگمان دا بە سەرکردە و فەرماندەکان، دەبێ وێنای شتەکانی دیکە بکەن و خولەك بە خولەك جێبەجێی بکەن، ئێمە ناتوانین کارێك بکەین کە تا ئێستا لەنێو بارەگای سی ئای ئەین، واتە لە دووری شەش هەزار میلین.

لەپاشاندا لێکۆڵینەوەم سەبارەت بە نەخشەکان کرد، کارێکە رۆژانە چەند جارێك ئەنجامی دەدەم، دەکرێ جوگرافیای سروشتی کاریگەری هەبێ، تا مرۆڤ وا سەیری بکات دیوارێك بێ، ئەگەر بە چاوی یاخیبوونەوە سەیری بکەی، ئەوەی دەیبینین ئەوەیە، کەچی تۆپۆگرافییەکەی سەختە، لەلایەکی دیکەوە داتای جوگرافی هاوپەیمانەکانمان تەواوە، هاوکاتیشە لەگەڵ ستراتیژییە جوگرافییەکانمان.

تیمەکانمان لەو شوێنانە دادەبەزێنین کە هاوپەیمانەکانمان کردوویانەتە ناوچەی ئۆپراسیۆن، ئەو شوێنانە جێگەی دڵنیاین، هۆکارەکەش ئەوەیە شوێنی دیکە نییە تا پیاوەکانمان لێی دابەزن و تا لەوێوە پەیوەندی بە سەرکردەی خێڵەکان بکەن، لە ئێستاشدا بەکردەیی پەیوەندیمان بە زۆربەیان کردووە.

تیمی شکاندنی سەرەکان ئێستا بەکردەیی لە پنچشێرن، لەگەڵ جەنەراڵ محەمەد فەهیم هێزێکی هاوبەش پێکدەهێنین بۆ هێرشکردن تا بتوانین بگەین بە بەرزاییەکانی باکوور، لەسەرووی ئەو بەرزیانەش وەك زریان بەرەو کابوول دەڕۆن، رێگەی کابوول و قەندوز دەگرنت، لە مۆڵگە چیاییەکان بەرەو دوورترین شوێنی باکوور دەڕۆن بەتایبەتی بەرەو شاری تالقان و قەندوز.

هەروا تیمی ئەلفا کە بەرەو فراوانی دەڕوا و دەبێتە ئەلفا و برافۆ بەرەو باشووری مەزار شەریف دەڕۆن تا دەگەنە باکوور.

تیمی چارلی لەگەڵ ئیسماعیل خان و هێزەکانی یەکتر دەگرنەوە، ئەوان لە بنکەکەیان بەرەو ناوەند و ڕۆژئاوای ئەفغانستان هێرش دەبەن تا بگەنە هیرات، کە دە دەکەوێتە باشوور و لەنزیك سنووری ئێرانە، ئەمەو ڕێگە بازنییەکەی باکووری هیرات و باشوورەکەی دەبڕن، تا هیچ یارمەتی و چەکێك لە باکوورەوە بۆ تالیبان نەیەت.

تیمی دەلتا لە هەرێمی بامیان دادەبەزێ کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەفغانستان واتە لە ڕۆژئاوای کابوول، بۆ ئەمەش کەریمی خەلیلی سەرکردەی شیعەی هەزارە بەشێوەیەکی تایبەت دەیەوێ بگاتە تیمەکەمان، تا تۆڵەی هەزارە بکاتەوە دژ بەتالیبان، بەڵام ئەوان بێ ئومێد بوون لە هاوکاریکردنمان.

ستراتیژییەکانی ئێمە لە نیوەی باکووری ئەفغانستان دەستی پێ کرد، ئەمەش وەك مکوڕبوونی ئارەزووە سەربازییەکانی هاوپەیمانە ئەفغانییەکان بوو، ئەمەش تاکە بژاردەمانە ئەگەر بمانەوێ لێدانێکی خێرا ئەنجام بدەین، فەهیم دەیویست دەست بەسەر کابوول دابگرێ، کەچی مەبەستی ئێمە ڕووخاندنی قاعیدە بوو، هەڵبژاردنی ئێمە لەلایەن سەرۆکەوە ڕوونە تا بتوانین بەرگری لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بکەین، کاتێك قاعیدە لەناو دەبەین شێوەی هاوپەیمانییەکەمان دەبێ خێرا بێ بۆ گەیشتن بەو مەبەستە.

ئەمە هاوپەیمانییە زۆر ساکار بوو، سی ئای ئەی دەیویست قاعیدە لەناو ببات، کەچی هاوپەیمانە ئەفغانییەکان دەیانویست وڵات بگەڕێننەوە.

پێدەچێ دارشتنی ئەو پلانە زۆر ئاڵۆز بێ، لە هەندێك کاتدا تێی ناگەی ئەوە جگە لە ئاڵۆزیی هەماهەنگییەکە، واتە تەنیا یەك خاڵ نییە بۆ چوونە ژوورەوە

بەڵكو چەندین خاڵ هەیە لـەنێو ئـەو وڵاتـەدا، هـەموو چـینەكانی كۆمەڵگـەش بەشێوەیەك دەگوترێ بەتایبەتی لە باشووری ئەفغانستانە ئەوێش شوێنی تاڵیبانە.

هەندێك لەوانەی سی ئای ئەی لەلایەن هـەواڵگری پاكسـتانییەوە هاوكـاری دەكـرا، بەشـێوەیەك چارەسـەری بابـەتی باشـوور بكـەن، بـەڵام پاكسـتانییەكان نەیاتوانی چارەسەری بكەن چونكە لە بەرژەوەندی ئەوان نییە و هەر خۆشیان بوونە تاڵیبانیـان هێناوەتـە بـوون، لەلایـەكی دیكـەوە پاكسـتانی و ئەفغانییـەكان دەیانویست ستراتیژییەك دابنێن دژ بە هیند، چونكە پاكستان وڵـاتێكی تەسـكە، هەردەمیش هێرشی هیندییەكان لەلای پەنجابەوە ترسناكییەكەی گەورەیە بۆ سـەر پاكستان، بەڵام ئێمە جگە لە تینیت كە نووسینگەمان هەیە لـە ئیسـلام ئابـاد، زانیمان هەواڵگری پاكستان وەڵامێك نییە، بێگومانیش بەپێی بەرژەوەندیەكانـە، زۆرجـاریش پەیوەنـدیی بەرژەوەندییـەكانی پاكسـتان و ویلایەتـە یـەكگرتووەكان لەیەكتر نزیك دەبێتەوە، بەڵام بەردەوام نییە.

ریچارد ئەمیرتاج هەر زوو دركی بەمە كرد، ئەمەو نامەیەكی روون و توندی دا بـە نـەواز شـەریفی سـەرۆكی پاكسـتانی، ئـەویش لـەلای خۆیـەوە هـەموو پشتگیرییەكی كردەیی و سیاسی پێشـكەش كـرد، كەچـی هـەواڵگری پاكسـتانی پەسەندی ئەوەیان نەدەكرد كە تاڵیبان برووخێندرێ چونكە هەندێكیان قاعیـدەیان لەلا قبووڵ نییە، وەك ئەوەی هەموو شتێك لەگەڵ كرپارەكاندا لایان پەسەند نەبێ بەو شێوەیە مامەڵەیان لەتەكدا دەكرێ، بۆیە بەشێوەیەك بەرگرییان لەمە دەكـرد، منیش ئەوەم دەزانی هەواڵگریی پاكستانی كارەكەیان بەتـەواوی ناكـەن، كاتێـك ئێمە هەنگاومان نا، ئەوان بەردەوام نابن.

لە ڕۆژانی یەکەمی تشرینی یەکەم سەردانی پنتاگۆنم کرد لەوێدا چاوم کەوت بە ڕامسفێلد و ولفوفیتز و جەنەراڵ مایرزی سەرۆکی ئەرکانی هاوبەش، لەپاشاندا لە پەیوەندییەکی ڤیدیۆیدا جەنەراڵ فرانکس لە تامبا بەشدار بوو، جگە لە چەند نوێنەرێکی حکومەتی ئەمریکی لە ئیسلام ئاباد، هەموومان هیوایان هەبوو کە پاکستان هاوکاریمان دەکات، بەتایبەتی ئەو کاتەی هەڵمەتی بۆردمانکردن دەست پێ دەکات و پاڵەپەستۆ دەخرێتە سەر تالیبان بۆ ڕادەستکردنی چەکدارەکانی قاعیدە، تینیت ئەمەی بەدوور نەزانی، بەڵام من بێ ئومێد بووم، پێم وابوو تەنیا بەفیڕۆدانی کاتە، لەوانەشە لەنێو پاکستاندا شەڕی ناوخۆیی بێتە ئارا هەروا جەنگی ناوخۆیی لە باکوور و باشووری ئەفغانستاندا بێتەکایەوە لەنێوان تاجیك و ئۆزبەك هەموو ئەوانەش دژ بە پشتۆن دەبن کە زیاتر تالیبان پشتی پێ بەستوون، لەو کاتەشدا دەبێ خێڵەکانی پشتۆن ڕازی بکەین تا شەڕ دژ بە تالیبان بکەن، بەڵام پاساوی شەڕی ناوخۆیی ئەفغانستانی هۆیەك نییە تا هەواڵگری پاکستان بێتە ناو ئەو جەنگەوە و لەپاشاندا ڕایان کێشین بۆ دانوستاندن، بەو هیوایەی قاعیدە ڕادەست بکەن، دیارە ئەمەش ڕوونادا.

ڕامسفێلد گوتی پاکستانییەکان ناتوانن تالیبان ڕازی بکەن بۆ ڕادەستکردنی قاعیدە، بۆ ئەمەش وفۆفیتز هەمان بۆچوونی هەبوو، کەچی مایرز زۆر قسەی نەکرد.

ڕامسفێلد سەبارەت بەو پەیوەندییە ڤیدیۆییە پرسیاری لەبارەی بۆچوونی من کرد و منیش گوتم ئەو ڕاست دەکات، چونکە نوێنەرانی ئەمریکا لە ئیسلام ئاباد هەڵەن، پێدەچوو ڕامسفێلد بڕوا بهێنێ، جگە لەوەش پرسیاری ئەوەم لە خۆم کرد لەدواتردا جیاکاریەك لەنێوان سی ئای ئەی دەبێ.

هەمان بابەتم بە سەرکردایەتیی وەزارەتی بەرگری راگەیاند و گوتم من سەفەر بۆ تامبا دەکەم تا لەنێو دوو رۆژدا جەنەڕاڵ فرانکس ببینم، بەڵام ئەوەی کردم جیا بوو چونکە لە بەیانی رۆژی دواتردا پەیوەندییەکی تەلەفۆنیم کرد بۆ هاوڕێیەك لـە دەرەوەی وڵاتدا.

## کارزای...

پەیوەندییە زۆر روون بوو، چونکە لە بارەگای سـەرکردایەتی سـی ئـای ئـەی بوو، تا دەگاتـە بنکـە بچـووکەکەی پێشـەوە لـە پاکسـتان و لـەنزیك سـنووری ئەفغانستان.

"گریگ ئەوە چی دەکەی؟".

"دەمەوێ کارەکـان بەراسـتدا بـڕۆن لـە واشـنتن، لـێ مەگـەڕێ بچـمە نـاو ئەفغانستان، چی وای کردووە بەشێوەیە درەنگ دەست پێ بکەن؟".

"بەشێوەیەك سەرۆکتە" بەشێك لە ناوەڕۆکەکەم تێ گەیاند.

نوێنـەرانی لـە ئیسـلام ئابـاد هـەموو بەرپرسـیاریەتی سـی ئـای ئـەی و کارمەنـدانی ئـەو وڵاتـە بەرپرسـیارە، لـەنێو ئەوانیشـدا گـریگ، بـۆ ئەمـەش پەیوەندییەکی تەلەفۆنی بۆ گریگ هـات بـەبێ ئـەوەی هـیچ هەماهەنگییـەکمان هەبێ لە باشترین حاڵەتدا، ئەمەو سەرکردایەتی مەیدانی لە رۆژهـەڵاتی خـواروو دەیەوێ بەدەوری دەسەڵاتەکەیدا بخولێتەوە.

هیچ پرسیارێکم نەکرد سەبارەت بە زنجیرەکانی سەرکردایەتی گریگ ئەو هەرزوو زانی بەبێ ئەوەی ناچار بێ باس لە ململانێی ناوخۆیی بکات، هەر ویستم بیزانێت سەبارەت بە پلانەکانمان لە باشوور، ئەمەش ستراتیژیەکی سەرەکییە.

"دەتبەمە ناو ئەفغانستان، تەنیا پێویستە لە شوێنی خوت بمێنیتەوە، باشە چ بابەتێکت لەگەڵ کارزای هەیە؟".

گریگ پوختەیەکی روونی خستە روو، ئەمەو کارزای پێویستی بە هەموو پشتگیرییەکی سیاسی و ماددی هەبوو، منیش پێم راگەیاند کارزای چی دەوێ بۆی دابین بکە، هەموو ئەمانەش بۆ تینیتی بەڕێوەبەر روون دەکەمەوە، هەموومان رازیبوون لەسەر باسەکانی گریگ.

باوکی حەمید کارزایە سەرکردایەتی لقی بۆبلزای لە خێڵی پشتۆنی گرتە دەست، ئەمەو چەند ساڵێك پێش ئێستا تاڵیبان لەسێدارەیان داوە، کەچی کارزای وەك کەسێکی رۆشنبیر دەیویست جێگەی سیاسی باوکی بگرێتەوە، تا تۆڵە لە تاڵیبان بکاتەوە و وڵاتەکەی رزگار بکات، پێی وابوو لەدوای ١١-٩ ویلایەتە یەکگرتووەکان هێرشێکی پێچەوانە بکات، ئەویش ئەو هەلە بقۆزێتەوە، ئەمەو گریگ داوای کرد، کە لەلایەن منەوە رێنمایی کرابوو هەموو بۆچوونەکانی کارزای وەربگرێ تا زیاتر زانیاری هەبێ سەبارەت بە پلانەکانمان، بۆ ئەمەش گریگ کارەکەی کورت کردەوە بەوەی پارەیەکی زۆری پێشکەش بەخێڵەکەیان کردبوو.

لەپاش چەند رۆژێکی دیکەدا و لە سەرەتای تشرینی یەکەمی ٢٠٠١ کارزای بەخۆی و دوو ملیۆن دۆلار لە پاکستانەوە رۆیشت بەرەو باشووری ئەفغانستان بۆ ئەمەش مانتۆڕێکی بەکار هێنا بوو، تا هیچ رێگرییەکی لەپێش نەبێ، کە تاڵیبان

دایان ناوه وەك خاڵی پشکنین، زۆر بەکاریانە گەیشتە شارۆچکەکەی لە تارین کوت.

بە هۆی پارەپێدانی ئەمریکی و سەرکردایەتییەکەی کە جێگەی رەزامەندی بوو، توانی پیاوانی خێڵەکەی تەجنید بکات بۆ ئەمەش ملیشایەکی چەکداری پێکهێنا، بەڵێنی پشتگیری ئەمریکای پیّ دان، پیاوانی خێڵەکەی زۆر رقیان لە تالیبان بوو، بەڵام هاندانەکانیان بەس نەبوو چونکە چەکەکانی دەستیان هۆیەك نەبوو تا جەنگێك بەرپا بکەن.

گریگ مکورِ لەوەی پەیوەندی بە کارزایەوە بکات تا بیسەلمێنیّ ویلایەتە یەکگرتووەکان پشتگیرییەکانی زیاترە لە پارە و بەڵێنەکانی، هەروا ئەوەمان دەزانی ئەفغانییەکان متمانەیان بە ئێمە نییە تا ئەو کاتەی لە شەڕدا بەشداریان لەگەڵدا بکەین، چاوەڕوانی کۆشکی سپی بووین تا تیّ بگەن لە پلانەکەمان، کە کاتژمێر دوای کاتژمێر دادەنریّ.

بەڕێوەبەری سی ئای ئەی جۆرج تینیت و مـن دۆخی سیاسیمان لە ژووری قەیرانەکانی کۆشکی سپی باس کردەوە کە بە سەرۆکایەتی جۆرج دەبلیو بوش بوو، لەوێدا ئەوەم بۆ سەرۆك و بەرپرسە گەورەکانی ئاسایشی نەتەوەیی روونکردەوە کە کارزای لەلایەن سەرکردەکانی هاوپەیمانی باکوورەوە پشتگیری لیّ دەکریّ، بۆیەش ئەمەم زانی چونکە من پرسیارێکم خستە روو، بۆ ئەمەش ئۆزبەك و تاجیك و تورکمان و هەزارە پێیان وایە کارزای تاکە سەرکردەی سیاسیانە، تا هەمووان لەناوچەی پشتۆن کۆبکاتەوە، ئەگەر پیاوانی کارزای نەتوانن دەست بەسەر قەندەهاردا بگرن ئەوا بەختمان لە ئەفغانستاندا جێگەی بایەخ نابیّ، بێگومان سەرۆك و ئەوانی دیکە گوێیان لە ناوی کارزای نەبوو بوو لەپێشتردا،

بۆیە چەندین پرسیاریان کرد و وەڵامم دانەوە، لە کۆتایشدا بەپێی ئامۆژگاریی ئێمە کاریان کرد.

من و بەڕێوەبەر بەخێرایی سواری ئۆتۆمبیلەکانمان بووینەوە بەرەو بارەگای سی ئای ئەی رۆیشتین، چونکە ئەوەی دەمان ویست بەدەستمان هێنا، بە بەڕێوەبەرم راگەیاند سەری گریگ لێ دەکەمەوە، ئەویش تەنیا جگەرەکەی داگیرساند و پرتەیەکی لێوەهات.

لەپاش کاتژمێرێك لە گەڕانەوەم لە کۆبوونەوەی کۆشکی سپی چوومە نووسینگەکەم و بروسکەیەکم بۆ گریگ نارد تیایدا تەنیا بۆ ئەو بوو و کەسی دیکە نابێ سەیری بکات، و تیایدا دەم ویست پێی رابگەیەنم " سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان رازییە، تکایە دەست پێ بکە".

گریگ پێویستی بە فەرمانی ئۆپراسیۆنی تەواو نەبوو، یان پێویستی بەتیمی پلان نەبوو، چونکە لەپێشتردا هەموو کارەکانم بۆی باس کردبوو-بەوردی- تەنیا کارە پێشبینیکراوەکە رەزامەندی لەسەر دراوە، ئەو دەیویست ئامانجێکی روونی هەبێ، دەیویست من و کۆفر پشتگیری بکەین لە بارەگای سەرکردایەتی لە واشتندا، بەبێ ئەوەی داوامان لێ بکات ئەو دەیزانی ئەوە ئەرکی ئێمەیە.

## برنتسن و بتسی

داوام لە گاری برنتس کرد تا پرۆسەی رێکخستنی تیمەکان بگرێتە ئەستۆ و لەلایەن بارەگای سەرەکییەوە پشتگیری لێ دەکرێ، لەپێشتریشدا گاری لەگەڵ مندا لە دژەتیرۆر کاری کردووە، لە ئاداری ۲۰۰۰ ناردومەتە ئەفغانستان، بۆ کارێکی زۆر ترسناك، هەروا ئەویش هەموو هاوپەیمانەکانمان دەناسێ و دەیناسن،

ئەو بەشێوازی داری فارسی قسە دەکات، هەروا ئەو کارمەندێکی دڕندەیە و زۆرکاتیش هیچ بەزیەکی نییە لە کاتی دژەتیرۆردا، بۆیە ئەو گەنجەم خۆش ویست.

ڕۆژێك بەخێرایی هاتە ناو نووسینگەکەم وەك گایەك بیەوێ ڕوو لە شوێنێك بکات، ئەو کاتێك گەڕایەوە سەرۆکی وێستگە بووە لە دەرەوەدا بۆ ئەوەی پەیوەندیمان پێوە بکات، بەڵام کۆفری سەرۆك بەشەکەی ڕازی نەبوو.

"سڵاوت لێ بێ گاری"

ناچار بوو دانیشێ، ڕووی لێم کرد و دەستەکانی زۆر گەورە دیار بوون.

"ئایا لە پێشتردا قسەت لەگەڵ ماسی کردووە؟"

"بەڵێ قوربان".

"زۆرباشە، تۆ دەزانیت من گرنگی بە هەموو تیمە مەیدانییەکان دەدەم، ئەوەی پێویستیان پێی بێ پێیان دەدەم، بۆیە کاری ئێمە لە بارەگای سەرکردایەتی پشتگیری مەیدانە، لەپاش چەند هەفتەیەکی دیکە دەچیتە شوێنی شرۆن لەپنچشیر، من خۆشحاڵم بەبوونت لێرەدا، ئێمە پێویستیمان بەتۆیە".

"تۆ چی دەڵێت با وابێ"، کاتێك هەستایەوە لە دۆخی ئامادەباشیدا بوو، خۆی توند کرد و بەشێوازی لونگ ئایلند هاواری کرد "سوپاست دەکەم، دەمەوێ هەل وەربگرم تا لەژێر فەرمانی تۆدا بم، هەموو ئەو دایك سۆزانیانە لەناودەبەین".

من و جۆن ویستمان ئەو ئەفسەرانە ڕاسپێرین کە لەلایەن بارەگای سەرکردایەتیەوە پشتگیریان دەکرێ، بەڵام زۆری پێ ناچێ ڕۆڵەکان دەگۆڕێ، هەموو کارەکانیش لەسەرووی هەموویانە سەلامەتی کارەکە و خودی خۆیەتی.

هەموو ئەو شتانەی ئەنجامان دا هەواڵگری رۆڵی سەرەکی تیادا بینی بوو وەك داواکارییــە هەواڵگرییــەکان و کۆکردنــەوەی زانیارییــەکان و بڵاوکردنــەوەی ئــەو خاتوونە ئەفسەرەی راپۆرتەکانی دەزگای شاراوە دەنووسیٚ هیچ پووچییەك قبــووڵ ناکات، ئەو بیست ساڵ لە کاری شاراوەدایە، بۆ ئەمەش زۆرێــك لــە ئەفســەرانمان کۆکردۆتــەوە کــە هــەموویان کارەکانیــان لەوپــەڕی ئامادەباشــیدان لــەرووی هەواڵگرییەوە و هەردەمیش پرسیارەکان لەنێوان تەکتیك و ستراتیژیەتدایە.

دوژمــن لــە دۆڵێکــی دیاریکراودایــە؟ سیســتەمی شــەڕەکە چــۆن دەبــیٚ؟ چەکەکانیان؟ هاوپەیمانی بەستن لەگــەڵ خێڵــە ئەفغانییــەکان؟ یــان کامــە خێــڵ پەیوەندییان بە تاڵیبانەوە کردووە لەپێناو بەرژەوەندییــەك؟ پلانــی هاوپەیمانــەکان چییە؟ یان توانای سەربازی و هــەواڵگریان تــا چــەندە؟ چ بزنســمانێکی ئــەفغانی دەکریٚ ببێتە هاوبەشمان؟ بۆچوونی سیۆکراتی پیاوانی ئایینی چییە؟ ئایا بریــداتۆر توانیویەتی خۆی بسەلمێنیٚ کاتێك مووشەکی هلفایری بەستراوە پێی؟ ئەو پرسیارە لۆجستیانە چین سوپای ئەمریکی دەیەویٚ وەڵــامی بداتــەوە؟ پاســەوانی شۆڕشــی ئێرانی لە ئەفغانستان چی دەکەن؟ ئەی سەبارەت بە دەزگای هەواڵگری پاکستان؟ کێشە سیاسیەکان چین کاتێك جەنگ دەکەوێتە شوێنێك؟

هەروا بتسی لە کاتی پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیارییەکان لە مەیداندا چەندین پرسیاری یەك لەدوای یەکتر کردبوو، هەروا تیمەکەی وا لیٚ کرد هەموو زانیاریەك بدەن بە مەیدان وەك شیکردنەوە و ئاراستەی سیاسی، لــەوە تــیٚ دەگــەین تیمــە مەیدانییە لە هەمووان زیاتر دەزانن کاریان چییە، بــەڵام تیمێکــی گۆشــەگیر لــە دۆڵێکدا پێویستی بە روانینێکی فراوان هەیە، بۆیە بتسی هەموو ئــەو روانیانــەی خستە روو.

پێویستمان بە تیمەکانی برنتسن و بتسی بوو، تا بەشێوەیەکی روونتر سەبارەت بە دەقە هەواڵگرییە وێنەدارەکان بزانن، پێویستمان بە ئاستێکی بەرزی هەواڵگری جوگرافی هەبوو، تا بەوردی ئامانجەکانمان دژ بەدوژمن بپێکین، پێویستمان بە کەسانی ئەفغانی هەیە تا قاعیدە و تالیبان لەپێستیان دەربێنن، هەروا دەبێ گرنگیدانمان بسەلمێنین بۆ ئەفغانییەکان تا دوژمن بکوژین، بێگومان قاعیدە و هێزە بیانییەکان نایەنە ریزەکانی ئێمە، هەر کاتێکیش هاوڵاتییەکی ئەفغانی کوژرا ئەوا پێشێلی ستراتیژییە، ناکرێ مووشەکبارانی مزگەوت و نەخۆشخانەکان بکەین، دەبێ بەوردی زانیارییەکان کۆبکەینەوە تا بەکاری بێنین بۆ هێزە جەنگاوەرەکانمان.

## سندووقی جادوویی

لەگەڵ جۆن رێککەوتین یەکەیەکی ئامانجگیر و پسپۆڕ دابمەزرێنین، بۆ ئەمەش داوامان لە مرۆییەکانی دەزگای شاراوە کرد یارمەتیمان بدەن، ئەوانیش پارێزەرێکیان بۆ ناردین.

"پارێزەرم ناوێ، دەمەوێ کەسێکی شیکەرەوەی بلیمەت بێ کەسێك بێ ئامانجەکان بزانێ و لە تەکنەلۆژیادا شارەزایی هەبێ، کەسێکم دەوێ سیستەمی جوگرافی شوێنەکان دابنێ تا بزانێت چۆن ئامانجەکان بەراستی بپێکێ، پارێزەرم ناوێ لەئانوساتێکدا دوودڵ بێ لە بڕیارەکانی".

چەند جارێك بەنێو ژوورەکاندا سوڕامەوە لەوانەیە بەدوای کەسێکدا بگەڕێم هیچ بوونێکی نەبێ.

جۆن بەهێمنی گوتی "باشە، با چاومان بەو کەسە بکەوێ".

زۆرجاران جۆن جۆرێك لـە عاقڵمەنـدی پێـوە دیـارە، بەبەرپرسـیارانە شـێتم دەكات، بەڵام زۆر جار خۆمی لێ لادەدەم.

"باشە باشە، نەفرەت... بڕۆ بیهێنە".

دان هاتە ژوورەوە، ئەو كەسـێكی باڵـا مامناوەندییـە، كەسـێكی شـیكە و بەپارێزەرێكی سەركەوتوو دەچێ، دانی بەوەنا كـە پـارێزەرە، بـەڵام ئەفسـەرێكی ئازای ئۆپراسیۆنەكانە، من و جۆن هەموو شتێكمان بۆ شی كردەوە، سەبارەت بـە پێویستیەكانی وەك شێوەی سیستەمەكەی یان شێوەی كارەكەی، باسـی ئـەوەشمان كرد كارەكە پێویستی بە كەسێكە لە جوگرافی شوێن بزانێ.

جۆن وەڵامی دامەوە "دوو رۆژ لەسەرم راوەستە".

هیچ بژاردەیەكی دیكەمان نەبوو، لەگـەڵ ئـەوەی ئـەو كـوڕە زۆر متمانـەی بەخۆی بوو، كاتیشمان نییە تا یەكێكی دیكە بانگ بكەین.

"باشە بگەڕێەوە لام" لەو كاتەی فەرمانم پێ كرد بیرم لەوە كردەوە ئێمە دوو رۆژمان لەبەردەستدا نییە.

دان گوتی "بێگومان" ئەمەش بە خەندەیەكی ساكار، هیوام وابوو ئەو بزانێ ئێمە چیمان دەوێ.

گرفتەكـە جێگـەی سەرسـوڕمانە چـونكە پێویسـتمان بـە هـەزاران داتـای جوگرافیی شوێن هەیە، واتە نموونەكان ببێتە وێنەیەكی بەردەوام، پێویستیمان بـە نەخشە هەبوو نەك هەموو نەخشەیەك، چونكە كارەكـە زۆر ئـاڵۆزە، بەشـێوەیەك بەردەوام نوێی بكەینەوە، تا شێوەیەكی دینامیكی هـەبێ بـۆ هـەموو داتایـەكی دوژمن وەك رێگە و فرۆكەخانە و مزگەوت و بازاڕ و قوتابخانە و نەخۆشخانە و چیا

و زێ و سنووری سەرەکی و ناوچەی خێڵەکی، هەموو شتێك، دەمویست چاودێری تیم و سەرچاوەکان بکەم چونکە ئێستا لە هەموو وڵاتدا پەرشوبڵاوەیان پێ کراوە، لەوانەیە تێکەڵی هێزی دوژمنەکان بن، دەم ویست ئەو نەخشەیە ئاگاداری هەموو لایەنەکان بێت هەمووشی بە وێنە بێ بۆ شوێن و کۆکردنەوەی زانیارییەکان.

کاتێك گەنج بووم کارم لەسەر جوگرافیای شوێن کـردووە، بـەڵام ناوەکـە زۆر لەمێژە لەبیرم چووە، نەخشەی سەرەکی هاوکاریکردنی باوکم بوو لەتەم تیمەکـەی بۆ رووپێوی زەوییەکان و هەردەمیش باسی درەختەکانی نەخۆشخانە و چـوونم بـۆ گردەکانی بیدمۆنت بوو، توانیم شوێنەکان وێنـا بکـەم و لەسـەر نەخشـە وێنـەی بکـەم، هـەروا دەم تـوانی نەخشـەکانی تۆپـۆکرافی بخوێنمـەوە لەتـەك وێنـە ئاسمانییەکان، لەگەڵ ئەوەی لەیەك لە تاقیکردنـەوەکان فیرمۆنـت و نیوهامشـاوم تێکەڵ کردبوو، ئەمە بێزاری کردم بەڵام لێـی فێـر بـووم، لـەجیاتی نەخشـەیەکی جیهانم لەسەر دیوار دانا بەبێ ئەوەی هیچ ناوێکی لەسەر بێ، دواتـر لـە زانکـۆی نیو مەکسیکۆ بەردەوام بوو، ئەمەو لە شیکردنەوەی وێنەی ئاسمانی زۆر ژیرانە پێ کام، زۆربەی کاتەکانم لە هاویندا پیاسەکردنم بوو لە دۆڵی ریۆ گرانـدی باشـووری لبۆکرك، تا بەراوردی بکەم بە وێنە ئاسمانییەکان و چـەندین شـتی دیکـەی سـەر نەخشە، بۆ ئەمەش وێنەی روانینی شوێن لەلای من تـەنیا وەك ئامرازێـك بـوو، چونکە نەخشەکان رەنگدانەوەی بیرکردنەوەکانم بـوو، کەچـی ئێسـتا نەخشـەیەکم دەوێ هەموو شتێکی تیادابێ.

دان گەڕایەوە و وەڵامێکی پێ بوو.

رروونی کردەوە و گوتی "هیچ شتێك سەبارەت بەو جۆرە تەکنەلۆژیایە نـازانم کە تۆ دەتەوێ، بەڵام یەکێکم دۆزیوەتەوە".

"کێت دۆزیوەتەوە؟".

کەسێك خاوەنی سندووقێکی جادووییە.

"لەراستیدا دەتوانین هەندێك سیحر و جادوویی بەکاربێنین، باشە ئەو کەسە چ بەو سندووقەکە دەکات".

"ئەو مامەڵە بە سیستەمی زانیاریی جوگرافی دەکات، خودی خۆی بەرنامەیەکی کۆمپیوتەرییە بۆ کۆکردنەوەی داتا جوگرافییەکان، دەتوانێ لەسەر نەخشە بیخانە روو، دەتوانێ کارگێڕی ئەو زانیاریانە بکات و شی بکاتەوە بە هۆی پێکهاتە جیاوازییەکان، ئەوەی تۆ دەتەوێ".

لێم پرسی: "ئایا دەزانێ ئەو لەژێر تاقیکردنەوەدایە؟".

"کار دەکات، هەموو کاتەکانی بۆ کار بەکاردێنێ".

"باشە، نیشانم بدە".

دان کەمێك سەری لەقاند و بەخێرایی چووە دەرەوە و لەپاش چەند خولەکێك کوڕێکی باڵابەرزی لەگەڵ خۆیدا هێنا و ناوی "کن" بوو.

دان لەپێشتردا باسی ئەوەی کردبوو کە بنکەی دژەتیرۆر-ئۆپراسیۆنی تایبەت ئەنجام دەدا بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان لە هەموو ناوچەکانی ئەفغانستان، سەبارەت بە هاوڕێ و دوژمنەکان، زۆر نابا ئینکلسۆپیدیا مووشەکباران دەگرێتە دەست، کە سەر بە بنکەی سەرکردایەتیی هێزی ئاسمانی ئەمریکی بوو، هەموو ئەمانە تابلۆیە ئامانجی سەربازی ئەو شوێنانە و سیستەمی هێرشبردن دەگرێتەوە، کن لەو بڕوایە دابوو دوای ئەوەی هەموو سەرەداوەکان دەگرینە دەست دەتواندرێ سیستەمی زانیاری جوگرافی دابنرێ و نەخشەیەك دروست بکەین سەبارەت بە هەموو گۆڕانکارییەکان، ئەمەش لەنێوەندی هێرشێکی دیاریکراوەکان، هەروا دەتواندرێ سوود لە بنکەی نەخشەی سی ئای ئەی وەربگیرێ، بۆ بەدەستهێنانی

هەموو جۆرە نەخشەکان، کاری بنکەی دژەتیرۆریش -ئۆپراسیۆنە تایبەتییەکان هەموو ناوچەکانی ئەفغانستان بخەنە نێو ئەو سیستەمەوە.

کاتێك "لە کن"یان پرسی ئایا دەکرێ کارەکانی بگوازێتەوە بۆ بنکەی دژەتیرۆر-ئۆپراسیۆنی تایبەت، دان ژمارەی ژمارەی تەلەفۆنێکی نووسی و گوتی "بۆ هانك کرامبتۆن کار دەکا، ئەو کات سەرۆکەکەت ئەگەر هەر پرسیارێکی هەبوو، دەتوانێ پەیوەندی بەو ژمارەیەوە بکات، لەپاش دە خولەك دەتبینم".

ئێستا دان و کن لە نووسینگەکەی مندان، کن جلوبەرگی فەرمی نەپۆشیووە، ئەو کەسێکی زۆر بەتوانا بوو، زۆر بەئاستەم چاوەکانی دەتروکاند، ئەمەش پێچەوانەی دانی ساردووسڕە، لەلایەکی دیکەوە کن دەستی بە باسکردنی سیستەمی زانیاریی جوگرافی کرد، نازانم چۆن کار دەکات بەڵام زانیم ئەمە شاکارە، لەوەش گرنگتر دەیزانی چیمان دەوێ، هەستم بەجۆشوخرۆش و متمانەبەخۆبوونی کرد، بۆیە پێم راگەیاند دەست بە کارەکانی بکات، هەروا ئەگەر هەر گرفتێکی هەبوو ئەو بە دان رابگەیەنێ.

لە ماوەی چوار کاتژمێردا کن کۆمپیوتەرەکانی ئامادەکرد، لەتەك مۆڵەت وەرگرتنی پرۆگرامەکانی، بۆ ئەمەش دەستی کرد بەوەرگرتنی زانیاری بۆ ئۆپراسیۆنەکانمان.

لە ماوەی دوو رۆژدا توانی هەموو نەخشەکان بگونجێنێ، لەو کاتەشدا ئامادە بوو وەڵامی هەموو پرسیارەکان بداتەوە، وەڵامەکانیش بەپێی داتا دەییەکان، بەمەش کن و تیمەکەی توانیان پێکهاتەی دەیان پێکهاتە بژمێرن، ئەمەش بەپێی ئەو زانیاریانەیە بۆ پراکتیکردنی سیستەمەکە و ئەوەی دەمانەوێ.

هەموو سەرەداوەکان نیشانمان دەدات و دەتوانین سەیری بکەین، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بتوانین سەیری نەخشەی ئەلیکترۆنی بکەین، بەمەش هەموو

بڕیارەکانی سەرکردایەتی زۆر ئاسان بوون، من زوو زوو سەیری نەخشە دەکەم واتە هەموو رۆژێك زیاتریش لە کاتی بەیانیان و شەواندا.

ئەو سەندووقە سیحر و جادووییەی باسمان لێوە دەکرد لەوە باشتر بوو کە وێنامان دەکرد.

هەڵمەتی مووشەکباران لە رۆژی یەکشەممەی رێککەوتی حەوتی تشرینی یەکەم بوو سیستەمی دەستنیشانکردن زۆر روون بوو، لەو کاتەدا هیچ رووداوێك بە هۆی هەڵمەتەکەوە کەس لە براکانمان نەکوژرا، هەموو تیمەکانمان رزگاریان بوو هاوکات سیخوڕە ئەفغانییەکانیش تووشی هیچ نەبوون بەتایبەتی لەو شوێنانەی ئامانجمان بوو.

لەو کاتەی فرۆکەی بی -٢ لە هەڵمەتێکی مووشەکباران بوو بۆ سەر ئامانجی یەکەمی پەیوەندیمان لەگەڵ سەرچاوە ئەفغانیەکەمان پچڕا، لەوە دڵنیا نەبووین ئەو ناوچەیەی جێ هێشتووە، مایك باز موسلی و تیمەکەی سەرکردایەتی هەڵمەتە ئاسمانییەکانیان دەکرد، پێشتریش لەیەکێك لە وڵاتانی دوورگەی فارس کاریان کردبوو، لەم هەڵمەتەدا کارێکی شاکاریان ئەنجام دا بەتایبەتی هەردوو فرۆکەوانەکە، زۆر بەوردی لە ئامانجەکانیان دابوو، هەروا خۆیان دوورخستبۆوە لەو شوێنانەی کە ئاگادار کرابوونەوە مووشەکبارانی نەکەن، ئەمەش وای کرد هەموو لایەك بەجۆشوخرۆشەوە حەزیان لە جەنگ بێ.

لە یەکێك لە بۆنەکانی دیکە دان و کن هاوبەش بوون لە پەیوەندیکردنێکدا بۆ بینینی ڤیدیۆ کە لەرۆژێکدا دووجار سەیرمان دەکرد، ئەمەش لەتەك فەرمانداریەتیی سووپا، بۆ ئەمەش هەموو هاوبەش سەربازییەکانمان لەنێویاندا تیمی سی ئای ئەی ئاگادار کردەوە سەبارەت بە رێگەی باشووری بگڵان، کن لەو

ساتەنەدا هەردەم کۆمپیوتەرەکەی لەدەست دا بوو بۆ ئـەوەی پەیوەنـدی بکـات و جەخت بکاتەوە هیچ تیمێك و سـیخوڕێکی ئێمـە لـەو ناوچـەیەدا نییـە، هـەروا ئەمەی بە فەرماندارییەتی ناوەندی گەیاند کە بە سـەرۆکایەتی جەنـەرال موسـلی بوو، هاوکات فرۆکەی ئێف -١٦ لەو کاتەدا لەسەرووی کـاروانێکی دوژمنـدابوو، دان و کن پێی ڕاگەیاندن هەموو شتێك باشە، ئەمەو فرۆکـەی ئێـف ١٦ هێرشـی مووشەکبارانی دەست پێ کرد.

لەپێش چەند رۆژێك لەگەڵ یەکـەم هێرشـی سـەربازی ئـەمریکی لەباشـوور لەرێککـەوتی ١٩-٢٠ تشـرینی یەکـەم لـەنزیك قەنـدەهاردا ئەفسـەرێکی پەیوەندیکار لە هێزی تایبەت بە بنکەی دژەتیرۆردا داوای لەکن کرد سەبارەت بەو ناوچەیە، ئەمەو دەزگای نەخشەی سی ئای ئەی هەندێك زانیاری پێـدا سـەبارەت بەزانینی سیستەمی زانیاری جـوگرافی تـا بزانـدرێ ئـەو ناوچـەیە مینـی تیـادا نەچێندراوە، لەمەوەش کـن پەیوەنـدی بـە نووسـینگە و خاڵەکانـەکان کـرد، بـۆ ئەمـەش هـەموو لایەنـەکان درا بەکۆماندۆسـی ئـەمریکی داتاکـانیش هـەموو کێڵەگەکانی مینی نیشاندا.

داوام لە دان کرد پوختەیەك پێشـکەش بـە تینتـی بەڕێوەبـەر بکـات، ئـەو پوختەیە دەبوایە دە خولەك بخایەنێ، بەڵام کاتژمێرێکی پێ چوو، لێـرەوە کـن بـە هۆی لاپتۆکەیەوە هەموو نموونەکانی خستە روو.

سەرکردەی سووپا و کۆنگریس لەدوای چەند هەفتەیەکدا پوختـەی سـندووقی سـیحری و جادوویەکـەیان داوا دەکـرد، سـەرەڕایی ئـەوەی ئێسـتا مـن نەخشـە چاپکراوەکان بەکار دەهێنم بۆ ئۆپراسیۆنەکانمان.

ئۆپراسیۆنەکان قەبارەیان گەورەتر بوو ئەمەش بووە هۆیەك زیاتر ئاڵۆزی تـێ بکەوێ بۆ ئەمەش تیمی کار لە هۆبەی ئامانجەکان فراوان بوو، هەروا سیسـتەمی

کۆمپیوتەر و لاپتۆپ کە لەلایەن کن و سێ ئەفەسەری دیکە بەکاردەهێندرێ، هەمووشی بەستراوەتەوە بە کۆمپیوتەرەکانی نووسینگە و پرینتەر و ئامێری کێشانی وێنەی نەخشەکان، تیایدا هەموو پوختەکانی شەوی رابردوو نیشان دەدات، هاوکات هەموو سەرەداو و دۆخەکان لەنێو نەخشە ئەلیکترۆنییەکان بۆ فەرماندە و سەرکردایەتیی ناوەندی سوپا دەنێردرێ، تا هەموو زانیارییەکی جوگرافیان هەبێ.

دان کاری لەسەر ئەوە دەکرد تا کۆمەڵگە هەواڵگرییەکان لەگەڵ ئۆپراسیۆن بۆ سەر ئامانجە بەیەکتر ببەستێتەوە.

بۆ نموونە رۆژانە ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەیی زانیاری نوێی دەدا بە بنکەی دژەتیرۆر –ئۆپرۆاسیۆنی تایبەت، زانیارییەکانیش لەرووی داتا جوگرافییە دیاریکراوەکان بوو، بۆ ئەمەش تیمەکە چەند کاتژمێرێك کاریان دەکرد تا بەکاری بێنن لەگەڵ سیستەمی زانیاری جوگرافی، هەروا یەکێك لە ئەفسەرەکان داهێنانی لەوە کرد تا بتوانین هەموو زانیارییەکان بە ئارەزووی خۆمان گل بدەینەوە بە مەرجێك ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی شێوە داڕێژاوەکەی بگۆڕێ، بۆ ئەمەش کن داوای لە تیمی ئاژانس کرد تا سەردانی بنکە بکەن بۆ ئەوەی هەموو ناساندنەکان ئەنجام بدرێ، ئەمەو باسی چۆنیەتیی بەکارهێنانی ئامانج و داتاکان تا بتواندرێ بچێتە ناو سیستەمی ئێمە، هەروا ئاژانس داڕشتنێك بۆ راپۆرتەکانی بکات تا بگونجێت لەگەڵ پێویستییەکانمان، ئەمەو ئەوانەی سەردانیان کردبووین یەکسەر رازی بوون، لە رۆژی دواتر کن بە چەند خولەکێك نەك بە چەند کاتژمێرێك هەموو داڕێژاروەکانی خستە سیستەمەکەوە.

## هینری ا.کرامبتۆن

لەلایەکی دیکەوە بنکەی دژەتیرۆر —ئۆپراسیۆنی تایبەت سیستەمی هاوبەشی داهێنا وەك ئەوەی لە مەیدانی جەنگدا بێ، بەشێوەیەك دانەی تەواوی نەخشەکانمان لە وێستگەی کابوول بێ، لەو کاتەی ئەمریکا زیاتر چووە نێو ئەفغانستان کن سەفەرێکی بۆ ئەفغانستان کرد تا بتوانێ سیستەمی زانیاری جوگرافی بەیەکەوە بلکێنێ، تا سووپا سوودی لێ وەربگرێ.

لە کۆتاییدا کن و تیمەکەی توانیان چەندین ئەفەسەری مەیدان فێری کۆمپیوتەر و لاپتۆپ بکەن تا شارەزاییەکی تەواویان هەبێ لەسەر زانیاریی جوگرافی کە ئێستا لەخزمەتدایە، ئەمەو بنکەی دژەتیرۆر —ئۆپراسیۆنی تایبەت هەر کۆمپیوتەرێکی پڕ بوو لە زانیاری و داتاکان، هاوکات لە هەر گۆڕانێکیش زانیاری و داتاکان گۆڕانکاری بەخۆیانەوە دەبینن، ئەم زانیاریانەش لەلای هەموو بنکە و تیمێك و ئەفەسەرێك هەبێ، تا روانینی روونی بۆ گۆڕەپانی جەنگ هەبێ، بەمەش کردەکان زیاتر بەیەکتری دەبەسترێتەوە و زیاتر ئاوێتەی یەکتر دەبن.

دان و کن لەپاشتردا دەتوانن پرۆگرامی وێنەی داتای سێ رەهەندی دروست بکەن، بەشێوەیەك هەموو رووەکانی جوگرافی ئەفغانستان لەسەر شاشە نیشان دەدەن، هەروا فرینێکی گریمانی بۆ سەر گۆڕەپانی جەنگ دەکەن، بەو شێوەیە هەموو رووەکان بە هۆی سوڕانەوە دەزانین، بەراستی ئەزموونێکی بەهادار بوو.

ئەو وێنە دینامیکییە، بەبەراورد بە وێنەی ورد، وێنایەکی نوێی بەخشی بە سی ئای ئەی و سووپا و بڕیاردەرانی سیاسەت، ئەمەو سندووقە سیحرییەکە، بۆ بەکارهێنانی تایبەت و بڕیاردەرانی سیاسەت داهێنان بوون.

ئەو جۆرە هۆشیارییە وای کرد سی ئای ئەی لە هەموو ئاژانسەکانی هەواڵگری دیکە جیاواز بێ، بەتایبەت ئەوانەی زانیاری کۆ دەکەنەوە بۆ

جێبەجێکردنی کارەکانیان، بەپێی لێدوانی ئێف بی ئای ئەوان کار دەکەن تا بەڵگەیەك بدۆزنەوە بۆ دادگاییکردنی کەسێك، هاوکات ئاژانسی هەواڵگری بەرگریی پێداویستی سوپا دابین دەکات، کەچی سی ئای ئەی لەلایەکی دیکەوە زانیاری دەخاتە روو بۆ بەشێك لە کرپارەکانی هەر لە سەرۆکەوە بگرە تا سەربازێك.

ئەرك و راژەکانمان ئاوێتەبووی داهێنانە وەك داهێنانەکانی دان و کن، کاتێك بنکەی دژەتیرۆر-ئۆپراسیۆنی تایبەت رادەهێنن بۆ ئەزموون و داهێنان، بەم شێوەیەش هەموو لایەنەکانی جوگرافیای شوێن و شیکردنەوە و جەنگی گرتەوە.

## سەرکردایەتییەکی ئاوێتەبووی کارا

هەڵمەتەکەمان لە ئەفغانستان جیا بوو لەگەڵ ئەوەی نائاسایی بوو، تیایدا رۆڵمان کۆکردنەوەی زانیارییەکان بوو بۆ بڕیاردەدانی سیاسەت-کرپارەکان- بەو شێوەیە هەموو کاتی تیمەکان بۆ کاری شاراوە بوو، هەروا هەواڵگری بۆ بەکارهێنانی تایبەت بوو، لەپێشتردا سی ئای ئەی بەو شێوەیە لەرووی کۆکردنەوەی زانیاری و بەرهەمی شیکردنەوە و دانانی ستراتیژیەت بەو شێوەیە نەبوو، لەتەك پراکتیکردنی کاری شاراوە بۆ بەکارهێنانی هونەرەکانی دەسەڵات و جەنگ بەو شێوەیە نەبووە.

هەر زوو زانیمان بڵاوەپێکردنی تیمەکان تەنیا پشتگیری ماددی و سیاسی نییە، بەڵکو پێویستی بە هەواڵگری هەیە، ئێمەش هەموو زانیارییەکمان پێ بەخشین و هانمان دان تا لەنێوان خۆیاندا بەکاربێنن، زۆر جاریش تیمەکانی بە هۆی دینامیکی پەیوەندییە لاوەکییەکان زۆر بە خێرایی بەرپەچی دوژمنیان

داوەتەوە، هەندێکجاریش لەپێش ئەوەی بارەگای سەرکردایەتی خاڵ دابنێ بۆ بەرپەرچدانەوە، من ئەمەم دەویست، بۆ ئەمەش سەرکردە مەیدانییەکان سەلماندیان هاوکارییەکی تەواوی ئاڵۆزی هەواڵگری هەیە و کاری شاراوەش لەوپەڕی گرنگی دایە.

یەکێك لە نموونەکان فەرمانەدەی تیمی ئەلفا لەنزیك مەزار شەریف پەیوەندی کرد تا پێمان رابگەیەنێ کە بارەگای سەرکردایەتی ناتوانێ تیمەکانی لەگەڵ خێڵەکانی هەزارەی ناوەندی ئەفغانستان بەیەکتر ببەستێتەوە، بۆ ئەمەش تەنیا پەیوەندییەکمان کرد بە هاوپەیمانە ئەفغانییەکان لە رێگەی ئۆزباکستانەوە، لەوێدا گرفتێکی گەورە هەبوو چونکە نەمان دەزانی لە کوێدا دابەزین بەتایبەت لە هەرێمی بامیان، نەشمان دەزانی چ کاتێك تیمەکانی دیکە پەیوەندیمان پێوە دەکەین، هەروا متمانەی تەواویشمان بە هەزارە نەبوو تا رووبەڕووی تاڵیبان ببنەوە، لەوکاتەی ئێمە تیمەکەمان دادەبەزێنین، بەو شێوەیە لەو نێوەندە مابووینەوە و نەمان دەزانی چی بکەین.

پێ دەچوو فەرمانەدەی تیمی ئەلفا دوو کەسی خۆبەخشی دانا بوو تا بەرێگەی وشکانیدا بڕۆن ئەمەش ٣٦ کاتژمێری دەوێ.

داوام لێ کرد ئەو کارە بکات، پێش دەچوو لەگەڵ فەرمانەدەی تیمەکانی دیکەش پەیوەندی هەبوو، هەستی بەوەش دەکرد دانانی تیمێك لە بامیان بۆ دانانی ستراتیژیەت پێویستە، چونکە دەکەوێتە رۆژئاوایی کابول، تا بتوانین تەجنیدی هاوپەیمانە ناوچەییەکان بکەین و بتوانین بەرەو کابول بجولێین، لەو کاتەی تیمی شکاندنی سەرەکان رێگەی خۆی دەبڕێ لە دەشتاییەکانی باکوور، بۆ ئەوەی لە باکوورەوە هێرش بکاتە سەر کابول، بۆ ئەمەش فەرمانەدەی تیمەکە

لەوە گەیشت و بەدەم داواکارییەکانماوە هات، لەپێشتریشدا هەموو لایەنەکانی هەواڵگریمان پێ بەخشی بوو بۆ مەبەستە ستراتیژییەکان.

دوو ئەفسەری نارد، یەکێکیان مایك سبانە، کە لەدوای چەند هەفتەیەك لە شەڕێکدا کوژرا، هەردوو ئەفسەر پەیوەندیان بە خەلیلی سەرکردەی هەزارە کرد، ئەمەش دوای بە ئۆتۆمبێلێك بەنێوەندی چیاکاندا تێپەڕین، ڕێگەی خۆیان دەبڕی سەرەڕایی ئەوەی متمانەی تەواویان بە هاوپەیمانە خێڵەکییەکان نەدەکرد، لەدواتردا بەگەرمی پێشوازیان لێ کردن و تیمی پشکنینی ڕێگاکانیان لەگەڵدا ناردن تا بە هەموو شێوەیەك هاوکاریان بکەن، بەمەش هەردوو ئەفسەر شوێنێکیان دۆزییەوە بۆ دابەزین و سیستەمی بەرگری تا ئەو کاتەی تیمەکانی دیکە پەیوەندیان پێوە دەکەن، لەپاش چەند ڕۆژێك تیمی سی ئای ئەی —هێزی تایبەت لەوێدا دابەزین، بەو شێوەیە جێی پێی خۆیان لەناوەڕاستی ئەفغانستان داگیر کرد، بەمەش پرۆسەی کۆکردنەوەی هەواڵگری پەرەی سەند.

سەرەتاکانی سەرکەوتن زۆر بەخێرایی بەدەرکەوت و لەسەرووی پێشبینییەکانماوە بوو، هەموو ئەمانە بە مکوڕبوونی سەرکردە و دیزاینکردنی تۆڕەکانەوە بوو، هەموو ئەوانەی چاومان پێیان کەوت دەسەڵاتیان پێ داین، لەتەك ئەوەی توانیمان پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ سوپای ئەمریکی بهێنینە ئارا، بەتایبەتیش لەگەڵ سەرکردایەتی ناوەندی، هاوکات لەتەك هاوپەیمانە ئەفغانییەکان لەو پەڕی هێزدا بووین، هەر کاتێك بیانویستایە بەتەنیا جوولەیان دەکرد یان بە هاوبەشی، گرنگی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جۆرج تینیت، کە پەیوەندییەکی پتەوی هەیە لەگەڵ سەرۆکە نوێیەکەمان، کە گوێی بۆ ئامۆژگارییەکانی تینتی بەڕێوبەر و کۆفر بلاك گرت، بۆ ئەمەش سەرۆك بۆش هەموو دەسەڵاتێکی دا بە سی ئای ئەی بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر دوژمن لەو

### هینری ا.کرامبتۆن

کاتـــەی پێویســـت بـــوو، زۆرجـــاریش مەبەســـتە ســـتراتیژییەکانمان دەپێکـــا، هەندێکجاریش پەیوەندی بە منەوە دەکرد منـــیش لـــە ڕێگـــەی خۆمـــەوە هـــەموو ڕێنماییەکانم دەدا بە سەرۆکی تیمەکان، زۆرجار لەنێوەندی کاتژمێرێکـدا جوولـەم پـــێ دەکـــردن، ئـــەوە جگـــە لـــەوەی مامەڵـــەکردن لەگـــەڵ هاوپەیمانـــەکان بـــۆ هاوکاریکردنمان تا لە کۆتاییدا بتوانین حکومەتی کابوول بڕووخێنین.

لە کاتێکدا پێداویستییەکانی سی ئای ئەی و دەسەڵاتەکەی هەردەم پێویستی بەوە بوو ئاوێتەی سووپا و جەنگاوەران و جەنەراڵ فرانکس بێ.

## سەرکردایەتیی ناوەندی

لە سێی تشرینی یەکەمی ۲۰۰۱ بەرەو تامبـا فـڕیم تـا چـاوم بکـەوێ بـە جەنەراڵ تۆمی فرانکس لە بارەگای سەرکردایەتی ناوەندی، بن کلارك یاوەرم بـوو، ئەو سەر بە ئۆپراسیۆنی تایبەتە لە سەرکردایەتی ناوەندی، تـەنیا وەك هاوکارێـك هاتۆتە نێو سی ئای ئەی، لە کۆتایی ئەیلوولدا خۆی بە تیمەکانمان ناسـاند، بۆیـە وەك خۆبەخش و ڕاوێژکارێکی سەربازی دەست بەکار بوو و جگە لەوەی ئەفسـەری پەیوەندییەکانە لە سەرکردایەتی ناوەندی، کەسێکی ڕێکوپێکە حەز بەوە ناکـات ببێتـە جێگـەی سـەرنجی خـەڵك. کەسـێکی گرانـە، بەشـێوەیەکی هاوسـەنگ پرسیارەکانی دەخاتە ڕوو بەتایبەتی بۆ تێگەیشـتن لـە بابـەت و گرفتـەکان، ئـەو دەرچووی "سیتادل"ە کە کۆلیژێکی جەنگییە و لە کارۆلینای باشـووردا، لـەپاش گەنجی زۆربەی ژیانی لەناو سووپای ئەمریکادا بەڕێ کردووە، کەسێکی باڵا بـەرزە و هیچ کاتێك ماندوو نابێ، لە یەکەم کۆبوونەوەدا بەسوپاسەوە ڕەزامەندی دەربڕی

بۆ هەر بڕیارێکی سیاسی کە دەیدەین، ئەمەش لای ئێمە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە بوو.

بە هاوشانی یەکتر چووینە نووسینگەی جەنەراڵ فرانکس، کە هەموو لا دیوارەکانی نەخشێندرابوو بە وێنە و خەڵاتەکانی زۆربەی وڵاتانی جیهان، ئەو کەسێکی باڵابەرزە و رووخساری لوچی تیایدایە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ماوەیەکی زۆر لەناو سووپادا بووە و تشکی رۆژ بۆ ماوەیەکی زۆر لە رووخساری داوە، زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ کردم و بەتوندی تەوقەی لەگەڵدا کردم.

بۆ ئەو کۆبوونەوەیە هەر یەك لە نوێنەری سی ئای ئەی لەلای سەرکردایەتیی ناوەندی ئامادەبوو، ئەو ئەفسەرێك بوو چەندین خولی راهێنانی لەدەرەوەی وڵاتدا ئەنجام داوە و کەسێکی کارا و بەسوودە، هەروەها ئەمیراڵ بەرت کالاند سەرۆکی ئۆپراسیۆنی تایبەت لە سەرکردایەتیی ناوەندی و بەرپرسی سەربازی لەلایەن بن کلارکەوە ئامادە بوون، لەپاشاندا جەنەراڵ جین رینوارد سەرۆکی هۆبەی سێیەمی ئۆپراسیۆنەکانی سەرکردایەتیی ناوەندی هاتە ناو کۆبوونەوەکە، ئەمەش لەتەك گاری هاویل بەرپرسی سەرکردایەتی ناوەندی و سەرکردەی هێزی دەلتا لە سۆماڵ، بەتایبەتی لەو کاتەی فرۆکەی بلاك هۆك هێندرایە خوارەوە، هەردووکیشمان لە یەمەن خزمەتمان کردووە بەتایبەت ئەو کاتەی هێرشکرایە سەر کەشتیی کۆلی جەنگی، تەوقەم لەگەڵ هەمووان کرد، تەنیا گاری نەبێ کە باوەشمان بەیەکتردا کرد.

جەنەراڵ فرانکس جیا بوو لە هەمووان، چونکە بەتوندی قسەی دەکرد و رێزی بۆ کەس نەبوو، ئەمەشم هەر لە خولەکی یەکەمی کۆبوونەوەکە زانی "ئەوە چییە

له واشنتن هاتۆته كایەوه، ئوسامه بنلادنی كوڕی سۆزانی له كوێدایه؟ ئێـوه چـی دەكەن لەپێناو وڵاتەكەتان".

پێم گوت " ئەوه دەكەین جەنەراڵ"، لەم كاتەدا هەموو نەخشـەكانم لەسـەر مێزەكە دانا، باشترین توانای خۆمان خسته روو بەرامبەر به دوژمن، هەروا باسی داتاكانی تیمەكانم كرد، كه له بنچینەدا لەلایەن هاوپەیمانه ئەفغانییەكانەوه دیاری دەكرێ.

"جەنەراڵ ناتوانین سەركەوین ئەگەر لەگەڵ هاوپەیمانـه ئەفغانییـەكان نـەبین، دەتوانین هەماهەنگیان لەگەڵ تواناكانیان بكەین، ئەوان وڵات و دوژمن دەناسـن، هەروا هاوپەیمانەكانمان دەزانـن چـۆن شـەڕ دەكـەن، وەك هێـزی پیـادە بـەكاریان دەهێـنین، ئـەوان پێویسـتیان بـه پشـتگیری مـاددی و پشـتگیری ئاسمـانی و هەواڵگرییەكانمان هەیه، هەروا تیمەكانی سی ئای ئـەی پێویسـتی بـەپیاوانی تـۆ هەیه، هەر كاتێك زووتر بێ ئەوا باشتره".

فرانكس گوتی " باسی ئەفغانییەكانم بۆ بكه".

"ئێمه دەیان ناسین، له دوو ساڵی رابردوودا تیمەكانمان دەنێرنه ئەفغانسـتان، بۆیه پێویسته بزانین توانای هاوپەیمانەكان تا چـەنده، هـەروا دەبـێ دوژمنـەكانمان بناسین، هەموو شتێك دەخەمه بەردەسـتت وەك ناسـنامەی ئەوانـەی هاوكاریمـان دەكەن، ئەوان كلیلـی شكسـتی قاعیـدەن، ئێمـه و ئـەوان نـەبین ئـەوا شكسـت دەهێنین".

بەڵێنم پێ دا هەرچی كۆكراوەی هەواڵگرییه پێشكەشیان بكەین، هـەتا ئـەو زانیاریانەی لـه برایـداتۆریش وەری دەگـرین، وەك باسمـان كـرد فرۆكەیـەكی بـێ فرۆكەوانه و سیستەمەكەی زایناری جوگرافییه و تیایدا وێنەی دۆسـت و دوژمـن

دەگرێ، هاوکات سندووقە سیحرییەکەمان هەموو کات نەخشەکان نوێ دەکاتەوە، ئەم تەکنەلۆژیایەش لەو پەڕی پێشکەوتندایە لەپێشتردا شتی وانەبووە بۆ پشتگیری هەواڵگری سوپا، کە کاری سەرەکی کۆکرنەوەی هەواڵگرییە، بێگومان بەبێ ئەو هەموو شتێکمان بەرەو رووخان دەڕوا وەك هەوڵەکانی کاری شاراوە و هێرشە سەربازیەکان و دیبلۆماسیەت و چەسپاندنی یاسا و سیاسەت، بۆیە هەواڵگری پشتگیری هەموو کەرەستەکانی هونەری دەسەڵات دەکات.

بۆ ماوەی دوو کاتژمێر قسەمان کرد، لەوێدا پلانمان دانا و نەخشەمان کێشا، هەموو لایەك بەڵێنی دا پشت بە ئاڵوگۆڕییەکان ببەستین.

## زۆری نەماوە هێرش بەرین

بن کلارك لەدوای کۆبوونەوەکە گوتی ئێمە کارێکی باشمان کرد، ئەوەی منیش دەم ویست گوێم لێ بێ ئەوە بوو، لەپاشاندا یەکسەر بەرەو سەرکردایەتیی سی ئای ئەی فڕیم، ئەوەش دەزانم لە چەند رۆژێکی داهاتوودا هێرشی ئاسمانی دژ بە قاعیدە و تالیبان دەکرێ.

کارمان لە ئەفغانستاندا بیست و چوار کاتژمێر بەردەوام بوو بۆ دیاریکردنی هەموو ئامانجەکان، دەبێ کارەکە بەشێوەیەکی راست ئەنجام بدەین، هەموو شتێکیش پەیوەستە بەو زانیاریانەی کە کۆی دەکەینەوە.

ناوەڕۆکی کۆبوونەوەکەم بە تینتی بەڕێوەبەر و کۆفر بلاك و عەمیدێك لە هێزی تایبەتی ئەمریکی گاری مایك جۆنز راگەیاند، جونزیش لە بنکەی دژەتیرۆردایە بەو پێیەی راوێژکارە، ئەو بە هیچ شێوەیەك شتی پڕوپووچ قبوڵ ناکات لەنێوەندی ئەو هێرشەدا هەموو ناوەڕۆکەکەم پوخت کردەوە و پێم

راگەیاندن، ئەمەو تینتی بەڕێوەبەر ئەو پوختەی لە کۆبوونەوەیەکدا بە دژەتیرۆری راگەیاند، لەلایەکی دیکەوە ریچ و تیمەکەی وێنەکانیان گەورە کردەوە بۆ دوا داتای نوێ بەتایبەتی هەوڵدانی دوژمن بۆ بەدەستهێنانی چەك و جبەخانە، بۆ ئەمەش موات لارسۆن دەستپێشخەری خۆی خستە روو سەبارەت بەم بابەتە، هەروا چارلی هەوڵی کۆکردنەوەی زانیاری لەلایەن هەموو سەرچاوەکانی هەواڵگری پوختکردەوە، جگە لەوەی کەسێکی دیکە بە ناوی جۆن هـ سۆب کامبل جەنەراڵی هێزی ئاسمانی و یاریدەری بەڕێوەبەر لە سی ئای ئەی ئامادە بوو، واتە ئەو بەرپرسی پشتگیری سەربازی بوو، ئەو لەوێدا ئامۆژگارییەکی جوانی پێشکەش کردین.

کۆفر بلاك وەك سەرۆکی بنکەی دژەتیرۆر بەهێمنی لەلایەك دانیشتبوو و هەموو باسەکانی دا بووە دەست ئەفسەرەکانی تا پوختەکانیان پێشکەش بکەن، هەروا زۆر بەچڕی چاودێری دینامیکی سیاسەتی دەکرد بەتایبەت گفتوگۆ بابەتییەکان، هەر لەوێدا نوێنەرانی رۆژهەڵاتی خواروو و ئاسیای ناوەڕاست و چالاکییە تایبەتییەکان ئامادەی کۆبوونەوەکان بوو، کەچی بنکەی دژەتیرۆر لەوێدا بەبێ دەنگی دانیشتبوون، چونکە بەڕێوەبەر ئەو بەشەی راسپارد بوو بۆ فەرمانداریەتی، کەچی ئاستی پشتگیری لەلایەن بەشەکانی دیکە لەنێوان باش و خراپدا بوو، چونکە لەنێوەندی هەمووماندا بنکەی دژەتیرۆر دەیویست پێشبڕکی لەنێوان هەمووانـدا بکات، هەموو ئەمانەش وای کرد جۆرێك لە ناخۆشی بێتەکایەوە، هەروەك چۆم کۆفر پێشبینی ئەمەی دەکرد.

چارلی ئالن وەك جێگری ئاژانس سەرچاوەیەکی چەسپاو بوو، هەردەم پشتگیری و هانی هەموو لایەکی دەدا، بەتایبەتی لەرووی پێداویستی گۆڕانی کەشتی ئاسمانی دەستکرد بۆ رووماڵکردنی وێنەیی جۆراوجۆر، چارلی ئەو کارانەی

دەکرد، هەروا هەردەم دەی گوت ئایا هاوکاریت دەویَ بۆ بۆ پشتگیریکردنی شیکردنەوەکان؟ چارلی وەك کەسێکی ئازا هەردەم دەیویست گوێی لەهەواڵی سەرکەوتنی کاری شاراوە بێ، بەتایبەت لەرووی تێکدان تا دەگاتە ریکلام لەپاشاندا کار بکرێ بۆ کوشتن، کاتێك ئاگادارم کردەوە سەبارەت نزیکبوونەوەی هەڵمەتی مووشەکباران و هەماهەنگی لەگەڵ هێرشی پیادە و وشکانی ئەفغانییەکان بەتایبەت بۆ شارە سەرەکییەکان، قۆڵی گرتم بەدەنگێکی نزم گوتی "ئێستا وانەیەکی شایستەیان پێ دەدەین".

هەردەم لە کاتی مۆڵەتەکانی کاتژمێر ١٧٠٠ لەتەك چارلییەوە دادەنیشتم.

لەپاش دوو رۆژ لە سەردانیکردنم بۆ لای جەنەراڵ فرانکس بە سەرکردایەتیی ناوەندیم راگەیاند هەڵمەتی بۆمبارانکردن دارێژراو تا ئێستا چۆن دانراوە هەر وایە، ئەمەو لە بەرامبەر مێزەکەم لە نووسینگە بچووکەکەم دانیشتم، گفتوگۆم لەگەڵ ماسی کرد سەبارەت بە نزیکبوونەوەی هێرشەکان.

هەرچی گوتمان وەك تێبینی لە دەفتەری تێبینیەکان نووسیم و لەپاشاندا دام بە سکرتێرەکەم تا چاپی بکات، ئەو سەرنجانەش خۆی لەسێ لاپەڕەدا دەبینیەوە، کە رێنمایی بوو بۆ تیمەکان، ناونیشانی باسەکەش بە ناونیشانی "ستراتیژییەتی سەربازی"، ئەمەو باسەکە چەند خاڵێکی سەرەکی لەخۆ گرتبوو بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- پێدانی رێنماییەکان بۆ هەموو خێڵە هاوپەیمانەکان، هەر کاتێك ویستیان لە فڕۆکەکانیان بێنە خوارەوە سەرەتا با خۆیان بناسێنن.

٢- پێدانی رێنمایی بۆ هەموو خێڵەکان تا هەموو جوولەیەکی سەربازی گەورە بوەستێنن، با هەر یەکەو لە شوێنی خۆیاندا بمێننەوە.

٣- ئاگادارکردنەوەی هەموو هێزەکانی پیادە و وشـکانی کـە سـەر بـە خێڵـە هاوپەیمانەکانن حۆیان ئامادە بکەن سەبارەت بە نزیکبوونەوەی هێرشکردن، دووبارە داواشیان لێ کرایەوە لە شوێنی خۆیاندا بن.

٤- پێدانی رێنمایی بۆ هەموو سیخورەکان تا لەنێو وڵاتدا دەست بـە تێکـدان بکەن، هەروا ئۆپراسیۆنی دیاریکراو ئەنجام بدەن ئینجا لە هـەر شـوێنێکدا بن "ئەمەش خۆی لە کوشتنی سەرکردەکانی دوژمندا دەبینێتەوە، ئەمەش وەك هەماهەنگییەکی نێوان هێزی ئەمریکی لەجەنگدا لەپاش ١١-٩".

٥- هەموولایەك ئاگادار بن لەوەی ئۆپراسیۆنی چوونە ژوور لەلایەن سـی ئـای ئەیـەوە دەکـرێ، لەپاشـاندا ئۆپراسـیۆنی تایبـەت و بۆمبـارانکردن زۆر بەخێرایی لە باشوور دەست پێ دەکـات، ئەمـەش لەگـەڵ بۆمبـارانکردنی ئاسمانی دیاریکراو.

٦- دووبارەکردنەوەی بـەردەوام بـۆ ئـەو ناوچـانەی کـە نـابێ بۆمبـارانکردن بیانگرێتەوە "ئەو ناوچانەش شوێنی سیخورێ تاکلایەنـە و نەخۆشـخانە و مزگەوتـەکان و شـوێنە هەسـتیارەکانە، لەگـەڵ ئـەوەی ئێمـە چـەندین بڵاوکراوەمان لە هەموو ئەفغانستاندا بڵاوە پێ کردووە بەزمانەکانی پشـتۆ و داری و ئینگلیزی و تیایدا هاتووە "تالیبان شوێنی مەدەنییـەکان بـەکار دێنێ بۆ شـاردانەوەی جبەخانـەکانیان، بۆیـە هـەموو ناوچـەکان تووشـی کارەسات دەکات، لەو شوێنانە مەمێنەنەوە جبەخانەی سەربازی و پیاوانی تالیبانی تیادایە".

٧- پێویسـتە لەسـەر هـەموو خێڵـە هاوپەیمانـەکان ئامانجـە سـەرەتایی و لاوەکانیانیان دیاری بکەن تا هێرشەکانیان لەسەر زەوی بەپلان بێ.

٨- سیخوڕەکان دەبێ ڕێگەی ڕاکردنی پێشبینیکردنی خۆیان دیاری بکەن، لەو کاتەی شەڕ دەست پێ دەکات، لەوانەشە ئوسامە بنلادن و سەرکردەکانی دیکە هەمان شێواز بگرنە بەر، بۆیە دەبێ پشکنین بۆ ڕێگەکان بکەن تا نەتوانن ئەمکارە بکەن "لەرووی مێژووییەوە ئەوە دەزانین بەدیل گرتنی سەرکردەی دوژمن لە جەنگە نانیزامییەکان زۆر گەورە نییە، بۆیە پێویست دەکات پلانی خێرا ئامادە بکەین".

٩- ئامادەکردنی بەندکراوەکان و لێپرسینەوە لەگەڵیان تا وتەکانیان بقۆزینەوە.

١٠- هەڵسەنگاندنی پێداویستییە مرۆییەکان.

لە کۆتایشدا نووسیم "ئێمە دەجەنگێین لەگۆڕەپانی ئەفغانیدا لە پێناو ئامانجەکانی دژەتیرۆر، سەرەڕایی ئەوەی ئەمە چەند ئامانجێك دیاری دەکات لەسەر زەوییەکی پڕ لە تەماوی و گۆڕاودا، ئێمە دەجەنگێین لە پێناو جەنگی دژەتیرۆری یەکگرتوو کە سی ئای —ئەی-وەزارەتی بەرگری ئەنجامی دەدا لە هەموو جیهاندا، سەرەڕایی ئەوەی ئێمە هەڵە دەکەین بەڵام لەمەوە بوارێکی نوێی پەیڕەوکراو دەدۆزینەوە، بۆیە ئامانجەکانمان زۆر روونە بۆ هاوبەشییەکی تەندروست".

هەموو ڕێنماییەکانم دا بە ئەفسەری پەیوەندیکردن لە تامپا تا جەنەراڵ فرانکس و تیمەکەی سەیری هەمووی بکات.

سەرەتا زۆر بەتوڕیی کارم دەکرد، بەشێوەیەك پێم وابوو ئەو هەموو شتانە کۆناکرێتەوە، بۆیە هەڵدەچووم کاتێك یەکێك پێی وابوو پلانەکانم شکست دێنێ، چەند کەسێکم لە بنکەی دژەتیرۆر-ئۆپراسیۆنی تایبەت دەرکرد، لەنێویاندا ئەفسەرێکی کۆنی ئۆپراسیۆنی سی ئای ئەی و ئەفسەرێکی دیکەی پەیوەندی

لەگەڵ سەرکردایەتیی ناوەندی سووپا، بەنهێنی و بەئاشکرا ئاگاداری هەموومانم کردەوە.

توڕەبوونەکەم پەیوەندی بە ترس و شەرەف و شانازییەوە هەبوو، ترسم لەوە هەبوو هێرشێکی دیکە بۆ سەر وڵاتەکەمان بکرێ، هەروا لەوە ترسام پیاوانمان تووشی سەربرین ببنەوە، لە هەمووی خراپتر ترسم لە شکستهێنانی هەموو کارەکە هەبوو.

کەچی دەبێ هەموو ئەوانە سزا بدرێن کاتێك پێشێلی هەستەکانت دەکەن، بەڵام من بەسەر ترسدا سەرکەوتم، قاعیدە توانی بێتە کەنارەکانمان و هەزاران کەس بکوژێ لە نیویۆرك، هەروا بۆمبارانی بارەگای سووپای نەتەوەکەمانی کردووە، هەوڵی دا هێرش بکاتە سەر پایتەختی وڵاتەکەمان، تەنیاش سەرنشینەکانی گەشتی ٩٣ی کۆمپانیای یونایتد ئایرلاینزە شکستی بە وان هێنا، هەموو هیوا و ئاواتم ئەوە بووە بتوانم هاوڵاتیانی نەتەوەکەم بپارێزم، ئێستاش کاتی هاتووە؟

کات و هەل لە ئێستادایە، لەوانەیە ئەمە دوور بێ لە سزادان، بەڵکو ئەمە گێڕانەوەی کەرامەتی وڵات و ئاژانسەکەمانە، بە کارمەندانی تیمەکانم گوت: لەپێش ئەوەی ئێوە بڕۆن دەبێ بزانن ئێوە ئەو پێشەنگەن کە وڵاتمان پشتی پێ دەبەستێ، ئێستاش ئەو شەرەفەتان پێ بەخشراوە سزایان بدەن و کەرامەت و پاراستنی وڵاتمان بۆ بگەڕێنەوە، ئێستا لە هەموو کات زیاتر وڵات پێویستی بە ئێوەیە.

زۆر شانازیم پێوە دەکردن، شانازیم بەوانە دەکرد کە لە شوێنەکاندا بڵاوەیان کردووە جگە لەوانەی لە بارەگای سەرکردایەتین، هەر لەدیك هۆڵم کە تەمەنی لە

## هونەری سیخوڕی

هەمووان گەورەترە تا دەگاتە ویل هـۆرد بچـووك، دیـك راوێكـارێكی گەورەیـە سەركردایەتی هاوپەیمانی خێڵەكانی لەتەك سی ئای ئەی دەكرد لە نێوەندی جەنگی ڤێتام. تووشی سووتانێكی زۆر بۆوە بە هۆی كەوتنە خوارەوەی هیلكۆپتەرەكەی لە كۆنگـۆ، بـەڵام دوای چـەند رۆژێكـی دیكـە رێگـەی خـۆی دۆزییـەوە بـە هـۆی جەنگەڵەكانەوە دواتر بۆ ماوەی سی ساڵ پلەی بەرزدەكرێتەوە لەریزەكانی دەزگەی شاراوەدا، دواتر خانەنشین بوو، بەڵام دوای خانەنشین بوونی گەڕایەوە و گرێبەستی كرد وەك راوێژگاری سەرەكی لە بنكەی دژەتیرۆر — ئۆپراسیۆنی تایبەت.

ویل هۆرد كوڕێكی ئـەفریقی ئەمریكییـە و تەمـەنی بیسـت و دوو سـاڵە و خەڵكی سان ئەنتۆنیۆیە، لەمێژ نییە پەیوەندی بـە سـی ئـای ئـەی كـردووە وەك تێكۆشەرێكی دژەتیرۆر، لـە رۆژانـی یەكـەمی دامەزرانـدنی بنكـەی دژەتـیرۆر-ئۆپراسـیۆنی تایبـەت بەدەركـەوت، نـەمزانی لـە كوێـوە هـاتووە تـا لێـرەدا خزمەتگوزاری بكات، ئێستا بەرگری پەیدا كردووە كاتێك ئێمە هـەموو كـارێكی پێ دەكەین، هەروا دژی ئەوەیە بچێ بخەوێ، ئێستا لـە بنكـەی دژەتـیرۆردا كـار دەكات، بۆ ماوەی دە سـاڵە لـە دەزگـەی شـاراوە وەك بەڕێوەبـەری ئۆپراسـیۆنی دژەتیرۆر و ئەنتەرنێت لە باشووری ئاسیا كار دەكات.

هەردەم بەرامبەر بە رەتكردنەوە بە كۆمەڵە، هەروەها بەشێوەیەكی رێكوپێك لەتەك ئەو ستراتیژییەتدایە كە دامان ناوە، هـەر زوو زانیمـان بلیمەتـە ئەمـەش شتێكی نوێ نییە، چـونكە سۆسـیدیدیس لـە پـێش هـەزار سـاڵ باسـی گرنگـی تورەبوونەكان و وەڵامدانەوەكانی دەكات لە كاتی جەنگدا.

ئێمە لە بەیانیی رۆژی یەكشەممەی رێكەوتی حەوتی تشرینی یەكەمی ٢٠٠١ ئێستا تەنیا دوو كاتژمێرمان مـاوە تـا دەسـت بـە هەڵمـەتی ئاسمـانی بكـەین، تیمـەكانمان لەوپـەڕی ئامادەباشـیدان، هـەموو پیـاوانی نووسـینگەی بارەگـای

سەرکردایەتی بەخێرایی هەواڵگری و وێنە دەنێرن بۆ پشتگیری تیم و هاوبەشی سەربازی و هاوپەیمانە ئەفغانییەکان، کارەکە لەنێوەندی هەرایەکی ڕێکخراو و دارێژراودایە.

ماسی لەلایەکی دانیشت و لێی پرسیم :"ئێستا تۆ ئاسوودەی بەم کارە".

من ئاسوودە بۆ ئەم کارە" ئەو پێی وایە چییە؟ کەچی من ساڵانێکە چاوەڕوانی ئەوەم، ئێستا کاتی هاتووە، کاتمان نییە بەفیڕۆی بدەین لە گفتوگۆیەکی دڵەڕاوکێی فەلسەفی.

بەگاڵتەوە پێم گوت "ئێستا لە هەموو کاتێك ئاسوودەترم، جۆن".

قۆڵی گرتم و خەندەیەکی کرد و گوتی "من سەبارەت بە دوژمن پرسیارت لێ ناکەم، بەڵکو باس ل ەتۆ دەکەم، ئایا خۆت ئامادەکردووە تا بەرپرسیاریەتی مردنی هەزاران کەس بگریتە ئەستۆی خۆت؟".

پێم گوت "شایستەن بمرن".

"بەڵێ کاری خۆمان دەزانین، وەك تۆ هەست بەرەزامەندی دەکەم کاتێك سەردەکەوین، بەڵام دەبێ ئەوە بزانیت چەندین پێویستی رەوشت و ئەخلاق هەیە نابێ لەبیری بکەی، دەبێ بیر لە گیانی ئەمری خۆت بکەیتەوە، لەپێشتریشدا چەندین ئۆپراسیۆنی دیکەمان کردووە، کەسانێك ژیانی خۆیان لەدەست دا، بەڵام هیچ کامیان وەك ئەمجارەیان نییە، پێویستە بۆ چەند ساتێك بوەستیت و رابمێنیت و نوێژ بکەیت، هەروا پیاوانیشت پێویستیان بەوەیە، هەموومان پێویستیمان بەوەیە".

با کارەکە بۆ جۆن بەجێ بهێڵین کاتێك ئەم ئاراستە سەرەکییە دەخاتە روو، تەنیا کەسایەتی و پیاوانی باش پێویستی بەوە هەیە، زۆر بەکەمیش ئەوە دەزانین، ئەو جێگر و هاوڕێمە هەروا کەسێکە بابەتە رەوەشتییەکانم زوو بیر دەهێنێتەوە.

"بەڵێ تۆ ڕاست دەکەی".

دەرگەمان بۆ چەند خولەکێك داخست، نوێژمان کرد، جـەنگێك چـاوەڕێمانە، بەڵام ئێستا ماوەیەکی جیاکەرەوەیە ئەگەر خـودا لەتـەك ئێمـەدا بـێ، ئەمـەش ڕزگاریمانە، ئێمە لەنزیك ئەوەین هەزاران کەس لە دوژمنـەکان بنێـرن بـۆ دۆزەخ، ناشمەوێ لەوێدا بیان بینم.

ئەو چەند وشەیەی جۆن بوو بەسەرچاوە بۆ خوێندن بۆیە لـە سـاڵانی ڕابـردوو کاتێك وانەم لە زانکۆکان بە قوتابیان گوتەوە یان بە ڕاهێنەرانی سی ئـای ئـەی و سەربازەکان رادەگەیەنم، لەگەڵ ئەوەی بۆچوونێکی لاهوتی نییە، بەڵکو نموونەیەکە لە کاری جەنگ، پێویستە خۆت بناسیت، هەر کاتێك خـۆت و تـیم و وڵاتەکـەت ناسی ئەوا باشترە، بەو شێوەیە بەباشی دەتوانیت هاوڕێ و دوژمن دیـاری بکـەیت لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا، هاوکات سن —تزوش ئەوەی دەزانی.

لەپێشتردا ئەو جۆرە نموونە هەڵچوونانەم دەزانی، کە گەدەت گەمارۆ دەدا، لە هەستم ماوە ئەمە زۆر بەهێزترە لە هەموو ئەو وانانەی لە هۆڵ و پۆلی زانکۆکـان دەیخوێنین یان ئەو وشـانەی لەلاپەڕیەکدایـە، مـن ڕێنوێنییـەکانی گـەورە پیـاوان وەرگرتبوو، کەچی کاتێك پراکتیکی دەکەیت مانای گەلێك زیاترە، نموونەکانیشـم زۆر قورس بوونە، من زۆری نەماوە شتی زیاتر فێر ببم.

ئەو کاتە لە نووسینگە بووم کاتێك عەقید کلارك سەری لـە دەرگـاوە هێنـا ژوورەوە و پەنجەی بۆ سەرەوە بەرز کردەوە، ئێستا بۆمبەکانی ئـەمریکی ئاسمـانی ئـەفغانی گرتۆتـەوە، فرۆکەوانـەکانیش زۆر بـەوردی پشـت بـە ئاراسـتەکانی هەواڵگرییەکان دەکەن، تا جبەخانـەکانیان لـە دوژمنێکـی نـەزان بـەتاڵ بکـەن، دوژمنەکان بێ ئەوەی خۆیان ئامادە بکەن، خۆیان وەك دڕندە نیشان دەدەن.

# بەشی دەیەم

# ئۆپراسیۆنەکان لە ئەفغانستان

ناکرێ دە لەسەدی ئەوانەی بۆمان دەنێرن هەموویان لێرە بن، هەشتا لەسەدا تەنیا ئامانجن، هەروا نۆ لە جەنگاوەرەکان لەگەڵمانن، چونکە ئەوانە بۆ شەڕ هاتوونەتە کایەوە، ئای، باشە ئەی سەبارەت بە یەکێك کە ماوە؟ ئەو جەنگاوەرە، ئەو ئەوانی دیکە دەهێنێتەوە.

---

وتەی کەسێکی نەناسراوە، کەچی بۆ هێرکلیتس نووسراوە.

---

هێرشی ئاسمانی زۆر وێرانکەر بوو، فرۆکەوانە ئەمریکییەکان لە نێوەندی سێ ڕۆژدا واتە لە حەوتی تشرینی یەکەمی ٢٠٠١ لە زۆربەی ئامانجەکانی قاعیـدە و تالیبانیان دا، لەنێو ئەو ئامانجانەشدا لە سیستەمی کۆنی بـەرگریی ئاسمانیانـدا، هاوکات هەموو مۆڵگەکانی دوژمن و بنکەی سەرکردایەتی و وێستگە و قـەڵاکان بوونە وێرانەیەك، زۆربەی یەکەکانی پێشەوەی دوژمن بەتەواوی لەناوبرا، زیاتریش بەچڕی جەختمان لـە بنکـەی سـەرکردایەتی و جـەنگاوەرە بیانییـەکانی دوژمـن دەکردەوە، ئەوان سەختییەکی زۆریان بینی.

لە ڕۆژی چـوارەمدا پنتـاگۆن نـاڕازی بـوو لـەوەی هـیچ شـوێنێك نییـە تـا بۆمبارانی بکەن، بۆیە داوایان کرد بەچڕی کاری هەواڵگری زیاد بکەن تا ئامـانجی ئاسایی بگرێتـەوە، ئێمـەش ئـەوەمان ڕوونکـردەوە ئـەمکارە مەحاڵـە، چـونکە هەمووی وێران کراوە، ئەمەش وای کرد وەزارەتی بـەرگری بیانـەوێ مقۆمقۆمـان لەگەڵدا بکەن، بۆ ئەمەش بنکەی سەرکردایەتی ناوەندی و سەرکردایەتی هاوشـی ئۆپراسیۆنی تایبەت خۆیان لەگەڵ ئەو حاڵەتە بگونجێنن، سـەرکردەکانی پنتـاگۆن هەردەم نموونەی شەڕەکانیان دەهێنایەوە لـەنێوان دوو دەوڵەتـدا، ئـەوان تـەنیا وا سەیری سەیری سەرکەوتنیان دەکـرد، تـەنیا ئامانجـەکان وێـران بکـەن، هـەردەم لەنێوەندی گواستنەوەی جوگرافی گۆڕەپانی جەنگدا دەگەڕان، ئەوان نەیان دەزانـی بنکەی گواستنەوە تەنیا لە هەستونەستی ئەفغانییەکانە.

چوار هۆ هەبوو بۆ ئەو هەڵمەتە خێراییەی ئاسمانی، یەکـەمیان دیـاریکردنی ئامانجە ئاساییەکان، چونکە ئەفغانستان لەنێو وڵاتانـدا پاشـکەوتووترین وڵاتـە، کەچی سیستەمی بەرگری هەیە بەڵام پێشکەوتوو نییە، کاتێك هێرشکرا ژێرخانی

هەموو ئەفغانستان وێران بوو. دووەم سیستەمی بەرگری ئاسمانی دوژمن زۆر کۆن بوو و شایەنی ئەوە نەبوو ببێتە هەڕەشە. سێیەم هەڵمەتی ئاسمانی ئەمریکی وردترین هێرش بوو لە مێژووی جەنگەکاندا ئەمەش بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و کارابیەکان. چوارەم خاڵیش فرۆکەوانەکان زۆر بەوردی ئامانجاکانیان دەزانی، هەموو ئەمانەش بە هۆی هەواڵگرییەوە بوو، چونکە ئێمە نەخشەی سیحریمان کێشا بۆ سیستەمی زانیاری جوگرافی، ئامانجەکان ئەو یەکە و پێکهاتانەی دوژمن بوون لە بەرەی پێشەوە دابوون بەتایبەتی بەدرێژایی دەشتەکانی باکوور، جگە لە مۆڵگەکانی تاڵیبان لە قووڵایی شاری قەندەهاردا، هەموو کارە هەواڵگرییەکان بە هۆی لێزەرەوە دەستنیشان کرا، بەمەش ئاستی ئاسمانی و زەوی باش بوو.

هاوپەیمانە خێڵەکانی ئەفغانستان و سیخوڕە تاکلایەنەکان رۆڵێکی بەرچاویان هەبوو بۆ دەستنیشانکردنی ئامانجەکان، بەمەش لە هەموو لایەکی وڵاتەوە ئامانجەکانیان دیاری کردبوو، زۆرجاریش لەنێو سەربازگەکانی دوژمندا، ئەوە جگە لەوەی چەند لایەنێکی هونەری خراپ بوون لە هەوڵی هەموو هەواڵگرەکان، پێیان وابوو ئەو ئامێرانەی بەدەست ئەفغانییەکان بوو بەراستی بەکاری ناهێنن، چونکە وێنە و راپۆرتی هەموو شتێکیان دەنارد، ئەمەش تێکەڵییەك بوو لەنێو داتاکان، زۆربەی داتاکانیش پێویست نەبوون کاتێك دیاریان کردبوو سیستەمی شوێنەکان، پەنامان بردەبەر ئەو تەکنیکارانەی سیستەمەکانیان هەموار دەکردەوە، تا سیخوڕەکانمان نەتوانن پل بەهیچ دوگمەیەك دابگرن تا سیستەمی جوگرافیای شوێن داتای جوگرافی ئەو شوێنە بەوردی تۆمار بکات، بەشێوەیەك شوێنی دوژمن جیا بکرێتەوە تا بۆمباران بکرێ، ئەمە سەرکەوتوو بوو، کاتێك سیخوڕ دەچووە ناون دوژمن تەنیا یەك دوگمەی دادەگرت و داتا جوگرافیەکانی تۆمار

دەکرد، دواتر دەچووە شوێنی ئەفسەری سی ئای ئەی تا داتاکان بچەسپێنن و بدرێ بە سیاسەتمەداران لەپاشاندا بدرێ بەو فرۆکەوانانەی مووشەکەکان دەهاوێژن.

ئەو هێزە تایبەتەی کە پەیوەندی بەسی ئای ئەیەوە کرد ئامارەکانی لێزەری دادەنا بۆ زیاتر رووناککردنەوەی درێژایی بەرەی جەنگ، هەروا چاودێرە پێشکەوتووەکان بەراستەوخۆیی پەیوەندییان بە هێزەکانی تایبەت دەکرد تا بتوانن هێرشی ئاسمانی دەست پێ بکەن، هاوکات بریداتۆر کە ئامێری لێزەری بۆ دانرابوو بۆ رووناککردنەوەی شوێنەکان هەموو بۆمبارانەکانی بە ڤیدیۆ گرتبوو ئێمەش بۆ هەواڵگریەکان ناردمان بەتایبەتیش بۆ کرپارە سیاسییەکان، کەچی ئەوان دەیانویست هەواڵگری بەهێزتر بێ و زانیاری زیاتر بدەن. هەموویان دەیان ویست هەر لە سەرۆکەوە تا سەربازەکانی نزیك هێرات تا دەگاتە باڵیۆزی ئەمریکی لە ئیسلام ئاباد، هەواڵگری زیاتریان دەویست هەر لە هێرشە تەکتیکییەکانەوە تا دەگاتە یاری سیاسییە ستراتیژییە بچووکەکان.

بریداتۆر رۆڵێکی زۆر خێرای بینی لەنێوەندی هەموو هێرشەکاندا، ئەمەو توانیمان تەکتیکی فرۆکە بێ فرۆکەوانەکان باشتر بکەین، بەپێی ئەوەی پێویستمانە، لەلایەکی دیکەوە بنکەی سەرکرداتیمان لەم رۆژانە دەست دەکات بە هێرشی مووشەکی، ئەمەش هەمووی بە هۆی بریداتۆر، کە لە سەردەمی سۆفیەتدا توانی بووی زۆر کار بکات، واتە لە حەفتاکانەوە تا ئێستا، ئێستاش رادارەکانی تالیبان کە زۆر کۆنن، ناتوانن بیبینن.

من و ماسی لەگەڵ تیمی بریداتۆر لە بنکەی سەرکردایەتی سەیری شاشە رووناکەکەمان دەکرد، کەچی نزیکەی ٢٥ کەسمان لە خۆمان کۆکردبۆوە، بەشێکیان وەك خواستراو لە ئاژانسەکانی حکومی، زیاتریش باسیان لە

شیکردنەوەکان دەکرد، هەروا جەختیان لە وردی هەوالگری دەکردەوە کە رۆلێکی بەرچاوی هەیە لەم کارەدا، چەندین بابەتیان خستە روو و هەموو سەرچاوەکانیان باس کرد، تا بیدەن بە تیمی برایداۆر، من و جۆن چاودێریمان دەکردن، ئێمەش بەدوای هەلێکی نوێدا دەگەرێین.

چاودێری رادارەکانمان دەکرد، لەو کاتەی دەسورا.

یەکێك لە شیکەرەوەکان گوتی "ئەوە دەیەوێ روو لە بالندەکەمان بکات".

یەکێك لە سەرۆکی تیمەکانیش هەلێدایەوە و گوتی" دەبێ بەسیخوری خۆمان بشارینەوە دەنا دەیهێننە خواروە".

گوتم : "نا چاودێری بکەن".

"گەورەم فرۆکەکەیەکی مێگ لە شوێنی خۆی، لە فرۆکەخانەی ئەو نزیکانە، دەیەوێ بفرێ".

دووبارەم کردەوە "چاودێری بکەن".

چاودێری مێگەکەمان کرد کە بەخێرایی بەرەو ئاسمان دەفرێ و بەرز دەبێتەوە.

یەکێك گوتی "ئەی ئەگەر ئێمەیان هێنا خوارەوە؟".

یەکسەر رێنماییەکانی خۆم دا بە هەوالگری، تا فرۆکەیەك هەلبسێنێ، کە بەهاکەی زۆر زۆرترە لە فرۆکەکە بێ فرۆکەوانەکەمان، بەو شێوەیە راستەوخۆ لەسەرووییەوە فری.

چاودێری رادارەکەمان تا ئەو کاتە دەسوڕێ و دەنگی چـریکە چـریکەی دێ، کە دەیویست لە بریداتۆر نزیك بێتەوە، لەم کاتەدا فرۆکەی دوژمن زۆر بـەخێرایی تێپەڕی بەبێ ئەوەی رێگـە بـدات فرۆکـەی ئێمـە رێگـری بـێ، جـارێکی دیکـە هەولێدایەوە و هەڵەی کرد، بە هۆی کۆنی فرۆکەکەی نـەیتوانی بـەدوای فرۆکـەی ئێمەوە بێ، بینیمان دوژمن چۆن رووخاوە و دەیەوێ وەڵاممان بداتـەوە، لەمـەوەش هـەموو ئـەو ڤیدیۆیانـەمان تۆمـار کـرد کاتێـك بریـداتۆر و رادار و بنکـەی سەرکردایەتی و فرۆکەوانەکەی مێگ چـی دەکـات، بەراسـتی هەواڵگرییـەکانمان شاکارن.

گوتم " کارێکی چاکتان کرد، هەموو شتەکانم بۆ بنێرن تا بیدەین بە کرِیـارە سەربازەکان".

لەدواتردا ماسی گوتی :" دەزانی هیچ فرۆکەوانێك ناتوانێ ئەمە بکات".

لێم پرسی "چی بکات".

"سوڕانی رادارەکە، ئەمەش ترسناکییە بۆ فرۆکەکەمان".

"ئەمە سوودی بۆ ئەوە هەیە، بۆ جاری یەکەم بەکاری دەهێنین، ئێمە نـازانین چی لەمە باشترە".

ئەمە بۆ جاری یەکەم فرۆکەیەکی بێ فرۆکـەوان تـا سیسـتەمی تۆمـارکردن بەدەستبێنێ بۆ بەرپەرچدانەوە، هیچ کاتێك پلان بۆ ئەوە دانەنرابوو، تـەنیاش بـۆ قۆزتنەوەی هەلی کۆکردنەوەی هەواڵگری بەکارمان هێنا.

بە هۆی بریداتۆر توانیمان پشت بە وزەی جولە ببەستین، تا بە هەموو جۆرێك بزانین کاردانەوی دوژمن چییە، لە رێگەی ئەمەوە توانیمـان مووشـەکی هلفایـەر

بهاوێژین بۆ سەر ئۆتۆمبیلێكی پێك ئاپ یان جەنگاوەرێكی دوژمن دەست نیشان بكەین لێی دەین، بەمەش بریداتۆر توانی وەك بنكەیەكی بێ چەك ببێتە بنكەیەك بۆ هەموو هەواڵگرییەكانمان.

ئێوارەی بیست تشرینی یەكەم فرۆكەی بریداتۆری بێ چەك بفرێنین بەسەر باشووری ئەفغانستاندا، چاودێری فرۆكەكەم كرد كە بێ فرۆكەوانە، كاتێكیش فرۆكەكە دابەزی لەناوەڕاستی ناوچەی تاڵیبان بوو، ئەمەش هەنگاوێكی بوێرانە بوو، هاوكات لەو كاتەدا بەرگریەكی كەمیان مابوو، بۆیە من و سوویا ڤیدیۆیەكەمان بینی.

لەلایەكی دیكەوە تیمێك لە سەركردایەتیی هاوبەشی ئۆپراسیۆنی تایبەت بەشێوەیەكی هاوسەنگ دەستان بە جوولە كرد، كاتێك لەناو هەلیكۆپتەری تشینۆك ئی ئێچ ٤٧ دابوون، هەروا لە باكووریشەوە هەڵگری فرۆكەكان كیتی هۆك لە زەریای هیندی بوون و ئێستا بیابانی بڕی بەرەو قەندەهار دێ، لەم كاتەدا سەركردایەتی ناوەندی بەو پێیەی باڵی تاكلایەنی شاراوەیە یان باڵی ئۆپراسیۆنە رەشەكانە، هێرشی كردە سەر بارەگای مەلا عومەری سەركردەی تاڵیبان، كەچی هەواڵگرییەكانمان ئاماژەیان بەوە دا مەلا عومەر لەو شوێنەدا نییە، لەوانەیە چەند سەركردەیەكی دیكەی تاڵیبان لەوێدا بن، هەرچۆنێك ئەمە لێدانێكی توند دژ بە دوژمن.

هاوكات بۆ جارێكی دیكە بریداتۆر لەپێش فرۆكەكانی تیشۆك فڕی، كە كۆماندۆسی تیادا بوو، یەكێك لە شیكەرەوەكان ئەوەی ئاشكرا كرد كە یەكێك لە فرۆكەكانمان لەسەرووی چیایەكی بەرزدایە، هەروا لەو شوێنەدا چەكێكی دوور هاوێژی سۆفیەتی تەقە دەكات و لە دوو لوولەوە ئاگر بارانی ئەو ناوچەیەی كردووە

و کاراشـە دژ بـە فرۆکـەکان بەتایبـەتی ئـەو فرۆکانـەی لەنزمیـدان، هـەموو زانیارییەکانمان ئاراستەی سـەرکردایەتیی هاوبەشـی ئۆپراسـیۆنە تایبەتییـەکان و تیمی کۆماندۆس کرد، کە چەند خولەکێك لەو شوێنەوە دوورن.

یەکێك لە ئەفسەرانی پەیوەندی گوتی "لەناوی بەرن"

من لەبەرامبەر شاشەکەدا بووم، لەو کاتەدا مووشـەکێکی هلفایـەر لەسـەر بەردێکی گەورەی نزیك ئەمانجەکە تەقیـەوە، ئـەم هاوێشـتنەش هەڵەیـەك بـوو، چونکە دەمان ویست لە خودی ئامانجە بدات.

نەفرەت، کەسێك بەچرپەوە وای گوت، لەپاشاندا هەمووان بێـدەنگ بـووین، ئەگەر ئەمە لەناو نەبەین ئەوا هێرشبەرانی ئاسمانی دەبێ کارێـك بکـەن، کاتێـك سەیری شاشەکەم دەکرد ئەوەم زانی ئەمەو فرۆکەکان ڕێڕەوی خۆیان گۆڕی، بـەڵام لەوانەیە بەرامبەر ترسناکی ببنەوە و ڕێگری بکات لە کاتەکانیان.

ئەو ڤیدیۆیەم بینی کاتێك بریداتۆر پەخشی دەکرد، کاتێك هلفایەر بەهێمنی لە تۆپە دوورهاوێژەکە دەدا، لەو کاتەی مووشەکێکی دیکەی هلفایەر ئامانجەکەی پێ کا، ئەمەش بووە هـۆی ئـەوەی تەقینەوەیـەکی گـەورە بێتەکایـەوە، هەرچـی جبەخانەی ۲۳ ملیم هەبوو تەقییەوە.

بریـداتۆر بەراسـتی شـاکار بـوو چـونکە هـەموو ڕووبەڕووبوونـەوەکانی بەشـێوەیەکی تـەکیکی نیشـان دەدایـن، لـەم تەکنەلۆژیایـەش گـرنگتر تیمـی هەواڵگریمان بوو کە ئەمەی داهێناوە، ئەگـەر ئـەوان نـەبووان ئـەو فرۆکەیـە بـێ فرۆکەوانە تەنیا لە شوێنێکدا بۆگەنی دەکرد.

سەیری هۆڵەکەم کرد کە دەیان کارمەند و تەکنیکار و شیکەرەوە بە جۆشوخرۆش، بەشێوەیەك ژنان و پیاوانی مەدەنی و سەربازی لە ئێستادا وەرچەرخان بە جەنگەکە دەکەن.

ئەو هەواڵە خۆشەمان بە سەرکردایەتی هاوبەشی ئۆپراسیۆنی تایبەت ڕاگەیاند، لەپاش چەند خولەکێك لە تەقینەوەی تۆپ هاوێژەکە هەموو هێرشبەران بەرەو مۆڵگەی مەلا عومەر دەڕۆن، ئەو شوێنە هیچ بەرگرییەکی تیادا نەما، هیچ هەواڵگرییەکی بەهاداریان پێ نەگەیشت، بەڵام کاتێك ڤیدیۆیە لە هەموو جیهان پەخشکرا و بینیان کۆماندۆسەکان بەرەو قەندەهار و بارەگای مەلا عومەر دەڕۆن، ئەمە بووە شۆك لەلای تاڵیبان، زۆر بەوە تێکچوون کاتێك سەربازی ئەمریکی دەیەوێ بەو خێراییە بچێتە ناو شوێنی داڵدەکەیان، لەمەوەش تاڵیبانییەکان پرسیاری ئەوەیان دەکرد: هاوپەیمانەکانیان چیان لە قاعیدە کردووە؟ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دواتردا چی دەکەن؟ کەی و لەکوێ؟

ترسناکییەکانی دوژمن زیاتر دەبوو کاتێك پشتگیری هەواڵگریمان زیاتر دەبوو لەتەك کاری شاراوەی سەرکردایەتی هاوبەشی ئۆپرۆاسیۆنی تایبەت، زۆری نەبرد کۆمانۆس چەندین ئۆپراسیۆنی ئەنجام دا بەبێ ئەوەی هەڕەشەیان لەسەر بێ.

لە زۆربەی سەرچاوە هەواڵگرییە مرۆییەکان زانیمان، کە زۆرێك لە ئەفغانییەکان پێشوازیان بە هێرشە وردەکان کردووە بۆ سەر جەنگاوەرە بیانییەکان، بەبێ ئەوەی زیانی بەلایەکانی دیکە بکەوێت، پێیان وابوو هێرشی ئەمریکی هێزێکی داپلۆسەر نییە بەرامبەر بەوان، بەتایبەتی دوای ئەوەی لەلایەن داگیرکاری سۆفیەتییەوە زوڵمیان زۆر لێ کراوە و لەپاشاندا تووشی جەنگی ناوخۆیی هاتوون، لە کاتێکدا ئێستا بینیان بەخێرایی و بەشاراوەیی مووشەکباران

کراون، بۆ ئەمەش زۆرێك لە ئەفغانییەکان پێیان وایە ئەمریکییەکان هاوپەیمانێکن جێگەی متمانەن، چونکە ئێمە ئەوانە لەناو دەبەین کە بیانیین و لەگەڵ تالیبانـدا دەژین، هاوکات هیچ جۆرە بریندار و کوشتنێك لەنێوەندی مەدەنییەکانـدا بـوونی نەبوو، بێگومان ئەفغانییەکان سـەبارەت بـە فرۆکـەی بریـداتۆری بـێ فرۆکـەوان شتێکیان نەزانیووە، هەروا سەبارەت بە سیستەمی دانانی بۆمب نـەیان زانیـووە، جگە لەو جبەخانانەی بە لیزەر ئاراستە دەکرێن، بۆ ئەمەش هەر کاتێك ویلایەتـە یەکگرتووەکان ویستی ئۆتۆمبێلێکی پڕ لەجەنگاوەری قاعیدە دەتەقێنێتەوە.

هەوڵمان دەدا کارەکانمان باشـتر بکـەین، لـەپاش شـیکردنەوە ئـەوەمان پـێ ڕاگەیەندرا کە هەندێك لەو جەنگاوەرانە لەناو پیـك ئەپەکـە دابـوون، بەشـێکیان ڕزگاریان بووە، لە شاشە دەمان بینی زۆربەیان بریندارن و خۆیان دوور دەخەنـەوە، ئەمەش لەلای ئێمە پەسەند نییە، ئێمە دەمان ویست چالاکتر بین کاتێك ئامانجێك دەکەینە خاڵی لێدانەکانمان.

داوای یارمەتیمان لە خانەنشینەکان کرد بەتایبـەتیش لـە تشـاك بـوم بـوم، یەکسەر زانی گرفتەکەمان چییە، بەخێرایی گەڕایەوە وێنەی داتایـەکی پـێ بـوو، ئەمەو دیزانییەکە زۆر جوان و ساکار بوو، بۆ ئەمـەش وێنـەی سـەرە کانزایـەکی نیشاندایین بە قەبارەی چارەگە دۆلارێك کە لەسەر سەرە بۆمبـەکان دەخـزی، ئـەم هەمووارکردنە بەخێرایی و ئاسان ئەنجام دەدرێ، بۆ ئەمەش بوم بـوم باسـی زیـاتر کاراکردنی ٢٥ لەسەدا کرد، بەمـەش دەتوانـدرێ تیشـەکە کوشـتن لەوانەیـە ٢٥ لەسەر زیاتر بکرێ.

بۆ ماوەی هەفتەیەك توانیمان سەرە کارایی لەسەر بۆمبەکان دابنێین، چـەند لێدانێکمان شیکردەوە و بینیمان قسەی بوم بوم تەواوە و کەس ڕزگاری نەبووە.

چەکەکانمان بەوە جیا دەکرایەوە کە خەرجییەکانی کەمە و جێگەی سەرنج نییە، بەتایبەتی کاتێك هەواڵگریمان شتێکی نوێ ئاشکرا دەکات و ئێمەش لە ئامانجە چەسپاوەکانمان دەدا بەڵام بەهایەکی زۆری هەبوو، بۆیە جەنگ وەك پێشتر نییە.

## لەبڵاوبوونەوەدا

هەڵمەتە ئاسمانییەکە زۆر بەراستی جێگەی خۆی گرت، بۆ ئەمەش ئۆپرۆاسیۆنە مەیدانییەکان بەهێمنی بەڕێوە دەچوو، من پێویستم بەوە بوو سەردانی ئەفغانستان بکەم تا راوێژ لەگەڵ هاوپەیمانە ئەفغانییەکان بکەم.

شەش هەفتەی بەسەرچووە شرۆن لە پنچشیرە، ئەو ئێستا بنەمای هێرشێك بۆ سەر کابوول و ناوچەکانی دەوروبەری دادەنێ، هەروا هێزەکانی بەرەی یەکگرتوو لە باشوور هاوبەشن بۆ چوونە ناو قندۆز لە رێگەی چیاکانی رۆژهەڵاتەوە، ئەمەو تیمەکەی ئامادەکردووە، ئەو تیمەش ناوی نراوە شکێنەری سەرەکان، تا رێگە خۆش بکەن بەرامبەر تیمی بژاردەی هێزی تایبەتی ئەمریکی کە ژمارەکەی ٥٥٥، کە ناونراوە بە سێ شکێنەرەکە، هەروا پیاوانی تیمی پێنجەم لە بنکەی کارشیخان ئاباد و لە قووڵایی پنچشیر، هەردوو تیمەکە ئێستا زیاتر بەچڕی وەکە تیمی گەڕان لە دەوروبەری دەشتەکانی باکوورن.

تیمی شکێنەری سەرەکان پێویستیان بە جبەخانەی سی ئای ئەی هەیە، هەروا شێوەی فەرمانڕەوایی بگۆڕن، بۆ ئەوەش شرۆن پێکهاتەیەکی دانا وەك دانانی ئەفسەری ئۆپۆاسیۆنی کە شارەزا بێ لە باشووری ئاسیا، ئەمەش تاکە بژاردەیەکە تا ئەو یەکەم کەس بێ بچێتە ناو ئەفغانستان لە پاش ١١-٩، دیارە بۆ تێگەیشتن

لە ڕێگەکە پێویستیان بە یارمەتیی سی ئای ئەی هەیە. لەم ڕووەوە هاوکاریان کردین تا هەڵمەتەکە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستان دەست پێ بکەن. یارمەتیی سی ئای ئەی کە من یەکێك بووم لەوان، متمانە و پێشبینی ئەوەمان دەکرد تالیبان بڕووخێت، ئەگەر هاتوو بە هەماهەنگی هێرشی ئاسمانی چڕ هێرش بەرین، لە پیادەشدا هێزی بەرەی یەکگرتوو هەنگاو بهاوێن، بۆ ئەمەش شرۆم هانی هاوپەیمانە ئەفغانییەکانی دەدا، هەروا کاری بۆ چارەسەرکردنی هەموو ترسەکانیان کرد، وەك فەهیم و زۆری دیکەی سەرکردەکانی بەرەی یەکگرتوو کە بەهێمنی لەتەك هەموو تیمەکانی سی ئای ئەی و هێزی تایبەت مامەڵە بکەن، کە لە ڕێگەی پنچشیرەوە هاتوونەتە نێو ئەفغانستان، چونکە ئەوەی دەبینـدرێ بەرەی یەکگرتوو وەك کیانێك مامەڵەی دەکرد واتە دەوڵەتێکی نەتەوەیی، دەبوایە ڕازی بوایە لە هەر چوونەژوورێك، دەیان ویست بنکەکانیان لەپنچشیر وەك خاڵی پشکنین و سنووری لێ بکەن، کاتێك لە هەر جێیەك بمان ویستبایە بڵاوە بکەین، ئەم هەوڵەشیان پڕوپووچە بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتیان.

شرۆن لە پەیوەندییەکدا ئەمەی پێ ڕاگەیاندم، منیش پێم گوت نابی بوار بەم شتە بدرێ چونکە هیچ مانایەکی نییە لەڕووی کردەیی و لوجیستی و سیاسی، شرۆن ئەمەی دەزانی، بەڵام ئەمە هاوپەیمانەکان دڵخۆش ناکات، دەکرێ ئەم بابە زیاتر گفتوگۆی لەسەر بکرێ، بەڵام ئەوان دەیانەوێ چی بکەن؟ ئایا داوامان لێ دەکەن نەچینە ژوورەوە؟ ئایا دەیانەوێ بمان وەستێنن؟ ئەوان چەندین ساڵە لەگەڵ تالیبان دەجەنگن، ئێستاش کاتی هاتووە تا سەرکەوتن بەدەست بێنن، لەمەوەش زانیم هاوپەیمانەکانمان دەیانەوێ دەستیان بە هەموو شتێك بگات، بەڵام ئەم هەواڵدانە تەنیا گەمژەیەکی پەسەندکراوە، لەگەڵ شرۆن بۆچوونەکانمان ئاڵوگۆڕ

کرد، ئەویش لە ڕێگەی خۆیەوە زۆر بەڕێزەوە بۆ هاوپەیمانـەکانمانی شـی کـردەوە، وەك ئەوەی پێویست بوو.

ئێستا ئێمە پێویستیمان بە برنتسن هەیە تا بەگیانێکی سەگانە بجەنگیّ، ئەو سەرکردایەتی شکێنەری سەرەکان دەکات، دەم ویست سەرکردایەتیمان بکـات بـۆ کابوول و دوورتر، ئەو کاتەی برنتس دەچـێتە نـاو هاوپەیمانـە ئەفغانییـەکان ئـەو ناوەستیّ.

تیمی ئەلفا لەو کاتەدا لە باشووری مەزار شەریفدا بوو، هاوکات پێویستی بە چەند ئەفسەرێکی سی ئای ئەی و کەسانی دیکە بوو، ئەوە جگە لە تیمـی هێـزی تایبەت، چونکە لەم چەندە هەفتەی رابردوودا بە هۆی سەرماسـۆڵەوە ڕێگـەکانمان گیرا بوو، رامسفێڵد بەمە شێت بوو، لە کاتێکدا پیاوانی سی ئای ئەی لە مەیدانن بەبیّ پیاوانی ئەو، ئەمەم لە هاوڕێیەکانم زانی کە لەتامبا بوو، بەوەی رامسـفێڵد پەیوەندی بە سەرۆکی کۆمەڵەی پێنجەم کرد کە لـەنێو هێـزی تایبـەت بـوون لـە ئۆزپاکستان، هەروا پەیوەندی بە جۆن موڵهۆند کرد تا ئاگاداری بکاتەوە کـە ئـەو بەرپرسە لە حاڵەتی کەشەکە.

لەپاش مانگێك لە بوونم لە بارەگای سەرکردایەتی سی ئای ئەی تا سەیرێکی بڵاوبوونەوەکە بکەم، هەروا پێویستم بەوە بـوو تـا کۆبوونـەوە لەگـەڵ هاوپەیمانـە ئەفغانییەکان بکەم، هەروا پیاوانمان لەسەر زەوی ببینم، هەروا بیرم لەوە دەکردەوە بە ماوەی سیّ ساڵ چۆن قاعیدە لە ئەفغانستان دەڕوخیّ.

جەنەراڵ فرانکس پلانی دانا بۆ گەشتێك تا چاوی بکـەویّ بـە سـەرکردەکانی بەرەی یەکگرتوو بەتایبەتیش جەنەراڵ محەمەد فەهیم لە دوشـەنبێی تاجیکسـتان، هەردووکمان ڕێگە باشـەکانمان هەڵبـژارد تـا لەگـەڵ ئەفغانییـەکان چـۆن بتـوانین

ئامانجەکانمان بپێکین، پێم ڕاگەیاند من پێویستە بچمە ناو ئەفغانستان، هەروا لــە کۆبوونەوەکەدا لەگەڵ فەهیم باسم لەوە کرد کە ئێمە هەواڵگری و پــارە و وەرگێــڕ بۆ کۆبوونەوەکە دەهێنین، هەروا سەرکردایەتی ناوەندی شــتەکانی دیکــە بهێنــێ، وەك ئامرازی گواستنەوەم بۆ ئەفغانستان.

جەنەراڵ فرانکس داوای لە یەکێك لە پیاوە گەورەکانی ئەرکان کرد تا یاوەری بێ بۆ ئەفغانستان، منیش جەنەراڵ گاری هاریلم دەستنیشان کرد، کــە لــە ســاڵی رابردوودا لە یەمەن کارم لەگەڵ کردووە، بۆ ئەمەش فرانکس ئەمیرال برت کالاندی دەستنیشان کرد ئەو یەکێکە لە بەرزترین پیاوانی مغاویری دەریایی و لە هەمووان پلەی بەرزترە، تەنیا جارێکی دیکە بینیوومە ئەو کاتەی ســەردانی تامبــام کــرد، ئەوەش سەلماندی ئەم دەسنیشانکردنە زۆر باشە.

پێویستمان بە تیمی برنتس و جبەخانە و تیمی شکێنەری سەر و تیمی ئەلفا بوو، باشترین ڕێگەش بەکارهێنانی فرۆکەی گۆلفستریم کە تا دۆشنبێ دەمانبا.

سیندی بە ئۆتۆمبیلەکەی منی بردە فرۆکەخانــە، تــا ئــەو شــوێنەی تیایــدا ســواری فرۆکــە تایبەتییەکــە بــووین، فرمێســکی لــە چــاوانی قــەتیس مــابوو و نەیدەزانی چی بڵێت تەنیا باوەشــی پیــاکردم و ماچــی کــردم، پــێم ڕاگەیانــد دوو هەفتەم پێ دەچێ، لەپێشتریشدا بە کوڕەکانم گوت من دەچمە ئەفغانستان، ئێستا هەموویان چوونەتەوە قوتابخانە دوای ئەوەی بەخێرایی لەدەرەوەدا گەڕاینــەوە، دەم ویســت ئــەوەیان لێ بشــارمەوە، بــەڵام ئــەوان لــە کۆتاییــدا زیــرەکن، بینیــان جلوبەرگەکانم کۆدەکەمەوە تا بچمە ســەرووی چــیایە بــەرزەکان، پــیم ڕاگەیانــدن پێویستە لەگەڵ کێشەکانتان مامەڵە بکــەن، هــەروا باســی هــیچ نەکــەن چــونکە پێویستە نهێنییەکان بپارێزن وەك بوونی ئاسایشێك، باسیش لەوە بکەنەوە کە بــۆ

جارێکی دیکە داماندەمەزرێنن لە یەکێك لەوڵاتەکان، سیندی بینی کاتێـك دوور دەکەوتەوە، هەستم بەوە کرد کە ژنێکی بەهێزە و منیش ئەوم خۆش دەوێ.

چوومە لای پیاوەکانی سی ئای ئەی کە هەموویان لەسەر پلیکانەکـە کۆبـوو بوونەوە، هەموو شتەکان باش بوو تەنیا دوو گەنج نەبێ چـۆرێك لـە دڵـەڕاوکێیان پێوە دیار بوو، یەکەمیان وای کرد دڵەڕاوکێ لای ئەوی دیکە زیاتر بـێ، ئەمـەش شتێکی ئاساییە چونکە ئەمانە هێزێکی نیمچە سـەربازین و سـەر بـە سـی ئـای ئەین، هەردەم شانازی بەوە دەکەن کە گوێ نادەنە هیچ.

لە هەردووکیانم پرسی "گرفت هەیە؟".

"پزیشکەکەمان ئەوەی لە وەزارەتی بەرگری دەرکراوە هاتۆتە نـاو سـی ئـای ئەی بەدرەنگ کەوتووە و چاوەڕێی ڕێپێدانین تا پەیوەندی بکات".

"چ ڕێگەپێدانێك؟ ئەو لەگەڵ سی ئای ئەیە با بڕۆین".

"نەخێر قوربان کارەکە وا ئاسان نییە، پێویسـتە وەزیـر ڕەزامەنـدی لەسـەر دەربڕێ".

"وەزیر، وەزیری بەرگری"، ئەمـەم زۆر پێ ناخۆش بوو.

"بەڵێ قوربان، هەرنا نووسینگەکەی دەبێ ڕەزامەند بێ".

"کەواتە تەلەفۆنیان بۆ بکەن".

"قوربان پەیوەنـدیمان کـرد، ئێمـە بـۆ مـاوەی دوو هەفتەیـە کـاری لەسـەر دەکەین".

لەو ماوەیەدا زەنگی تەلەفۆنەکەم لێی دا و گفتوگۆیەکی ناخۆشمان ئەنجام دا.

"قوربان، نەمانتوانی ڕەزامەندی وەربگرین".

"پێدەچێ ئێوە گاڵتەم لەگەڵدا دەکەن".

"نەخێر قوربان، نووسینگەی وەزیر ڕێگەپێدانی ڕەت کردەوە تـا پەیوەنـدیمان پێوە بکات".

پرسیم " بۆچی؟"

"نازانم قوربان".

هەمووومان پێمان ناخۆش بوو بەتایبەتیش پزیشکەکە، بەڵام نەم دەزانی چـی بکەم، بۆیە هەمووومان چووینە ناو فرۆکەکە و پزیشکەکەمان بەجێما.

لە کورسی خۆم دانیشتم و خۆم بەستایەوە، فرۆکەکە دەستی بە جووڵە کـرد، لەوێدا پرسیارم لە خۆم کرد خوایە چۆن ئەو شەڕە دەبەینەوە، کە وەزارەتی بەرگری ئەو جۆرە بن، لە هەمووی سەیری ئەو گێلانە زیاتر گرنگی بـە پلـەکانیان دەدەن، نەك گرنگی بەو پیاوانە بدەن کە لەگۆڕەپانی جەنگدان، مەبەسـتیش لەمـە ئێمـە پێویستیمان بە پزیشکێکە.

کاپتنی فرۆکەکە، فرۆکەکەی لە هەوایەکی سافی فێرجینیا بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە- بەرەو ڕۆژهەڵات و بـۆ لای تاجیکسـتان، وا بـیرم دەکـردەوە هەرچـەند لـە واشنتن دوور بکەوینەوە کارەکان ئاسان دەبێ، هـەتا ئەگـەر ئەفغانسـتانیش بـێ، بەجۆشوخرۆش بووم تا چاوم بکەوێ بە جەنەراڵ فرانکس و هاوڕێیە ئەفغانییەکانی و پیاوانی ئەمریکی لە مەیداندا.

سەیری ناو فرۆکەکەم کرد هەموو ئەوانەی دانیشتبوون سیخوڕی ناودار بـوون و لەشیان وەك وەرزشەوان بەدەردەکەوت و ماسوولکەکانیان بەدەرکەوتبوو لە تەك

ریشە درێژەکانیان، هەموویان خاوەنی کارایی کردەین، هەندێکیان چەند زمانیـان دەزانی و قسەیان پیێ دەکرد، بەشێکیان هەر خەڵکی وڵات بوون، دوانـیش لەوانـە مووسڵمان بوون، هەندێکی دیکەیان شارەزایان هەبوو لە کاری شاراوە، هەنـدێکی دیکەیان چەند شەڕیان بینبوو، بەبێ ئەوەی ئەوانی دیکەیان لەگەڵدا بێ.

هەموویان کابۆی پیسی جینزیـان پۆشـی بـوو، وەك ئـەوەی بـۆ کـار بچـن، هاوکات پێڵاوەکانیان بە نرخێکی گران کڕدرابوو، لەتەك گولەبەندی دروستکراو لە جۆری فۆر تکس، سەیری خۆم کرد هەمان جلوبـەرگم پۆشـیووە، هـەمووما‌ن وەك ئەوەی ریکلام بۆ جلوبەرگێك بکەین.

دەستمان بە گفتوگۆیەکی هێمن کرد، هیچ کەس خەوی لێ نەکەوت، چـونکە دەنگی فرۆکەکە لە بەرزایی چل هەزار پێ هۆیەکە بۆ پشـوودان، لـەم کاتـەدا نـە تەلەفۆنێك زەنگی دەهات نە باسی سیاسەتیش دەکرا.

گەشتەکەمان بەسەلامەت دەڕۆیشت، بۆیە لەشم بۆ دواوە برد و سەرەخەوێکم شکاند، وەك ئەوەی لە هەفتەکانی رابردوودا وا بکەم.

کاتێك فرۆکەکە دابەزی، ئێمە دابەزین و رۆنی هاوڕێمان کە گەنجێکی کارایە و زمانی رووسی دەزانێ بەرەو نووسـینگەکەی بـردین، نووسـینگەکەش جێگـەی هەندێکمان بۆوە، رووبەرکەی کەمبوو، کەچی نووسـینگەکە پاسـەوانێکی پتـەوی هەبوو، وەکچۆن پـارێزەری هـەموو پەیوەندییەکانمانـە، ئـەو گەنجـە کـار لەسـەر کۆکردنەوەی زانیاری دەکات، هەروا رۆڵی پەیوەندیی لۆجیسـتی دەبینـێ لـەنێوان تیمی شکێنەری سەرەکان و تیمەکانی دیکەمان لە باکووری ئەفغانستان.

ئەمە دوا جارە سەردانی دۆشنەبیم کرد، واتە لەپاش ١٨ مانگ، ئەو کات هیچ بوونێکی حکومەتی ئەمریکی لێ نەبوو، من و کۆفر و بن و ریچ زیاتر پاند بووین، چونکە ناکرێ تۆ نەچییە دۆشەنبێ و تەشقەند لە ئۆزپاکستان.

لەگەڵ شرۆن بە بێتەل قسەم کرد و پێم راگەیاند کە لەپاش دوو رۆژی دیکەدا کۆبوونەوە لەگەڵ فرانکس و فەهیم، هەروا باسی ئەوەمان کرد ئەم چەند رۆژە بۆمبارانکردن کەمتر دەکەینەوە، چونکە ئێستا لەمبارەیەوە زۆر کارا نین، ئەو جگە لەوەی هاوبەشە ئەفغانییەکانمان هەردەم باسیان لە جبەخانەکان دەکرد تا ئامانجەکان بپێکین، سووپای خێڵە ئەفغانییەکان دەیان ویست دەست بە شەڕ بکەن، بەڵام نەك بەبێ رووماڵکردنی ئاسمانی.

دۆشەنبێ تا ئەو کاتەش هیچ نەگۆڕابوو تەنیا مۆڵگەیەکی خانوو بوو و لەسەر شێوەی سوفیەتی دروستکرابوو، تەنیا ئەو خەڵکانە تیایدا نیشتەجێ بوو بوون کە بێ ئومێد بوونە و لەلایەن بەرپرسە گەندەڵەکان دەقۆزرێنەوە، هەروا چەتەکانی تلیاك لەنێوخۆیاندا شەڕیان بوو، کاتێك بەرەو پیاسە چووین دوای چەند خانوویەك چایخانەیەکمان دۆزییەوە تیایدا هەندێك نان و چای گەرممان خوارد، هەموو خەڵکەکە سەیری ئێمەیان دەکرد، بەبێ ئەوەی شتێك بڵێن.

دواتر چووینە بارەگاکەمان دوا شت باسی رەهەندە سیاسیەکانمان دەکرد، باسی شتێکمان دەکرد هیچ پەیوەندی بە کارەکەمانەوە نەبوو، چونکە یەکێك لە ترسناکییەکانی کاری هەواڵگری کاتێك تۆ لەشوێنێکی هەڵەدا بیت، یاخود لە کاتێکی هەڵەدابیت، ئەمەش هیچ سوودێکی نییە ئەوا کارێکی گێلانەیە، بۆیە زۆر دوور دەبین لە شەقامەکانی دوشەنبێ.

هەر لەو شەوەدا لەنێو فرۆكەكەی جەنەرال فرانكس كۆبووینەوە كـە فرۆكـەی سی -١٧ بوو لەسەر گۆڕەپانی فرۆكەخانەی دۆشەنبێ راوەستابوو، تەوقەم لەگـەڵ جەنەرال فەهیم كرد پێشتر نەمبینیبوو، هەروا باوەشم بە عارفی ئەندازیار كرد كە سەرۆكی هەواڵگری بەرەی یەكگرتووە بوو، بۆ مـاوەی دوو سـاڵ لەگـەڵ یـەكتردا كارمان كردووە و بەردەوامیش پەیوەندیمان هەبووە.

ئەمـەو جەنـەرال فـرانكس و عەمیـد كیمـۆنز هـەردووكیان لـە هـەواڵگری سەربازی بوون، هەروا ئەمیرال كالاند و عەقید موهلولاند بە برنتسم ناساندن، ئەوە لەوەی حەمید كاری وەرگێڕانی دەكرد، ئەویش یەكێك لـە ئەفسـەرە كردەییـەكان بوو.

جەنەرال فرانكس كارەكانی گرتە دەست، نەخشەكەمان دانا، ئەمەو جەنـەرال ئاماژەی بەو شوێنەدا تا هێزی ئاسمانی ئاراستەی بكرێ، داوا لـە فـەهیم كـرا تـا باس لەو ناوچانە بكات، تا بزانین یەكەمجار هێرش بكەینە كوێ؟ پێ دەچوو فەهیم جەختی لەوە دەكردەوە هێزی ئاسمانی لە هەموو شوێنێك بدات، ئـەمـەش مەحالـە، بەو شێوەیە قسە دەكرا و وەڵام دەدرایەوە، هەروا جەنەرال فرانكس باسی لەوە كرد كە پێشتگیری لە سەركەوتن بكەین، تا ئێمە لەسەر زەویدا بـەهێز بـین، دەتـوانین یەكەم شوێن بۆ بچین مەزار شەریفە؟ یاخود دەشتایەكانی باكوورە؟ یان تالقانە؟

لەو كاتەدا فەهیم گوتی كابوول بنكەی سەرەكییە، بەڵام نەیتوانی خشتەیەك دابنێ، هێزەكانی ئامادەنین تا بەرەو باشوور بڕوات، واتە لـە رێگـەی بـەرزایی و دەشتاییەكانی باكوور، ئەو مكوڕ بوو لەوەی جبەخانە و پارە و هێزی ئاسمانی بۆی دابین بكرێ، لەتەك ئەمـەشدا دەسكەوتی سیاسی و سەربازی دەویست، وەك ئەوەی ئەو گفتوگۆیە ببێتە دانوستاندن.

حەمید زۆر بەئاسانی و متمانەوە وەرگێڕانی ئەنجام دەدا، بۆیە من و بـرنتس هەستمان دەکرد خەومان دێ، لێـرەدا هەسـتمان بەشـەرمەزاری دەکـرد، چـونکە هاوپەیمانـە ئەفغانییـەکانمان دەیـان ویسـت سـازش بکـەن، لـە هەنـدێك کاتـدا دەپاڕانەوە، لەپێشتریشدا بە فـرانکس راگەیانـد کـە فـەهیم و عـارف دەیانـەوێ هەندێك خاڵی دەسەڵات بگرنە دەست، بەڵام هیچ کـام لـە دەسـەڵاتەکانی نییـە، پێشم وابوو بەزوویی هەموو خاڵەکانمان جێبەجێ دەکەن.

هاوکات فەهیم زۆر گرنگی دەدا بە کابوول، بەڵام فرانکس باسی لە گرنگیـی مەزار شەریف دەکرد، چونکە رێگەیەکە بۆ هێنانی هـەموو پێداویسـتییەکان لـە رێگەی پیادە لە ئۆزباکستانەوە، بۆیە زیاتر جەختی لە باکووری خواروو دەکردەوە.

لەوێدا باسی ئەوەم کرد، کە پێویستە هەماهەنگی هەبێ لەنێوان هێرشـەکان لە ئاسمان و زەویدا، فەهیمیش ئـەوەی راگەیانـد لـە نـەبوونی هێرشـی ئاسمـانیی هێزەکـانی سـەرکەوتن بەدەسـت نـاهێنن، لـەو کاتـەی هێزەکـانی فـەهیم لـە دەشتاییەکانی باکوور رووبەڕووی پەنجا هەزار کەسی دوژمن دەبێتەوە، لەریزەکانی ئەویشدا چارەگێك لەو ژمارەیە بوونی هەیە، بۆیە ئەگەرەکان لـە مـەزار شـەریف لاوازە، چونکە دوژمنی هاوپەیمانەکانمان زۆر زیاترە لەنێو هەموو وڵاتدا.

فەهیم هیچ بژاردەیەکی نەبوو، لە کۆتاییدا درکـی بـەوە کـرد کـە جەنـەراڵ فرانکس جەخت لە مەزار شەریف دەکات، بۆیە دەبـێ پشـتگیری لێ بکـرێ، تـا بەخێرایی هێرشەکان بەرەو تالقان و دەشتاییەکانی باکوور بکەن.

فەهیم لەسەر ئەمانە رازی بوو، دواتر ئاستی گفتوگۆکەی بەرەو نزمـی بـرد، داوای پارەیەکی زۆری کرد وەك پێدانی مانگانە، ئەمەش وای کرد بێدەنگییـەکی ناخۆش بەسەر ئەم کۆمەڵە بچووکەدا زاڵ بێ.

لەمكاتەدا فرانكس هاواری كرد "قسەی پڕوپووچ"، لە مێزەكە دووركەوتەوە.

هاوكات فەهیم ڕەنگی گۆڕا و كەوتە دڵەڕاوكێ، سەیرێكی عارفی كرد، كە لە قسەكە گەیشت، ئەویش چاوەكانی بەولاوئەولادا دەبرد.

لەلایەكی دیكەوە برنتس سەیری فەهیم و عارفی كرد و بە شێوەزاری داریش شەرمەزاری كردن.

دووبارە هەمووان بێدەنگ بوونەوە، جەنەراڵ فرانكس چووە دەرەوە تا جگەرەیەك بكێشێ، منیش هەڵسامەوە خۆم لە مێزەكە دوور خستەوە.

لەپاش ماوەیەكی كەم و لەدوای چەند خولەكێك دووبارە كۆبووینەوە، بە فەهیم و عارفم ڕاگەیاند كە مووچەیەكی مانگانە دابین دەكەین، بەڵام تەنیا بۆ چەند پێداویستییەكی دیاریكراو ئەوە جگە لە یارمەتیدانی هەموو ئەوانەی لە تالیبان رادەكەن، ئەو ژمارەی من دیاریم كرد زۆر كەمتر لەوەی ئەوان داوایان كردبوو، بەڵام ئەم ژمارەیە بەس بوو، هیچ بوارێكیش نییە تا ئەو هەموو پارەیە بدەین بەوان، بۆیە دەبێ نرخێكی كەم بدەین بە هاوپەیمانەكانمان تا گفتوگۆكان بەردەوام بن، دیارە ئەمە زۆر باشترە لەوەی چەندین ملیار دۆلار لە هێزی وشكانی و پیادەی ئەمریكی خەرج بكەین، لە كاتێكدا دوژمن زۆرێك لە ئامانجی ئەمریكی دەبێ، تەنیاش كات بەفیڕۆ دەدەین.

لەو كاتەدا شوێنەكانی دۆست و دوژمنمان دیاری كرد، هەروا گفتوگۆمان لەسەر چەندین بژاردە كرد، هەروا باسی بڵاوەپێكردنی هێزە تایبەتییەكان كرد، بۆ ئەمەش عەقید موهولاند باسی ئەو ڕێگایەنەی كرد، كە پیاوەكانی دەتوانن بەشداری بكەن.

لە کۆتایی کۆبوونەوەکە، جەنەراڵ فرانکس بەڵێنی دا بە فەهیم کە لە ئەفغانستان یەکتر دەبیننەوە، بەتایبەتی لەنزیك ڕۆژانی جەژنی سەری ساڵ و لەدایکبوون، هەروا باسی داهاتوویەکی گەشی کرد لەنێوان هاوپەیمانەکاندا، لەو کاتەشدا هاوپەیمانەکانمان پێویستیان بەوە حەبێکی ئازارشکێن هەبوو، لەپاش ئەو دانوستانە پڕ لە دڵەڕاوکێیەدا.

جەنەراڵ فرانکس زۆر بەکارایی دەجوولایەوە، ئەمەش پەیوەست بوو بە هەڵسەنگاندنە کەسایەتییەکان بەپێی ستراتیژیەتی ئەو دانوستاندنەی گفتوگۆمان لەسەری کرد، هیچ بوارێکی باشتی نییە بۆ هاوپەیمانی باشتر نییە بۆ کاری شاراوە تا ڕێکی بخرێ لەگەڵ هەڵمەتی سەربازی.

بەفەهیم و عارفم ڕاگەیاند لە ماوەی ٤٨ کاتژمێردا لە پنچشێردا دەتانبینم، ئەگەر دۆخی کەش و هەوا ڕێگر نەبوو، هەروا ئەمیراڵ کالاند یاوەرم دەبێ، لەگەڵ فەهیم ڕێککەوتم کە لەوێدا گفتوگۆکانمان بەردەوام دەبێ.

لە ڕۆژی دواتردا من و برنتس لە ڕێگەی ڕادیۆیی کەشتی ئاسمانی پەیوەندیمان بە تیمی ئەلفا کرد، کە لە باشووری مەزار شەریفدان، ئەو تیمە بەرەو پێشەوە دەچوون، لەو کاتەی هێزەکانی دۆستەم دەستی بەسەر گوندێکدا گرت، لەپێشتردا تالیبان زاڵبوون بەسەریدا، هەروا گوێمان لە تەقەی ئەو شەڕە بوون سەبارەت بە تەقەی کۆتایی شەڕەکە، پیاوانی ئێمە ئازا بوون و متمانەیان بە خۆیان بوو، بەڵام پێویستیان بە پشتگیرییەکی زیاتری هێزی ئاسمانی هەبوو، ئێستاش پێویستیانە.

لەگەڵ شرۆنی تەمەن شەست ساڵە قسەمان کرد، ئەو لەتەك گەدەی خۆیدا یاخی بووە، ئەمەش بە هۆی ئەو خواردنانە بووە کە لە شوێنە سەختەکاندا خواردوویەتی.

لەمەش خراپتر پێی ڕاگەیاندین سەربازە نەخۆشەکەی هێزی تایبەتی ٥٥٥ دۆخی باشتر نەبووە، پێ دەچێ تووشی هەوکردنێکی زۆر بووبێ لە هەناویدا و لە دۆخێکی خراپدایە، ئەمەو دوو هێلیکۆپتەر نێردرا بۆ گواستنەوەی، یەکەمیان بەناچار دابەزیبووە لە ناو خاکی دوژمنەکاندا، ئەوەی دووەمیش پارێزەری لە تیمی گەمارۆدراو دەکرد، لەپاش ئەوەی فرۆکەکەی تێکچوو، لە کاتێکدا فرۆکەی ئێف ١٦ بۆمبی بەسەر هەلیکۆپتەرەکە دادا تا دوژمن سوودی لێ نەبینێ، لەو کاتەی فڕین لەسەر چیایە بەرزەکانی ئەفغانستان ئاسان نییە بەتایبەتی لەگەڵ نزیکبوونەوەی وەرزی زستاندا.

لەو شەوە گەڕاینەوە فرۆکەخانە دوای ئەوەی دوو خاڵی چەکدارمان بڕی، ئەمەش لە دۆشەنبێ شتێکی ئاساییە، بینیمان دوو هەلیکۆپتەری سی ئاچ -٤٧ دەنیشنەوە، هەر لەو کاتەی هەلیکۆپتەرەکان گەیشتنە سەر زەوی برنتس و پیاوانی هەموو شتێکی خۆیان لەگەڵ جبەخانە کۆکردەوە، سوپاسی ڕۆنم کرد، ئەو هەر لە دۆشەنبێ دەمێنێتەوە و وەك یەکێك لەکاردایە ئەگەر ئێمە ڕزگارمان بوو، پشتگیریمان پێشکەش دەکا، هاوکات ڕۆن لە ماوەیەکی دیکەدا پلەی بەرز دەکرێتەوە و دەبێتە سەرۆکی بەشی دەزگای شاراوە.

سەیری هەموو جولەی هەردوو کۆپتەرەکەم دەکرد، کە دەمبینی پانکەکانی دەسوڕێتەوە، لەم کاتەدا ڕێنمایم دا بە تیمەکە، هەروا لاسایی جوولەی ئەمیرال کالاندم کردەوە لەو کاتەی بەرەو کۆپتەرەکە دەڕۆیشت، لەلایەکی دیکەوە ئەو چەندین جار سواری کۆپتەری سی ئیچ -٤٧ بووە.

لەلای من سواربوونی کۆپتەر وەك سەرکێشییەکی دیکەیە، چونکە ئەوە یەکەمجارە سواری ئەو جۆرە فرۆکەیە دەبم، یان لە ڕاستیدا سواری هیچ فرۆکەیەکی دیکە نەبووم.

سواری کۆپتەرەکە بووم بەبێ ئەوەی رووبەڕووی هیچ ناخۆشییەك ببمەوە، من دەمانچەیەك لە جۆری گلۆك و ٩ ملیمیم پێ بوو لەتەك جانتایەکی پشت، لە یەکێك لە کورسییەکان دانیشتم و خۆم بەستایەوە، دووبارە وردبوونەوەم بۆ هەموو شتێك دەکرد، هەروا پێویست بوو تەکتیکی خێرا ئەنجام بدەم کە پەیوەستە بە پلانی ستراتیژی، ئەمکارەش ناوێتەی کارا هەردوو لایە، لەگەڵ رێکخستێکی تەواو بەمکوڕبوون لەسەر چی و چۆن.

سەیری تەنیشتم کرد بینیم برت لەتەکم دانیشتووە، ئەو وەك پیاوی ریکلامی "میشلن" وابوو، جلوبەرگەکەی چەندین کونی لەسەر بوو، گاڵتەم بە پۆشاکەکەی کرد، ئەویش بە خەندەیەك وەڵامی دامەوە، لەپاشاندا دەرگەی پێشەوە و دواوە کرایەوە تا کارپێکەری تۆپهاوێژی رەشاش بواری هەبێ لە هەر شوێنێك تەقە بکات، لەو کاتەدا با بەپەیکەرەکە کەوت بەتایبەت کاتی دووسەد پێ بەرزبووینەوە، لەپاش سی خولەك سنووری ئەفغانستانمان بڕی.

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا کاتێك هەستم بە بەرپرسیارەیەتییەکە کرد، بیرم لە هێرشەکانی ١١-٩ و کەشتی کۆل و هەردوو باڵێۆزخانەی دار سەلام و نایرۆبی دەکردەوە.

چ گەورەیەکە من وەك ئەو پیاوانە دەچینە ناوەڕاستی ناوچەی قاعیدە و تاڵیبان، هیچ کاتێك بەو شێوەیە شانازیم بە وڵاتەکەمەوە نەکردووە، لەو کاتەی سەرکردایەتییەکەم ئەم هەلەی پێ بەخشیووم بۆ خزمەتکردن، هیچ کاتێکیش بەو شێوەیە هەستم بە متمانەبەخۆبوون نەکردووە.

کۆپتەرەکە زیاتر بەرز دەبۆوە کاتێك نزیکی زنجیرە چیایەکانی باکووری هندۆکۆش دەبووینەوە، زۆری نەبرد هەستم بە سەرمایەك کرد، هیچ کات هەستم بەو سەرما و ساردییە نەکردووە.

بارێکی گرانمان لەناو کۆپتەرەکە دانابوو، کاتێك لەبەرزیی ١٦ هەزار پێدا بوو، دەمبینی بورغییەکانی کۆپتەرەکە هەر یەك بەلایەکدا دەڕوا، لە پەنجەرەکەوە سەیرم کرد بینیم برنتس و ئەوانی دیکە لەناو کۆپیتەرێکی دیکەدان، لەو کاتەدا برت هیدفۆنێکی لە گوێ کردەوە تا هیچیتر گوێی لە گرفتی فرۆکەکە نەبێ، بیرم لەوە کردەوە هەست بە فێنکی دەکا، کەچی من جلوبەرگێکی زۆرم نەپۆشیووە، پلەی گەرمی لەو کاتەدا دە پلەی ژێر سفر بوو بە پێوەری فهرنایت (نزیکەی ٢٣ پلە لەژێر سفر) لەو کاتەدا هەوای سەرماوسۆڵە لە دەرگە کراوەکاندا دەهات هەتا دەهات ساردتر دەبوو، لەسەر کورسییەکە خۆم کۆکردەوە تا بتوانم پلەی گەرمیم بپارێزم، بەردەوام بووین لە سوڕان لەو کاتەی سووتەمەنی تەواو بوو.

بیرم کردەوە: زۆر گرنگە، قاعیدە ناتوانێ بمکوژێ، بۆیە لێرەدا سەرما دەمبەستێ تا مردن، کەچی کۆفر ئەمەی زۆر پێ ناخۆش دەبێ.

لە کۆتاییدا بەرەو بەرزی دەڕۆیشت هەر بەرز دەبۆوە، لەدواتردا بەنێو چیایەکاندا تێپەڕ دەبووین، لە پەنجەرەوە سەیری کرد دیواری چیایەکان چەند پێیەك لێمانەوە دوورە، فرۆکەوانە زۆر بەکارایی لەنێو دۆڵەکاندا بەرەو دۆڵی پنجشیر ڕۆیشت.

لەنزیکی کاتژمێر ٣:٠٠ لەنزیك کەناڵی زێیەدا نیشتینەوە، لەوێدا چەکدارە ئەفغانییەکان پێشوازیان لێ کردین، لەو کاتەدا ئافرەتێك بەرەو رووم هات تا شتێکی پێ بدەم بەڵام پیاوە ئەفغانییەکان بە قژ دووریان خستەوە، لەوکاتەدا

پانکەی کۆپتەرەکە بەردەوام بوو لە سوڕان ئێمە کەلوپەل و جبەخانەکانمان دەهێنا خوارەوە، کاتێك شرۆن هات لەگەڵ تیمەکەی تەوقەی لەگەڵ کردین و سواری کۆپتەرەکە بوون، لەنێویاندا سەربازێك هەبوو لەسەر داری سیسەمی فریاکەوتن بوو، لەدواتردا ئەو رزگاری بوو.

هەردوو کۆپتەرەکە بۆ ماوەی چەند خولەکێك مانەوە، لەدواتردا بەرزبۆوە تا بگەڕێتەوە بۆ دوشەنبێ، ئێمەش بەرەو ئۆتۆمبیلەکان دەڕۆیشتین، تا لەنێو ئەو دۆڵە سەخت و سەرماوسۆڵەدا بڕۆین، چەند پیاوێکی ئەفغانی میوانداری ئێمەیان کرد، هەروا لەگەڵ برنتس باسم لەو باسانە کرد کە پەیوەستە بە ئاسایشمان، لەپاشاندا بە بێتەل پەیوەندیمان بە بارەگای سەرکردایەتی و دۆشەنبێ کرد تا پێیان رابگەیەنێن گەیشتووینە شوێنی خۆمان، لەپاشاندا خەوم لێکەوت وەك مردوویەك.

لەپاش چوار کاتژمێر لە خەو هەڵسایین، لەوێدا ئاسۆی بەیانیام بینی و هەوای ساردم هەڵ مژی و سەیرێکی دۆڵی پنچشیری تەسك کرد، لەم لاو ئەو لا چەند خانوویەك هەیە، بەتایبەت لەسەر ئەو زێیە بەستراوەدا، کە لە هندوکۆشەوە بەرەو دەشتاییەکانی باکوور دێ، ئەوە دەبینن من ئێستا لە ئەفغانستانم.

برنتس بەکردەیی دەستی بەکار کرد، ژماردنەکانی ملیۆنەها دۆلار بوو کاتێك باسی لە کڕینی ئۆتۆمبیل و ئامرازەکانی تیمی چاودێری دەکرد، هەروا لەگەڵ گەورە پیاوانی هاوپەیمانە ئەفغانییەکان کۆدەبێتەوە، جگە لەوەی پەیوەندی لەگەڵ سێ جەنگاوەرەکە دەکرد، پلانی بۆ ئەوە دادەنا تا هەشت لە موژدەبەر رزگار بکات کە سەر بە شلتەرناو و ئەنتەرناشیونالن، دوای لەمانە دوو ئافرەتی ئەمریکین و لەلایەن تالیبانەوە دەستگیر کراون، ئێمەش توانیبوومان یەکێك

بکەینە سیخور لەو شوێنەی موژدەبەرەکانی تیایدایــە و ڕۆژانــەش ڕاپۆرتمــان بــۆ دەهات، دەمان ویست بە بەرتیل ڕزگاریان بکەین، پێش ئــەوەی هێــرش بکەینــە سەر کابوول.

بەیانییەکەی لەگەڵ تیمەکەمان و هاوپەیمانە ئەفغانییــەکان پێداچــوونەوەمان بە هەواڵگری و پلانە سەربازییەکان دەکرد، لەگەڵ مایکل هاس ئەفسەری گەورەی هێزی تایبەت کۆبووینەوە، لە پاشاندا هەموومان کۆبووینەوە تا لــەنزیك گردێـك وێنەیەکی بەکۆمەڵ بگرین.

سازشەکانی برنتس لەگەڵ عارف و ئەوانی دیکە بەردەوام بــوو ســەبارەت بــە پارە و هەواڵگری و بارمەتەکانی شلتەر ناو ئینتەرناشیونالّ، هاوکات لەگەڵ بــرت و حەمید لە کــاتێکی درەنگــدا بــە ئۆتۆمبێــل چــووین بــۆ بنکــەی چــاودێری و سەرکردایەتی هاوکات ئەو قەڵایە سەر بە بیسمنەڵلا خان بوو، کــە ســەرکردایەتی چەکدارەکانی ئەفغانی دەکرد، ئەوانەی ڕاسپێردرابوون بۆ هێرشکردنە سەر کابوول.

بنکەی سەرکردایەتی لەلایەکی بوو با بەتەواوی لێی دەدا و دەڕوانێتــە ســەر گۆشەی باکووری ڕۆژئاوای دەشتاییەکانی باکوور، هەموو لایەکی بە بەردی گەورە داپۆشراوە، هاوکات خانوویەکی بەبەرد لەسەر لووتکەی چیایەکەدا دروســتکراوە، لەوێوە دەتوانیت بڕوانیتــە دەوروبــەر، کاتێــك ڕۆژهــەڵات لەپشــت هەورەکانــەوە تیشــکی دیــار بــوو، لــە ئاســمــانیش مەلــەکان لەســەرووی چــیایەکانی دەفــڕین، جــەنگاوەرەکان لــەخوارەوە چــەندین جلوبــەرگی ڕەنگاورەنگیــان لەبەردایــە، بــە چەکەکانیان لەدەوری قەڵا بچووکەکەدان، ئەگەر چەکی تیا نەبوایە دیمەنەکانی وەك ڕۆمانی کۆتانی بەربەری وابوو.

خان پێشوازی لێ کردین لەو کاتەی دەچووینە نێو هۆڵە فراوانەکە، کە فێنکییەکی خۆشی هەیە، چونکە دیوارە ئەستوورەکان ڕێگرە لە با و گەرمیی خۆر، بنمچەکەش لە چەند دارێك پێکهاتبوو و زۆربەی دارەکانیش بە دەست نەخشێندرابوون، کاتێك خان دانیشت و ئێمە دانیشتین ڕۆژ یەکسەر بوو بە شەو، چاوەکانی گەورە و گەش بوون و لووتیشی لەدوورەو دیار بوو، لەبەرامبەر مێزەکەش دانیشت، دەستمان بە گفتوگۆ کرد.

هاوڕەیانە ئەفغانییەکان چەندین بابەتیان خستە ڕوو سەبارەت بە هەواڵگری و توانا سەربازییەکانمان، من پرسیارم سەبارەت بە ڕوانینەکانیانیان کرد لەبارەی ئەفغانستان، ئەوان باسی چیرۆکی داگیرکەری سۆفیەتیان کرد، هەروا پرسیارم سەبارەت بەوە کرد کێ باشە بۆ وەرگرتنی سەرۆکایەتی، هەموومان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن باشترە یەکێکی پشتۆن بێ، چونکە ناکرێ بشوور بەشدار نەبێ لە حکومەت، پێشتریش هەمان پرسیارم لە عەبدوڵڵا عەبدوڵڵا کرد، ئەو نیوە پشتۆن و نیوە تاجیکە، پێی وایە ئەگەر سەرۆك پشتۆن بێ ئەوا کێشەیەکی زۆری دەبێ، هەروا بەدیاریکراوی وەڵامی دامەوە: کارزای تاکە بژاردەیە، چونکە ئەو پشتۆنییە و بڕوای بە چەمکی نەتەوەییە، لەپاشاندا عەبدوڵڵا عەبدوڵڵا دەبێتە وەزیری دەرەوە و بەتایبەتیش لە سەردەمی کارزای، دواتر ناڕەزایی دەردەبڕێ و لەپاشاندا کاندید دەکرێ بۆ سەرۆکایەتی، بەڵام هەڵبژاردنی ٢٠٠٩ بەتەزویر دەدۆڕێنێ.

لەنێوەندی کاتژمێرێکدا چوونە ناو بابەتەکە، لەدواتر پرسیارێك بەرێزەوە کرا: ئایا دەتوانن پشت بە ویلایەتە یەکگرتووەکان ببەستن، وەفادارە بە بەڵێنەکانی؟ ئەوان باسیان لەوە کرد کە چۆن دژ بە سۆفیەت جەنگاون، بەڵام بڕوایان بەوە بوو ویلایەتە یەکگرتووەکان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هاوکاریان دەبن لە بنیاتنانەوەی وڵاتەکەیان، تا حکومەتێکی یەکێتیی نیشتمانی دابمەزرێنن، ئەمە ناکرێ ئەگەر

بەڵێنیش هەبێ، ئێمە گوتمان ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەمجارەش درۆی کرد، ئەمجارە چی دەگۆڕێ؟

باسی کارەساتەکانی ١١-٩ کرد کە چۆن مەسیحی و جوو و مووسڵمان لەسەر دەستی قاعیدە مردوون، هەروا باسی ئەوەم کرد کە وەك یەك خوێن پێویستە تۆڵەی خۆمان بکەینەوە، جەختیش لەوە بکرێتەوە بۆ جارێکی دیکە قاعیدە لە ئەفغانستان داڵدەیەکی نەبێ، بەرژەوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکانە بوونی ئەفغانستان بە شێوەیەکی سەقامگیر ببینێ، تا دوژمنان نەتوانن خۆیان دروست بکەونەوە بۆ هێرشکردنە سەر وڵاتەکەمان، هەموو بیانووەکانم پەیوەست بوون بە تۆڵەکردنەوە و دادپەروەری، لە کاتێکدا لە ئەفغانستاندا چەندین جار بەڵێنیان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان وەرگرتووە بەڵام بەڵێنەکانیان جێگەی باوەڕ نەبووە.

لەنیوە شەودا داوامان کرد بڕۆین، توانیمان ڕێگە چیاییەکە بگرینە بەر تا بگەڕێینەوە بۆ باکوور لەوێوەوەش بچین بۆ دۆڵی پنچشیر و بنکەکەمان، من و برنتس پەیوەندییەکانمان لەگەڵ بارەگای سەرکردایەتی و وێستگە نزیکەکان بوو، هیچ گرفتێك نەبوو، کاتێ گەیشتین وەك مردوو خەوتم.

من و برت لە ڕۆژهەڵاتدا خواردنی بەیانیمان خوارد کە پێکهاتبوو لە چا و نانی گەرم، لەپاشاندا لەگەڵ ئەمرڵا کۆبووینەوە، هەموومان بەیەکەوە دانیشتین ئەمەو حەمید و کەسانی دیکەش لەوێدا بوون، لەپاشاندا سواری سێ ئۆتۆمبێل رووسی بووین ، بۆ ماوەی کاتژمێرێك لە ڕێگەی ئەو دۆڵە تەسکەدا بووین تا گەیشتینە سەرەتای دۆڵی پنچشیر لەوێدا جەنەراڵ بسمەڵڵا خان پێشوازییەکی گەرمی لێ کردین، لەوێوەوەش ئێمەی بردە هێڵەکانی پێشەوە.

دیمەنەکە بە گۆڕەپانی جەنگی جیهانی یەکەم دەچوو، لە رۆژێکی پایزی سافدا، تیایدا سەربازی هەردوو لا لە پشوودان، خەندەق و مۆلگەکان لە رۆژهەڵاتەوە تا رۆژئاوا بوو، هەردوو لاش لە ئامادەباشی جەنگدا بوون، هەمووش دەزانن لەم نزیکانە روودەدات.

دەمان توانی لەدووری چەند سەد یاردەیەکەوە سەربازانی دوژمن ببینین، کە بەئەسپایی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە کەلوپەلەکانیان دەگوازنەوە، بە دووربینەکەم هەموو رەبییەکانم سەیر کرد، کە زۆربەیان رووخاوە، بەپێی قسەی خان زۆربەی بینایە و تونێل وەکخۆی ماوەتەوە.

لە رێگەی ئەو پوختەیەی کە ئەمرڵا و بسو ئەڵلا خان خستبوویانە روو، هێڵەکانی شەڕ لەزۆر رووەوە دەکرێ بێنە ناو ئێمە، چونکە زۆرێك لەوانەی سەردانیان کردوون تا دڵنیا بن لە خێزانەکانیان، چەند سیخورێکی تیادا بووە، هەروا ئەمرڵا باسی ئەو تۆڕانەی کرد کە بەدرێژایی بەرەکە کەسانێکیان هەن تا رووماڵی ئەو شوێنە بکەن.

خان بەشانازیەوە باسی لە سوپاکەی دەکرد، کە زیاترە لە دە هەزار پیاوی چەکداری، ئەوە جگە لە هەندێك زرێپۆش و تۆپهاوێژ، باسی ئەوەشی کرد کە چەندین پیاوی هەیە لەسەر ئاستی فەوج لە کاتی شەڕدا چەندین فرتوفێڵ بەکار دەهێنن تا تۆپهاوێژەکە زۆر بەخێرایی بۆمبارانیان بکات، کەچی زۆر بە بێ ئومێدییەوە باسیان لەوە کرد کە پێویستیان بە هێزی ئاسمانی ئێمە هەیە، لەبەرامبەر هێزێکی گەورە کە یەکێك بەرامبەر بە پێنجە.

لەپاش کۆبوونەوەمان لەگەڵ خان بەرەو رۆژهەڵات رۆیشتین، تا بەتەواوی هێڵەکان ببینین، دوو جاریش وەستاین تا چا لەگەڵ سەرکردەی چەکدارە

ناوخۆییەكان بخوێنەوە، ئەوان پێشوازییەكی گەرمیان لێ كردین، لەسەر چەندین مافووری رەنگاورەنگ دانیشتین، خانووەكان قورِ بوون، زۆرجاریش رووبەرِووی بۆمبارانكردن بوونەتەوە، هەموو بەراوردێكمان كرد سەبارەت بەبەرپرسیارەتیان، ئەوان بەدووردرێژی باسیان لە توانای خۆیان و توانای دوژمن كرد، هەروا باسیان لە روانگە سیاسییەكانیان كرد، هاوپەیمانە ئەفغانییەكان زۆر بەوردی باسیان لە دوژمن كرد، هەروا سەركردەی تالیبانیشیان دەناسی و ناوەكانیان هێنا، زۆرجاریش پەیوەندیان هەبووە، بۆیە زۆر بەرۆتینی تیمی چاودێریان بۆ سەر هێڵەكان دەنارد، هەموو جەنگاوەرەكان وەك پیرێك دیار بوون، زۆربەشیان نەخوێندەوارن، بەڵام زۆر متمانەیان بە خۆیان بوو.

گەیشتینە فرۆكەخانەی باگرام دوای ئەوەی لەپشت رۆژنامەنووسەكانەوە رۆیشتین، ئەمرلا وەك گاڵتەیەك گوتی دەكرێ رۆژنامەنووسەكان ترسناكتر بن لە تالیبان، پێم گوت ئەمە تەنیا نووكتە نییە، هەروا دەبێ بزانین چۆن وێنەی تیمەكەمان لە یەكێك لەرۆژنامەكان بڵاوكراوەتەوە، ئەمەش بە هۆی گوێپێنەدانی پیشەكەمان.

فرۆكەخانەی باگرام نیمچە وێرانەیەك بوو، ئەوە جگە لە تاوەری چاوێری كە بەشێوەیەك لە شێوەكان نەرووخابوو، لەلایەكی دیكەوە دار و شووشە بە هۆی بۆمبارانەوە هەموو لایەكی گرتبۆوە، هەروا پارچەی بۆمبەكان لەنزیك تاوەركە بەچاو دەبیندرا، هیچ پەنجەرەیەكی پێوە نەمابوو، لەسەرەوە بەرەو باشوور چاودێری دوژمنمان كرد.

ئەمرلا باسی بۆمبارانی فرۆكە ئەمریكییەكانی كرد، كە دوژمنەكان چۆن تووشی شپرزەیی بوونە، پێ دەچێ، ئەمە تەنیا بەس نییە، بۆیە هاوپەیمانەكانمان

باسی ئەوەیان کرد بۆچی بۆمبارانکردن وەستاوە، لە کاتێکدا ئاسمان سافە و دوژمنیش لەدووری سەدان یاردەوە بەچاو دەبیندرێن.

لە شەودا لە خانوویەکدا خەوتین کە دیوارەکانی بەقوڕ سواق درابوو، بەڵام گەرم بوو، برت بۆ رۆژی دواتر گەڕایەوە پنچشیر، چونکە پێویست بوو پەیوەندی بکات لەگەڵ سەرکردایەتیی ناوەندی سووپا، ئێمەش لەگەڵ ئەمرڵا بەردەوام بووین، چووینە بەرەکانی رۆژهەڵاتی خواوو، ئۆتۆمبیلەکەمان بەرەو شوێنێکی چیایی بردین کە رێگەکەی زۆر تەسك بوو، ئەو شوێنەش هەزار پێ لەسەرووی دۆڵەکەوە بوو.

دیمەنێکی جوان بوو، توانیم سەیری باشوور و رۆژئاوا بکەم، لە کاتێکدا نیوەی باکوور و دەشتاییەکانی باکوورم بینی، هەمووی زنجیرەیەك چیای بچووك کە لەنێوان ئێمە و کابوول بوو، واتە لەدووری تەنیا سی میل، بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لەوێدا گفتوگۆمان کرد.

سەبارەت بە سەرکەوتنی کۆتایی پرسیارم لە ئەمرڵا کرد، ئەویش گوتی: "بەڵێنەکانت بەجێ بگەیەنن، ئەگەر سەرکەوتن یان شکستتان هێنا هەر دەبێ بجەنگن، چونکە هیچ بژاردەیەکی دیکە نییە".

ئەو هێز و متمانەی بە خۆی هەبوو، ئەو راست دەکات، هیچ بژاردەیەکی دیکە نییە، ئێمەش هەروا.

لەپاش چەند رۆژێك ئەفغانستانم بەجێ هێشت ئەویش بە فرۆکەیەك کە باڵەکانی چەسپاو بوون و مەکینەکەی تۆربینی بوو، ئەمەو لەنزیك گوندی شاریکار لە دەشتاییەکانی باکوور فرۆکە بەرز بۆوە، ئەمەش بۆ یەکەمجارە لەدوای چەندساڵێکدا فرۆکەیەك باڵەکانی چەسپاو بن لەوێدا لەسەر ئەو رێگەیە

خولاوییەوە بفڕێ، هەواڵەکە بڵاو بۆوە، لەپاشاندا ئەمرڵا پێی ڕاگەیاندم پێویستە متمانەی باشترتان هەبێ تا هاوبەشی یەکتر بین، هەموو دەیان زانی ئەمریکییەکان بەڕێوەن.

## گفتوگۆیەکی نەزۆك

لەپاش دوو ڕۆژ لەگەڕانەوەم، لەگەڵ تینتی بەڕێوەبەر چووینە ژووری قەیرانەکانی کۆشکی سپی، سەرۆك بۆش لەسەرووی مێزەکەوە دانیشتبوو، هەروا چینی جێگرەکەی و کۆندەلیزا رایسی ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی یاوەری بوون، هەروا مایەرزی سەرۆکی دەستەی ئەرکان و ریچارد ئەرمیتاج و جەنەرال وایەن داننینگ بەشداری ئەو کۆبوونەوەیان کرد.

بەرپرسە باڵاکان پوختەکانیان پێشکەش بە سەرۆك کرد، بێ ئومێدییەکیان پێوە دیار بوو، رامسفێڵد بەشێوەیەك قسەی دەکرد کە کێ بەرپرسیاریەتی هەڵدەگرێ، ئەوە جگە لەوەی جەخت لەوە دەکرایەوە کە وەزارەتی بەرگری جەنگەکە لەئەستۆ دەگرێ، لە چەند مانگێکی پێشتردا گوێم لە رامسفێڵدا ڕاگرت کە خۆی ناچار کردبوو لە جێبەجێکردنی ستراتیژیەتی سی ئای ئەی لەلای ئەوە بە واتای کۆمەڵەکان هەموویان یەکسانە بە سفر، هەروا ئەرمیتاج لەو بۆنەیەدا باسی لەوە کرد، کە هەموو ئەو گفتوگۆیەی لەوێدا کرا تەنیا گفتوگۆیەکی نەزۆك بووە هیچی تر نەبووە، لەلایەکی دیکەوە گفتوگۆیەکی تێروتەسەل کرا سەبارەت بە پشتبەستنمان بە هاوپەیمانە ئەفغانییەکان، سەرۆك بۆش و رایس گوێیان لە هەموو ئەو بەرپرسانە بوو کە قسەی خراپ بە یەکتر دەڵێن سەبارەت بە بۆچوون و لێداوانەکان، لەپێشتریشدا رامسفێڵد هەڵسەنگاندنێکی هەواڵگری وەزارەتی

بەرگری دابەش کرد، تیایدا باسی دوورکەوتنــەوە دەکـات لـە جـەنگ لـە کـاتی زستاندا بەتایبەتی بۆ هێرشکردنە سەر کابوول و مەزار شـەریف، قسـەکانی ئـەو تەنیا سیاسی بوو، ئەگەر راسـت بکـات دەیتـوانی بـۆ راگەیاندنـەکان ئاشـکرای بکات، لە کاتێکدا هەموو سەرکەوتنە سەربازییەکان بۆ خۆی دەگەڕێنێتەوە.

ئەوەتا بەرپرسە گەورەکان لەنێوەندی گفتوگۆیەکی نەزۆکـدان، لـە کۆتاییـدا تینیت قسەکانی پێ بڕین و زۆر بەمتمانەوە باسی لە پلانەکانمان کرد و رێگـەی دا من قسە بکەم، منیش لەلای خۆمـەوە هـەموو زانیارییـە نوێیـەکانم خسـتە روو بەتایبەت لەرووی روونیی تۆڕە هەواڵگرییەکان و سەرکەوتنە بەردەوامـەکانمان تـا پلانی سەرکردەکانی تاڵیبان تێك بدەین لە کۆتاییدا قسەکانم کورت کردەوە و گوتم "ئەگەر هێزی ئاسمانی دابین بکرێ، ئەوا هاوپەیمانە ئەفغانییەکان لەسەر زەویدان و هێرش دەبەن، هەروای دەتوانین سەربکەوین".

سەرۆك سەری رەزامەندی لەقاند، بەڵام چینی جێگری سەرۆك هیچ کاریگـەر نەبوو بە قسەکانم، رامسفێڵدیش برۆیەکانی لەیەکتر نزیك کردەوە.

لەم کەشی گومانە ئاماژە بە ئەنجامی سـەرکەوتنەکان نـەکرا، یـان گفتوگـۆ بکـەین سـەبارەت بـە پابەنـدبوونی سـەربازەکان بـۆ هاوپەیمانـە ئەفغانییـەکان و دەسکەوتی ئاشتی، تا ئێسـتا جـەخت لـە قاعیـدە و هێرشـە پێشـبینیکراوەکان دەکەین بۆ سەر وڵاتەکەمان.

لەلایەکی دیکەوە ئەوەم لەبیر چوو کە رامسفێڵد و ولفوفیتر و چەندانی دیکە رێنمایی تەواویان دابووە بە جەنەراڵ فرانکس تا خۆی ئامادە بکات بۆ داگیرکردنی عێراق.

کاتێك گەڕامەوە بارەگای سەرکردایەتی باسەکانی کۆشکی سپیم بە ماسی و کۆفر راگەیاند، ئێمە لەلایەن سەرکردەکانەوە جێگەی متمانە بووین، ئەوە جگە لە سەرۆك بۆش کە دوودڵییەکی پێوە دیار بوو، لەوانەیە بەنهێنی ئەو دوودڵییەی خستبێتە روو، بەڵام من لەوێدا هەستم بەوە نەکرد، وەکچۆن ئەوانی دیکەش وایان بینی.

لە ماوەی چل و هەشت کاتژمێردا، لە شەشی تشرینی دووەم، هێزەکانی ئەفغانی هاوپەیمان بە هاوکاری تیمی ئەلفا و برافۆ و هێزی تایبەت دەستیان بەسەر مەزار شەریفدا گرت، خەڵکی ئەو شارە بەگوڕوتین و دروشمەوە پێشوازیان لێ کردین، لەپاش رۆژێکدا هێزەکانی ئیسماعیل خان و تیمێکی بچووکی سی ئای ئەی و هێزی تایبەت هیراتیان گرت، بەو شێوەیە سووپای بسم ئەڵلا خان بەپشتگیری هێزی ئاسمانی بەرەو دەشتەکانی باکوور رۆیشتن، وەکچۆن لەپێشتردا ئەمەی بۆ کورتکردینەوە، بۆ ئەمەش دەستیان بەسەر کابۆلدا گرت و لەپاشاندا هێزەکان چوونە ناو بامیان، لەمەوەش میلشیایەکانی هەزارەی سەر بەخەلیلی بەرەو شارۆچکەکەیان رۆیشتن.

زیانەکانی قاعیدە و تاڵیبان بە هەزاران کوژراو و بەمەش تەرمەکان لە هەموو گۆڕەپانەکانی جەنگ لە باکووری ئەفغانستان پڕ بوون.

لە ١٢ی تشرینی دووەم چوومەوە ژووری دۆخەکانی کۆشکی سپی، بۆ ئەمەش روونکردنەوەی نوێم پێشکەش بە گەورە بەرپرسەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دا، بەکورتی باسی ئەوەم کرد کە هێزەکانی دوژمن لە ئەفغانستان ورەیان بەرداوە، وەکچۆن لەپێش چەندە هەفتەیەکدا بەکورتی لەگەڵ تینێتی بەڕێوەبەر باسم لێوە کرد، باسی هەواڵگری مرۆیی و ئەو روماڵەی بریداتۆر

و هێزەکانی تایبەت کردوویانە، لەتەك سیخوڕەکانی سی ئای ئـەی، کـە لەلایـەن ئەوانەوە فەرمان دەردەکرا و گرتنی کابوولیش لە هەمووان گرنگترە، وێنەکانیشـم نیشان دان.

هاوپەمانە ئەفغانییەکان لە چەند رۆژێکـدا گـەمارۆی جـەنگاوەرێکی زۆری دوژمنان دا بەتایبەت لـە پاشماوەکـانی قنـدۆز، لەلایـەن بارەگـای سـەرکردایەتی پەیوەندییەکم وەرگرت لەلایەن بیل هاربۆ ئەفسەری کاروباری گشتی بوو.

گوتی "داواکارییەکم هەیە".

"باشە".

"دوو رۆژنامەنووس سەر بە رۆژنامەیەکی ئەمریکی گەمارۆدراون، لەوانەشە ون بووبن، لـەنزیك قەنـدوز، زۆری نـەماوە پیلـی تەلەفۆنەکـەیان تـەواو بـێ تـا پەیوەندی بە کەشتییە ئاسمانییەکان بکەن".

"دەتەوێ بیاندۆزمەوە؟ رزگاریان بکەم؟".

"بەڵێ".

"زانیاری لەسەر شوێنەکەیان بلێ، ئەگەر ژمارەی تەلەفۆنەکانیان دەزانی".

چوومە بارەگای ماسی و پێم ڕاگەیاند، ئەو رۆژنامەیەی هێرش دەکاتە سـەر سی ئای ئەی بەشێوەیەکی رۆتینی.

جۆن گوتی "دەتەوێ هاوکاری ئەو رۆژنامەیە بکەم؟" پێدەکەنی.

"بەڵێ".

"لەراستیدا کارەکە جێگەی گاڵتە نییە".

"بەڵێ".

"باشە کاری بۆ دەکەین".

لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا تیمی سی ئای ئەی و کۆماندۆس ئەفغانی شوێنی ڕۆژنامەنووسەکانی دیاری کرد.

لە ڕۆژی دواتر هارلۆ پەیوەندی کردەوە.

"ئەوان زۆر سوپاستان دەکەن، داوایان کرد من سوپاستان بکەم".

"ئەمە دەگەنە پیاوەکانمان".

هەر لەو کاتەدا سیخوڕێکی ئەفغانی کە بۆ سی ئای ئەی کار دەکات، کە کۆمەڵەیەکی تاڵیبانی سەربازی دەستیان بەسەر بارمەتەکانی شلتەرناو و ئەنتەرناشیونالْ گرتووە، هەڵاتوون بەرەو باشووری کابوول، ئێستا شوێنیان دیار نییە، بەڵام توانیویەتی زۆرێك لە بارمەتەکان بدۆزێتەوە، کە تاڵیبان وازیان لێیان هێناوە، ئێستا رادەکەن بەرەو سنووری پاکستان، بۆ ئەمەش سی ئای ئەی زانیاری هەواڵگری ناردووە بۆ هاوبەشە سەربازییەکانمان لە سەرکردایەتیی هاوبەشی ئۆپراسیۆنە تایبەتییەکان، بۆیە زۆر بەخێرایی چوون بۆ رزگارکردنی هەشت بارمەتەکە، ئەمەو لەپاش دوو رۆژ بە خێزانەکانیان شاد بوونەوە.

## قەڵای جانجی

بەندکراوەکان بوونە هۆکاری گرفتێك لەکاتی هێرشی ئاسمانی و وشکانی، لەو کاتەی شارە ئەفغانییەکان یەك لەدوای یەك لەباکوور خۆیان دەدەنە دەست هێزی ئەمریکی و ئەفغانی، هاوپەیمانە ئەفغانییەکان سەدان کەسیان لە دوژمن گرت، بەڵام بە هۆی نەزانینیان لە سیستەمی بەندینخانە، لەلایەکی دیکەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان هیچ پرۆتۆکۆلێکیان دانەنا بوو کە پەیوەست بێ بە دیلی جەنگ و

یان کەرەستەکان دابین بکات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دیلە دوژمنەکان، هەروا سی ئای ئەی هیچ شتێکی داوا نەکردبوو سەبارەت بە دیلەکان، چونکە ژمارەیەکی کەم لە سەربازانی ئەمریکی لەسەر زەویدا هەبوون، بۆیە بژاردەکە کەوتە دەست هاوپەیمانە ئەفغانییەکان، ئەوان نووسراویان نەبوو تەنیا بە زار هەموو شتێکیان چارەسەر دەکرد، وەکچۆن هەر وان.

زۆرترین ژمارە لە جەنگاوەرانی دوژمن لە پاشماوەکانی قەندوز خۆیان رادەست کرد، چونکە لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ درابوون لەپاشاندا هێزی ئاسمانی بۆمبارانی دەکردن، لەلایەکی دیکەوە جەنەرال دۆستەم یەکێك لە هاوپەیمانەکانمان لەو ناوچەیەدا بەرپرسیاریەتی زیندانیکردنی گرتە ئەستۆ، بەندکراوەکان زۆربەیان ئەفغانی و جەنگاوەری بیانی بوون، لەنێویاند ناپاکی ئەمریکی جۆن وکرلبند، دۆستم ئەوانەی گواستەوە بۆ قەڵای جانجی شوێنەوار، کەچەند میلیك لە مەزارشەریفەوە دوور بوو، بەو شێوەیە رووخساری بەندکراوەکان وەك دیواری قەڵاکە وابوو، لە کاتێکدا ئەو شوێنە بۆ جیاکردنەوەی بەندکراوەکان رێك نەخرابوو، هەروا پیاوانی دۆستەم هیڤ شارەزایەکیان لە پرۆسەی سزادان نەبوو، ئەوان تەنیا سەرباز و سوارچاکی خێڵەکان بوون، نەك پاسەوانی بەندینخانەکان، بۆیە نەیاتوانی بەتەواو بەندکراوەکان بپشکنن.

لە ٢٥ی تشرینی دووەمی ٢٠٠١ بەندکراوەکان یاخیبوون، ئەمەش لە کاتی پرۆسەی جیاکردنەوەی یەکێك لە هۆڵەکان، ئەوان چەکیان شاردبۆوە، هێرشیان کرد و بەخێرایی زاڵبوون بەسەر پاسەوانە ئەفغانییەکان و هێرشیان کردە سەر دوو ئەفسەری سی ئای ئەی، مایك سیان یەکێکە لە ئەفسەرەکان یەکسەر کەوت، هەروا دیڤید شەڕێکی زۆری کردبوو لەناو هۆڵەکەدا و لە رێگەی پلیکانەی ناوەوەدا، توانی بووی بەسەر پلیکانەدا سەربکەوێ لەو کاتەی تفەنگە

كلاشینكۆفەكەی ك-٤٧ بـەتاڵ كردبـوو لێیـان، ژمارێـەكی لێ كوشـتن، كاتێـك گەیشتبووە سەرەوەی دیوارەكـە پاسـەوانە ئەفغانییـەكان گەیشـتبوون، بۆیـە لێ نەگەڕان بچنە دەرەوە، بەڵام دەنگە دەنگ هەر بەردەوام بوو، هەروا شـەڕێكی زۆر توند بوو.

دیڤید گەیشتنە شوێنی دڵنیایی و لەوێدا تیمێكی هەواڵی ئەڵمانی بینی بوو و تەلەفۆنی لێ وەربگرتبوون، كە بەسـتراوەتەوە بـە كەشـتییە ئاسمانییـەكان، تـا پەیوەندی بە سی ئای ئەوە بكات لە تەشقەند، لە رێگەی خۆیەوە بە تیمی ئەلفای راگەیاند، هەروا دیڤید رای گەیاند كە مایك كوژراوە.

لەپاش كاتژمێرێكدا پەیوەندیم پێوە كرا، ئەو كاتە لەماڵەوە بووم، واتـە لـە پاش نیوەڕۆ رۆژی یەكشەممە، بەخێرایی بەرەو نووسینگە رۆیشتم لـە لانگلـی كـە بیست خولـەك دوورە، یەكـەم راپـۆرت وەك راپۆرتـەكانی دیكـە نێردرابـوو، زۆر پرسیاری تیادا بوو بەبێ وەڵامدانەوە، ئایـا مایـك زینـدووە یـان مـردووە؟ ئایـا بریندارە یان لەهۆش خۆی چووە؟ ئایا بەدیل گیراوە یان توانیویـەتی رابكـات، ئایا لە شوێنێك خۆی حەشارداوە؟

مایكم بەباشی نەدەناسی، بەڵام ئەو خاوەن كەسایەتییەكی بەهێز بـوو، ئـەو سەر بە بەشی چالاكییە تایبەتیەكان بوو، لەپێش دوو ساڵ لە مارێنزەوە هاتووە و پەیوەندی بە سی ئای ئەی كردووە، ئەو گەنجێكی پتەو بوو و فرتـوفێڵی زۆر بـوو، كەسێكی پیشەگەرە بەڵام نایەوێ تیشك بخرێتە سەری، كەسێكی هێمن بـوو، لـەم ماوەیەدا شانونی خواستووە ئـەویش ئەفسـەری سـی ئـای ئـەی بـوو، لـە كـاتی راهێناندا ناسیوویەتی، بەتایبەت ئەو كاتەی لە بنكەی دژەتیرۆردا كـاری دەكـرد، ئەو مامۆستای یاسا بوو و پەیوەندی بە سی ئای ئەی كردووە. تا بەشدار بـێ لـە

دژەتیرۆردا، کچێکی جوان و ژیر بوو، ئەفسەرێکی زۆر باش بوو، خۆی مایك دووانەیەکیان دورست کردبوو، هەروا مایك دوو کچی هەبوو لە هاوسەرەکەی پێشوویی، لە شانۆنیش کوڕێکی هەبوو بە ناوی جاك.

لە مانگی رابردوو پێش ئەوەی بچمە ئەفغانستان لە شانۆنم پرسی دەتەوێ شتێك بە مایك بڵێم، ئەویش وێنەیەکی نوێی جاکی پێ دام، من مایکم نەبینیبوو کە من لە ئەفغانستان بووم، بەڵام لە رێگەی ئەفسەرێکی دیکەوە وێنەکەم پێ گەیاند، ئەمەش دوا وێنەی بوو مایك تیایدا وێنەی کوڕەکەی دەبینێ.

من و بلاك و ماسی باسی ئەوەمان کرد، چۆن هەواڵەکە بگەیەنین بە شانۆن، بۆ ئەمەش کۆفر بە جێگرەکەی راگەیاند تا بچنە کالیفۆرنیا چونکە شانون سەردانی خێزانەکەی دەکات، ماسیم بۆ ئەلاباما نارد چونکە کەسەکانی مایك لەوێدا دەژین، نیگەرانین بووین نەوەك هەواڵەکە بگاتە دەست رۆژنامەنووسان، بۆیە بە هەموو خێزانەکانمان راگەیاند کوڕ و پیاوەکانیان لەوپەڕی باشیدان.

لە ژووره بچووکەکەم دانیشتم و تینیت بەرامبەرمە، نەمان دەزانی چی بەیەکتر بڵێین، ماوەیەکی زۆر دانیشتین، پەیوەندییەکم پێوە کرا، دیار بوو دۆخەکە خراپ بوو، ئەمەم بە تینیت راگەیاند، بۆیە چاوەڕێ بووین هەواڵی زیاترمان پێ بگا.

لەپێشتردا هەڤاڵی دیکەم لەدەست دا لەنێوەندی سی ئای ئەی، هەندێکیان بە هۆی توندوتیژییەوە و هەندێکی دیکەیان لەنێو رووداوەکاندا، بەشێکیان بە هۆی نەخۆشییەوە مردوون، پیاوەری یەکێك لەو ئەفسەرانە بووم لەتەك هاوسەرەکەی، ئەو تەمەنی سی ساڵە بوو، لەناکاو کۆچی دوایی کرد، موویەکم لە

قژی هاوسەرەکەی کردەوە و زۆربەی وێستگەکانی ترانزێتی جیهانم پێ کردووە، ئەو پیاوێکی باشبوو بەشانازییەوە خزمەتی وڵاتەکەی کردووە.

مایکیش بەو شێوەیە بوو، بەڵام دۆخەکەی زۆر جیایە، مایك لەژێر فەرمانی مندایە و ئێمەش لە جەنگداین.

دەزگاکانی راگەیاندن لەرۆژی دواتردا بەشێك لە چیرۆکەکەی بڵاوکردەوە، کوژرانی یەکەك ئەمریکی لە شەڕ لەپاش ١١-٩، بەڵام ناوەڕۆکێکی وای تیا نەبوو، ماسی لەو کاتەدا گەیشتە ئەلاباما، کەچی بۆنك تا ئێستا لە رێگەی کالیفۆرنیایە، لەلایەکی دیکەوە پنتاگۆن بەیانێکی رۆژنامەوانی دەرکرد، باس لەوە دەکات ئەوەی کوژراوە سەر بەوەزارەتی بەرگری نییە، بۆ ئەمەش هیچ هەماهەنگییەك لەگەڵ بەیانی سی ئای ئەی نەکردبوو.

بیل هارلۆ ئەفسەری کاروباری گشتی سی ئای ئەی پەیوەندی پێوە کردم، زۆر تورە بووم ئایا نەیان دەتوانی بوەستن تا هەواڵەکە بەشانۆن رادەگەیەنن؟ پنتاگون لەمە چی دەستکەوت؟ لەوانەیە بۆنك توانی بێ گەیشتبێتە کالیفۆرنیا لەپێش ئەوەی شانۆن گوێی لە هەواڵەکە بێ.

شانۆن ئۆتۆمبیلی لێ دەخوری کاتێك گوێی لە رادیۆ دەگرت، ئەو گوێی لە هەواڵەکە بوو، بۆیە لە رێگە لای داوە و پەیوەندی پێوە کردم.

"هەواڵەکەم ئێستا لە رادیۆ گوێ لێ بوو، باس لە کوژرانی یەکێك لە ئەفسەران دەکات، پنتاگۆن دەڵێ ئەو سەر بەوان نییە، واتە ئەمە یەکێکە لە ئێمە، ئەوە مایکە، ئەی وا نییە".

"بەڵێ شانۆن ئەو شەڕی دەکرد کاتێك پێکراوە، ناتوانین دڵنیا بین لەوەی مردووە، بەڵام دوور نییە، ئەمەش بە هۆی یاخیبوونێك بووە لە زیندان، کاتێك بانگی زیندانییەکانی کردووە".

"زانیم".

هەستم پێ کرد، ئەو لە یەکێك لە ڕێگەکانی کالیفۆڕنیایە و مۆبایلەکەی لە دەستدایە، لەو کاتەی ئۆتۆمبیلەکان بەتەنیشتیدا بەخێرایی تێپەڕ دەبن، ئەویش بووە ئافرەتێکی بێوەژن لەگەڵ سێ منداڵدا.

"بن بۆنك لە ڕێگەیە بۆ لای تۆ، لە ماوەی دوو کاتژمێری دیکە دەگاتە لات، هەموو ناوەڕۆکەکەت پێ ڕادەگەیەنێ، هێشتا ئێمە زۆر نازانین، هەروا تیمێك لەوێدایە تا بیدۆزنەوە، بەڵام شەڕ تا ئێستا بەردەوامە".

"تێدەگەم، سوپاست دەکەم".

بە هیدفۆنەکەم بەهێمنی دانا، لەو کاتەدا تا ئەو پەڕی ڕقم لە تالیبان و قاعیدە بۆوە، هەروا پڕوپووچی ڕاگەیاندنی پنتاگۆنیش لەولاوە بوەستێ.

پێنج ڕۆژ بەسەرچوو دوای داپلۆسینی ئەو یاخیبوونە، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە فەرمان بدرێ لەلایەن پیاوانی دۆستەم و سی ئای ئەی و هێزی تایبەتی ئەمریکی و هێزی دەریایی تایبەتی بەریتانی هێرش بکرێ، نزیکەی سەد بەندکراوی هەڵهاتوو گەڕێندرایەوە، لەپاشاندا تەرمی مایك لەوێدا دۆزرایەوە، کە تیایدا تەقەی لێ کرابوو.

لەپاش چەند هەفتەیەك لە کاتی ناشتنی لە گۆڕستانی ئارلینگنتۆن، شانۆن هاتە لام لە نووسینگەکەم، خۆمان ئامادە کرد و زۆر بەهێمنی پرسە و

سەرەخۆشیم لێ کرد و هانم دا، دەبێ تێی بگەیەنین کە مایکل وەك پاڵەوانێك کۆچی دوایی کرد، لەتەك ئەمەشدا دەستەیەك کلێنسم بۆی دانا.

جلوبەرگێکی زۆر شیاوی پۆشی بوو، پرسە و سەرەخۆشیم لێ کرد، ئەویش بەهێمنی فرمێسکەکانی دەکاتە خوارەوە.

"مایك لەو کاتە ژیانی لەدەست دا کە لەنێوەندی جەنگدا بوو، ئەو کاتە مرد کە دەبوایە لەو کارەدابێ، من زۆر شانازی پێوە دەکەم، ئەم کارەش بە پلەیەکی گەورە گرنگی خۆی هەیە، بۆیە دوو دڵی ناوێ و پێویستە کارەکەت ئەنجام بدەیت، مایك خۆی بە شتی دیکەوە سەرقاڵ ناکات".

بۆ هەموو شتێك خۆم ئامادەکردبوو، تەنیا بۆ ئەمە نا، بۆیە بەردەوام بووم لە هاندانی، هیچ کات خۆم بەو شێوەیە نەبینی بوو، یان چۆن ئەو دەتوانێ ئەم هێزەی هەبێ؟ لەو کاتەدا خۆشەویستیم بۆ مایك هەبوو، کە لەپێناو وڵاتەکەیدا ژیانی خۆی لەدەست دا، نووسینگەکەم زۆر بچووکتر لەوەی، کە هەبوو، ئەمەش هێزێکی سروشتییە، ئەو ئافرەتێکی زۆر جوان بوو، لەتەك پەرۆشییەکەی، پابەند بوو.

بەڵێنم پێ دا بەراستی لە جەنگ بەردەوام دەبین، هەروا باسی نوێترین کارەکانم کرد لە ئەفغانستان، لەو کاتەدا قەندەهار خۆی بەدەستەوە دابوو، هاوکات سەرکردایەتی تاڵیبان و قاعیدە بەرەو پاکستان رایان دەکرد.

سوپاسی کردم کە دوا پێشهاتم پێشکەش کرد، سوپاسی سەرکردایەتیی کردم، ئەو کاتەی رۆیشتیش هیچ فرمێسکێك لە چاوانی نەدەهاتەخوار، ئەو بۆ پرسە و سەرەخۆشی نەهاتبوو، بەڵکو هاتبوو هانم بدات.

بۆ ماوەیەکی زۆر بەتەنیا دانیشـتم، هەسـتم بـەوە کـرد توانـام زۆر نییـە و گۆمانم لە تواناکانم هەبوو، چونکە ئەو جۆرە هێزە هەبوو، ناتوانم هـیچ کەسـێکی دیکە وەك ئەو نموونەی ئازایەتی نییە، قسەکانیشی هەمووی هاندان بوو.

ماسی حەز بەوە دەکات، لە کاتی سەردانی شانۆن چی رووی داوە، هـەموو قسەکانم پێ گەیاند ئەویش لە رێگەوە خۆیەوە بە کۆفری گـوت و دواتـر هـەمان بابەت گەیشتە تینیت.

## تۆڵەکردنەوە

هێشتا هەوڵەکانمان لە باشوور روونـاك نییـە، وەکچـۆن ئـەوەی لـە بـاکوور کردوومانە بەتەواوی دیـارە، هاوکـات هاوبەشـەکانمان لـە بـەرەی یـەکگرتوو بـۆ چەندینجار کارزایان دانـا وەك تـا هـەلی بـاش، لەوانەشـە تاکـە کـەس بـێ بـۆ سەرکردایەتیی نیشتمانی، پێویستە سەرکردایەتی بدرێ بە یەکێك لە پشتۆنەکان، ئەمەمان لەسەرەتاوە زانی، هەروا زانیمـان تاکـە هیـوای کـارزای پەیوەسـتە بـە گریگ، کە لە ماوەی ساڵی رابردوودا پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵیدا ئەنجام دا.

لەلایـەکی دیکـەوە هەڵمەتـەکانی سـەرکردایەتیکردنی سـی ئـای ئـەی لـە ئەفغانستان پەیوەسـتە بـە هـەواڵگری و تەجنیـد، هـەروا مامەڵـەکردن لەگـەڵ سیخوڕەکانی سی ئای ئەی لەپێناو پـارە و بـاوەڕ و چەسـپاندنی خـود، هاوکـات شێوەیەك لە تۆڵەکردنەوە، کە لەلایەن کەسانی دیکەوە هەیە.

لە بنکەی سەرکردایەتی چاودێری گریگ و تیمەکەیم کـرد کاتێـك بـە شـەو ئۆپراسـیۆن دەکـەن، ئـەو کاتـەش نهێنیـی شـەوانە ئـایکۆ بـوو لـە پەخشـێکی

راستەوخۆی بریداتۆردا، ئەم تیمە هاوبەشە پێکهاتبوو لە سی ئای ئەی و یەکێکی حەوت کەسی هێزی تایبەت.

کۆپتەری سی ئێچ-٤٧ بەشێوەیەکی نزم لەسەرووی چیایەکانەوە و تۆزوبایەکی زۆری بەرامبەر بە فرۆکەوانەکان دروست کردبوو، بەڵام یەکێك لە فرۆکەوانەکان چاوانی دەگێڕا بۆ ئەوەی ئاسۆیەك ببینێت، لەو کاتەدا گولەیەکی ئار بی جی بەرەو روویی دەهات، کە لەلایەن تاڵیبانەوە تەقیندرابوو، کەمێك لەنزیك کۆپتەرەکەی دیکەوە، ئەمەم زۆر بەروونی لەنێوەندی شاشەکەوە دەبینی.

بیرم لەوە کردەوە کورەکان کۆتاییان پێ دێ لەپێش ئەوەی کۆپتەرەکانیان بهێننە خوارەوە، لەو کاتەدا هیچ رێگەیەك نەبوو تا رزگاریان بکەین، یان چۆن لەو کاتەدا بیانگۆڕین بە کەسانی دیکە؟

باشترین تیمی نیمچە سەربازی بوو، پێکهاتەکەیان نموونەیی بوو لەگەڵ سیخوڕەکانی سی ئای ئەی و سەرکردایەتیی هاوبەشی ئۆپراسیۆنی تایبەت، پێشتریش گریگ لە تیمی چاودێری مارێنز کاری کردووە لەپێش ئەوەی بێتە ناو چالاکییە تایبەتیەکان، هەروا جیمی کوڕێکی بچووك و رێکوپێك و زمانشیرین، ئەو کۆلۆنێلی یەکەم بوو لە هێزی دەلتا، لەپێش ئەوەی پەیوەندی بە سی ئای ئەیەوە، لەپێش چەند ساڵێکەوە لە پێشبڕکێی رم هاوێشتن پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە، ئەو ئێستا باشترین سیخوڕە لە هاوپەیمانی ئەتڵەسی و لەنێوەندی تیمێکدایە هەموویان پێشبڕکێ دەکەن.

هەردوو کۆپتەر لەو کاتەدا مانۆڕیان دەکرد هەر یەك بەلایەکدا، لەم کاتەدا هەردوو تیم لە دەرگاکانەوە خۆیان فڕێدایە خوارەوە و هەردوو تیمیش یەکتریان ون

کرد و بەدوای یەکتردا دەگەڕان، دوای پەیوەندیکردن یەکتریان دۆزییەوە چوونە نـاو دالّدەیەکی هاوپەیمانەکانی ناوچەکە.

کۆپتەرەکان لەدەوروبەر و نزیکی دوژمنەکان نیشتنەوە، بـەلّام کـارزای بـە هۆی هێز و چۆنیەتیی فەرمانداریـەتی، تـوانی زامنـی هاوکـاری خێڵەکـەی لـەو ناوچەیەدا، پێشوازیان لە تیمی سی ئای ئەی کـرد و هێزێـك ئـەوانیان پاراسـت، کارزای تا ئەو کاتە بـێ ئومێـد بـوو و پێویسـتی بـە هاوکـاری هـەبوو، هـەروا خێڵەکەی تا ئەو کاتە دوودڵ بوون نەوەك پابەندبوونـەکانیان درێژخایـەن بـێ، بـۆ ئەمەش کارزای داوای لە گریگ کرد قسە بۆ ئەنجوومەنی خێڵەکـەی بکـات، کـە ناسراوە بە "جیرگا" کە لە گوندی تارین کوت بچووکی دوورە دەستە.

هەموو دەنگی بەشداربووەکان لە جێرگا تەنیا دەنگی پیاوە، ئافرەتان ناتوانێ دەنگی بەرزبکاتەوە ئەوان وەك کۆیلەیەك وان، هـەروا جـەنگاوەرە خێڵەکییـەکان پابەندن بە پاراستنی هەموو ئەوانەی سەردانیان کردوون، هەروا تیمی ئایکۆش بە هەمان شێوە، تا ئەو کاتـەی لـەوە تـێ دەگـەن کـە ئـەو بیانیانـە چـیان دەوێ، لەپێشتردا کارزای شیکردنەوەی خۆی پێشکەش کرد، بەلّام بیانییەکان چی دەڵێن؟ ئایا ئەوان پارێزگاری لە خۆیان و خانەوادەکانیان دەکەن؟ ئەمەو تالیبان و بیانییە هاوپەیمانەکانیان لە قاعیدە ژمارەیان زۆر زیاترە، کەچی دەبێ ئەو پلانە جێبـەجێ بکەن تاوەکو قەندەهار بڕۆن؟ ئەمەش شەست میلی ترسناکە تا دەگەنـە باشـوور، لەپاشاندا دەست بەسەر ئەو شارەدا بگرن؟ ئەمە چۆن روودەدا؟

ئامادەبوونی جیرگا بە ریشە درێـژەکانیان دانیشـتن، رووخسـاریان ئەوەنـدە خۆر لێی داوە هەمووی بۆتە لـۆچ، کەچـی جامانـەکانی سـەریان رەنگـاورەنگن، زۆربەشیان ددانیان لـە دەمـدا نییـە، هاوکـات هـەر هـەموویان چـەکدارن، زۆر

بەهێمنی گوێیان بۆ کارزای گرت کاتێك گریگ وەك میوانێـك پێشـکەش کـردن، گریگ سەری سوڕما لەو جەنگاوەرانە قژیان درێژە و ریشیان پان و درێژە، هـەروا بیری لەوە کردەوە چۆن ئەوانە رازی بکات تـا بێنـە ریـزی چـەکدارییەوە، گـریگ سوپاسی ئەو میوانداریيەی کرد. باسی لە ئازایەتی کـارزای و سـەرۆکایەتییەکەی کرد، باسیشی لەوە کرد کە قاعیـدە بـە هاوکـاری تاڵیبـانی ئـەفغانی هێرشـیان کردۆتە سەر خاکی ئەمریکی، هەروا باسی لەو کارەساتە کرد کە ژنان و پیـاوان و منداڵان چۆن مردوون، بۆیە ویلایەتە یـەکگرتووەکان بـەڵێنی داوە تۆڵـەی ئەمـە کارەساتە بکاتەوە، باسیشی لەوە کرد جەنگاوەرە ئەفغانییەکان باجی خوێنی داوە چونکە بەشێکی زۆر لە سەرکردەکانیان بەدەستی ئەوان کوژراون، وەك ئەحمەد شـا مەسعوودیان پارچە پارچە کردووە، لەپاش ئەوەی قاعیدە بۆمبێکیان هاوێشـتووە بۆی، لەو کاتەی بە بیانووی کامیرای ڤیدیۆیی خۆیان حەشارداوە، هـەروا تاڵیبـان عەبدولحەقیان بەدیل گرتووە، لە کاتێکدا ئەو جەنگاوەرە دژ بە سۆفیەتیش شەڕی کردووە، لەپاش ماوەیەك لـە ئەشـکەنجەدان، لەسـێدارەیان داوە، بۆیـە پێویسـتە جەنگاوەرە ئەفغانییەکان بەشدار بن لە جەنگی پیرۆزدا؟ ئەی چـی دەڵـێن لـەوەی گەلی ئەفغانی بەدەست ئەو کۆمەڵە چەوسـێنەرە ناڵاندویـەتی؟ پێویسـتە لەسـەر ئەفغانییەکانە دژ بە قاعیدە بجەنگێن ئایا ئەمە بەرپرسیاریەتی و ئەرك و شەرەفی جەنگاوەر نییە؟ ئا پیاوانی راستەقینەی ئەفغانسـتان رێگـە دەدەن کەسـانی وەك عەرەب و چیچان و ئۆزبەك و پاکستانی لەژێر ئاڵای قاعیدە داهاتووی ئەفغانستان دیـاری بکـرێ؟ وەکچـۆن نـاتوانن بێنـە نـاو ئـایکۆ، بـەو شـێوەیە ویلایەتـە یەکگرتووەکان دژ بەو دوژمنە هاوبەشـەمانە؟ قاعیـدە داگیرکـەرێکی بیانییـە و وڵاتی ئێوەی کردۆتەماڵی خۆی، بۆیە ئێستا کاتی ئـەوە هـاتووە تۆڵـەی خۆتـان بیسننەوە.

جێرگا بەو قسانە زۆر کاریگەر بوون لەم کاتەدا گریگ هەموو رووەکانی بەجوانی دەبینی لە سەرلەقاندن، پرسیاری ئەوەی دەکرد دەبێ ئەنجامەکەی چی بێ، بەڵام هیچ بژاردەیەکی دیکەیان نەبوو، تاکە باسیش ئەوەیە بەرەو قووڵایی ئەفغانستان بەلای باشووردا بڕۆن، ئەم شوێنەش دڵی خاکی تاڵیبانە، بۆیە پێویستە سووپایەکی تایبەت دروست بکرێ تابتوانن شکست بە دوژمن بگەیەندرێ و قەندەهار داگیر بکرێ، هەروا دەبێ کارزای بەزیندوویی بمێنێتەوە.

ئەنجوومەنی جێرگا چەندین پرسیاریان کرد بە هۆی کەمی ژمارەیان بەرامبەر بەو ژمارە زۆرە تاڵیبان و قاعیدە؟ ئەی سەبارەت بە چەك؟ پشتگیری ئاسمانی؟ چی روودەدا ئەگەر شکستیان هێنا؟

گریگ و کارزای کارێکی زۆر باشیان کرد، گریگ لەوێدا سەبارەت بە تۆڵەکردنەوە شەرەف و ناسنامە و پیاوەتی ئەوانی خستە روو.

لە کاتێکی دیکەدا کاتێك گریگ لە خەوێکی قووڵدا بوو، نێردراوێك کاتژمێر ۲:۰۰ بەهێمنی بانگی کرد:

"حەمید حەمید" گریگ لەم کاتەدا بیری لەوە کردەوە کارزای لەو کاتەدا چی دەوێ؟

گریگ لەدوای نێردراوەکە چوونە بارەگای کارزای، ئەو باڵەخانەیەش پێشتر سەر بەسووپای تاڵیبان بووە لە تارین کوت، کارزای لە گۆشەیەك دانیشتبوو، خۆی لەنێو پاڵتۆکەی نابوو، تووشی کۆکەش بوو بوو، بە چاوێکی ماندووە و سەیری ژوورەکەی دەکرد، کە چەندین پیاوماقووڵ دەوری دابوو، لە کاتێکدا هەموویان سەیری گریگیان کرد.

کارزای گوتی "ئەوان دەیانەوێ بـزانن ویلایەتـە یـەکگرتووەکان دانوسـتاندن لەگەڵ مەلا عومەر دەکەن".

گریگ لەم کاتەدا بەئاگاییەوە سەیری هەمووانی کرد و گوتی "سـەرۆکەکەم گوتوویەتی یان ئەوەتا لەگەڵ ئێمە دەبن، یان دژی ئێمە دەبن، ئێمە چـۆن بتـوانین دانوستاندن لەگەڵ مەلا عومەردا بکەین، تەنیاش ناخۆشی و مردن و کارەسان بـۆ ئێوە دەهێنێ؟ ئێمە دانوستاندن لەگەڵ ئەو ناکەین، ئێمە لەگەڵ ئێوەدا دەجـەنگین تا سەرکەوتن".

کارزایش هەموو قسەکانی بە زمانی خۆیان بۆیان وەرگێڕا.

هەموو پیاوەکانی ئەو ژوورە سەریان بۆ لەقانـد، لەپاشـاندا هـەموو بەیـەك دەنگ گوتیان " ئـاوف و ئـاوف ئـاوف" بـەو واتایـەی هـەموویان ڕەزامەنـدن، ئەوانیش دەجەنگن، بۆیە کارزای و گریگ سوپایەکیان پێکهێنا، کارزای سوپاسی گریگی کرد و زۆر بەرێزەوە داوای لێ کرد دەتوانێ بڕوا، گریگ بیری لەوە کـردەوە کە یەکسەر بچێ بخەوێ، هەر تازە بە ناوی سەرۆکی ویلایەتـە یـەکگرتووەکان بـۆ سەرکردە خێڵەکییەکان قسەی کردووە، ئایا دەسەڵاتی خۆی بەزانـدووە؟ بۆیـە لـە دڵی خۆی رازی بوو کە لە هەمانکاتدا دەبێ بڕیار بدەی، نـەفرەت ئەمـەش بـووە هۆی ئەوەی پەیوەندی بە سی ئای ئەیەوە بکەم، لەوانەیە بەیانی بروسـکەیەك بـۆ فرانك بنێرم، یەکسەر خەوی لێ کەوتەوە.

لە هەژدەی تشرینی یەکەمی ٢٠٠١ لـەدووری چـەند میلێـك لـە باشـووری تارین کوت و لەسەر رێگـەی قەنـدەهار، ئـایکۆ و هاوپەیمانـەکانیان رووبـەڕووی تاڵیبان و قاعیدە بوونەوە، دژمن کاروانێکی لە قەنـدەهارەوە نـارد، هەنـدێك لـە پیاوانی کارزای تووشی دڵەراوکێ بوون لەو ژمارە زۆرە و رایان کرد، کەچی گریگ

هەندێکی دیکەی راهێنابوو تا بەرەو پێشەوە بچن، داوای لە پیاوانی ئایکۆش کرد هەمان کار بکەن، ئەگەر نەتوانن یەکگرتوو بن ئەوا لەوانەیە هەموو لەناوبچن، لەمەش خراپتر شکست دەهێنن، ئەگەر قاعیدە توانی لە باشووری ئەفغانستان بمێنێتەوە ئەوا ئەمریکا هەردەم لەژێر هەڕشەدا دەبێ، بە نەبوونی کارزای تا زاڵبێ بەسەر قەندەهاردا، ئەوا خێڵە پشتۆنییەکان لەگەڵ کەسانی دیکەی جگە لە پشتۆن دەبنە هاوپەیمان، بەو شێوەیە بەختی ئەفغانستان کەم دەبێتەوە تا ببێتە دەوڵەتێکی نەتەوەیی، ئەوەش خاڵی وەرچەرخانە لە جەنگ.

ئایکۆ و هاوپەیمانە ئەفغانییەکان دوای ئەوەی هەموو کۆبوونەوە توانیان جەنگێکی مەزن ساز بدەن، هاوکات چاودێری هێزە ئاسمانییەکان زۆر بەوردی لە ئامانجەکانیان دەدا، دەیان بۆمبی گەورەیان خستە سەر بارەگاکانی دوژمن، بۆ ئەمەش ئایکۆ و ئەفغانییەکان لەسەر هێڵەکانی ئاگر نوێژیان کرد، هەردەم بە کلاشینکۆفەکەیان لە هێڵی بەرامبەری دوژمندا بوون، زۆرێك لە کاروانەکانی دوژمنیان کردە خۆڵەمێش، هەروا سەدان لە دوژمنەکان لەوێدا کوژران.

ئایکۆ و ئەفغانییەکان هێرشی بەرامبەریان بەرپەچ دایەوە، ئەوانەی لە قاعیدە و تاڵیبان مابوونەوە هەموویان رایان کرد بەرەو قەندەهار، هیچ کاتێکیش ئەو جۆرە ئۆپراسیۆنەیان نەبینی بوو.

هاوکات بۆ هاوپەیمانە ئەفغانییەکانیش هەمان شت بوو، لەو کاتەی هێرشی ئاسمانی بەو جۆرە وردبینیە بوو، لەگەڵ ئەوەی کارایی کارزای و تیمی ئایکۆ و ئازایەتییان سەرچاوەی جۆشوخرۆش بوو بۆیان، لەپێشتردا ئەو جۆرە سەرکەوتنە خێرایەیان بەخۆیەوە نەبینی بوو، لە هەمووشی گرنگتر ئەمریکییەکان وەفادار بوون بەرامبەر بە بەڵێنەکانیان.

کارزای سووپایەکی بچووکی پێکهێنابوو، لە یەکەم شەڕەدا زۆر گـرنگ بـوو سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، هەروا لە چەند هەفتەیەکی دیکە هـەمان سـوپا بـە سەکردایەتیی ئەو بەرەو جەنگ دەڕۆن، ئەمـەو کـارزای و گـریگ هاوبەشـییەکی قووڵیان ڕێکخست تا بەرەو باشوور هەنگاو بنێن واتە بەرەو قەندەهار، بۆ ئەمەش گریگ و ئایکۆی هاوڕێیی لەسەر هێڵی جەنگدا بوون، هـەردەم ئالنگـاری ئـاگری دوژمـن بـوون، هـەردەمیش لەئامادەیـدا بـوون، لەلایـەکی دیکـەوە چـەکە تێکچووەکانیان چاك دەکردەوە و هێرشیان دەبرد و مردووەکانیان دەشاردەوە.

هەروەها ڕووبەڕووی چەند ئاستەنگی ناروون بوونەوە، لەو کاتـەی هاوپەیمانـە ئەفغانییەکان چایان دەخواردە و لەپاشـاندا نوێـژیان دەکـرد، ئەمـەش بەرنامـەی پشتگیریی سەربازیی ئەمریکیان دوا دەخست، گریگ ئەمـەی بەنیگەرانیـەوە بـۆ هاوکارە سەربازە ئەمریکییەکانی باس دەکـرد، کـە ئەمـە جۆرێکـە لـە سـانایی جەنگی ئەفغانی، هەروا دەتوانن ڕاهێنانیان پێ بکەن تـا لـە هێڵـەکانی پێشـەوە ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە، بەڵام ناکرێ ئەوەیان لەبیر بچێ لەو کاتەی نوێژ دەکـەن یان چا دەخۆنەوە.

ئایکۆ توانی پەیوەندییەکی قووڵ ببەستێ بە هۆی کارە ڕۆژانەکانی بەتایبەت میلیشیا خێڵەکییەکان بەسترابوونەوە بەنوێترین هێزی ئاسمانی لە جیهاندا، هەموو ئەمانە لە هەموو ئەفغانستاندا دووبارە دەبوونەوە، بۆ ئەمەش تیمەکانی سی ئای ئەی توانیان جەنگاوەرە دێرینەکانی پێشتری سـەردەمی پیشەسـازی و فڕۆکەوانـە نەبیندراوەکانی سەردەمی ئاسمانی بەیـەکتر ببەسـتنەوە، لـەو جەگانـەی لـەناکاو دەست پێ دەکەن و ئەنجامی باش بدەنە دەست، دیـارە جـەنگ و دڵنیـایی خـاکی ئەمریکی پەیوەست بوون بەیەکتریەوە.

لە یەکێك لـەڕووداوەکان دەوریـیـەکی بچـووکی چیچـانی توانیـان بەرپەچـی پیاوانی کارزای بدەنەوە، لەدواتردا رایان کرد بۆ ناو چیایەکان و لەوێشـدا گـریگ چاوەڕوانیان بوو، لەوێدا ئەو پیاوانە داوایان کرد هێرشی راستەوخۆ ئـەنجام بـدرێ، گریگ لەو کاتەدا ئاماژەی بە شوێنێك کرد لەو کاتەدا بۆمبێك لە ئاسماندا هاتـە خوار زربەیانی پارچە پارچە کرد.

ناخۆشترین رووداویش کـە ئـایکۆ رووبـەڕووی بوونـەوە کاتێـك لـە رێگـەی قەندەهار بوو کەچی لەلایەن هاوڕێکانیانەوە ئاگرباران کرا، لەو کاتەدا یەکێك لـە پیاوانی ئایکۆ پیلەکانی ئـامێری سیسـتەمی دیـاریکردنی شـوێنەکانی دەگـۆڕی لەجیاتی شوێنی دوژمن دەستنیشان بکات، شوێنی خۆیانی دەستنیشان کرد، لەو کاتەدا فرۆکەی ئەمریکی بۆمبێکی هاوێشتە ناویان، گـریگ هـەر زوو خـۆی بـە کارزای دادا تا بیپارێزێ، هاوکات چەند کەسێك لە تیمی ئـایکو و هاوپەیمانـەکان کوژران یان بریندار بوون.

هەموویان تووشی شۆك بوون، لەمکاتەدا تالیبان پالەپەسـتۆی خسـتە سـەر هێرشـەکە، بـەڵام پیـاوانی ئـایکۆ هـەر زوو خۆیـان کـۆکردەوە و گرنگیـان بـە بریندارەکان دا لە هەمانکاتدا شەڕیان دژ بە دوژمن دەکرد، ئەوانەی رزگاریان بوو بەرەو باشوور هەنگاویان نا واتە بەرەو قەندەهار.

لە هەمانکاتدا تیمی فۆرکس تروت و ملیشیا پشتۆنییەکان کە سەر بە غۆل ئاغای شیرازی بوون شەڕیان لە سـنووری پاکسـتان ئـەنجام دا و بـەرەو قەنـدەهار دەچوون، بەو شێوەیە هەردوو ملیشیای هاوپەیمان دوژمنیان گەمارۆ دا.

قەندەهار کەوتە دەستی هێزەکانی ئایکۆ و لەو رۆژی شەرمەزرای کارزای کە دەکاتە ١٩٤١ چووە ناو قەندەهار واتە لە رۆژی حەوتی کانوونی یەکـەمی ٢٠٠١

ئەو رۆژەش ناونرا بە رۆژی سەرکەوتن لەجیاتی رۆژی شەرمەزاریی. فۆکس تـروت لەلای رۆژهەڵاتەوە چوونە پێش بەمەش تاڵیبان پایتەختە رووحییەکەیان لەدەست دا، ئەمەش دوا قەڵای مەدەنی دوژمن بوو لە ئەفغانستان، ئەمە لێدانێکی گەورە بوو لە مەلا عومەر و کۆمەڵەکەی، کە لەپاشاندا بەرەو سنووری پاکستان رایـان کرد.

گریگ و تیمی ئایکۆ گەورەترین پرۆسەی تەجنیدکردنیان ئەنجام دا لە رێگەی کاری شاراوە، ئەمەش تۆمارێکە لە مێژووی سی ئای ئەی، بۆ ئەمەش ئاژانسەکە نیشانەی "ئەستێرەی هەواڵگری" بەخشی بەگریگ کە هاوتای مەدالیای شەڕەفە، وەکە رێزلێنانێك بۆ سەرکردایەتییە جیایەکەی.

## رقلێبوونەوە

دەکرێ رقلێبوونەوە، لە ئۆپراسیۆنی دژەتیرۆر و جەنگ رۆڵێکی بەرچاو ببینێ لە کۆکردنەوەی هەواڵگریدا.

تۆنی جێگری سەرکردەی تیمی دەلتای هاوبەش لەنێوان سی ئای ئەی و هێزی تایبەت، لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠١ تیمەکەی لە چیاکانی ناوەڕاستی ئەفغانستان دابەش کرد، ئەمەو تیمەکەی پەیوەندی بە میلشیا هەزارە سەر بەکەریم خـەلیلی کرد، هەزارە پێشوازی لیّ کردن، ئەوان ژمارەیەکی کەمی شیعەن لە ئەفغانستان، ئەوانیش چەوساندنەوەیەکی زۆریان بەدەست تاڵیبانەوە بینی بوو.

ویلایەتە یەکگرتووەکان رازیبوونی خۆی و پابەند بوونی قـووڵی هـەبوو بـۆ جەنگەکە، بۆ ئەمەس دەلتا لە هەفتەکانی یەکەمدا ئامانجە سـەرەتاییەکانی پـێ

کا: لـە کۆکردنـەوەی هـەواڵگری و قووڵبوونـەوەی هاوپـەیمانی و هاوکـاریکردنی هاوپەیمانە ئەفغانییەکان لەو کاتەی تاڵیبانی شکست پێ هێنا لە هەرێمی بامیان، هەروا زاڵبوو بەسەر ئەو ڕێکانەی دەڕوانێتە ڕۆژهەڵات کە بەرەو کابوڵ دەڕوات.

هەروا دەی ویست کارێکی دیکە بکات.

تۆنی وەك گەنجێك درێژەیەکەی لە مامناوەندی کەمتر بوو، هـەردوو شـانی زۆر دیار بـوو و قژیشـی رەش، زۆر بەئاسـانی خەنـدەی بڵـاودەکردەوە، پێدەچـوو رەزامەند بێ، هەردەم وەك بۆیەك سەیرم دەکرد کێکی باستا پێشکەش دەکرد لـە یەکێك لە کافییەکان، وەك ئەوەی هەموو رێبواران رازی بکات هەردەم خەندە لـە لێوانیدا بوو، پێشتر تەنیا لە رێگەی کارەکانیەوە ناسیم.

ئەو بە هۆی راهێنانە سەختەکان، وەك ئەوە وابوو بـەرد بتوێنێتـەوە، کاتێـك رای دەکرد دەی توانی هەموو هێزی خۆی تیـادا بـەکاربێنێ تـا دەگاتـە شـوێنی خۆی.

لەنێوەندی کانوونی دووەم هاوپەیمانە ئەفغانییەکان بەرەو فراوانی دەڕۆیشـتن، رۆژ بەرۆژ دەسەڵاتیان زیاتر دەبوو، ئەوە جگە لە زاڵبوونیان لەسەر زۆربەی لاکانی وڵاتدا، بەو شێوەیە تاڵیبان و قاعیدە لە ترس و دڵەڕاوکێدا بوون، زانیمان ئوسامە بنلادن هەوڵدەدەن رابکەن، بەتایبەتی لە شکستیان لە تۆرا بۆرا.

لە کۆبوونەوەی ئەرکاندا فەرمانێکم دا کە " پێویستە هەواڵی زیاتر بدەین تا هەواڵگریمان زانیاری لەسەر بـنلادن و سـەرکردەکانی دیکـە پەیـدا بکـەن، ئێمـە توانیمان ژمارە سێیان بکوژین، کە محەمەد عـاتف و چـەندانی دیکـە بـوو، بـەڵام دەمەوێ هەموویان بکوژین".

یەکێك لە شیکەرەوەکان لـە بارەگـای سـەرکردایەتی لـە وەڵامـدا گـوتی "عیمادئەڵلا سەرۆکی هەواڵگری تاڵیبان نامەیەکی بە هۆی نێوەندەکانەوە ناردووە، دەیەوێ قسەی لەگەڵ بکەین، چ وەڵامێکی بدەینەوە؟".

پـێم گـوت "قسـە دەکـەین، پرۆتۆکۆلێـك ئـەنجام دەدەیـن، ئەگـەر تـوانی سەرکردەکانی قاعیدەمان رادەست بکات"، هیچ گومانم نەبوو قاعیـدە دوژمنـی ئەمریکایە، تاڵیبانیش تەنیا لە خزمەتیاندان، ئەگەر دەیانەوێ با نەبنە ئاستەنگ تا ببینە ئامرازێك بۆ لەناوبردنی قاعیدە.

لەپێشتریشدا عمادئەڵلا و لە زۆر کاتی جیـاواز ئـارەزووی لـەوە بـووە قسـە بکەین، وەك لە تەمووزدا چەند مەرجێکی دیاری کرد، ویستیان بـەردەوام خۆیـان شایستە بن، لەوەش گرنگتر زیاتری دەویست لـەوەی بەرژەوەندییـەکانی ئـەمریکا پاساوی بۆ دەهێنێتەوە، ئەو جێگەی متمانە نییە، بەڵام هەلێکی پێ دەدەم، تەنیا بژاردەیەکی ساکاری دەخەمە پێش.

پرسیارم کرد" کێ کار لەسەر ئەو پەیوەندییە دەکات".

"تۆنی".

"باشە".

لەگەڵ تیمەکەم لە بارەگای سەرکردایەتی هـەموو وەرچـەرخانە کردەییـەکانم تاوتۆ کرد، رەزامەند بووم تا تۆنی لەگەڵ عمادئـەڵلا کۆبوونەوەیـەکی راسـتەوخۆ ئەنجام بدەن، دەبێ لـە کۆبوونـەوەی یەکـەم بۆمـان بسـلەمێنێ، ئەگـەر زانیمـان بیجوولێنین، ئەوا دەکەین بە سیخوڕێکی ئاراستەکراو، بۆیە ئەو کارە بکەن، هەروا پاداشتی ئەوانە دەکەین ئەگەر ئوسامە بنلادن و کەسانی دیکەمان رادەست بکەن.

بژاردەی دووەم: بەدیلگرتن و لێکۆڵینەوە کردن لەگەڵیدا.

"سێیەم، ئەگەر نەمان توانی دەستگیری بکەین بە هۆی بەرگریکردنی، ئەوا داوا لە تۆنی دەکەین هەموو ئەو شتانە بەکار بێنی بۆ خۆپاریزی خۆی و تیمەکەی، بە شێوەیەکی دیکە بابیکوژن ئەگەر کات لواو بوو".

لە رۆژی پاشتر پوختەیەکم دا بە کۆفر و تینتی بەڕێوەبەر و هەموو بەشداربووانی کۆبوونەوەی کاتژمێر ۱۷:۰۰ کە لە هۆڵی کۆبوونەوەکانی نهۆمی حەوتەم داوای رەزامەندیم نەکرد، بەڵام پێیانم راگەیاند وەکچۆن هەمان شتم لەگەڵ تیکەمدا کردووە، هەموو رووەکانم خستە روو هلوکات بلی ئەنجامە پێشبینیکراوەکانم کرد، کۆفر هیچ هەڵچوونێکی پێوە دیار نەبوو، چونکە تەنیا بەهاتنی ئەو واتە ئەوانی دیکە لێی دەترسن، ئەو هیچی نەگوت و ناچاریش نەبوو هیچ بڵێ، لەم کاتەدا تینیت جگەرەکەی خستە دەمی، کەس دژی نەبوو و کەسیش گفتوگۆی نەکرد.

هیچ کاتێك ئاماژەم بە ئەنجامەکانی نەکرد، وەك ئەوەی تۆنی و تیمەکەی بەدیل دەگرن و لەپاشاندا رووبەڕووی ئەشکەنجە و کوشتن دەبنەوە، لەدواتر قاعیدە وێنەیان بە ڤیدیۆ دەگرن و لە ئەنتەرنێت بڵاوی دەکەنەوە، ئەمەش بەزیەکی دیکەیە لەجیاتی ئەوەی لە شەڕدا بکوژرێن.

شوێنی کۆبوونەوەکەیان لە ناوچەی غازنی کێشە لەسەر دیاری کرد، کە زەوی حەرامە، ئەمەو تۆنی و سێ لە سیخوەڕە ئەمریکییەکان و ژمارەیەك لە ئەفغانییەکان بەرێ کەوتن سەرەتا بە ئۆتۆمبێل چوون لەپاشان بە پیادەیی تا بگەنە شوێنەکە، لە ماڵێك هیچ کات جیا نەبوو، ئەوەی سەیرە بریداتۆر بە هیچ

شێوەیەك وێنەی ئەو شوێنەی نەگرتووە، هیچ یارمەتییەکی ئاسمانیمان پێ نەدان، ئەوان بەتەنیا بوو.

عمادئەللا نەهاتە کۆبوونەوەکە بەڵکو یەکێکی لەجیاتی خۆی نارد، ئەویش هەموو شتێکی دەزانی، بەڵام شکستی هێنابوو لەوەی هەواڵگری بۆ سوودوەرگرتن بەکار بێنێ، بە شێوەیەکی دیکە هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو تا لەگەڵیدا رێك بکەوین، هەروا ئارەزووی لەوە نەبوو خزمەت بەسی ئای ئەی بکات تا بتوانێ هەواڵی تاڵیبانمان بۆ بنێرێ، ئەو تەنیا فەرمانی سەرۆکەکەی جێبەجێ دەکا، هیچ پێشبینیەك نییە تا لەو کۆبوونەوەدا لەسەری رێکبکەوین.

تۆنی پەیوەندی نەکرد تا رێنماییەکانی پێ بدەین، ئەو کاری خۆی دەزانێ، وەك دانایی لە کارەکان لەو کاتەی سەرکردایەتی دەوێ بەرپرسیاریەتییەکە بگرێتە ئەستۆ.

لەو کاتەدا ئاماژەیەکی دا تا تیمەکەی زاڵ بێت بەسەر مەفرزەکەی تاڵیباندا، هەموویان بەستانەوە و لەنزیك خانووەکە بەجێیان هێشتن، نوێنەری عمادەڵا لە مافوورێك لوولدا، ئەمەو لەو دۆخەدا مافوورەکەیان لەگەڵ خۆیاندا برد، تا ئەو شوێنەی کۆپتەرەکە دەنیشێتەوە بۆ هەڵگرتنیان.

بەندکراوە تاڵیبانییەکە لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا هەموو شوێنی سەرکردایەتی قاعیدە و تاڵیبانی ئاشکرا کرد، ئەوە جگە لەو شوێنانەی کە جبەخانەکان لە سنووری پاکستانەوە دێ، لەپاشان بە هۆی هەواڵگرییەوە جەختمان لەسەرچاوەکان کردەوە، داوامان لە فرۆکە بۆ بێ فرۆکەوانەکان کرد تا هێرشی بۆمب دەست پێبکەنەوە.

فرۆکە ئەمریکییەکان شوێنەکانی دوژمنیان خاپوور کرد، تەنیا گۆشت و ئێسك مایەوە، دەیان کەس لە تالیبان و قاعیدە لەناوبران، بریداتۆر لە کاتی هێرشدا وێنەی یەکێکی نیشاندایین کە بەپێیەکانی رای دەکرد، تا گەیشتە ماتۆڕسکلێك، ویستی رابکات، زۆر دوور نەکەوتەوە لەناو تەقینەوەیەکدا ون بوو، لە شاشەی ڤیدیۆ چاودێریمان کرد، لەدواتردا زانیمان ئەو عمادەللّای سەرۆکی هەواڵگری تالیبانە.

ئەو رازی نەبوو بە خستنە رووەکەی ئێمە.

## هەستکردن و کەسایەتی و شەرەف

باشترە لێك نزیککردنەوەکان گشتی بێ لە بەکارهێنانی کاری شاراوە وەك هەموو بابەتەکانی دیکەی کۆکردنەوەی هەواڵگری، کە پێویستی بە گۆڕچان وەشاندن دەکات، هەروا پێویستە جێبەجێکارانی کاری شاراوە ئارەزوومەندبن، بەڵام زۆر جار پێویستیان بە هاندان هەیە.

لەگەڵ هاوپەیمانە ئەفغانییەکان بەشداربوون لە تەجیندکردن و سەربازگیری تا سەرکردە خێڵەکییەکان بۆ لای خۆمان رابکێشین بۆ بەرژەوەندی کێشەکەمان، ئەوان بەردەوام پەیوەندییان هەیە لەگەڵ رۆڵەی وڵاتەکەیان هەتا لەگەڵ ئەوانەی نیشتەجێی ئەو شوێنانەن کە تالیبان زاڵە بەسەریاندا.

هێرشی ئاسمانی بەو شێوە وردییە وای کرد زۆرێك لە سەرکردەی خێڵە ئەفغانییەکان لایەنگری ئێمە بن، هەندێکیان باوەڕی تەواویان بە کێشەکەمان نەبوو، بەتایبەتی ئەوانەی خستنەرووەکانی ئێمەیان رەت کردەوە، هەروا

پرسیارمان لە سەرکردەی خێڵەکانی لاکانیی دیکە دەکرد بەتایبەتی ئەوانەی وازیان لە هاوڕێیەتی دەهێنا بەوەی ئایا ئارەزووتانە بمرن یاخود پاداشت وەربگرن؟ ئەمەو بە شێوەیەکی نیمچە گشتی ئارەزوویان لە پاداشت بوو، داوامان لێ کردن نیەتی تەواویان دژ بە قاعیدە بێت، بۆیە پێویستە سیخوڕیمان بۆ بکەن، هەروا تفەنگەکانیان دژ بەهاوڕێیەکانی ناو قاعیدە بەرز بکەنەوە، بەشێك لەوانەی سەرکردەی تالیبان بوون هاوشان بوون لەگەڵمان دژ بە قاعیدە دەجەنگان، هاوکات سوودی ماددیشی هەبوو بۆیان.

بە هۆی ئەو زنجیرە لەدوایی یەکە لە هێرشبردن و ترساندن و سەرکەوتن و پاداشت، لە کۆتایی ٢٠٠١ ڕێژەیەکی گەورە بەرەو پێشەوە چووین.

لە کاتێکدا شەرف و هەستکردن و کەسایەتیی زۆر جار جۆرە ترسێك بوو لە گۆڕەپانی جەنگدا، بۆ ئەمەش سیوسیدیدیس ئەو بۆچوونە دەخاتە روو بەتایبەتی لە دەقە کلاسیکییەکەی بە ناوی "مێژووی جەنگی بیلۆبۆنیسیە" باسی لێوە دەکات.

بەدرێژایی هەوڵەکانمان کارەکە بەروونی بەدەرکەوت لەو کاتەی توانیمان سووپای خێڵەکییەکان سەربازگیر بکەین، ئەمەو بەهێنانی ١.٦٩ ملیۆن رەتڵ چەك و جبەخانە و جلوبەرگ و خواردن و کەلوپەلی پزیشکیمان هێنا، هەموو ئەمانە بە پەڕەشووت هاتنە خوارەوە، ئەمەو لەنێوەندی ١١٠ باڵەی گەورە لە چل و یەك شوێندا وەرگرت، ئەمەش لەنێوان رێکەوتی ناوەندی تشرینی یەکەم و ناوەندی کانوونی یەکەمی ٢٠٠١ بوو، سی ئای ئەی هێزی ئاسمانی رادەست کرابوو، بۆیە بەپێی پێویستی هاوبەشە ئەفغانییەکانمان پابەندبووین بە کارەکانمان.

لەگەڵ نزیکبوونەوی زستان سەرکردە خێڵەکییە ئەفغانییەکان پێویستیان بە داڵدە و جلوبەرگ هەبوو، هەروا بەبێ ئەوەش ناکرێ جێیان بێڵین و لەپاشاندا بجەنگن؟ لە ماوەی چل و هەشت کاتژمێردا هەموو پێویستییەکیان بە پەرشووت لە ئاسمانەوە بۆ هات، ئەمەش وای کرد ئەو سەرکردانە جێگەی متمانەی هاوڕێیەکانیان بن، لەتەك هەموو پێداویستییەکان چەکمان پێ دان و هەردەم هێزی ئاسمانیش لەلای خۆیەوە جۆشوخرۆشی پێ دان تا بەردەوام بجەنگن دژ بە قاعیدەی داگیرکەر، کە حکومەتەکەیان لەبن دەست دەرهێنابوو.

سی ئای ئەی رێزی هەبوو بۆ هاوپەیمانە ئەفغانییەکان و وەفادار بوو بەرامبەر بە هەموو بەڵێنەکانی، بۆ ئەمەش متمانە دەبێتە هۆی ئەوەی سەرکردەی هاوپەیمانەکان بەجۆشتر کاریان لەسەر کەسایەتی و شەرفی خۆیان دەکرد، وایان سەلماند ئەوان بەهێزن لە بوونی زۆری جبەخانەکانیان.

هێزی رقلێبوونەوە وای کرد هێزی تالیبان بەرەو لاوازی بڕوات، هاوکات رۆژبەرۆژ هاوپەیمانییەکانی تالیبان پارچە پارچە دەبوون، بەمەش قاعیدە هێدی هێدی لاواز دەبوو.

## تۆرا بۆرا

لە کۆتایی تشرینی دووەم ئەوەمان زانی کە ئوسامە بنلادن و سەرکردەکانی دیکە لە جەلال ئابادەوە رایان کردووە بۆ سنووری پاکستان، لەوانەشە چوو بن بەرەو تاکە داڵدەیان لە چیایەکانی تۆرا بۆرا.

برنتس کە لەکابوولدا بوو رۆژبەرۆژ پێشکەوتنەکانی شکێنەری سەرەکانی دەخستە روو، هەروا جۆنی جێگرەکەی نارد تا بنکەیەك لە جەلال ئاباد دابنێ، بۆ

ئەمەش جۆنی تکساسی باڵابەرز هەموو تیمەکەی لەگەڵ سیخوڕەکانی سی ئای ئەی و کۆماندۆسی سوپای ئەمریکی کۆکردەوە تا بەدوای جێی پێی بنلادن و پیاوەکانیدا بڕۆن، ستراتیژیەت و ئامانجمان ئەوە بوو هەر سەرکردەیەکی قاعیدە بکوژین، برنتس ئەمەی دەزانی بۆیە تیمە نوێیەکەی ناو نا جۆلێت تا ئەو بەرپرسیاریەتییە بگرێتە ئەستۆ.

پێشبینی ئەوەمان دەکرد ئەگەر زۆر پاڵەپەستۆ بکەین ئەوا بنلادن رادەکاتە پاکستان، ئەو سەرەڕایی ئەم هەموو ئاستەنگانەی خۆی کەسێکی جەنگاوەر نەبوو، هیچ کات نەوەستاوە تا بجەنگێ، ئەو کەسێکی ترسنۆکە، ئەگەر نەی کوژین یان بەدیلی نەگرین ئەوا رادەکا.

هەموو ئەوانەی لە دانانی نەخشەکان بەشداربوونە رایانم سپاردبوو، تا وێنەیەکی تۆبۆگرافی دورست بکەن بۆ هەموو رێڕەوەکان کە بەکار دێ بۆ چوونە پاکستان، سەرەتا وێنەی باراشیار وێنەی کێشرا، کە ناوچەیەکی بچووکی خاکی ئەفغانستانە و دەچێتە ناو پاکستان، ئەو ناوچەبە لە باشووری تۆرا بۆرایە، باشترین شوێنە تا دوژمن لەوێدا خۆی بشارێتەوە، چونکە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك قاخچییەکان ئەو رێگەیان بەکارهێناوە و رێگەکە سەدان کیلۆمەترە لەسەر سنووردا، بەم رێگەیە دوژمن دەتوانێ بچێتە ناو پاکستان. نەخشەکە دانرا، کە بەشێوەیەکی جوانی سیستماتیك نەخشێندرابوو وەك تابلۆیەك وابوو، هەموو وێناکانی زەوی و شوێنەکانی دوژمنی تیایدا دانرا بوو، لەگەڵ ئەو رێگایانەی کە پێشبینیکرابوو دوژمن لەوێوە رابکات، ئەم وێنەیە بەشێوەیەکی سێ رەهەندی بوو.

جارێکی دیکە چوومەوە نووسینگەی سپی و نەخشەکانم بەدەستمەوە بوو، واتە بۆ سەرۆك بۆش شی بکەمەوە کە رووبەڕووی چ ئالنگاریەك دەبینەوە لەسەر سنووری پاکستان، وەك پێشبینیکردن بۆ راکردنی ئوسامە بنلادن و بەشێکی دیکەی سەرکردەکان، هاوکات نووسینگەی سپی لەگەڵ ئەوەی جێگەی ئەوە نییە نەخشەی تیادا دەربێنیت، چونکە کورسی و مێزەکانی جوان و رازاوەن، لەنێوان سەرۆك بۆش و چینی دانیشتبووم، هەموو رووەکانم خستە روو.

سەرۆك پرسیاری کرد "ئایا رێگەیەك هەیە تا ئەو سنوورانە دابخەین؟".

"نەخێر گەورەم، هیچ سوپایەك لە جیهان ناتوانێ ئەو جۆرە سنوورانە دابخا کە زۆر دووروودرێژە هاوکات چیایە بەرزەکانی ئەو ناوچەیە، دەتوانین یەکەی چاودێری دابنێین، تا چاودێری هەموو پاشەکشەیەکی دوژمن بکەین، بەڵام لەوانەیە لەو زەوییە فراوانەدا ئاگادار نەبین ئەوانە رابکەن".

"بنلادن دەتوانێ بۆ کوێ رابکات؟"

ئاماژەم بە نەخشەکە کرد " لێرە لە نتو باراشینار".

سەرۆك پرسی "ئەی چی هەیە سەبارەت بە هاوپەیمانە پاکستانییەکانمان".

"من زاڵ نیم بەسەر ئەو بەشەی پاکستان".

"بنلادن ئێستا لە کوێیە".

"پێمان وایە بەرەو تۆرا بۆرا رۆیشتووین، ئەگەر ئێستا لەوێدا نەبێ".

سەرۆك "سوپاس".

لەپاش چەند ڕۆژێك، ئێستا ئێمە لە سەرەتای کانوونی یەکەمداین، برنتس پەیوەندی پێوە کردم و گوتی "ئێستا جۆن تیمەکانی لە بنکەی تۆرا بۆرا بڵاوکردۆتەوە، بنلادن لەوێدایە، کارەکە سەختە، جۆن داوا دەکات پیاوانی زیاتر بۆ بنێرین، ئەمجارەیان هاوپەیمانە ئەفغانییەکان ئەمکارەیان پێ ناکرێ، پێویستمان بە سووپای ئەمریکی یان ماترێنزە، پێویستە ٨٠٠ سەرباز بنێردرێ".

لێم پرسی " تۆ دڵنیایی؟ ".

وەك ئەوەی هاوار بکات : "بەڵێ دڵنیام".

"باشە".

"بروسکەیەك دەنێرم، ئەمە پوخت دەکەمەوە، با جۆن پەیوەندیت پێوە بکات، ئەو دەتوانێ ناوەڕۆکی زیاترت پێشکەش بکات".

"باشە، لە چاوەڕوانیدام".

زۆر جار وام لە پیاوەکانم کردووە لە مەیدان هەر کاتێك ویستیان دەتوانن قسەم لەگەڵدا بکەن، ڕاستە ئەوان لەژێر فەرمانی مندان، بەڵام ئەوان لە گۆڕەپانی جەنگدان، کاری من دابینکردنی سەرکردایەتی و ئاراستەی ستراتیژی و پشتگیرییە.

لەپاش چەند کاتژمێرێك جۆن لە بنکەی تۆرا بۆرا بەو تەلەفۆنە قسەی کرد کە بەستراوەتەوە بە کەشتیی ئاسمانی.

"سڵاو سەرۆك، پێویستیمان بە پشتگیرییە"، بە دەنگێکی توند قسەی کرد، پێشتر بەو شێوەیە قسەی نەکردووە.

"بەڵێ برنتس پێی ڕاگەیاندم".

"دەتوانین ئەو حەرامزادەیە دەستگیر بکەین، بەڵام پێویستیمان بە پیاوانی دیکە هەیە، ئێستا پێویستمانە، هەندێك لە پیاوانی سوپامان بۆ بنێرە".

جۆن بەدووروودرێژەی باسی دۆخەکەی کرد، منیش هەموو تێبینیەکانم نووسی، لە کۆبوونەوەی کاتژمێر ۱۷:۰۰ هەموویم بە کۆفر و بە بەڕێوەبەر نیشان دا لە ڕۆژی پاشتر پەیوەندیم بە جەنەراڵ تۆمی فرانکس کرد لە تامبا، بۆم باس کرد کە پێویستیمان بە چییە، ئەو نیگەرانیی خۆی دەربڕی لە نەبوونی پلان و ماوەی بڵاوەپێکردنی ئەم پشتگیرییە گەورەیە، منیش مکوڕ بووم لەوەی پیاوانی ئەمریکی لەتۆرا بۆرا ئازان، بەڵام نەم توانی جەنەراڵ فرانکس و هیچ کەسێکی دیکە ڕازی بکەم.

پەیوەندیم بە برنتس کرد و گوتم "بە نهۆمی حەوتەمم ڕاگەیاند، هەروا بە جەنەراڵ فرانکسم ڕاگەیاندووە، داواکارییەکەتم گەیاندووە، کەچی جەنەراڵ فرانکس جەخت لەوە دەکاتەوە لەوەی تیایدا سەرکەوتووین، واتە کارەکانتان لەگەڵ ئەو تیمە بچووکە و هاوپەیمانە ئەفغانییەکان بێ، هەروا باس لەوە دەکات کارەکە پێویستی بە پلان و کاتە تا ئەوانە بڵاوە پێ بکەین".

"نەفرەت"، برنتس زۆر وەڕس بوو، ئەو دووبارەی کردەوە منیش دووبارە بۆم باس کردووە چیم کردووە.

"گاری دەبێ بەردەوام لەوەی هەمانە، ناتوانین چاوەڕێ بکەین، هەر درەنگبوونێك کات دەداتە بنلادن تا ڕابکات، هەروا کاتی زۆر دەبێ تا هێرش بکاتە سەرمان، نازانین کەی هێرش دەکرێتە سەر وڵاتەکەمان، لەوانەیە ئێستا خۆیان بۆ ئامادە بکەن، نابێ بەنەرمی لەگەڵ دوژمن بجووڵێینەوە، پشت

بەشاراوەیی و خێرایی ببەستە، بەوەی هەتە هێرش بەرە، هەروا لەوانەیە بتوانین لە ئاسمانەوە جبەخانەت بۆ بنێرین".

"بەڵێ قوربان".

برنتس و جۆن تیمێکی لە چوار سیخورِ لەقووڵایی چیایی تۆرابۆرا پێکهێنا، هەروا چەند سەد یاردەیەك لە دوژمن نزیکبوونەوە، بنکەیەکی چاوێریان لەلای بەردەکان دانا، تا بڕوانێتە دۆڵەکە، ئەمەو دوژمن سەد لە سەد زیاتر بوون، چونکە لە هەموو چەکدارەکانیان لەوێدا کۆبوونەتەوە، ئێستا پشوو دەدەن، بۆ ماوەی سێ رۆژە بەردەوام فرۆکەکان بۆردومانیان دەکات، لەپاشاندا دەست بە بۆمبارانکردن کرایەوە و زۆرێك لە پیاوانیان کوژراوە، لەوەش گرنگتر بنکەی قاعیدە خاپوور کرا.

ئەمە پرۆسەیە زۆر گرنگ بوو بەشێکی زۆری سەرکردەکانی قاعیدە تیاچوون، هەروا هیچ کام لە ئەمریکییەکان نەکوژران و بریندار نەبوون، بەڵام ئەم سەرکەوتنە تەواو نەبوون، چونکە ئوسامە بنلادن بەرتیلی دابووە بەشێك لە هاوپەیمانە ئەفغانییەکان، بۆیە رایکردۆتە پاکستان، واتە نتو باراشینار.

لەو کاتەی ئوسامە بنلادن رای کرد بۆ پاکستان، بەشێك لە رۆژنامەنووسە بیانییەکان لە تۆرا بۆرا بینی، ژمارەی ئەو رۆژنامەنووسانە لە ژمارەی سی ئای ئەی و سوپای ئەمریکی زیاتر بوون.

بۆ ماوەی دە ساڵ بەدوای دوژمنە سەرەکییەکەمانەوەین، بەڵام راکردنی بنلادن بووە بەشێك لە شەرمەزاریی سەرکەوتنەکانمان لە ئەفغانستان.

لەگەڵ ئەوەی ئێمە زیاتر لە دە هەزار کەسمان لە دوژمن کوشتووە، لەوانەشە زۆریش زیاتر بێ، توانیمان ژێرخانی سەرکردایەتیان بڕوخێنین، ئەوەی ماوە لە

قاعیدە و تالّیبان رایان کردە ئەفغانستان، هەروا دەستمان گرت بەسەر زیـاتر لـە بیست بنکەی قاعیدە، بۆ ئەمەش لەرووی هەوالگرییەوە بەکارمان هێنـا، هـەروا دەستمان گرت بەسەر تاقیگەی ئـەنتراکس، هـەروا رێگـر بـووین لـە زۆرێـك لـە هێرشەکان بۆ سەر ولاتەکەمان، لەلایەکی دیکـەوە ویلایەتـە یـەکگرتووەکان بـۆ چەندین سالّ کاریگەری دەبیّ چونکە دەستمان گرت بەسەر مۆلّگەیەکی هەوالگری و رێگربووین تا دوژمن دالّدەیەکی هەبیّ لەناو ئەفغانسـتان، ئـەوە جگـە لـەوەی توانیمان زۆرێك لە سیخورەکانیان لە زۆربەی ولاتانی دونیا بکوژین، هەروا ئێمـە هاوکاری گەلی ئەفغانیمان دا تا خۆی رزگار بکات لە رژێمی تالّیبانی چەوسێنەر، هەموو ئەمانە لە ماوەی سیّ مانگدا ئەنجام درا، ئەمەش بە هۆی ١١٠ سیخوڕی سی ئای ئەی و لەوانەشە ٣٠٠ سەربازی هێزی تایبەتی ئەمریکیمان لە گۆڕەپانی جەنگدا لەگەلّدا بوو.

### ئۆپراسیۆنی ئەناکۆندا

تیمە سەربەخۆییەکان کە لەپاش ١١-٩ بلاّوەمان پیّ کرد، هاوکات هـەموو هێزە سیاسییە خێلّەکانمان وەك کەرەستەیەك بـەکار هێنـا، بۆیـە لـە ناوەڕاسـتی کانوونی یەکەمی ٢٠٠١ لەگەلّ نەتەوەیەك بەدەرکەوت کە لەژێر سایەی تالّیباندا خۆی رزگار کرد، هەروا لەگەلّ ئامادەیی بوون بۆ دانپیانان بە حکومەتی ئەفغانی، دانانی وێستگەیەك لە کـابول، دەمـان ویسـت سـەرۆکی وێسـتگەکە کەسـێکی بەتوانا بیّ و کارایی دیبلۆماسی هەبیّ تا بتوانیّ بنکەی چەسپاو دابنیّ، هەروەها پشتگیریی حکومەتی ئەمریکی بکات لە هەموو روویەکەوە، یەکێك لـە هەسـتم دابوو وەك دانانی ریچ لە جێگەی برنتس، بۆ ئەمە گاری کارێکی زۆر شـاکارانەی

کرد، بەڵام ریچ زۆر باشترە بۆ ئەو کارە، چونکە ریچ کاری لەسەر کێشەی ئەفغانستان لە ماوەی دوو ساڵ و نیوێکدا کردووە، هەروا وەك سەرۆکی ویستگە لە سەرکردایەتیی مەیدانی کاری کردووە.

کۆفر رازی بوو لەوکاتەی بیرۆکەکەم بۆی باس کرد، ئەمەو ریچ یەکەم سەرۆکی ویستگەی ئەفغانستانی نوێ بوو، ئەمەو لە پێش جەژنی سەری ساڵی ٢٠٠١ بنکەکەی رادەست کرا.

لە ناوەڕاستی کانوونی دووەمی ٢٠٠١ بەوەمان زانی کە بەشێك لە پاشماوەکانی قاعیدە و تاڵیبان لەپاش ئەوەی پاشەکشەیان کردووە، دواتر لەسەرووی دۆڵی شامای کۆت لە رۆژهەڵاتی باکتیا کۆبوونەتەوە، ئەم شوێنەش دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەفغانستان، ئەو شوێنە لە بەرزی دەهەزار پێ دایە، جگە لەوەی ناوچەکە زۆر سەختە، هاوکات ئەو شوێنە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك جێگەی شۆڕشگێران بووە، وەك تۆرا بۆرا خەڵکی ناوچەکە زۆر بەئاسانی دەتوانیت بیانکەیتە تۆڕی سەرچاوەکان، هەموو ئەوانەی لەو شوێنەدان، تەنیا بۆ هۆیەك لەوێدان یان بۆ خۆشاردنەوە یان بۆ شەڕ.

تیمێك لە سێ کەسی سی ئای ئەی و سێ کەسی دیکە لە ئۆپراسیۆنی تایبەتی یەکەی پسپۆڕییەکان رێکخست بۆ کۆکردنەوەی هەواڵگری سەبارەت بە دوژمن لەم دۆڵەدا، لەلایەکی دیکەوە شانزدە کەسی دیکە دانرا بۆ هەواڵگری ئامادە و چاودێری و ئەفسەر و قەناس بەدەست و دانوستکار.

لە پێنجی شوباتدا لە نزیك کردبز لەتەك بەردە گەورەکاندا کۆبوونەوە، ئەمەش وەك شوێنەوارێکی بنکەی بازرگانی جیهانی لە نیۆریوك، لە کاتێکدا

ئاڵای ئەمریکی لەنێوەندی ئەو بایە ساردەدا دەشەکایەوە، لەولاتر و کەمێك دوورتر چیایەکان و لە دۆڵی شا –ئای کوت بەفر دەبریسکایەوە.

نوێژ بکەن:

سوپاسی خودا دەکەین، کە ئەم هەلەی پێ بەخشیووین، تا ڕێز لەو برایە ئەمریکیانە بگرین، لێرەدا گیانیان لەدەست دا، ئێستاش لەم شوێنەداین تا تۆڵەی مردووەکانمان بکەینەوە، کە بێ مانا لەناوبران، ئێستاش لێرە یادیان دەکەینەوە. خوا سەبووری بدات بە خانەوادەکانیان، ئەی خودا داوای بەرەکەتت لێ دەکەین، تا بتوانین بەرپرسانی ئەو کارە بدۆزینەوە، ئێستاش کار دەکەین بۆ لەناوبردنیان، تکات لێ دەکەین هەر یەك لە ئێمە بپارێزیت، بە ناوی یەسوع نوێژ دەکەین، ئامین.

لەپاشاندا بەڵێنیان دا:

ئەم شوێنە وەك یادەوەرییەك بۆ ئەمریکییە ئازایەکان دادەنێن، کە لە ١١ی ئەیلوولدا مردن، تا هەموو ئەوانەی دەیانەوێ ئازاری ئەمریکا بدەن، ئەوا ئێمە دەستەوەستان نین تا سەیری تیرۆر بکەین، لە هەموو پارچەیەکی دونیادا ئێمە بەتوندی وەڵامیان دەدەینەوە، تا بەرگری لە نەتەوە مەزنەکەمان بکەین.

هاوکات هەمووان کۆبوونەوە تا وێنەیەك بگرن، لەپاش دوو هەفتە دەقی نوێژەکە و وێنەکە لە نووسینگەکەم بوو.

سەیری وێنەکەم کرد کە پێکهاتبوو لە تیمێکی ڕەنگاورەنگ و لە ١٦ کەسی نیشتمانپەوەر بوون، ئەوان لەسەر پاشماوەی شارێکی ئەمریکی بەشانازییەوە وەستاون، وشەکانم خوێندەوە، دووبارە خوێندمەوە، بیرم لەوە کردەوە ئێمە سەردەکەوین بە هۆی ئەو پیاوانەوە، کە هەردەم لە خزمەتی وڵاتەکەمانن. ئەوان

لەخواترسن و عەشقی ئەو کارە ترسناکەشن، هەموویان سەرکردەن، گوێ بەوە نادەن ئەگەر لە سی ئای ئەی یان ئۆپراسیۆنی تایبەت بن، گرنگ نییە ئەگەر ئەفسەر بن یان سەرباز، گوێ بە هیچ کەسێکی واشنتن نادەن تا لێیان بپرسنەوە، تەنیا داوا لە خوا دەکەن، تەنیا دەیانەوێ ئاراستەیەکی ستراتیژی و کەرەستە و پشتگیری سیاسیان دەوێ، ئێمەش ئەوەی بتوانین بۆیان دابین دەکەین.

داوام لە یەکێك لە یاریدەرەکان کرد پێنج دانەی کۆپی بکەین، کە وێنە و دەقە دەگرێتەوە، دانەیەکم پێشکەش بە کۆفر و تینت و ماسی کرد، تەنیا دانەیەکم بۆ خۆم هێشتەوە، لە دیواری نووسینگەم هەڵواسی، دانەیەکیشم وەکە یەدەگ هێشتەوە.

لە سەرەتای مانگی ئازاری ٢٠٠٢ پوختەیەکم بۆ سەرۆك بۆش باس کرد، لەو کاتەی دەمان ویست هێرش بکەینە سەر دۆڵی شا-ئای —کوت لە ئەفغانستان، سوپای ئەمریکیش ناوێکی رەمزی بۆ ئەم هێرشە دانا بە ناوی "ئۆپراسیۆنی ئاناکۆندا" سەرکردایەتی ناوەندی سوپام گرتە دەست، لەپێشتریشدا جەنەرال فرانکس پوختەیەکی پێشکەش بە سەرۆك کرد، ئەو دەیویست گوێی لەسی ئای ئەی بێ.

جۆن ماکلافلین جێگری بەڕێوەبەری سی ئای ئەی لەجیاتی تیبت هاتبوو، داوای لێ کردم پوختەیەك بۆ سەرۆك و چینی جێگری و رایسی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، پێشکەش بکەم، من نەخشەم لەگەڵ خۆم هێنا، سەرۆك و جێگرەکەی لەسەر دوو کورسی دانیشتن، وەك پێشتر کاتێك بچمە کۆشکی سپی بەگرمۆڵە دادەنیشم.

کاتێك دەستم بە ڕوونکردنەوە کرد نەخشـەکەم بـەکارهێنا، تـا شـوێنەکانی دوژمن لـە دۆڵ و چـیاییەکان دەسـت نیشـان بکـەم، هـەروا ڕێگـەکانی ڕاکـردنم دەستنیشان کرد، کاتێك دەیانەوێ بەرگری بکەن و ڕابکەن، ژمارەی ڕاسـتەقینەی جەنگاوەرەکانی دوژمنمان نەدەزانی، ئێستاش ئەو شوێنە گەورەترین شـوێنە کـە قاعیدە و تاڵیبانی تیادا کۆبۆتەوە، پێشبینی شەڕێکی سەختمان کرد، لەپاشـاندا پاشەکشە بۆ پاکستان دەکـەن، پێشـبینی کوشـتنی هـەموویان ناکـەین، یـاخود بەشێکی زۆریان بکوژین، یان بـەدیلیان بگـرین، ئەمـەش بـە هـۆی ئـەو کەشـە نالەبارەیە کە تیایداین، هاوکات تەم هـەموو لایـەکی گرتۆتـەوە بەمـەش هێـزە ئاسمانیەکان بەتەواوی هەموو شتێك نابینن، لەلایەکی دیکـەوە تـۆڕی ڕاکردنیـان گەلێك زۆرە، لەوانەیە بچنە ناو خەڵك یان بەرەو پاکستان بڕۆن، وەکچۆن لە تـۆرا بۆرا هەمان شتیان کرد.

لە پێشکەشکردنی پوختەکەدا باسی کاری هەواڵگریم کرد، باسیشم لەوە کرد کە هێزێکـی هاوبـەشمان لـە سـی ئـای ئـەی و ئۆپراسـیۆنی تایبـەت هەیـە کـە پشکێنەرانی ئەفغانی هاوشانیانە، ئەوە جگە لەوەی بریداتۆر توانیویەتی هـەموو دۆڵەکە ڕووماڵ بکات، چونکە تا ئێستا ئێمە فڕۆکەی بێ فڕۆکەوان بەکاردەهێنین، تەنیا یەکێکیان چەکی پێوە کراوە.

لە کۆتایی پوختەکەمدا سەرۆك لێی پرسیم "جۆشوخرۆشی پیاوەکانمان چۆنە، هانك؟".

"زۆرباشە بەڕێز سەرۆك".

سەرێکی لەقاند و گوتی : سوپاس.

کاتێك کۆشکی سپیم بەجێ هێشت هەستم کرد نارێکییەك لە وەڵامەکانم هەیە، راستگۆیانە بوو بەڵام تەواوکاری نەبوو، چونکە سەرۆك پێویستی بە روونکردنەوەی زیاتر هەیە، نەك ئاماژەیەك مانایەکی هەبێ، هەروا پیاوانمان زۆر شایستەن.

بۆ رۆژی دواتر لەگەڵ جێگری بەڕێوەبەر چووینەوە کۆشکی سپی، ئەمەو دوا پێشهات و پێشکەوتنەکانم پێشکەش بە سەرۆك و تیمەکەی کردەوە، بەتایبەت دوا پێشکەوتن لە دژی تیرۆردا لە ئەفغانستان و ناوچەکە، لەدواتردا وێنەیەك و چەند کاغەزێك لە جانتاکەم دەرهێنا.

"سەرۆك دەتوان وەڵامێکی باشترت بدەمەوە سەبارەت بەو پرسیارەی دوێنێ کردت".

"بێگومان" ئەو دەستی درێژ کرد و هانی دام.

وێنەیەکی هەر شانزدە کەسم نیشان دا، هەندێکیان چەکدار بوون، لەبەرامبەر چەند بەردێك و ئاڵای ئەمریکادا بوون.

"سەرۆك ئەوانە بەشێك لەو پیاوانەن کە تۆ دوێنێ سەبارەت بەوان لێت پرسیم، باسی جۆشوخرۆشی ئەوانت دەکرد، ئەم تیمە تێکەڵەی سی ئای ئەی و ئۆپراسیۆنە تایبەتییەکانن، وەك چاودێر لە ئۆپراسیۆنی ئەناکۆندا کار دەکەن، ئەم پارچە بەردانەش پارچەیەکی دەگەڕێتەوە بۆ بنکەی بازرگانی جیهانی لە نیۆریۆرك، ئەوان بەڵێنیان داوە، ناتوانیت پیاوانی سی ئای ئەی و ئۆپراسیۆنی تایبەت جیا بکەیتەوە، بەو واتایەی پشتی یەکتریان گرتووە، تکا دەکەم، گوێم لێ بگریت تا بزانیت ئەوان چیان گوتووە.

بەڵێنەکەم خوێندەوە تا ئەو کاتەی قورگم گیرا.

"بەڕێز سەرۆك، ئەو وێنە و وشانە وەڵامی ئەو پرسیارەتە کە دوێنێ کردت".

بۆ ماوەی چەند چرکەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا گرت.

ئەو کاغەزەی بەڵێن و نوێژەکانی تیادا نووسرا بوو، دام بە سەرۆك، لـەدواتردا زانیم لە نووسینگەی تایبەتی خۆی لەتەك کۆشکی سپی هەڵیواسیووە.

هەموو ئەو باسانەی پێشـتر خسـتمە روو، مانـای ئـەوە نییـە کەسـێك لـە ئەمریکییەکان نـەکوژراوە، یـان هاوپەیمانـەکان تووشـی زیـان نەبوونەتـەوە، لـە کاتێکدا بە هۆی ئاگری هاوڕێیەکانەوە زۆرێك لە ئەفغانییەکان کـوژراون، هـەروا بەشێك لە مغاویرە ئەمریکییەکان لەنزیك لێواری رۆبرتس کوژراون، ناوەکەشی وا لێ نرا وەك رێزلێنانێك بۆ نیل رۆبرتس.

چـاودێری پەخشـی زینـدووی ڤیـدیۆیی بریـداتۆرمان دەکـرد، لـەو کاتـەی کۆپتەرەکان دەنیشنەوە، لەگـەڵ ئـەوەی شـەڕ لـە لێـواری رۆبـرتس بەردەوامـە، ڤیدیۆیەکەمان بۆ سەربازەکانی تامبا نارد، بەتایبەتی ئەو کاتـەی مـەغاویرە لـە شوێنێکدا گۆشەگیر بوو بوون، کاتێك ئێمە ویستمان پشتگیریان بکەین، بریـداتۆر مووشەکی هلفایر لە دوژمن وەشاند لەدووری سەد یاردە لە مغاویرەکان، هێرشـی دوژمنی دانەمرکاندەوە، ئەمە جاری یەکەمە تیایـدا فرۆکەیـەکی بـێ فرۆکـەوان بەسترابێتەوە بە چەك، تیایدا پشـتگیری ئاسمـان و زەوی دەکـات، کاتێـك لەگـەڵ هێزی نەیاردا لە جەنگداین.

لەپاش چەند هەفتەیەك لە ئۆپراسیۆنی ئەناکۆندا، یەکێك لـە سەرچـاوەکانی سی ئای ئەی رای گەیاند کە چەند جـەنگاوەرێکی بیـانی لـە یـەکێك لـە گونـدە ئەفغانییەکانە، سەرچاوەکە ئەوەشـی راگەیانـد ئـەو جەنگاوەرانـە رزگابووەکـانی ئۆپراسیۆنی ئەناکۆندان، ئێستاش پلان دادەنـێن بـۆ راکـردن، ئەمـەو دەریـاوانی

ئەمریکی بەپێی ئەم سەرچاوەیە دەستی بە جوولە کرد، کە سەرچاوەیەکی مرۆیـی ئەو هەواڵەی گەیاندووە، لەم کاتـەدا فرۆکـەی ئـاورایۆن بـی -٣ وەك چـاودێرێك بەسەر گوندەکەدا هاتوچوو، تاقمەکە ئاسمانییەکە بینیان سێ ئۆتـۆمبێلی دوژمـن گوندەکە جێ دەهێڵن و بەرەو باشووری رۆژهەڵاتی پاکستان دەڕۆیشتن، بۆ ئەمەش بۆ بی -٣ کاتێك دانرا تا هێرش بکات، بریداتۆر بـۆ مـاوەی چـەند کاتـژمێرێك چاوێریەکی وردی دەکردن، وێنەکان ئەوەی نیشان دەدا هـەموو کەسـەکان پیـاون، کاتێك وەستان بۆ میزکردن تیمێکی مەغاویری سـەربازی لـە فرۆکەخانـە بـاگرام لەئامادەیدا بوون تا بە هیچ شێوەیەك نەهێڵن کاروانەکە سنووری پاکستان بـبڕێ، لەپێش ئەوەی بگەن بە سنوور تیمێکی بچووکی سـی ئـای ئـەی و ئەفغانییـەکان گەیشتنە ناوچەکە تا ڕێگری بکەن لـەو کاروانـە، ئەمـەو تیمەکـە بـە خۆیـان و ئۆتۆمبیلەکانیان گەیشتنە ئەو شوێنەی بۆیـان دیـاریکرابوو، لەپاشـاندا دوژمـن ڕێگەکەی خۆی گـۆڕ کاتێـك تیمەکـەمان ڕێگربـوون تـا لـە سـنووری پاکسـتان بپەڕنـەوە، ئەمـەش وای کـرد ەربـازان و مغـاویری دەریـایی کـاتێکی زۆریـان بەدەستەوە بێ.

بە نزیکبوونەوەی کۆپتەرەکانی مغاویری دەریایی لـە دوژمـن، توانیمـان بـە کامیراکانی بریداتۆر زیاتر زاڵ بین، لەو کاتەدا کۆپتەرەکە نزم بۆوە و مەغاویرەکان شێوەی هێرشەکەیان بە جۆری (ا) پێکهێنا، شەڕ دەستی پێ کرد، هەموو پیاوانی دوژمن لەوێدا کوژران، لە ریزەکانی ئەمریکیش هیچ کەسێك نەپێکرا.

هەموو کوژراوەکان چیچانی بوون، جبەخانەیەکی سـەربازی ئـەمریکیان پـێ بوو، ئەوان لە ئۆپراسیۆنی ئەناکۆندا دەستیان بەسەردا گرتبوو.

سی ئای ئەی لەنێوەندی چل و هەشت کاتژمێردا چەندین سەرچاوەیەکی دیکەی دەست کەوت، پێشهات و پێشکەوتنەکان دەخرایە روو، هەردەمیش هەموو بابەتەکانمان بە مغاویری دەریایی رادەگەیاند، ئەمەش نموونەیەکی دینامیکییە بۆ هەوالگری و شیکردنەوە و سەرکەوتنی کۆتایی بۆ بەکارهێنەر.

## ماڵئاوایی

لە حوزەیرانی ٢٠٠٢ دوا گەشتم بۆ ئەفغانستان کرد وەك سەرۆکی بنکەی دژەتیرۆر-ئۆپراسیۆنی تایبەت، سەردانی مەزار شەریف و کابوول و قەندەهالار و خۆست کرد، هەروا چووم بۆ قەڵای جانجی کە لەوێدا مایك سبان گیانی لەدەست دا، بەرێز و ستایشەوە لەوێدا وەستام بۆ هەمووان و ئەو ئەفغانیانەی کە لەو یاخیبوونەدا کوژران.

کاتێك چووم بۆ خۆست و قەندەهار ریچ لەگەڵمدا بوو، ئەو وەك سەرۆکی وێستگە کارێکی مەزنی کردبوو، کاتێك گەیشتبووە لەژێر فەرمانی خۆیدا لە کابوول ئەوەیٚ تۆڕێکی پەرتوبڵاوی کۆکردبۆوە، هەروا هاوکاری ئەفغانییەکانی کردبوو لە پێشخستنی بەڕێوەبەری ئاسایشیان دژ دەرکەوتنەوەی تاڵیبان لە وڵاتەکەیان، لەتەك ئەمەشدا کاری لەگەڵ وەزارەتی دەرەوە و بەرگری کردبوو، ئەو دوو وەزارەتە بەخێرایی لە ململانێدا بوون لە وڵاتێکی هەژار و حکومەتێکی دڵسۆز و کارا.

لەنێوەندی گەڕانەکانم سەرم سوڕما بووم بەو ئاشتییە رێژییە لەتەك پێشبینییەکانی گەلی ئەفغانی لەمەڕ پشتگیریی ئەمریکی و نێودەوڵەتی، ئەوان پێویستیان بە پشتگیری ئێمە هەبوو، چونکە دوای چەند ساڵێك لە جەنگ

ئەفغانستان شوێنێکی بێ ئومێد دەبێ، کەمێك کارەبا هەبوو، زۆر بێ ئومێد بووم لە درەنگ بەدەنگەوە هاتنی پەرەپێدانی وڵات، ئەمەو بەپێی سیستەمی ئێمە ناکرێ ئاژانسە نا سەربازییەکان ئامادە بن، لەلایەکی دیکەوە وەزارەتی دەرەوە و ئاژانسی ئەمریکی بۆ پەرەپێدانی نێودەوڵەتی زۆربەی فەرمانبەرانی لە کابوول دانابوو، بەڵام لەمەیدان نا، لە کاتێکدا حکومەتی خۆجێی و پەرەپێدان هەمان گرنگیان هەیە یان زیاترە.

لە مانگی پێشوودا سەرۆك بۆش پرۆژەی مارشالی بۆ ئەفغانستان دانا، بەڵام لەم گەشتەمدا شتێکی وام نەبینی جێگەی رێزی ئەو بەڵێنە بێت.

لەگەڵ ریچ گفتوگۆی ئەوەم کرد کە چۆن کاری شاراوە شێوەیەکی پەراوێزخراو بێ، لە کاتێکدا تەواوکاری سیاسەتە لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی دیکە، تەنیاش کوڕانی سی ئای ئەی ژمارەیەکی دیاریکراوی پەرشوبڵاویان لە سووپا هەیە لەناو ئەفغانستاندا، تا ئەو دەستکەوتانە بپارێزن کە بەدەستمان هێناوە.

لەگەڵ ریچدا چووینە لای کارزای و کۆبووینەوە ئەو رێزێکی زۆری هەبوو، هاوکات پرسیاری ئەوەی کرد کە ئایا ئەمریکا چ پلانێکی هەیە بۆ ئەفغانستان، باسی چەند هەڕەشە کرد کوە بە هۆی فراوانی وڵاتەوە قاعیدە دالدەیەکی لە پاکستاندا هەیە، هاوکات باسی ئێران و رووسیا و چین و هیندمان کرد، گفتوگۆکەمان زۆر درێژتر بوو لە وەڵامەکان.

لە رۆژی کۆتایدا هاوبەشە ئەفغانییەکانمان داوەت کرد لەنێویاندا ئەندازیار عارف و ئەمرڵڵا، ئەمەش لەدوای نیوەڕۆیەکدا و لەژێر درختەکاندا و لەوێشدا جووگەیەك لەئاوی ساف و سارد کە دەشتاییەکانی باکوور دەهات دانیشتین، بۆ

ماوەی چەند کاتژمێرێك باسی هەوڵە هاوبەشەکانمان کرد و پرسیارمان سەبارەت بە داهاتوو دەکرد.

ئەوان زانیان کارەکەم لە کۆتاییدایە، هەندێك وێنەمان گرت، هەروا مافوورێکی جوانیان پێ بەخشیم و لەپاشاندا ماڵئاواییمان لەیەکتر کرد.

عارف لە پۆستەکەی لادەبرێ بەو پێیەی تۆمەتبار کرا بەگەندەڵی ئەمەو لەپاش چەند ساڵێك لە پەلەرماندا هەڵدەبژێردرێ، ئەمرڵا پۆستی بەرز دەکرێتەوە دەبێتە سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی نیشتمانی، ئەو بەئازایەتی خزمەت بەوڵاتەکەی دەگەیەنێ، لەپاش چەند ساڵێك دەست لەکار دەکشێنێتەوە دژ بە کارزای و لاوازی سەرکردایەتییەکەی.

ریچ نیشانەی ئازایەتی پێ دەبەخشرێ لە ئەفغانستان بۆ دووبارە دامەزرێنەوە وەك سەرۆکی وێستگە، ئەو تا خانەنشین بوونی خزمەتی کرد واتە تا ساڵی ۲۰۰۷، ئەو بەوە جیا دەکرێتەوە کە سەرۆکی وێستگەی پێنج وڵاتی توند و تیژ بووە.

## بەشی یانزدەیەم

# دوورتر لە ئەفغانستان

زیاتر لە شەڕ دەزانین نەك لە ئاشتی، زیاتر لە کوشتن دەزانین، نەك لە ژیان...

عومەر.ن. برادلی

زۆربەی ئەوانەی بەزیندوویی مانەوە لە پاش تۆرا بۆرا بەرەو پاکستان ڕۆیشتن، هاوپەیمانە پاکستانییەکان بەشێك لەوانەی دەستگیر کرد، بەڵام نەیانتوانی ئوسامە بنلادن دەستگیر بکەن.

لە مانگەکانی دی و ساڵانی دواتر چەندین سەرکردە و پیاوانی قاعیدەیان دەستگیر کرد، لەنێویاندا ئەبو زوبێدە ئەو لە ئازاری ۲۰۰۲ لە فەیسەڵ ئاباد دەستگیر کرا، لە دواتر چەند کەسێکی دیکە دەستگیر کران وەك ڕەمزی بن شیبە کە لە کراتشی لە ئەیلولی ۲۰۰۲ گیرا، هەروا هاوپەیمانە پاکستانییەکان پلانگێڕی هێرشەکانی ۱۱-۹ بە ناوی شێخ خالید محەمەد لە هێرشی ڕەوالبندی لە ئازاری ۲۰۰۳ دەستگیر کرا.

سەرکەوتنەکان لە ئەفغانستان لەرووی خاپوورکردنی داڵدەکانی قاعیدە دەستمان بەسەر گەنجینەیەکی هەواڵگری داگرت، لە لێکۆڵینەوەیەکح بەبەردەوامی و فراوانی ئەنجام درا، ئەمەو سی ئای ئەی و دەزگا هاوپەیمانەکان لە ساڵانی دواتردا سەدان کەسیان لە دەوڵەتدا گرت، بەمەش کاری هەواڵگری و شاراوە پەیوەستە بە سوپا و دەزگای چەسپاندنی یاسا، بەبێ سەرهەڵدانی هێرشە تیرۆریستیەکان، ئەمەش زۆرێك لە گیانەکان دەپارێزیت و ناژمێردرێ.

بەڵام ئەم دوژمنە نەرمە و گونجاون هەردەم هەوڵدەدات داڵدەی دیکە بۆ خۆی پەیدا بکات، هەروا کارەکانی پێش دەخا سەبارەت بە ئەجندا و خستنەرووی، ئەمەش تەنیا لە وڵاتێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدایە.

## رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

لەگەڵ کۆفر بەردەوام بووم تا سەرەتای کانوونی دووەمی ۲۰۰۲ هەردەم گفتوگۆمان دەکرد سەبارەت بڕیاری سەرکردایەتی پەیوەست بە راودونانی سەرکردەکانی قاعیدە، هەر تەنیا لە ئەفغانستاندا نا، بەڵکو لە هەموو جیهاندا، هەموو بڕیارەکانی سەرۆك پراکتیك دەکرێ ئینجا لە هەر شوێنێکی جیهاندا بێ، بۆ ئەمەش پارێزەری کۆشکی سپی و سی ئای ئەی باسیان لەوە دەکرد کە بڕیاری سەرۆك تەنیا پەیوەندی نییە بە کاری شاراوە، بەڵکو ئەمە رێگەپێدانێکی جیهانییە.

لەپێشتردا کارلمان دەست نیشان کرد وەك سەرۆکی تیم لە یەکێك لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەویش ئەفسەرێکی پێشووە لە هێزی تایبەتی سووپا ئەمریکی و شارەزایی کردەیی هەیە هەر یەك لە ئەفریقیا و ئەمریکای لاتینی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەو یەکێکە لە سەرکردەی لقەکانی دژەتیرۆر کە لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا لە لقەکانی دژ بە قاعیدە کاری کردووە.

کارل یەکسەر دەستبەکار بوو، هەر بەزوویی چەندین کەسی تەجنید کرد و تیمێکی بچووکی لە سیخوڕەکان دانا، هەروا کاری لەگەڵ رۆژهەڵاتی خواروو کرد، تا دڵنیایان بکاتەوە ئەوان هاتوون تا کار و هەوڵەکانی ئەوان تەواو بکەن، نەك رووبەڕووبوونەوەی سیخورە مەیدانی و سەرکردەکانیان، بنکەی دژەتیرۆر ویستی کارەکانی باشتر و بەجۆشتر بکات بەتایبەتی سەبارەت بە ئۆپراسیۆنەکانیان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆ ئەمەش کارل چووە ناو بەراوردکارییەکی هاوبەشس لەگەڵ ئۆپراسیۆنی تایبەتی ئەمریکی، پارەیەکی پێویست دەستنیشان کرا و یەکەیەك لە بارەگای سەرکردایەتی دانرا کە ببێتە پاشکۆی بنکەی دژەتیرۆر-ئۆپراسیۆنی تایبەت، هەروا چەندین ستیچی چاودێریان لەدەرەوە دانا، بەڵام ئەمە بەس نەبوو بۆ رووماڵکردنی بەردەوام.

بۆ کارلم روونکردەوە کە ستراتیژییەکانمان بۆ لەناوبردنی سەرکردایەتیی دوژمن و شوێنی داڵدەکانیانە، کە هەردەم بەو ئامرازانە دەتوانن دانیشتووان لە خۆیان نزیک بکەنەوە، کارل پێویستی بە زۆرێك لە ڕێنماییەکان نەبوو بە هۆی ئەزموونی لە دژەتیرۆردا، هەروا بەخێرایی پلانی پێشکەوتنی کردەیی ڕێکخست، واتە هەموو شتێك سەبارەت بە کۆکردنەوەی هەواڵگری تاکلایەنە بۆ ئەمەش بەرنامەی ڕاهێنانی دانا بەتایبەت بۆ هاوتا ناوچەییەکان، لەتەك ئەمەشدا تیمەکەی، تیمێکی پزیشکی لەگەڵدابوو تا بتوانن بچنە ناو ناوچە خێڵەکییەکان تا نیەتە باشەکانی دانیشتوانی ناوچەکان وەربگرن.

ئامانجی یەکەمان سەرکردایەتیی قاعیدە بوو بەتایبەتی ئەو سەرکردانەی بەرپرسن لە کوشتنی ئەمریکییەکان، دواتر مکوڕ بووم لە لەناوبردنیان، لەو کاتەی چەند کتێبێکم بینی سەبارەت بەو کارەساتە.

لە کۆتایی ٢٠٠٢ دوای چەند مانگێك لە ڕۆیشتنم لە بنکەی دژەتیرۆر، کارل هەموو تیمەکانی هەواڵگری یەکخست کە هۆیەکن بۆ سەرچاوەکانی هەواڵ و زانیاری، زۆربەی کارە شاراوەکانیان زۆر بەوردی ئەنجام دەدا.

بەوشێوەیە تواناکانمان زیاتر دەبوو بۆ دۆزینەوەی دوژمن و بەگژداهاتنیان، لە هەندێك شوێن شەڕەکە گەورە دەبوو، بەتایبەتی ئەو شەڕانەی لەناو خەڵکیدا روو دەدەن نەك لەنێوان سوپاکان، منیش ئەمەم بۆ هەموو جیهان سەلماندووە، پێویستمان زۆرتر بە خەڵکییە تا لەتەکماندا بن، تەنیا ئەوەندە بەس نییە تا یەکێك دەستنیشان بکەیت و بیکوژیت، ئەو کاتە لەوە تێگەیشتم کاتێك لە ئەفغانستان جەنگاین، تیایدا بنەما و ستراتیژیەتمان تێکەڵ بەیەکتر کرد، لە هەموو ئەمانەشدا تەنیا شتێك هەیە پێویستی بە توێژینەوە و تێگەیشتن هەیە و هەردەم پرسیار دەکەم: ململانێی مرۆڤایەتی بەرەو کوێ دەچێ.

## بەشی دوانزدەیەم

# تافل

**لە نیشانەکانی هەستیی رۆشنبیر، وەرگرتنی بیرۆکەیە، بەبێ ئەوەی پەسەندی بکات.**

**ئەرستۆ**

لەنێوەندی حوزەیرانی ۲۰۰۲ شێوە کردەیی و سیاسی لە ئەفغانستان کەوتە نێو قەیرانێکی ناسایشی نیشتمانی ئەمەش گوازرایەوە کاری نیشتمانی، تەنیا نۆ مانگ لەپاش هێرشەکانی ۱۱-۹ لەتەك قورسایی سیاسەتی ئەفغانی و ئۆپراسیۆنەکانمان، کەچی هێزی سیاسیمان بەرەو عێراق هەنگاوی نا.

دەبێ بژاردەی پیشەیی لەم ژینگە دیاریکراوە نوێیە چۆن بێ؟

رۆب رینچەر سەرۆکی بەشی داهاتە مرۆییەکان لەپێش چەند هەفتەیەك لە چوونم بۆ ئەفغانستان بانگی کردم.

گوتی " هانك وەزارەتی بەرگری دەڵێت دەتوانیت لە بنکەی دژەتیرۆر-ئۆپراسیۆنی تایبەت بمێنتەوە، یان کارێکی دیکە بگریتە دەست، تۆ کارێکی زۆر باشت کردووە، تەنیا دەتوانیت پێم بڵێت چیت دەوێ".

"سوپاش رۆب، دەگەڕێمەوە لات".

رۆب رۆڵێکی سەرەکی بینی بە گرنگیدان بە کارمەندانی بنکەی دژەتیرۆر-ئۆپراسیۆنی تایبەت، لەگەڵ ئەوەی بەشەکانی دیکە رێگەیان نەدەدا ئەفسەرەکانیان بگوازرێنەوە بۆ یەکەکەمان، ئەمەش هاوکارێك بوو لە ساڵی رابردوودا لەناکاو بگەڕێمەوە بۆ ناو خانەوادەکەم، تا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان نیشتەجێ بم.

زۆر بەدڵفراوانییەوە هەموو بابەتەکانیان بۆم خستە روو، من سوپاسیان دەکەم، لەمەوەش زۆر وەڕس بووم لەوەی سەردانی ئەفغانستان بکەمەوە، مانەوە و رۆیشتنم بەندە بە نهۆمی حەوتەم، پێشبینی ئەوەم دەکرد، شتێکی زیاترە لە ئەفغانستان، لەوانەشە داهاتووم تێکەڵ بووبێ بە ئەفغانستان، چونکە تا ئێستا جەنگ کۆتایی نەهاتووە، لەگەڵ ئەوەی درکم بەوە کردووە ئەمجۆرە شەڕە هیچ

کاتێك کۆتایی نایەت، ئەمە جەنگی جیهانی دووەم نییە سەرکەوتن تیایدا بەدی بێت، تا لە رۆژی سەرکەوتندا لە ئەوروویا ئاهەنگ بگێڕیت، یان رۆژی سەرکەوتن بەسەر ژاپۆندا یاد بکەینەوە، ئەمە وەك ئەوە وایە لەگەڵ پەتایەك بجەنگیت، یان ئەوەتا پەتاکە لە رەگەوە دەربهێنیت یان تا رووبەڕووی یەکێکی دیکە ببیتەوە، ئیجا بەهەر شێوەیەك بێ دەبێ لە جەنگدا بیت.

زۆرێك لە سەرکردەکانی قاعیدەمان لەناوبرد، بەڵام ئوسامە بنلادن و جێگرەکەی ئەیمەن زەوهیری، تا ئێستا زیندوون و زاڵ بەسەر رێکخستنەکەیان، هەواڵگرییەکان باسیان لەوە کرد کە قاعیدە بەرەو پاکستان رۆیشتووە، لەو شوێنانەشن کە تا ئەو پەڕی خێڵەکین بەمەش دالدەکەیان سەقامگیرە و ئەو ناوچەیەش تا ئێستا لە سەرەتادان، بۆیە قاعیدە و تالیبان ئەو هەلەیان قۆستۆتەوە تا لەکۆمەڵگە هەژارەکاندابن، چونکە دوورە لە زاڵبوونی یاسا، ئێمە نەمانتوانی ئەم بابەت چارەسەر بکەین، بەڵام ئەوە دەزانین قاعیدە تا ئێستا توانای هەیە، سەرەڕایی ناتوانێ پلان دابنێ بۆ هێرشی دیکە، زۆر لقوپۆپی دیکەی قاعیدەمان لە مەغریب تا فلیپین هەڵوەشاندەوە، بەڵام تا ئێستا کارەکە کۆتایی نەهاتووە، بەتایبەتی لە ئەفغانستاندا، ئەمەش پێویستی بە چارەسەری بەردەوام هەیە، جگە لەوەی سەرکەوتن چەند ساڵێکی دیکەی دەوێ.

نەمان توانی ئامانجە ستراتیژییەکان بەتەواوی بپێکین بۆ نەهێشتنی یاخیبوون، ئەمەمان لەگەڵ فرانکس لە ئەیلوولی ۲۰۰۱ باس کرد: بۆ رەشکردنەوەی سەرکردایەتیی دوژمن و بێبەشکردنی لە دالدەکانی و ئەو دۆخانەی کە دەیقۆزنەوە.

کەچی مکوڕبوون سەبارەت بە ئەفغانستان هێدی هێدی ون دەبوو، لە هەمانکاتدا بابەتی عێراق خۆی دەهێنا پێش، کەس نەی پرسی لەبارەی بۆچوونی

من، هەروا منیش شتێکی وام سەبارەت بە عێراق نەدەزانی، نەم دەویست بەشدار بم لەو ململانێیە، کە بەرەو بۆگەنی بوون دەڕوات، بەڵکو خۆم لەنێوەندی خۆمدا خۆم بخومەوە.

تووشی گومان بووم سەبارەت بە سیاسەت و داهاتووی رۆڵی سی ئای ئەی لە ئەفغانستان، هەولّم دا تێبگەم سەبارەت بە ئاستی سیاسەتی گەورەکان، بەڵام تۆڕە دینامیکییەکان لەلایەن کۆماندۆسی کاری شاراوە بارێکی گرانی کەوتبووە سەرشانی، هێزەکان گۆڕ بۆیە ئەگەر بمێنمەوە ناتوانم کارێکی زۆر بکەم، ئەم کارەی منیش بۆ هەڵوێستی سیاسی زیاتر دانابیە، لەم کاتەدا دیار بوو رەخنە و گلەیی لە کاری سی ئای ئەی دەکرا، دەتوانین لە پاش ١١-٩ رووەکان دەربخەین دوای ئەوەی کارەکانمان زۆر بەروونی دەبیندرا بەڵام ئێستا وا نابیندرێ.

لەپێشتردا لەگەڵ گریگ ئەم باسەم خستە روو، تا نموونەکەمان بۆ داهاتوو نموونەیەکی بەردەوام بێ، پێم گوت بەشێك لە رووەکانی سەرکەوتنەکانمان لە ئۆپراسیۆنەکانی داهاتوو سوودی لێ وەردەگیرێ لەرووی کردەیی و تەکتیکییەوە. تینیت و کۆفر ئەو هەلانەیان قۆستەوە کاتێك حکومەت زللەیەکی گەورەی بەرکەوت، لە کاتێکدا کاری شاراوە لە ماوەی ئەو چەند ساڵانەیدا زانیارییەکی زۆری کۆکردبۆوە هەمان کاتیش پلان و ئاگادارییەکانی دەخستە روو، ئەوەشم بۆ گریگ باس کرد کە بەشێك لە سەرکردە نیشتمانییەکان نایانەوێ چارەسەرنووس بدەنە دەست ئێمە، ئەوان پێیان وایە ئێمە کەسانی کلاسیکین و نایەنەوێ بکەونە ترسناکییەوە، چونکە ئەمە گونجاو نییە بۆ هەندێك سیاسەتمەدارانی واشنتن، گریگ یەکسەر لە کارەکە تێگەیشت بۆیە بێ ئومێد بوو، ئەو سیخوڕە کاتی ئەوەی نییە باس لە سیاسەت بکات، ئەو وەك کوڕێ لادێیە زۆر زوو توڕ دەبێ، بەڵام زۆر زیرەکە و روانینی بۆ کارەکان بەدانایی چارەسەر دەکات.

گفتوگۆکانمان زۆر باش نەبوو بۆ سی ئای ئەی و حکومەتەکەمان، تەنیا بەو دۆخە رازی بووین، ئەمەش لە خزمەت و راژەکانمانی کەم نەکردەوە، لەم کاتەدا بیرم لە کارەکانم دەکردەوە بەتایبەتی چوار کارکردنم لە دژەتیرۆردا، بەبێ سڵمینەوە هەوڵمان دەدا، بۆ ئەمەش زیاتر بەقووڵی تێدەگەیشتم، لەوانەیە بە هۆی ماندووبوونمەوە کەمێك لە درکپێکردنەکانم بەتەواوی نەبن، ئەی چۆن بتوانم هەمووی لە بۆنەیەکدا کۆبکەمەوە؟ ئەی چی روویدا لە دوای کارەساتی ١١-٩؟ ئەمە مانای چییە؟

ئێستاش بیری خاوخێزان دەکەم

لەپاش دوو رۆژ پەیوەندیم بە رۆب کردەوە.

گوتم "دەمەوێ بچمەوە زانکۆ بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر".

لە وەڵامدا گوتی "شاکارە، ئێمەش خەرجییەکانت بۆ دابین دەکەین، تۆ بەردەوام مووچەی خۆت وەردەگریت".

"سوپاس، داواکاریەك پێشکەش بە کۆلیژی توێژینەوەی نێودەڵەتی دەکەم، لە زانکۆی جونز هۆبکنز، ئوان بەرنامەی ماستەریان هەیە بۆ ماوەی ساڵێك سەبارەت بە سیاسەتی گشتی، بەدواداچوون بۆ بابەتەکە دەکەم، هەموو ناوەڕۆکێکت دەخەمە روو بۆ کارەکان".

پاداشتەکانم زۆر سانا بوون وەك هاوسەر و باوك، تا هەموو کاتە لەدەستچووەکان قەرەبوو بکەمەوە، ئەوە جگە لە ماندبوونی لەشم، وام هەست دەکرد من دارەکان دەکەمە دوو کەرت کەچی دارەکان تەواو نابن، بەردەوام داری دیکەم بۆ دێنن، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە واز لە دار بڕین بێنم، هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشم و تەورەکەش فڕێ بدەم.

بیرم لە ئاگاداری کۆفر کردەوە سەبارەت بە ترسناکییەکانی سیاسەت و شکست و سەرکەوتن، بیرم لەوە کردەوە واباشترە لە هەموو شتێکی سەرکردایەتی بێمە دەرەوە، هەرنا بۆ ماوەیەك.

لەپاش پشووی تەمووز دووبارە چالاك بوومەوە ئەو رۆژانەم لەگەڵ خێزانەکەمدا بەسەر برد بەتایبەت لە لووتکەی چیایەکانی رۆکی، چوومە کۆلیژ، ئەمجارەیان پانتۆڵێکی جینز و نیشێرتێکم پۆشی، ئەمجارەیان دوور لە بۆینباخ و گولەبەند.

کاتەکانم دابەش کرد یەکەم کارم بەدواداچوون بوو بۆ دووبارە سەیرکردنی نووسینەکانی دوای هێرشەکانی ١١-٩، شتێکی وا نەبوو تا لەسەری بوەستم.

لە زۆر کەسم پرسی سەبارەت بە ئەنجامی ئەمریکا لە ئەفغانستان، زۆربەیان باسی ئەوەیان کرد کە سۆفیەت و بەریتانییەکان نەیان توانیووە بەتەواوی کارەکانیان بپێکن، ئەمەش بە نەپێکانی ئیمپریالەیەت ناودەبرێ، زۆرێکیش لە شارەزایانی سەربازی باسیان لە جەنگی کەنداو دەکرد، بەشێوەیەك وشکییەك هەیە لە سیاسەتی ئەو ناوچەیە، بەشێکیش لە شارەزایانی دژەتیرۆر باسیان لە رووخان و خاپوورکردنی ئاسیای ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و خاکی ئەمریکا نەکردەوە. زۆر بەکەمی باسیان لە ئایدۆلۆژیای گەندەڵی قاعیدە یان گەلی ئەفغانستانیان دەکرد، بیرم لەو گفتوگۆیانە کردەوە لەگەڵ شا مەسعوود کە لە سەرەتای ٢٠٠٠ باسی گرنگی گەلی ئەفغانستانمان دەکرد لە هەر ململانێیەك، بەڵام ئایا هیچ کاتێك لە ئەفغانییەکی پرسیووە بۆچوونی چییە.

گفتوگۆکانمان زۆری نەخایاند لە بارەی رۆڵی هەواڵگری لە ئەفغانستان، تەنیا نەمان توانی پێشبینی لە هێرشەکانی ١١-٩ بکەین تا بیوەستێنین، لەجیاتی

مردنی مایك سبان رووماڵەکە لە کۆتـایی تشـرینی دووەمـی ۲۰۰۱ بـوو زیـاتر تیشککخرایە سەر سی ئای ئەی لەتەك ئەوەی زیاتر جەختکرایە سـەر رۆڵـی کـاری شاراوەی ئاژانسەکە و هەواڵگری کە خودی هەڵمەتەکـەی بەتـەواوی گرتبـووە ئـە ستۆ، هەموو ئەمانە هەراسانیان کردم، چۆن لە جەنگی دیکە سەرکەوتوو دەبـین، ئەگەر تێگەیشتنێك نەبێ لەم رووە سەرەکییە؟

پێشبینییەکانم زۆر روون بوو هاوکـات سـەرکەوتنەکان لەلایـەن مامۆسـتای توێژینەوەی نێودەوڵەتی پێشکەوتوو بەجوانی بەدەردەکـەوت، بەتایبـەت لەلایـەن فوئاد عەجەمی مامۆستا لە زانکۆی جونز هۆبکنز کە باسی پاڵەپەستۆی قاعیدە و تاڵیبانی دەکرد، ئەو پێشبینی رووخانی ئەوانی دەکرد لـەو کاتـەی هێرشـێکی رێکخراو و مکورِ بوون بەسەریاندا بکرێ.

هەروا ئایلیۆت کۆهین چەند سەرنجێکی خستە روو لە وتارێـك لـە ناشـیوناڵ ئەنترست لە تشرینی دووەمـی ۲۰۰۱ بڵاوکرایـەوە، کـە ناونیشـانەکەی جـەنگی رۆژئاوا بوو ئەو نووسیوویەتی " لە ۱۱-۹ جەنگێکی تارمایی دەستی پـێ کـرد، کەچی هەر ئەمەش جەنگە، لەگەڵ ئەوەی هەندێك بڕوایان بە زمانی جەنگ نەبوو بەتایبـەت لـەدیاریکردنی جـەنگ لەنێوەنـدێکی تەسـك، کەچـی ویلایەتـە یەکگرتووەکان لە ۱۹۹۱ زیاتر دەیەوێ جەنگ لەگەڵ عێراقدا یەکلاکـەرەوە بـێ، بەو مانایەی دیاریکردنی جەنگە، کە سەرەتایەکی روونی هەیە، دژ بە دەوڵـەتێك یـان دژ بـە هێزێکـی چـەکداری، ئەمـەش بـەروونی لـە مەرجـەکانی کۆتـایی و ستراتیژییەکانی پاشەکشە بەدەردەکەوێ".

ئێستا لە سەردەمی جەنگداین لەنێوەندی سنوورێکی ئاسایی، بەمەش کۆهین گوتی "جەنگەکان پۆلینێکی روونی هەیە، بەتایبـەت ئەوانـەی لـەبارەی بـاوەڕی

سەربازی دەزانن، واتە لە کۆلێژەکانی سەربازی یان سیاسی و جەنەراڵەکان دەزانن ئەمە تەنیا تاریکی و دڵەڕاوکێیە"، لە درێژەی قسەکانیدا گوتی " دەکرێ ئەم جەنگە شێوەیەکی دیکەی هەبێ بەشێوەیەك ترسناکییەکانی زۆر خێرا بن، چونکە ئاگادارییەکان تیایدا کەمترە"، دیارە ئەمەش پەیوەندی بە هەواڵگرییەکی یەکلاکەرەوە هەیە، بەشێوەیەك هاوکارمان دەبێ لە کەمکردنەوەی تاریکی و دڵەڕاوکێ، سەبارەت بە تێگەیشتن لە شێوەی نوێ و ترسناك، کۆهین بەسانایی گوتی" سیخوڕەکان رۆڵێکی گەورە دەبینن و زۆر زیاترە لە رۆڵی سەرباز و فرۆکەوانەکان".

عەجەمی و کۆهین بەتەواوی ناوەڕاستی باسەکەیان پێ کا، بۆیە پەیمانگەی توێژینەوە پێشکەوتووەکان ئەو شوێنەیە، کە دەبێ لەوێدا بم.

زۆر بەکەمی دووربینیم بۆ رووداوەکانی داهاتوو هەبوو، بەدواداچووننمان سەبارەت بە پرۆژەی مارشاڵ بۆ ئەفغانستان بەپێی بەڵێنەکانمان نەبوو لە ئەفغانستان، بۆیە رێگە بە تاڵیبان لە پاکستان دەدەین تا بتوانن ریزەکانیان رێکبخەنەوە و بڵاوەی لێ بکەن، چونکە عێراق زۆرێك لە گەنجینەی ئەمریکی دەبات، لەوانەیە بگاتە دوو ترلیۆن دۆلار، هاوکات رامسفێلدا ناوانێ خۆی رێکبخا لەگەڵ سەردەمی نوێ، کە ئاسۆکانی هێدی هێدی وا بەدەردەکەوێ، لە کاتێکدا یاریزانەکانی دەوڵەتانی دیکە رۆڵی تیادا دەبینن، هەندێکیان هاوڕێن لەتەك نەیارەکانمان، هەمووان رۆڵی سەرەکی دەبینن.

خۆم بە پرۆفیسۆر کۆهین ناساند، کە سەرپەرشتی بەشی توێژینەوە ستراتیژییەکان دەکات، لەلایەکی نووسینگەکەی دانیشتین باسی ئاستەنگەکانی

ئەكادیمیمان کرد، ئەم زۆر بەروونی تێگەیشت و بیری کردەوە، بۆیە بەخێرایی وەڵامم دایەوە.

ئەو زانیی ئەفسەرێکی سی ئای ئەیم ئێستاش لە مۆڵەتی توێژینەوەی ئەکادیمی دام، تا ئەو کاتە ژیانم ئاستەنگ بوو لەجیاتی ئەوەی یاریدەر بێ، ئەمەو لەپاش چوار ساڵ لە کارکردن لە دژەتیرۆردا، وای لێ هات هەموو دەزگاکانی پەیوەندی ناسنامەی من دەزانن، هەروا بەشێك لە کۆمەڵە تیرۆریستیەکانیش دەیانزانی، بۆ ئەمەش قاعیدە خەڵاتێکی تەرخانکردبوو بۆ ئەوانەی بتوانن ئەفسەرێکی سی ئای ئەی بپێکن، منیش لەنێویاندا بووم.

کۆمەڵگەی ئەکادیمی هەرەشەکانی بەکەمترزانی، منیش بەو هیوایە بووم، پێویست ناکات چونکە مامۆستا و تیمەکەیان دەزانن رۆڵی من لە ئەفغانستان چی بووە، دەمویست کەمتر تیشك بخرێتە سەر من، بۆیە زۆر بەکەمی باسی ئەفغانستانم دەکرد، زیاتریش باسم لە سیستەمی جەنگ و هەواڵگرییەکان دەکرد، زۆر بەکەمی گفتوگۆم سەبارەت بە ستراتیژیەت و سیاسەت دەکرد.

لە خوێندنەکەمدا بۆ دووبارە هونەری جەنگی سەن-تزۆ خوێندەوە، لەتەك چەند بەشێکی کتێبی سوسیدیس سەبارەت بە مێژووی جەنگی بیلۆبۆنیسیەم خوێندەوە لەگەڵ چەندین کتێبی دیکە سەبارەت بە جەنگ و گۆڕانکاری سیاسەت و ئابووری چین خوێندەوە لەرووی بەرەوپێشچوونیان، ئێستاش هەمان چاکسازی لەنێو ئیسلامدا سەرهەڵدەدا، لەلایەکی دیکەوە خوێندنەوەی پێشکەوتنە دیموکراتییەکانی ئەمریکای لاتینی و چەکی کۆکوژ، لەتەك گۆڕەپانی ئەنتەرنێت کە هۆکارێکی نوێیە بۆ هەواڵگری و کوشتن.

کۆرسی یەکەمی خوێندنم هۆکارێك بوو بـۆ بۆچـوونی فـراوان سـەبارەت بـە سیاسەت و ستراتیژیەت، بەدرێژایی سەردەمەکان باسـیان لێـوە کـردووە، ئـەوەی جێگەی سەرنجە ئەو باوەڕە هەڵانەی سەرکردەکانە بەتایبەت ئەوانـەی بڕوایـان بـە شێوازی سەربازیی کۆن هەیە، بۆ نموونە کارەساتەکانی جەنگی ناوخۆیی ئەمریکی و جەنگی یەکەمی جیهانی، تیایـدا جەنەرالـەکان پشـتیان بـە ئاگربـارانی خێـرا کردووە؟ لەپاشاندا ئـەوانی سـەرکردایەتی ملیۆنـەها پیاوانیـان کـردووە، هـەروا تفەنگی کۆنیان لەدەست دایە، لە کاتێکدا یەك گولـە دەتـەقێنێ یـان شمشـێریان لەدەست دایە؟ سوپای ئەمریکی چۆن بەرگری لە هاتنی فڕۆکە و تانکێـك بکـات بـەو پێیـەی دوو چـەکن گۆڕانکـاری بەسـەر جەنگـەوە دەهێـنن؟ ویلایەتـە یەکگرتووەکان چۆن بەو شێوە خراپە لە ڤێتنام جەنگاوە؟ خوێندنەوەکانم سـەبارەت بـەو جەنەرالانـە بـوو تـوانراوە شـەڕ بکـرێ لـەو کاتـەی توانیویانـە سـەرکردە سیاسـییەکانیان رازی بکـەن، لـەو کاتـەی راسـتیی ترسـناکی دوژمنـە ڤێتنامییەکانیان شاردۆتەوە، بۆیە سەرکردە سیاسـییەکان درۆیـان لەگـەڵ گـەلی ئەمریکادا کردووە، بۆیە سەردەمی جـەنگی ڤێتنـام متمانـە جێگـەی نابێتـەوە، لەنێوان سەرباز و دەوڵەت و نەتەوەدا.

ویلایەتە یـەکگرتووەکان چـۆن دەتـوانێ هاوشـانی ئـەو گۆڕانکاریانـە بـێ، بەتایبەت ڕووبەڕووی دوژمنێـك دەبێتـەوە، دەوڵـەت نییـە، وەك قاعیـدە؟ چـۆن دەتوانێ مامەڵە لەگەڵ دوژمنێکی دڕندە بکات، کە خۆی پڕ چەك کردووە هاوشان نییە و بێ تەکتیکە، کەچی کار بۆ ئەوە دەکات لە گۆڕەپانی جیهانێکی لەرزۆکدا بجەنگێ؟

مێـژووی نـوێی دژەتـیرۆر پەیوەسـتە بـە هـزری توێژینـەوە نێودەوڵەتییـە پێشکەوتووەکان، کـە جـەخت لـە وەرچـەرخانی سـەرەکی جەنگـەکان دەکاتـەوە

بەدرێژایی سەردەمەکان تا ئێستا، بۆ ئەمەش سێ روو خۆی دەهێنێتە پێش یەکەمیان پلەی هاوشانئەبوون لە کارە جەنگییەکان، کە ئێستا لە ئاستێکی نوێدایە، کەم نابێتەوە بەڵکو بەشێوەیەکی سەیر بەخێرایی دەڕوا، ئەمەش بە هۆی زیاتر کوشتن و کاولکردنە، ئێستا چەکەکان هێزیان زیاترە، کەچی ژێرخانی دانیشتووان بەرەو لەرزۆکی هەنگاو دەنێ، ئێستاش وای لێ هاتووە بە هۆی هەڵچوونێك ڤایرۆسێکی کۆمپیوتەریت بۆ رەوانە بکەن، ئێستا ئەمە واقیعێکی جیهانی لەناکاوە.

دووەم رۆڵی کۆمەڵە تیرۆیستییەکان بەرەو زۆر بوون دەڕوان وەك قاعیدە و ئەوانی دیکە بەبێ ئەوەی رۆڵی دەوڵەت بن، وەك خێڵە ئەفغانییەکان کە هاوپەیمانییەکی بەهێزیان دروست کردووە وەك هاوپەیمانی ئەتڵەسی وان لە شوێنی خۆیان، دیارە ئەمانە دەوڵەت نین بەڵام رۆڵیان زیاتر لە دەوڵەتەکان وەك رێکخراوە ناحکومییەکان بەرەو زۆر بوون دەڕۆن، وەك راگەیاندن و بزنسمان و زانکۆ و کۆمەڵە ئاینییەکان بەرەو زۆر بوون دەڕۆن، لەگەڵ ئەوەی بۆچوونی ئەوانە بۆتە بەشێك لە روانینی ستراتیژیەت، بەڵام تا ئێستا بۆچوونە ناو پلانێکی ستراتیژی بەدەگمەن دەبیندرێ.

سێیەم ئێستا گۆڕەپانی جەنگ بۆتە جیهانی، بەتایبەت لەرووی کردەیی و تەکتیکییەوە، کۆمەڵەیەکی نەیار دەتوانن پلان دابنێن لەلایەکی ئەم هەسارەیە، نەك بە چەند رۆژێك بەڵکو بە چەند کاتژمێرێك لە رێگەی ئەنتەرنێتەوە پلان دابنێن.

لێرەدا رۆڵی هەواڵگری چییە، ئەگەر ئەم هۆکارانە هاتنە پێش، ئێستا سروشتی جەنگەکان بەرەو گۆڕانکاری دەچێ؟ چۆن بتوانین ئەو یاریزانە بچووکانە

دیاری بکەین، کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکەی گۆڕەپانەکە هاتووچۆ دەکەن، ئەوە جگە لە چەندین تەکنیك و مکوڕبوونیان؟ واتە ئێستا هەواڵگری بەرەو قورساییەکی زۆر ڕۆیشتووە، کەچی لەم کاتانەدا زۆر پێویستە.

زۆر توێژەری بەڕێزی وەك جۆن کیڤان ڕەتی ئەوەیان کردەوە کە هەواڵگری بەهایەکی هەبێ لە جەنگدا، هەندێك لە داڕێژەرانی سیاسەتیش هەمان بۆچوونیان هەیە، بەڵام ئایا ئەو جەنگە دەگۆڕێ بەپێی بۆچوونی ئەوان؟ ئایا ئەکادیمیا هەواڵگری بەبابەتێکی شیاو دەزانێ، بێگومان پێی وانییە شایەنی بێ، بەڵکو پسپۆڕییەکی دەگمەن و جیایە؟ ئایا سەرکردە سیاسیەکان پێداچوونەوە بە بەهای هەواڵگری دەکەنەوە؟

پێویستم بە توێژینەوە هەبوو سەبارەت بەو بابەتانە، واتە سەبارەت بە هێزی هەواڵگری خاتوونی پرۆفیسۆر جنیفەر سیمس کە کتێبەکەی بە ناونیشانی "هونەری هەواڵگری و دروستکردن"ە.

خاتوونی پرۆفیسۆر تیۆرەکەی لەسەر بنەما مێژووە بەردەوامەکان داناوە، کە پەیوەستە بە دینامیکی تێکەڵاو کردنی کۆکردنەوەی زانیارییەکان و شیکردنەوە و بۆچوونی کڕیارە سیاسییەکە، دەبێ دان بەوەدا بنێم کە ئەمزانی کۆمەڵگەی ئەکادیمی چەند بەخراپی چارەسەری ئەم بابەتەیان کردووە، لەوانەیە ڕەنگدانەوەی بۆچوونی حکومەتی ئەمریکی بێ کە باس لەوە دەکات کۆمەڵگەی هەواڵگری وەك تیمێك پێویستە، بەڵام کەس حەز بەوە ناکات باسی بکات، وەك ئەوەی سەرابێك بێ، تیایدا ڕوانینێکی ڕۆمانسی و پاڵەوانییەتی لەخۆی بگرێ، یاری دەکات بەڵام ناتوانێ بە کەس رابگەیەنێ، کە یاری دەکات.

ئـەکادیمیای هـەواڵگری لـە زۆر رووەوە وەك بابەتـەکانی ئێـف بـی ئـای و وانەکانی وەزارەتی بەرگری وایە زۆر جیا نییە، کێن ئەوانەی سەرکردەی ئێـف بـی ئای و وەزارەتی بەرگرین یان هەر وەزارەتێکی دیکە هێڵێکی سیاسـی بگرنەبـەر، ئەوانەی لە ریزەکانی سی ئای ئەی دان دواتـر شـوێنی سـەرۆکایەتی دەبیـنن لـە ئاژانسەکانیان؟ واتە کـێن سـەرکردە ئەکادیمییـەکان کـە سـەرکەوتنی گـەورەیان بەدەست هێناوە لەنێوەندی توێژینەوە هەواڵگرییـەکاندا؟

من و پرۆفیسۆر سئیمس لە کۆتاییدا بۆچوونێکی ئـەکادیمی لـەلامان هاتـە کایەوە کە لە ساڵی ٢٠٠٥ لە زانکۆی جۆرجتـاون بـە ناونیشـانی "وەرچـەرخانی هەواڵگری ئەمریکی" چاپکرا، من لە دوو بەشەدا بەشداریم کرد.

ئەو شتانەی لە کۆلیژی توێژینەوە نێودەوڵەتییە پێشـکەوتووەکان فێـر بـووم سـێ خـاڵی سـەرەکی بـوون کـە پەیوەسـتە بـە هـەواڵگری. یەکـەمیان ئاسـتی تێگەیشـتنی جـەماوەی ئـەمریکی و بەشـی هـەرە زۆری سیاسـەتمەداران بـۆ هەواڵگری، بۆ ئەمەش لە جەنگی عێراقدا نەیانتوانی بەتەواوی بابەتەکان بپێکن، باسی ئەوەیانە کـرد بەشـێك لـە سیاسـەتمەداران و هـەواڵگرەکان هەڵـەیان کـرد سەبارەت بە چەکی کۆکوژ لە عێراقدا، کەچی ئەو وڵاتەیان داگـیر کـرد. لـەدوای چەند ساڵێکی دیکەش سەرکردە سیاسیەکان هەموو بۆچـوونێکی سـی ئـای ئـەی رەت دەکەنەوە، وەك یاخیبوونی عێراقییەکان لەو کاتەی ئەمریکییەکان هەستیان بەوە کردووە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، بۆ ئەمـەش بۆچـوونەکانی ولفـۆفیتزم بـەبیر هاتـەوە کاتێـك لـە ئـەیلوولی ٢٠٠١ لـە کۆشـکی سـپی خسـتییە روو، سیاسەتمەداران هەوڵیان دا بەپێی دەرئەنجامی هەواڵگری هەنگاو بنێن، کەچی لـێ نەگەڕان خودی هەواڵگری، هەواڵگرییەکان کۆ بکاتـەوە، لەپاشـاندا سیاسـییەکان شی بکەنەوە.

دووەم سەرسام بووم بە وەرچەخانی جەنگ لەو کاتەی پێویستە زیاتر بە هەواڵگری بدرێ لەرووی پێشبڕکێی ستراتیژی، بەپێچەوانەی ئەوەی لە ئەفغانستان کردمان لە عێراقدا کردمان، بەو پێیەی گەورەترین هاوپەیمانیمان لەبیرکرد کە گەلی عێراقە، عێراقییەکانیش کۆمەڵەیەکی ناڕێکخراو بوون کەچی هەوڵیان دەدا کەسایەتی بۆ خۆیان بگەڕێننەوە، ئەم جەنگەش جەنگی نێوان دوو دەوڵەت نەبوو، ئەمە جەنگێك بوو هەندێك خەڵك دەیانویست بێتە ئاراوە، بۆ ئەمەش سەرکردەکانمان هەر یەکەو بەلایەکدا پەرت بووبوون، بۆیە پێویستی بە زۆرترین کاری هەواڵگری هەبوو، بۆ ئەمەش دەبوایە چەندین ئاژانسی هەواڵگری بڵاوە پێ بکەین تا کاری هەواڵگری بکەن، بەڵام زۆر بەکەمی روونی و ستراتیژییەت لەئارادابوو، لە کۆتاییدا سیاسەتمەداران شکستیان لە ئاراستە و داواکارییەکان هێنا، کە دەبوایە ئەوان کڕیاری سەرەکی هەواڵگرییەکان بن.

سێیەم دینامیکی سیاسەت لەوەدایە کە ١١-٩ پێویستی بە بەرپەرچدانەوەی واشنتن هەیە، لەو کاتەدا ئێمە بەبێ لایەنانە لە مەیداندا بووین، وەك حکومەت توانیمان بە چەمکی هێز و زاڵبوون بزانین هێزە نەیارە بچووکەکان لەکوێ دان، لەگەڵیان دەستەویەخە ببینەوە لە گۆڕەپانێکی جیهانی، کە دەبوایە بەهەمان شێوە بەرپەرچیان بدەینەوە، بۆیە کارەکانمان سەرکەوت و پشتمان بە مانۆڕ بەست لەنێوەندی نیوئینجێکدا، بەڵام ئەو کارە لە واشنتنی پایتەخت نەدەکرا.

ساڵی ئەکادیمیم لە کۆلیژی توێژینەوە نێودەوڵەتییە پێشکەوتووەکان، ساڵێکی خۆش بوو، چونکە ئێستا چوارچێوەیەکی فراوانتر لەبەردەمم دایە، بۆیە نیگەران بووم لەو رێوشوێنەی کە سیاسەتی دەرەکی گرتویەتیەبەر، لەپاش داگیرکردنی عێراق خۆیان جەختیان لەوە کردەوە، کە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێنەوە بۆ سی ئای ئەی.

## بەشی سێزدەیەم

# ئەمریکا

لەسەر هەموو هاوولاتییەکە کە وەك سەرباز بێـت، ئەمـە دۆخـی گریگ و رۆمان بوو، هەروا ئەمە دەبێ دۆخی هەموو دەوڵـەتێکی ئازاد بێت.

-تۆماس جیفرسۆن

نەمدەزانی چۆنیەتی کاری من چییە، بەڵام ستیڤن کایس، ئەو لە ریزبەندیەکاندا پلەی بەرز بۆوە، ئێستاش ئەو جێگری بەڕێوەبەری سی ئای ئەی بۆ ئۆپراسیۆنەکان، ئەو بەرپرسی دووەمە لە دەزگەی شاراوە، ئەو لە نهۆمی حەوتەم داوای کرد بمبینێ.

بە هۆی زگە گەورەکەی و شانە پانەکانی نەیدەتوانی ئەو چاکەت و پانتۆڵەی لەبەریدابوو بەتەواوی رێکبخا، تا لەگەڵ لەشیدا بگونجێ، پێدەچوو هەردوو پێڵاوەکانی بە تف سڕیبێتەوە، رووخساری بە پەنجا ساڵ دەچوو، سەری رووتابۆوە، لەتەك ئەمەشدا ریشی بەتەواوی پڕبوونی پێوە دیار بوو، لۆچی سەر هەردوو چاویشی دیار بوو، چونکە ساڵانێك بوو لەژێر تیشکی خۆردا لە رۆژهەڵاتیی ناوەڕاست کاری کردووە، هەروا پێ دەچوو سەدان جوولە بزانێ بە هۆی راهێنە بەردەوامەکانی.

"بەخێربێت هێنری" بەدەنگێکی قورس وای گوت، هەردووکمانیش لەپێشتردا لە "کێڵگە" وەك راهێنەر یەکترمان ناسیووە.

"ستیف پێ دەچێ تا ئێستا توانایەکی باشت مابێ".

"هێنری هەوڵ دەدەم، ئێستا گوێم لێ بگرە، دەمەوێ بیر لە شتێك بکەیتەوە".

هەردەم بە ناوی هێنری بانگی کردووم، هیچ کاتێك پێی نەگوتووم فرانك، ئێستا ئەو سەرۆکمە، من زۆر بەباشی دەیناسم، کاتێك داوا لە یەکێك دەکات "بیربکاتەوە"، لە شتێك، ئەو دەیەوێ لەئامادەباشیدا بیت، ئەو ئەفسەر بووە لە مارێنزی ئەمریکی، ئێستاش هەروا بە هۆی ئەو رێگەیانەی گرتوویەتیەبەر.

"بەڵێ، من گوێ دەگرم".

"بنکەی سەرۆکایەتی سەرچاوە نیشتمانییەکان لەم هاوینەدا هەمووی دەکرێتە کۆد، بەشێکی باشە بەهایەکی زۆری هەیە، دەمەوێ تۆ سەرکردایەتی ئەو بەشە بکەیت کاری تیادا بکەیت بەتایبەت لەگەڵ سەرکردەکانی ئەمیرکی و دەزگەی چەسپاندنی یاسای ناوخۆیی، ئێستاش تۆ ئەفسەرێکی گەورەیت، بەڵام دەزانم گوێ نادەیتە دەربڕینە سیاسییەکان، وەکچۆن کەسانی دیکە بیر دەکەنەوە، بەخێرایی جوولە دەکەیت، هەموو شتێك لەدوای خۆت بەجێ دەهێڵیت، ئەمەش گرفت دەنێتەوە، پێویستیمان بە سەرۆکی سەرچاوە مرۆییەکانە، تا کار بکەیت بابەتەکان چاك بکەیتەوە، پێویستیمان بە هاوبەشی نوێ هەیە، ئەمەش هەلێکی دەگمەنە بۆ خزمەتکردن".

ئەو وەك پێشتر راست دەکا.

"پێدەچێ بۆمن کارێکی باش بێ، بەڵام لێم گەڕێ زیاتر بیر بکەمەوە، لەم نزیکانە پەیوەندیت پێوە دەکەم".

"بەڵێ، هەر لەم نزیکانە، هێنری".

لەو رۆژەدا توێژینەوەم لە مێژووی سەرچاوە نیشتمانییەکان کرد، وەك خوێنەر و وتەبێژ، هەروا راوێژم بەو هاورێیانە کرد، کە لەو بەشەدا خزمەتیان کردووە.

چووم بەرەو "ئا ئێس ئێس" کە پێشتر دەزگەی شاراوە بوو، لە ووڵ ستریتە؟، لەلایەن کۆلۆنێل ولیام "وایلد بێل" دۆنۆڤان بۆ تەجیندکردن دامەزراوە، ئەمەو ئا ئێس ئێس بەوە ناسراوە کاری تێکدەرانە و شەڕی دەستەویەخەی کردووە لەپشت هێڵەکانی نازی، لەتەك ئەوەی چەندین پاڵەوانییەتیان هەیە لە رۆژهەڵاتی ئاسیا، هاوکات کاری لەسەر کۆکردنەوەی هەواڵگری یەکلاکەرەوەی کردووە، بەتایبەت

لەلایەن پیاوانی کار و ئەکادیمی و زانا و قوتابییەکان، ئەوانەی بەشێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەخۆ گەیشتوون بە هەواڵگری لە هەموو بەشێکی جیهاندا، بۆیە کەرتی ئەمریکی گۆشەیەکی سەرەکی هەواڵگری لەلایەن ئای ئێس ئێس کۆکراوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی سەرچاوە مرۆییەکان بەپێی هەمان بنەما لەنێو وڵاتدا کاری کردووە، بەڵام بە ناوی جیا جیا.

سەرچاوە نیشتمانییەکان بریتییە لە تێکەڵکردنی ئێستا لەنێوان دوو کیاندا، یەکێکیان بە ناوی "کۆکردنەوەی هەواڵگری نیشتمانی" ناسراوە، ئەوی دیکەش بە ناوی "سەرچاوە بیانییەکان" ناسراوە، یەکەمیان جەخت لە کۆکردنەوەیەکی هێمنانە دەکات بۆ زانیارییەکان، بەتایبەت بۆ ئەوانەی دەتوانن بگەن بە هەواڵگریی دەرەکی، هاوکات ئەفسەرانی هەواڵگری نیشتمانی زیاتر کاریان لەسەر ئەو ئەمریکیانە کردووە، کە دەڕواننە بابەتی هەواڵگری بیانی، هەر لە پێشکەوتنی چین، لە نانۆدا، تا دەگاتە تەندروستیی دیکتاتۆرێکی ئەفریقییەك، بۆیە ئەفسەری کۆکردنەوەی هەواڵگری نیشتمانی ئەوان شارەزایەکی فراوانیان هەیە، کارەکەیان پەیوەست نییە بە سیخوڕی، بەڵکو پەیوەستە بە پوختەی نهێنیی زانیارییەکان دیارە ئەمەش ترسناکییەکی زۆری لەدوایە، بەڵام پاداشتەکانی زۆرە.

کەچی ئەفسەری سەرچاوە بیانییەکان، کەسانی خاوەن ڕەچەڵەکانی دیکەی دەرەوەی ناو ویلایەتە یەکگرتووەکانن. بەتایبەت ئەوانەی پابەندکراون بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانیان، باشترە خەڵکی مۆسکۆ و بیۆنگ یانگ بن، بەهێمنی کاریان لەگەڵ هێزەکانی چەسپاندنی یاسای ئەمریکی کردووە، بەتایبەتیش لەگەڵ ئێف بی ئای، کاتێك حاڵەتەکە پەیوەست بێ بە بنڕکردنی سیخوڕی و دژەتیرۆر، ئێف بی ئای گرنگییەکی زۆری پێ نەداوە، کەچی هەواڵگری گرنگیی بە هەواڵگریی دەرەوە

داوه وەك دینامیکی سیاسەتی ناوخۆیی چینی و سیاسەتی نەوتی فەنزیۆلی، یـان هەلی هەواڵگری ئاماژە لە ڕێگەی تۆڕەکانی گەیاندن لە ئەمریکای لاتینی.

سەرچاوە نیشتمانییەکان هۆکارێك بوو بۆ یەکگرتنی هەردوو دەزگەکە، ئـەم تێکەڵکردنەکەش هۆکاری خۆی هەبوو، چونکە زۆرجار، ئەمریکییەکان پوختەیەك لە هاووڵاتییەکی بیانی وەردەگرن بەمەش دەتوانن پەیوەندییەکی راستەوخۆ بکـەن بە سیخوڕێکی بیانی، کەسـێك سـەڵماندیووتی دەتـوانێ بگـات بـە هـەواڵگری و ئامادەیـە ئاشـکرای بکـات، هـەروا ئەفسـەری بەشـی کۆکردنـەوەی هـەواڵگری نیشـتمانی جـەخت لـە نـاوەڕۆکی زانیاریـیەکان دەکاتـەوە، نـەك تـەنیا لەسـەر تەجینیدکردنی بیانییەك، بەڵکو پێشکەوتنی متمانە لەکەڵ کەسی بیانی بەمـەش دەتوانێ کەسێکی بیانی بکاتـە سـیخوڕ، دیـارە هـەموو ئەمانـە پەیوەنـدی بـە کەمبوونی سەرچاوەکانی سی ئای ئەی لەپاش ئەوەی لە شەڕی سارد سەرکەوتنین، کاتێك بوودجەکان کەمکرایەوە هەردوو هۆبە جیا لەیەکتر کرا بەیەك.

لەلایەکی دیکەوە بەشی سەرچاوە نیشتمانییەکان شـێوەیەك لـە شـێوەکان و سەرەڕایی سەرکەوتنی ئۆپراسیۆنەکانی بـوو بـە پشـتی دەزگـەی شـاراوە، بـەڵام ئەفسەرانی سەرچاوە نیشتمانییەکان زۆر بەکەمی لە دەرەوەدا خزمەتیان کـردووە، ئەمـەش وەك میراتێك بۆ کۆکردنەوەی هەواڵگری نیشتمانییە، هاوکات لە دەزگەی شاراوەدا زیاتر هان و پشتی ئەوانەن لە شوێنە سەختەکاندا خزمەت دەکەن، هەروا پوختەکەی بۆ بەڕێوەبەر ئەمریکییەکە نانێردرێ، من ئـەوە دەزانم لەگـەڵ ئـەوەی هەندێکجار بۆچوونەکانم بەلایەکدا دەشکێتەوە و بێ لایەنانە نییە، دەکرێ پوختەی کارەکان لەو کاتەوە بێ کاتێـك کـارێکی سـەخت و دژوار ئـەنجام دەدرێ، یـاخود زانیارییەکان پێویستیان بە پێداچوونەوە بێ، بەتایبەت ئەو سیخوڕانەی لـەدەرەوە کار دەکەن، لەگەڵ ئەوە پوختەی زانیارییـەکان پێویسـتی بـە کاراییـەکی گـەورە

هەیە، لە کۆتاییدا دەگەڕێتەوە سەر چۆنیەتیی هەواڵگرییەکە و کـارایی کارەکـە، نەك پەیوەست بێ بە پرۆسەیەکی مەترسیدار، کە زۆرجار بـە هـۆی هەڵچـوونەوە هاتۆتە ئاراوە.

بەشی سەرچاوە نیشتمانییەکان بە دەربڕینێك سەرچاوەکانی داراییـە، ئەگـەر بەراورد بکرێ بە بەشە جوگرافییەکانی دیکەی دەزگـەی شـاراوە، لـەپێش چـەند ساڵێك بوودجەی کردەیی لە بنکەی دژەتیرۆر بە شێوەیەکی گەورە لەسـەر پێـدانی بەشی سەرچاوە نیشتمانییەکان بوو، لەوەش خراپتر بەشێك لە ئەفسـەرەکان بـەبێ ئاست بوون، هەندێکیان شکستیان هینا تا باوەڕی کێڵگە بەدەست بێـنن تـا کـار لەدەرەوەدا بکەن، بۆیە زۆربەیان چوونە بەشی سەرچـاوە نیشـتمانییەکان، لەوێـدا کاریان دەستدەکەوت لەنێو ژینگەیەکی سەقامگیر. پێدەچـێ یـەکێك لەوانـە زۆر باش بێ، چونکە بەشـێك لەوانـە وەك سـیخوڕ نێردرانـە دەرەوەی وڵـات و کـاری باشیان کرد، کاتێك گەڕانەوە بۆ کارەکانیان لە ئەمریکا ئەفسەری بـەتوانا بـوون، هاوکات زۆر لە بەشەکانی دیکە بوون بـە وێسـتگەی سەرچـاوە نیشـتمانییەکان، لەپێشتردا لەدەرەوەدا کاریان کردووە ئێستاش گەڕاونەتەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان زیـاتریش هۆکارەکـان خێزانـی بـوو، هـەروا هەنـدێك لـە ئەفسـەرانی سەرچـاوە نیشتمانییەکان زۆر بە هێزەوە رۆڵـی خۆیـان گێـڕا، بـەڵام ئـەو بەشـە زۆر لاوازە لـەرووی سـەرکردایەتیی مەیدانییـەوە، بۆیـە پێویسـتە بەشـێك لـە سـەرکردەی وێستگەکان بگۆڕدرێ، چونکە ئاستەکانیان زۆر نزم بوو لـەرووی تەجنیدکردنـەوە، هەروا دوو وێستگە کەسیان پێ تەجنید نەکرا.

سێ بوار سەرنجی راکێشام لەو کاتەی پێداچوونەوەم بە بەشی یەکەمدا کـرد، یەکەمیان بەشێك لە بەرهەمەکانی هەواڵگرییەکان بەراستی شـاکار و دەگمـەنن، لەراستیدا کەرتی تایبەتیی ئەمریکی زۆر پێشکەوتووترە لە حکومەتی ئـەمریکی

لـە زۆر بـواری تەکنـەلۆژیای بـەرز، ئەمـەش بـۆ پێداویسـتییەکانی هـەواڵگری لەوپەڕیدایە، زۆر لام گرنگ بوو کاتێك سەرمایەی هزریان بـەرەو پێشـەوە دەبـرد وەك بنەمایەك بۆ هەواڵگری باشتر، بۆیە هەواڵگری ئەمریکی زیاتر بەرەو پێشەوە دەچوو، بەبێ ئەوەی لەلایەن کەرتی تایبەتەوە هاوکاری بکرێـت، بۆیـە سەرچـاوە نیشتمانییەکان رووبەکی سیخوڕی بوو بۆ تەکنەلۆژیایە بەرزەکان.

دووەم هاوبەشەکانی سەرچاوە نیشتمانییەکان لە کەرتی تایبەت توانیان بگەن بە هەواڵگری بیانی و ستێچی تەکنەلۆژی بۆ هێنانەکایەوەی هەواڵگری بیانی، یان بەرامبەر هاووڵاتی بیانی کە دەتوانن بگەن بە نهێنییەکان، هەنـدێکی دیکـە لـە هاوبەشەکان بەکردەیی توانیان هاووڵاتی بیانی بۆ بەرژەوەندییەکانمان کـار بکـەن، ئەوان بەشـێوەیەك کوالیتیـان بـەرز بـوو، دیـارە ئەمـە بـوارێکی تارماییـە بـۆ کۆکردنەوەی هەواڵگری. نموونە پیـاوێکی ئـەمریکی لـە ڕەچـەڵەك ئـەفغانی بـۆ وڵاتەکەی خۆی گەڕایەوە، بۆ ئەمەش تۆڕێکی لە پیـاوانی خێڵەکـەی دانـا دژ بـە تالیبان، ئەوان رۆڵێکی بەرچاوی بینی لە کاری شاراوەی پێش ١١-٩ و لەدواتردا، لەلایەکی دیکەوە زانایەکی ئەمریکی لـە گفتۆگۆیەکـدا لەگـەڵ ئەکادیمییـەك لـە کۆتایی توانی بیانییەکە بکاتە سەرچاوە، ئەمەو بەهاوکاری یەکێك لەئەفسەرەکان توانرا زانیاری تەکنیکی دەگمەن سەبارەت بە بەرنامەی چەکی وڵـاتێکی بیـانی وەربگرێ، بۆیە نەدەتواندرا بە هۆی ئەفسەرێك خێڵێکی ئەفغانی بکەیتە سەرچاوە یان بگەیتە جیهانی ئەو بیانییە، هاوکات کەرتی تایبەت رۆڵێکی بەرچاوی بینـی سەبارەت بە بوارە زانستییەکان، زۆر بەکەمیش لەلایەن ئەفسـەرانی ئۆپراسـیۆنی پێشبینی تەکنەلۆژیا کوارك و تەکنیکی نانۆ بکەن، ئەمەش زنجیرەیەکی داخـراوی هاوسەنگە لە زانستیی جوولە "رۆبۆت".

لەلایەکی دیکەوە لەگەڵ پێشکەوتنی زیاتری ئامێری هەواڵگری بیانی، تواندرا زۆرێك ئەفسەرانی سی ئای ئەی بە ناسنامەی جۆراوجۆر سەفەریان دەکرد، بۆیە وێنای ئەوە دەکرێ کە هاوبەشەکانمان لە کەرتی تایبەت کە بەناو راستەقینەکانیان سەفەر دەکەن، دەیانتوانی زیاتر پشتی سی ئای ئەی بگرن لەدەرەوەدا، راستە ترسناکییەکی گەورەی تیادا بوو، بەڵام پاداشتەکەشی بەرز بوو.

سێیەم باشترین ئەفەسەرانی هەواڵگری بیانی و دیبلۆماسی و بەرپرسە بازرگان و زان و پیاوانی کاری ویلایەتە یەکگرتووەکان کە بەزۆری گەشتیان بۆ وڵاتان کردووە، ئەوانە سیخوڕی پێشبینیکراون، بەڵام هەر دەوڵەتێك جۆرێك لە نوێنەرایەتی هەیە وەکچۆن لە نەتەوەیەکگرتووەکان بە هەمان جۆرە، ئەمانە بەشێوەیەکی بەرچاو توانیویانە سەرچاوەی نوێ پەیدا بکەن، چونکە لە خودی وڵاتەکە باشترە راهێنان بکەن نەك لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، لەراستیدا باشترین سیخوڕ لەنێوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ئەنجامدراوە، هەندێکیان خۆیان هاتوونەتە ناو کارەکەوە.

ماری مارگرێت گراهام کە سەرۆکایەتیی سەرچاوە نیشتمانییەکانی دەکرد لەپێش دوو ساڵدا یەکێك بوو لەوانەی زۆرتر لە گفتۆگۆکانم ناویم دەهێنا بۆ وەرگرتنی کارە نوێیەکە، مکوڕ بووم لەوەی زیاتر پەیوەندییەکان لەگەڵ سەرۆکەکانی ئەنجوومەنی کارگێڕی بێ بەو پێیەی کلیلی سەرکەوتنەن هەروا بەشی سەرچاوە نیشتمانییەکان دەتوانێ لە رێگەی تێگەیشتن و متمانەوە بۆ بەرەو پێشبردنی کەرەستەی کۆمپانیا تا وابکەین تواناکانی بگەیەنینە ئاستی جیهانی.

ئەو گوتی "بیر لەوە بکەوە تا کار لەگەڵ کۆمپانیایەکی گـەورە بکـەیت کـە زیاتر چەند رەچەڵەکی تیادایە".

لێم پرسی "بەڵێ، چۆن بڕوات بەوەیە من دەگونجێم لەگـەڵ ئـەو دەرەبـەگ و سیخوڕی کۆمۆنیست و بکوژە دڕندەکان و دیبلۆماسییە خراپکارەکان یـان لەگـەڵ فرۆکـەوان و شـێتەکان، یـاخود هەنـدێك لـە جـەنگاوەرە پاڵـەوان و بیرۆکراتییـە گەندەڵەکان، لە کاتێکدا هەندێك لە جوتیارەکـان شـانازی بـەوە دەکـەن کـە بـە دەستەکانی خۆیان کار دەکەن، ئەوە جگە لەگەڵ کارمەندانی فریاکەوتن و پزیشکە جادووکەرەکان، ئەمە کـارێکی جیایـە، بـیرم نایـە چـاوم کـەوتبێ بـە سـەرۆکی ئەنجوومەنی کارگێڕی لەو پێنجسەد کەسەی لەسەر ئاستی دونیا دەوڵەمەندن، یان لەتەك سەرۆکی زانکۆیەك و زانایەك لەسەر ئاستی جیهانی دانیشتبم، بۆیە من بە هیچ شێوەیەك ئاگاداری کارەکانی وڵاتی خۆم نیم کاری من لە مەیدانی دەرەکیـدا بووە، تەنیا جەختم لە کاروباری دەرەکی کردۆتەوە، کاتێك لە ئـەمریکاش بوومـە وام هەست کردووە کوڕی ئەم وڵاتە نیم، هەستم بەوە دەکرد ئاستەنگە بگەڕێمـەوە بۆ نیشتمانی خۆم.

ماری مارگرێت چاوەکانی داخست و پێکەنی.

"باسی کارەکانی ناو ئەفغانستان بکە، کتێبی "جەنگی بۆش"یان پـێ بـدە، باس لەوە بکە تۆ هانکی، شەرم مەکە تۆیان خۆش دەوێ".

لە ماوەی ساڵێکدا بە داواکاریی سی ئای ئەی چاوم کەوت بە بـۆب وودوود، لەو چاوپێکەوتنە باسی رۆڵی سـی ئـای ئـەیم کـرد لـە ئەفغانسـتان واتـە پـاش کارەساتەکانی ١١-٩، بیل هارلۆ وەك بەرپرسێك لە کاروباری گشتی یـاوەرم بـوو تا چووینە ماڵی وودورد لە جۆرجتاون، گفتوگۆکان دوو کاتژمێری خایاند، وودورد

دەیان پرسیاری کرد، ئەو زۆر بەڕێز و کەسێکی رۆشنبیر بوو، وەك هاولۆ ئەو وەڵامانەم دەدایەوە کە پێم دەکرا، من بوارێکی باشیان بۆ رەخساندم، ووروورد رۆمانێکی ورد و هاوسەنگی نووسی، کە زیاتر جەختی لە چەندین بۆچوونی جیا جیا دەکردەوە.

ئەوەی روونە، هاوکارەکانم لە سی ئای ئەی و هەندێك کەس لە حکومەتی ئەمریکی زۆربەیان ئەوەیان زانی ناوی من لەو کتێبەدا ئاماژەی پێ دراوە، ئەوەی جێگەی سەیرە زۆرێك لە قسەی نەشیاو لە راگەیاندنەکان بڵاوکرایەوە، هاوکات بەشێك لە هاوڕێ و خزمەکانیشم هەمان قسەیان هەبوو، بەو شێوەیە خەڵکێکی دیکەش ئەوەی زانی، وەك هاورێیەکانم لە کۆلیژی توێژینەوەی نێودەوڵەتی پێشکەوتوو یان بڕوایان وابوو من وام.

ماری مارگرێت جەختی لەوە کردەوە کە زۆربەی ئەمریکییەکان دەیانەوێ هاوکاری سی ئای ئەی بکەن، ئەگەر بەرادەیەکی کەمیش بێت، ئەوەی جێگەی سەرنجیش بوو زۆرێك لە راگەیاندن و قسەی خەڵکی بەخراپی وێنای ئەفسەری سی ئای ئەیان دەکرد، وەك دەیان گوت کەسانێك ماسولکەیان بەهێزە، بەڵام بێ مێشکن، یان هەردووکیانن، ئەمەش پێشێلکردنە لە پاش ۱۱-۹، چۆن بەو شێوەیە بەردەوام بێ؟

ماری وەك کەسێکی راستگۆ و متمانەپێکراو داوای لێ کردم کارەکە پەسەند بکەم، باسی ئەوەشی کرد هەندێك بابەت هەڵە، لەوەش گرنگتر ئەرکە.

توێژینەوەم سەبارەت بە سەرچاوە نیشتمانییەکان کرد بەهێمنی روانیم لەگەڵ بم یان دژ، کەچی ئەوەی باوەڕی گۆڕیم، دوو رۆژ مانەوەیە لە ساندیاگۆ نەك لە سۆماڵ، هەروا پرسیارم لە خۆم کرد، کە ئێستا بەرەو پیری دەڕۆم، دەزانم دەکەومە

بەر قسەی برادەرانم لە بەشی ئەفریقی و بەشی چالاکییە تایبەتییەکان، زیاتریش گریك هیچ کاتێك بێدەنگ نابێ.

لە دوای دوو رۆژ تەلەفۆنم بۆ کایس کرد.

"سەرۆکی بەشی سەرچاوە نیشتمانییەکان، کارەکە خۆش دەبێ، کارەکە دەکەم، سوپاس".

گوتی " بەخێرهاتنت دەکەین".

لەدوایدا بیرم لەوە کردەوە کە داوای لقی نووسینگەیەك بکەم لە فایل یان ئەسین بۆ بەردەوامبوونم"..

تەلەفۆنم بۆ زۆرێك لەو گەورە ئەفسەرانە کرد کە لەژێر فەرمانی مندا کاریان کردووە بەتایبەتی لەدەرەوە و لە بنکەی دژەتیرۆردا، پێویستم بەیارمەتیی ئەوانە، بۆ خستنەرووی سەرۆکایەتی هەندێك وێستگە، کە لەم ماوەیەدا بەشی سەرچاوە نیشتمانییەکان دابینی دەکات.

کاتێك چووم بۆ سەرچاوە نیشئتمانییەکان چەندین دەسکەوتم بەدەست هێنا ئەمەو بەشە بچووکەکانی وێستگە و بنکە لە هەموو وڵاتدا بڵاوبۆوە، بەڵام بەرووماڵێکی بازرگانی، هەندێك وێستگە باشتر کاریان کرد واتە بەرهەمیان زیاتر بوو لە دژەتیرۆر، هەندێکی دیکە جەختیان لە هەواڵگریی سیاسی و ئابووری و زانستی کردەوە، دوو نووسینگە زۆربەی شتەکانیان رووماڵ کرد، بەو شێوەیە کارەکە فراوان بوو، چونکە شانۆی بەشی سەرچاوە نیشتمانییەکان دەستی کرد بە سەربازگیری و تەجنیدکردن و کۆکردنەوەی زانیاری بۆ دەزگەی شاراوە، هەروا هاوبەشەکانی بەش لە کەرتی تایبەت وەك هێزێکی خۆبەخشی هاوڵاتییان بوون- ئەو سیخورە ئەمریکیانەی سەردانی وڵاتان دەکەن.

بەهای هەواڵگری یەکلاکەرەوە بوو، لەو کاتەی سی ئای ئـەی سـەبارەت بـە چەکی کۆکوژی عێراق کارەکانی نـەپێکابوون بـۆ ئەمـەش ئەفسـەرانی سەرچـاوە نیشتمانییەکان بە هۆی سووپای ئەمریکی چەندین راپـۆرتی بـەهاداریان بەرهـەم هێنا. لەپاش جەنگی عێراق و ئێرانیش بەشێکی زۆری بەڵێندەرە ئەمریکییـەکان گەڕانەوە عێـراق، هەنـدێك لەوانـە زانیاریـان دا بـە سەرچـاوە نیشـتمانییەکان، هاوکـات ئێمـە زۆر پێویسـتیمان بەخشـی بـە سـووپای ئـەمریکی بـۆ ئەمـەش تۆڕەکانمان لە هەموو وڵاتدا بڵاوکردەوە، ئەمەش ئەنجامی خێرایی دا بەدەسـتەوە، وەك یەکێك سەرچاوەکانی بەش توانی ئامانجێکی عێراقی دەستنیشـان بکـات کـە نزیکبوو لە داینگە و چێشتخانەیەك، سێ جـار سەرچـاوە نیشـتمانییەکان داتـای وردی جوگرافییان پێشکەش کرد لەپاشاندا ئەمە درا بە سووپای ئەمریکی تا کار لەسەر ئەو راپۆرتە بکات، هەروا ئەفسەرێکی بەش لە رۆژی دواتردا هەواڵی دا بە تۆڕەکانی کێبڵی ئەمریکی دا کە بۆمبارانکردنەکەیان زۆر ورد بووە، داینگەکەش هیچی بەرنەکەوتووە.

سەرچاوە نیشتمانییەکان بـە هاوکـاریی ئێـف بـی ئـای چـەندین بەرپرسـی عێراقیان بۆ لای خۆیان راکێشا بەتایبەتی ئەوانـەی لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکان نیشتەجێبوونە، ئەوانە زانیاری یەکلاکەرەوە وردیان پێ داین، بۆ ئەمەش چـەندین سەرچاوە کەسانی نێو خێزان و هۆزەکانیان سەربازگیر کردبوو بۆ ئەمـەش سـەدان راپۆرتیاندا بەسەرچاوە نیشتمانییەکان، هەموو ئەمانـەش بـۆ کرێـارە سیاسـی و سەربازییەکان خرایە روو.

یەکێك لە دەستکەوتەکانی سەرچاوە نیشتمانییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو لـە بوارەکانی زانست و ژیری پیشەسازی رۆبـۆت و تـەکنیکی نـانۆ بـوو کاریگـەری هەبوو لەسەر هەواڵگری و جەنگ، بە هۆی زۆرێك لە ئەندازیاران تواندرا زۆرێك لە

مرۆڤەكان بكەن بە ئامرازی جەنگێكی پێشكەوتوو، هەروا دانانی رۆبۆتی جەنگاوەر كە رێگرە لەوەی ملیۆنەها كەس كاریگەر بن بە نەخۆشییەكان.

هەروا ئەندازیاری رۆبۆتە وردەكان لەرووی دینامیكییەوە هەوا و مێش و مەگەز كۆپی دەكەن، بكات بە فرۆكەی زۆر بچووكی بێ فرۆكەوان و دەتوانێ سیخوڕی بەسەر ئەو كەسانەوە بكات كە جێگەی گومانن، ئەمەش لەلایەن سی ئای ئەیەوە كەرەستەی نوێن بۆ كاراییكردنی هەموو بابەتەكانیان، دیارە یەكێك لە دەزگە هەواڵگرییەكانی دوژمن توانی بەشێك زۆری ئەو زانستە تێكەڵ بكات لە هەمان پرۆگرام، بۆ ئەمەش هەموو لایەنەكانیان شی كردەوە، هاوكات سی ئای ئەی و هەواڵگرییەكانی دیكە توانیا تەكنەلۆژیای زانیاریی بازرگانی پراكتیك بكەن.

زۆرجار بیر لەوە دەكەمەوە لە داهاتوودا بەهای كەرتی تایبەتی هەواڵگری ئەمریكی بەرز دەبێتەوە، بەتایبەت لەرووی خێرایی و تەكنەلۆژیاوە، بۆیە چەند بەشێكی دیكە بە نوێیی لە سی ئای ئەی دانرا وەك بەشی بەڕێوەبەرایەتیی زانست و تەكنەلۆژیا، بۆ پراكتیكی راستەوخۆ لە كۆمەڵگەی ئاسایشی نەتەوەیدا، دیارە ئەمەش چەند پێداویستی نوێ دەخاتە روو بۆ كۆكردنەوەی هەواڵگری بیانی؟ بەڵام چۆن سەرچاوە نیشتمانییەكان ئەو شێوە هەواڵگرییە لە بیانییەكان وەربگرێ بە هۆی ئەو پێشكەوتنەوە؟ ئەوە جگە لەوەی كاریگەری گۆڕانكارییەكان دەبێ لەسەر كەرتی تایبەت یان بەپێچەوانەوە؟ هەروا بەو پێیەی من سەرۆكی نوێی سەرچاوە نیشتمانییەكانم لە سەرەتای تێگەیشتنم دەبێ لە سەرەتادا چ دەسكەوتنێك بهێنینە ئارا.

وەڵامی ئەو پرسیارانە کلیلی سەرکەوتنی سەرچاوە نیشتمانییەکانە، وەك چۆن ماری مارگرێت گراهام وای گوت، لەپێش هەموو شتێکدا ئێستا چەندین سەرکردەم لەنێوەندی کەرتی تایبەتی ئەمریکیدا هەیە.

## سەرۆکی جێبەجێکار

سەرۆکی جێبەجێکار، کەسێکی دیارە و خاوەن ملیۆنەهایە و یەکێك لە سەرکردەکانی کارەکەیەتی لە بەشی سەرچاوە نیشتمانییەکان لە بارەگای سەرکردایەتی سی ئای ئەی، پێشتر مۆڵەتی ئاسایشمان پێ داوە تا سەردانمان بکات، ئێستا ئەو سەرچاوەیەکی گرنگە و هاوکاری سی ئای ئەیە و ماوەی چەند ساڵێکە ئەو کارە دەکات، ئەو ماوەی دوو هەفتەیە وەك کارمەند لێرە کار دەکات، یەکێکە لەوانەی هەر لەزووەوە سەردانی کردووین.

ئەو کەسێکی باڵابەرزە و بیروبۆچوونی عاقڵمەندانەیە، هەردەم پێی ناخۆشە لە شوێنێکدا بمێنێتەوە، نەم دەتوانی بەتەواو ئاشکرای بکەم چۆن بەو جۆشوخرۆشییەوە هاوکاریمان دەکات بۆ سیخوڕیکردن بەسەر بیانییەوە، کاتێك هاتە ژوورەکەم لە دڵی خۆمدا گوتم ئێستا بەخێرایی هەموو هێڵە سوورەکان دەبەزێنێ، بەڵام بەهێمنی لەژوورەکە دانیشت، منیش بەشداریم لەگەڵدا کرد سەبارەت بە هەواڵە هاوبەشییەکانمان.

بەهێمنی باسی ژێرخانی پرۆسەکانی سی ئای ئەی کرد، مەبەستیشی لەمەدا پێشکەشکردنی هەندێك هاوکاری بۆ رووماڵکردنی پراکتیکە دیاریکراوەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجە بیانییە مرۆییەکان وەك تەکنیك و پشتگیری کارگێڕی بۆ ئۆپراسیۆنی تایبەت، ئایا شتێك هەیە نەمان کردبێ؟

بەسەرسوڕمانییەوە وەڵامی زۆرێك لە پرسیارەکانی دامەوە و هەموو تێبینیەکانیشم نووسی، لە کۆتاییدا ویستی زیاتر بمێنێتەوە و گفتوگۆ بکەین سەبارەت بە بەدواچوونی پراکتیکەکان.

پرسی "ئەی چ هەیە سەبارەت بە قاعیدە؟ بۆ ئەوەندە رقیان لە ئێمەیە؟".

"لە ئێمە دەترسن، ترسیان لە جیهانگەرایی هەیە، بەپێی روانینە دواکەوتووەکانیان، پێیان وایە دەبێ کۆمەڵگە وا بژیت، ترسیان لەوەیە جیهانگەرایی بەتەواوی ونیان بکات بەتایبەت لەگەڵ هاتنی بازاڕی ئازاد و بەها لیبرالییەکان، پێویستە ئەوان بترسن، چونکە جیهانگەرایی زۆر خێرایە و هیچ رێگرییەك نییە لەبەرامبەری، بێگومان ئەوان جیان لە بیرۆبچوونی سیاسی سەبارەت بە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست".

ئەو گوتی "بەڵام زۆرجاران جیهانگەرایی لەلایەن کەرتی تایبەتەوە بەڕێوەدەبرێ".

"دەتوانیت وا بڵێت، بۆیە کەرتی تایبەت بە چاوخشاندنێك بە دەوڵەتان، رۆڵی بەرچاو دەگێڕێ، وەك قاعیدە تەنیا چەند یاریزانێکن تۆڕەکە بەڕێوەدەبەن، ئەم تۆڕە هەر هەڕەشەیەك لەسەر دەوڵەت هەبێ بەرپەچی دەداتەوە".

"ئەمە مانای چییە؟ نموونەیەکم بدێ".

"باشە بیر لە بەرپەچی ١١-٩ بکەوە، بەرپەچەکەمان تاکە کاردانەوە بوو، ئەو رۆژە هیچ فڕۆکەیەکی ئەمریکی هەڵنەفڕی، تەنیا چەندین هاووڵاتی ئاسایی هەبوو لە گەشتیی ٩٣ کۆمپانیای یۆنایتدە، ئەو هاووڵاتییانە توانیان زانیارییەکی زۆر کۆ بکەنەوە تەنیا لە ناسیار و هاوڕێیەکانیان ئەمەش هەمووی بە هۆی مۆبایلەکانیانەوە، هەر لە رێگەی ئەوانەوە دەمانزانی فڕۆکەیەك بەرەو واشنتن

دەڕوا، بۆیە بەرپەچمان دایەوە، ئەو سەرنشینانە لە هەمان تۆڕی یاریزانن، بەبێ ئەوەی دەوڵەت بەوانی گوتبێ، ئەمانە سەدان و هەزاران کەسیان رزگار کردووە، کەچی حکومەتی ئەمریکی لەو رۆژەدا هیچ کەسێکی رزگار نەکردووە.

"ئەفغانستانیش نموونەیی دیکەیە، هاوپەیمانەکانمان تۆڕێکیان لە یاریزانەکان پێکهێنا بوو بەبێ ئەوەی دەوڵەت بن، تەنیا ملیشیا بوون لەنێو وڵاتدا پەرشوبڵاوەیان کردبوو، هاوکات پیاوانی ئاینی و کار رۆڵێکی بەرچاویان گێڕا".

" بیرمە لە قاعیدە کردەوە کە چۆن کەرتی تایبەتیان بەکارهێناوە، بە هۆی کۆکردنەوەی هەواڵگریان لە ماڵپەڕەکانی ئەنتەرنێت، ئەوان لە شوێنە هەستەوەرەکانی گەشتیاریدا دەگەڕێن، بۆ ئەمەش کۆمپانیاکان بۆ ئەوە بەکاردەهێنن، بۆ پارەوەرگرتن بە هۆی پەیوەندییەکان زنجیرەیەك پەیوەندیان پەیدا کردووە بەمەش ئامانجەکانیان زۆر ئاسان دەبێ بەتایبەت بە هاوکاریکردنی کۆمپانیا بازرگانەکانی فرۆکەوانی، نووسینگە و وێستگەی شەمەندەفەر و هوتێلەکان، هەندێکجار پەیوەندییان بە کەشتیی گەشتیارییەوەش هەیە، بۆیە کەرتی تایبەت لەنێوەندی جەنگەکاندایە، پێت خۆش بێ یان پێت ناخۆش بێ".

هاوڕێیە نوێیەکەم "ئەمەی بە ترسناك زانی".

"راستە کەرتی رۆڵێکی بەرچاوی گێڕاوە بۆ هاوکاریکردنمان لە دیاریکردنی تۆڕەکانی تیرۆیستی، لەوانەیە من کەرتی تایبەتم هەبێ، ئەگەر کۆمپانیایەکە ژێرخانێکی جیهانی هەیە، چ بۆ کۆمپانیا یان خاوەنی کۆگایەکی لە وەزیرستان، واتە ئەو هەواڵگریانەی کە شوێنەکانی دوژمن دیاری دەکەن یان رێگری بکەن لە هێرشبردن، ئەمە بەهای ئەو هاوکارییە کە تۆ دەیکەیت".

ئەو کۆمپانییەکی هەیە و لقی نووسینگەکانی لـە هـەموو جیهانـدا بڵـاوە، هـەروا کارمەنـدانی هاتووچـۆی هـەموو شـوێنێك دەکـەن، هـەموو کەسـێك بەجۆشوخرۆشەوە دەیانەوێ چاویان بـە نوێنـەرانی کۆمپانیـا و لقـەکانی بکـەوێ ئەمەش بە هۆی ناوداریان لە هێزی داراییدا، راستە ئەو کارانە ترسناکی تیادایە، بەڵام ئەو کارمەندە سەرەڕایی کارەکانی دەیەوێ خزمەت بە وڵاتەکەی بگەیەنێت، ئەو سوپاسی سی ئای ئەی دەکات چونکە ئەو هەلەی پێی بەخشیوە، پێشتر هیچ سەرۆکێکی جێبەجێکار بەو شـێوەیە هاوکـار نـەبووە، ئەمـەو بـازاڕی بازرگـانی جیهانی مەیدانی جەنگە، زۆربەیان بەشەرەفەوە خزمـەتی وڵاتیـان کـردووە، ئـەم جۆرە هاوکارییە لە هـەردوو سـاڵی سـەرۆکایەتی هۆکارێـك بـوو تـا سـەرکەوتن بەدەست بێنم لە سەرچاوە نیشتمانییەکان.

بۆ ماوەی سێ کاتژمێر گفتوگۆمـان کـرد، زانـیم لـەدواتردا بـەرەو کـەناری رۆژئاوا دەڕوات، بۆیە نازانم بۆ هیچ هەستی بەکات نەکرد؟

بەرێزەوە گوتم " ئەمە گفتوگۆیەکی باش بوو، بەڵام نامـەوێ زۆر بمێنیتـەوە، نەوەك گەشتەکەت دوا بکەوێ".

"گەشـتەکەم دوا ناکـەوێ" بەشـێوەی پرسـیار وای گـوت، بۆیـە بەهەڵـە لێکدانەوەکەم کرد، ئەویش پێدەکەنی.

"نیگەران مەبە هانك، چونکە فرۆکەکەم بەبێ من نافڕێ".

لە وەڵامدا گوتم " ئا وایە" بێگومان ئەو خۆی خاوەنی فرۆکەی "لیرجت یان گۆلف ستریم ڤی" یان هەر ناوێکی دیکە، ئێستا زۆر شت هەیـە لێـی فێـر بـبم بەتایبەت لەرووی کەرتی تایبەتی ئەمریکی.

"سەردانم بکە" " دەمەوێ لە یانە داوەتی خواردنت بکەم".

لە وەڵامدا گوتی " بەڵێ قوربان دەتوانیت" لەدواتردا خواردنمان لە یانەکە جوانەکەدا خوارد.

## سەرۆکی زانکۆ

چاوم کەوت بە سەرۆکی لەلایەکی ئەو هوتێلەی بەکرێم گرتبوو، بەڵام بە ناوێکی خوازراو، وەك ئەفسەرێکی ناوخۆیی لە سەرچاوە نیشتمانییەکان واتە لە شارێك بووم زانکۆی تیادا بێت، زانکۆکەش چەند میلێك لێی دوورە، سەیری رێگەکەمان کرد نەوەك کەس چاودێریمان بکات، لە کاتێکدا لە کارەکانم لەسەرچاوە نیشتمانییەکان جەخت لەوە کردۆتەوە کە پیشەکەمان تەنیا لەنێوەندی سنووری ویلایەتە یەکگرتووەکان ناوەستێ.

بە هۆی قۆزی و قژە درێژەکەی و کۆتە شینەکەی کە لەسەر قەمیسەکەدایە ئەو وەك کەسێك وابوو لە گۆڤاری "جنتلمانز کوارترلی" کاری جوانپۆشی بکات، بەڵام ئەو سەرۆکی زانکۆیە، بەڵام تەوقەکردنە بەهێزەکەی لەگەڵمدا و چۆنیەتی روانینەکانی زانی ئەوە کاری منە، هەر زوو زانیم ئەمە کەسێك نییە لە شتەکان ببورێ بۆیە نابێ بە نالۆژیکانە قسە بکەم.

لەپاش یەکترناسینێکی کورت، لەپاش ئەوەی سوپاسم کرد سەبارەت بەوەی مامۆستا و هاوبەشی سی ئای ئەیە، واتە یەکسەر بێینە سەر بابەتەکە و گوتی "نامەوێ قاعیدە و کۆمەڵە تیرۆیستیەکان لەنێو زانکۆدا بوونی هەبێ، چونکە سەلامەتی قوتابی و فەرمانبەرانی یەکێك لە ئەرکەکانمە، دەمەوێ وەك هاووڵاتییەك هاوکاری سی ئای ئەی بکەم، ئێمە چەندین قوتابی رادیکالی موسڵمان لە زانکۆکەمان هەیە، بەڵام نازانین تا چەند رادیکالن، یان نازانین تا

چەند پەیوەندی فراوانیان هەیە لەگەڵ دەرەوەدا، ئایا تۆ دەزانیت؟ پێویستە ئەمە بزانین".

باسی دوو قوتابی بیانیمان کرد، جەختمان لە پەیوەندییە دەرەکییەکانیان کردەوە هاوکات باسی دەزگەی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ بیانییەکان کرد، کە هەردەم رۆڵی سەرەکییەکان هەبووە، بەتایبەتی لەوەی هەر بەرهەڵستکارێك تیرۆیستە، بۆیە ناکرێ هەموو بابەتەکان وەکخۆی بچەسپێندرێ، بۆیە پێویستە بگەین بە دوو مامۆستا تا ئەو دوو قوتابییە بەتەواوی بناسن.

"لەوانەیە، گرنگی پێ بدەین، ئەمەش پەیوەستە بە هەڵسەنگاندن، بۆ بەسیخوڕکردنی ئەو دوو قوتابییە تا بگەڕێنەوە سیخوڕمان بۆ بکەن، ئێمە پێویستیمان بەو جۆرە سەرچاوە هەیە، بەتایبەتی چەندین داڵدەی دوژمن سەقامگیرە، هاوکات پرسم ئەمانە هاوکاریمان دەکەن؟".

"بێگومان، ئەو مامۆستایە کێن؟".

دوو ناومان پێ بدە، لەوانەیە کەسێکی ئاسانتر هەبێ ئێمە نازانین.

"هاوکاری ئێف بی ئای بۆ هەموو هەواڵگرییە ئەمەش تەواوکەری کارەکەیانە، بێگومان ناوی تۆ ناڵێن یان ناوی هیچ مامۆستایەك ناهێنین کە سەرچاوەی ئێمەن، ئەمە هەر بەنهێنی دەمێنێتەوە".

" تۆ راست دەکەی ئێف بی ئای ناتوانێ نهێنییەکان بپارێزێ، لەوانەیە رۆژێك دابێت دەزگەکانی راگەیاندن رووماڵی کارەکانیان بکات، لەو کاتەی ئەوان کارا نین لەنێو زانکۆدا، کاتێك دەجوولێنەوە نیشانەکانیان پیشان دەدەن، هەڕەشەکانیان هیچ سوودی نییە، ئەگەر بابەتەکانیان پەیوەستیش بێت بە چەسپاندنی یاساش، بەڵام نەم بینیووە پێشێلی یاسا بکرێ، تەنیا ئەوەی دەبینم

هەڕەشەیەك هەیە بۆ سەر زانكۆ، بەڵام بە هۆی ئەژنـدای هـەواڵگری پشـتگیریت دەكات".

لێرەدا زانیم جیاوازییەك هەیە لەنێوان هەواڵگری و بەڵگەكان لـەنێوان سـی ئای ئەی و ئێف بی ئای، بۆ ئەمەش ئێف بی ئای پێچـەوانە بـوو، زۆرجـار داوام كردووە تا بـزانم ناسـنامەی بەشـی سەرچـاوە نیشـتمانییەكان بـزانم، ئەمـەم بـۆ روونكردنەوە ئەمە ناكرێ، بێگومان لەگەڵ هاووڵاتییـانی ئـەمریكی نـاكرێ، بـە هەموو شێوەیەك رەتی ئەوەیان كردەوە تا چاویان بە ئێف بی ئای بكەوێ، چـونكە هاووڵاتییانی ئەمریكی مافی خۆی هەیە، هەروا مـافی ئـەوەیان هەیـە بـەنهێنی هاریكاری لەگەڵ سی ئای بكەن بۆ پاراستنی ویلایەتە یەكگرتووەكان.

سەرۆكی زانكۆ رازی بـوو بـە ئەركـەكانی لەنێوەنـدی زانكـۆ و وڵاتەكـەی، بەشێك لە سەرۆكی زانكۆكان ئەركەكانیان پەراوێز خست، چونكە ترسیان لە سـی ئای ئەی هەبوو، هەروا وەك بۆنی گازی ئۆرویۆلی ترسناكە، هاوكات سی ئای ئەی هیچ ئامرازێكی یاسای نەدۆزیەوە بۆ چەسپاندنی یاسا، تەنیا دەتوانێ كار لەگـەڵ ئەو هاووڵاتییانە بكات دەیانەوێ هاوكاری بكـەن، بـۆ ئەمـەش ناتوانـدرێ هـیچ ترسێك بخرێتە روو نـە لـەرووی نیشـتمانییەوە نـەك لـەرووی خـودەوە، باشـترین هاوبەشی سەرچاوەكان ئەوانەن بڕوایان بە كارەكە هەیە، بۆیە كەس ناچـار نـاكرێ تا هاوكاری بكات، ئەمەش جوانییەكی ئازادییەكانی مەدەنی ئەمریكییە، لەتەك ئەمەش هێزێكی پتەوی هەیە لە جیهانی سیخوڕیدا، ئەمە راستە لەگـەڵ ئـەوەی هەندێك پێیان وایە ئەم جیاكردنەوەیە پەسەند نییە، بەپێی ئەو بابەتانـەی رۆژانـە لە سەرچاوە نیشـتمانییەكان بینیوومـە، بۆیـە ئازادییـە مەدەنییـە هـەردەم لـە وڵاتەكەمان بەهێز دەمینێتەوە، بەشێوەیەك مافی هـەموو هاووڵاتییـە تـا هـەوڵ بدەن وڵاتی خۆیان بپارێزن، راستە ئەو كەسانە هاوكاریمان دەكەن لە سـیخوڕیكردن

بەسەر هاوولاَتییانی بیانی، بەلاَم لە چوارچێوەی سنووری مافەکان، هەروا پێم وایە لە چوارچێوەی ئەرکی هاوولاَتییە بەپێی دەقی دەستوورەکەمان.

بۆیە بەئاگاییەوە لەگەلّ ئێف بی ئای مامەلّەم دەکرد، کە دەسەلاَتی گەڕان و دەستبەسەرداگرتن هەیە، بەپێی ئەو رۆلّە سیخوڕەی کە هەیەتی لەنێو سنوورەکەمان، پێدەچێ ئەم دەسەلاَتە چەوسێنەرە بەهەمان شێوە لەلایەن سووپای ئەمریکییەوە بەدی دەکرێ لەو کاتەی سەرکردایەتی باکوور دامەزرا، بۆیە نەمبینی هەوالگری و چەسپاندنی یاسا لە یەك ئاژانسی خۆمالّیدا بەدی بکرێ، هەروا هیچ کاتێك نەم ویستووە هەوالگری و چەسپاندنی یاسا تێکەلّ بەیەکتری بکرێ لەتەك هێزێکی سەربازی لەنێو ولاَتەکەماندا، ئێستا ترسم لە قاعیدە هەیە لەو کاتەی دژ بەیەکتر دەبین لەنێو دەزگەکانمدا ئەو کاتەی لەبایەتێکدا بەرپەچی یەکتر دەدەینەوە، بەو شێوەیە ئەو دەتوانێ هەڕەشە لە ئازادییەکانمان بکات.

لەلایەکی دیکەوە توانامان لە کۆکردنەوەی هەوالگری سەبارەت بە هەڕەشەکانی نێو سنوورەکەمان و شیکردنەوەیەتی لە سەرەتادا، بۆیە رێککەوتنی سی ئای ئەی لەگەلّ سەرۆکی زانکۆیەك بۆ سیخوڕیکردن چەندین مانای دەگەیەنێ.

لەگەلّ سەرۆکی زانکۆ بۆ ماوەی سی خولەك قسەمان کرد، دووبارە سوپاسم کردەوە، کەچی سەیرکردنی ئەو جۆرێك لە کینە بوو، لە کاتێکدا ئەو هەستە پێویست نەبوو، ئەو بەخێرایی لەنێو هوتێلّەکەدا ون بوو.

پرسیارەکە لەوەدایە چۆن هەندێك لە دەسەلاَتەکاتی زانکۆی رێگە دەدات تا کەسێك هەبێ و قاعیدە بێ لەنێو زانکۆدا، چونکە ئەوان بە هەموو شێوەیەك دەیانەوێ دووربکەونەوە لە هەوالگری ئەمریکی، لەو کاتەی هەڕەشەیەك لەلایەن

قوتابییەکانیانەوە سەرچاوەی گرتووە؟ یان ئەوەتا جۆرێك لە نەزانینی سی ئای ئەی هەیە؟ یان پێکهاتەکە لە هەردوو لاوە سەرچاوەی گرتووە؟

بەشی سەرچاوە نیشتمانییەکان و ئێف بی ئای لە ساڵی داهاتوودا بەشدار دەبن لە کۆکردنەوەی سەرۆکی زانکۆکان تا گفتوگۆ بکەین سەبارەت بە باسەکانی هاوکاریکرن لە هەواڵگری و چەسپاندنی یاسا.

## چەکە بایۆلۆژییەکان

تووشی نیگەرانییەکی زۆر بووم لە بوونی چەکی بایۆلۆژی، نەك زانستە بایۆلۆژییەکان وەك پیشەسازی، بەڵام کەسێك کە خاوەنی بەرژەوەندییەکی فراوان داوای کرد زیاتر بزانێت لەوبارەوە، بەو پێیەی هاووڵاتییەکی بەرپرسە، ئەرکە دەبێ بزانێ چۆن بەشداری هاوکارییەکان بکات، ئەو هاوبەشێکی باشە و دەسەڵاتێکی زۆری هەیە، پەیوەندی بە تیمی شارەزایانی سی ئای ئەی کرد، چووم بۆ ماڵە گەورەکەی و لەوێدا پوختەیەکم پێشکەش کرد، هەر لەوێدا باسمان لە هێرشی "ئاوم سینریکیۆ" کرد، کە لە ساڵی ۱۹۹۵ لە تۆنێلی میترۆی مۆسکۆدا پەرشوبڵاویان کرد، ئەمەش بە پەرشکردنی غازە و کاریگەری لەسەر مێشك دەکات، لەدواتردا بووە هۆی کوشتنی دوانزدە کەس و شێواندن و پێکانی سەدان کەس، هەروا باسی ئەو تاقیکردنەوانەم کرد کە قاعیدە لە جەنگی بایۆلۆژیدا ئەنجامی داوە، ئەمەشمان لە تاقیگەکانی ئەنتراکس زانی کاتێك دەستمان بەسەردا گرت، زۆرێك لە پوختەکانمان خستە روو، ئەمەش وای کرد گفتوگۆیەکی دوورودرێژ بکەین، بە هۆی پرسیارەکانییەوە زانیم حکومەتی ئەمریکی تا چەند ئاگاداری چەکی بایۆلۆژی نییە، ئەمەش تەنیا کەموکورتی نییە لە هەواڵگری بەڵکو

بەئاگانەهاتنی سیاسەتە، کاتێ وەك پێداویستی دەیدا بە هەواڵگری، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە گفتوگۆمان کرد.

بەرگریی نیشتمانی دژ بە چەکی بایۆلۆژی تا ئەو کاتە پێ نەگەیشتووە، هاوکات لاواز بووین لەوەی کۆکردنەوەی هەواڵگریمان هەبێ سەبارەت بە چەکی بایۆلۆژی، هەتا هیچ سیاسەتێك سەبارەت بەو بابەتە نەبوو، ئەمەش وای کرد هەمووومان ئاگادار نەبین.

لەنێوەندی هاتنەکایەوەی کۆبوونەوەمان لەگەڵ هاوەبەشەکەمان کە سەرۆکی جێبەجێکار بوو، ترسمان هەبوو، چونکە هەواڵگرییەکان سەبارەت بە چەکی بایۆلۆژی وەك ئەوە وابوو بەدوای کونە ڕەشەکانی ئاسماندا بگەڕێن کە بەردەوام گەورە دەبێ.

ئەفەسەری هەواڵگریی باش درککردنەکانی ئەگەر بیکات یان نەیزانێ، لەو کاتەدا پێویستە دان بە نەزانینەکانمان بنێین، هەروا دەبێ بەدوای ئەو شتانەدا بگەڕێن کە نایزانێ، دیارە هەموو ئەمانە پێویستی بە مکوڕبوونێکی متمانەپێکراو هەیە.

سەرچاوە نیشتمانییەکان ناتوانێ سیاسەت دابنێ، بەڵام دەتوانێ پێداویستییە سەرەتاکانی دیاری بکات، هەروا پێویستیمان بە بڕیاردەرانی سیاسەت نییە تا پێمان ڕابگەیەنن چ شتێك گرنگە، لەگەڵ ئەوەی ئەمە لە چوارچێوەی بەرپرسیاریەتییەکانیانە.

گەڕامەوە بنکەی سەرکردایەتی لەگەڵ دۆنا دانیشتم لە نووسینگە پەرشوبڵاوەکەیدا، ئەو بەرپرسە سەبارەت بە پێداویستیەکانی سەرچاوە نیشتمانییەکان، ئەو دیاری دەکات چ شتێك پێویستی بە هەواڵگرییەوە هەیە تا

بەرەو مەیدان بڕۆین و هاوکاری بین بۆ کۆکردنــەوی زانیارییــەکان، دۆنـا خـەڵکی شارۆچکەیەکی بچووکی بە نسلڤانیایە لەپێش پێنج ساڵدا پەیوەندی بە سـی ئـای ئەی کردووە، لە سەرەتادا وەك کارمەندێکی بچووك بـوو بـە مووچـەیەکی کـەم، هەروا بە هۆی خزمەتی لە ئەورووپا و ئەمریکای لاتینی پلەی یەك لـەدوای یـەك بەرز بۆوە، ئێستاش سەرۆکی بەشە بە مووچەیەکی باش لە جۆری ١٥، کەسـێکی زیرەك و سەررەقە، کەسێکە نازانی تا چەند توانای سەرکردایەتی هەیە، بـە هـۆی زۆری پرسیارەکانی رووبەڕووی چەندین گرفت بۆتەوە لەو دانیشتنەدا باسی خراپیی سیاسەتەکەمان کرد لەبارەی چەکی بـایۆلۆژی و هەولـە هەواڵگرییـەکانمان، ئـەو ئەمە دەزانیٚ بەڵام دووبارەم کردەوە.

لە دڵی خۆمدا گوتم " ئەمە خراپە ئێمە سیاسەتمان هەیە سەبارەت بە چەکی ئەتۆمی و کیمیاوی، کەچـی شـتێکی وا نـازانین لـەرووی بایۆلۆژییـەوە، دەکـریٚ خراپەکاران و دڕندەکان شتێك دابنێن تا نەخۆش بکەویت، کەچی دەتوانین سـەرنج بدەینە کارگەیەکی ئەتۆمی".

ئەو گوتی " کەمێك ماوەم پیٚ بدە تا بیر لەو بابەتە دەکەمەوە".

لەو نێوەندەدا بۆ ئەتلانتا چوو و لەوێـدا لەگـەڵ کۆمــەڵێك شـارەزا کۆبـۆوە زیاتریش سەبارەت بـە هەنـدێك نەخۆشـی و چـۆنیەتی خۆپاراسـتنی تـا بتـوانیٚ شیکردنەوەیەك وەربگریٚ، کاتێکیش گەڕایەوە منی زیاتر تووشی نیگەرانی کرد.

دەکریٚ بڵاوبوونەوەی پەتاکان بە دەستی خودی مرۆڤـەکان بـیٚ، لـە سـەرەتا کەس ئەمە نازانیٚ کە هۆکارەکانی نەخۆشییەکە چییە، لـە هـەموو حاڵەتەکانـدا بەکارهێنانی دوولایی هەیە بـۆ ئەمـە، زاناکـان پێویسـتیان بـە بەرهـەمهێنانی نەخۆشی هەیە تا تاقی بکەنەوە و لەپاشاندا چارەسەرێکی بۆ بدۆزنـەوە، لێرەشـدا گرنگە بزانین کیٚ یاریزانی ڕێگەپێدراوە بۆ ئەمە.

سەرچاوە نیشتمانییەکان و سی ئای ئەی دەتوانن لەو پێشبڕکێیەدا بن تا رواودووی سەدان بەڵگە بنێن، بەڵام هیچ سوودی نییە، کەچی چۆن بتوانین جەخت لە یەکێك بکەینەوە؟ چی گونجاوە؟

لەپاش دوو هەفتە دۆنا شیکردنەوەکانی بۆ روونکردمەوە دوای ئەوەی لەگەڵ شارەزایان قسەی کردبوو، ئەمەی بەراورد کرد بە چەند شتێك.

ئەو گوتی " چەکە".

"چەکی چییە؟".

"هۆکارەکانی نەخۆشی، ئەمەش جیاکارییەکە لە کۆکراوەی هەواڵگرییەکان، ئێمە دەبێ چاودێری هۆکارەکانی نەخۆشی بکەین، لەدواتردا دەبێتە چەك، قسەم لەگەڵ زانای بایۆلۆژی کرد، باسی چەندین بەرجەستەی کرد، بۆ نموونە ڤایرۆسێك لەلای کەسێك بەدیار دەکەوێ، لەوانەیە ئەو تەنیا دەرچووی زانکۆیەك بێ و توێژینەوەیەك ئەنجام دەدا، بەڵام ئەگەر کەسێکمان دۆزیەوە ئامرازەکانی بەرجەستەی لەلایە، ئەو کات چەندین ئامانجی هەواڵگریمان دەبێ".

"ئەمە لۆیکییە، ئەی چی تر؟".

ئەو گوتی " یان ئەوەتا زۆر خراپ دەبێ یان باشتر"، هەروا "زانای بایۆلۆژی باسی توێژینەوە نوێیەکانی کرد لەرووی نەخۆشی زەهایمەر، کە کەمێك پێشکەوتووە، زاناکانیش ئێستا دەیانەوێ نەخۆشییەکە نوێ بکەنەوە، وەك هەنگاوی یەکەم، تا بزانن چۆن چارەسەری بکەن".

گوتم "ئەمە باشە".

"باش نییە، ئەگەر توێژینەوەکە لەدوای گەڕان بووە هۆی بەرهەمهێنانی ئامرازی هێرشی سووپاکان و دانیشتووان، تا وابکات هزرەکان بڕوخێنێ".

پێم گوت " رووخانی هزر؟ سووپاکان؟ ئەی دواتر چی بکەین؟".

دونا بەکورتی گوتی "هاوڕێیەکەمان کە زانای بایۆلۆژییە، لەگەڵمانە دەیەوێ نامیلەکەیەك بنووسێ سەبارەت بە بنەماکانی مەیدانی گەڕان، تا کۆکەرەوانی زانیاری جەخت لە بابەتی دروستکردنی چەکی بایۆلۆژی دەکەن، هەروا دەتوانین کار لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیی هەواڵگری و بەشەکانی دیکە بکەین، بۆ هاتنەکایەوەی پێداویستییەکان لە چەند وڵاتێك، لەو کاتەدا دەبینین چ دەدۆزینەوە".

بۆ ئەوەی منیش سوودم هەبێ گوتم "ئەمە دەنێرین بۆ هاوبەشەکانمان لە دەزگەی پەیوەندییە دەرەکییەکان، تا ئەواەنیش بتوانن بگەڕێن".

شتێك فێر بووین لەو کاتەی راوەدووی بەڵگەی چەکی بایۆلۆژیمان دەکرد، ئەمەش زۆر گرنگە بۆ زانین و مەبەست، ئەمەو چەکی بایۆلۆژی پشت بە چەکی کۆکوژ دەبەستێ، بە هۆی بوونی ژەهرێکی زۆر وەك دەنکەکانی خەردەل بۆ بەرهەمهێنانی ریسین، چونکە زۆربەی ئەوانەی زیرەکن لەو بوارەدا دەتوانن بە هۆی هەستی بکوژیان چەکی بایۆلۆژی بەرهەم بهێنن و زۆریش بەئاسانی دەتوانن بیشارنەوە، بۆیە دەبێ زیاتر بەدوای ئەوانەدا بگەڕێن کە دەبنە هەڕەشە، رەهەندی مرۆڤایەتیان وەلاناوە، دیارە ئەمەش بنەمای سەرەکی سیخوڕیکردنە.

چەندین ناوی وڵاتانمان نووسی کە تێکەڵ بە کاری هەوڵەکانی دروستکردنی چەکی بایۆلۆژین، بۆ ئەمەش گەڕانمان کرد سەبارەت بەو قوتابیانەی کە پەیوەندارن بەو دەزگەیانەوە.

سەرچاوە نیشتمانییەکان نەی توانی هێزێکی سەرنجراکێشی هەبێ بۆ وەدەستهێنانی سەرچاوەکان، بە هۆی سەرقاڵبوونی بەشەکانی دیکە بەکاری دیکە، دۆنا دەستی بەو کارە کرد، بەڵام لە سەرەتادا لە مەیدان زۆر لاواز بوو، بەڵام کارکردنمان لەگەڵ شیکەرەوەکان و ئەو هاوبەشەی زانای بایۆلۆژی و هەندێك لە تاقیگە حکومییەکان توانیمان بەشێك لە زانیارییەکانمان دەست بکەوێ و دووبارە

جەختکردنەوە و پێشکەشکردنی بۆ وەدەستهێنانی کۆمەڵەیەکی متمانەپێکراو بۆ هەواڵگری، هەروا بۆ شیکەرەوەکان هەڵسەنگاندنیان بۆ هەرەشەکان دەکرد و هاوکارمان بوون تا زیاتر پێداویستەکانمان نیشان بدەن.

بۆ ئەمەش وەك زنجیرەك بەخۆڕ چەندین راپۆرت و پرۆسە بەردەوام بوون.

سەرچاوە نیشتمانییەکان گەیشتنە لایەنەکانی دوای ١١-٩ وەك توانای شیکردنەوە لە نێوەندی کۆمەڵگەی هەواڵگری، تا هەموو ئەوانە جیا بکەینەوە کە لەنێو ویلایەتە یەکگرتووەکاندا و پەیوەندییان بە چەکی بایۆلۆژییەوە هەیە، تیمی یەکەمان وەك شێوازی شیکردنەوە ئاگاداری هەموو ئەو قوتابیانە بوون کە رێگەی فیزەوە دێنە ناو وڵات، بۆ ئەمەش چەندین پرسیاری روون خرایە روو، بەتایبەتی ئەوانەی بە هۆی فیزەوە هاتوون بۆ خوێندن، واتە لێرەدا پرسیارێك دێتەکایەوە چەندن ئەوانەی بۆ خوێندن هاتوون و ناخوێنن و پەیوەندیان بە قوتابخانەکانەوە نەکردووە؟ یان کێن ئەوانەی بڕوانامەی دەرچوونیان وەرگرتووە و پەیوەندییان بە زانکۆکانەوە هەیە و بەرنامەی زانستی بایۆلۆژی تاوتۆ دەکات و پەیوندییان بە چەکی بایۆلۆژییەوە هەیە؟ ئایا هیچ قوتابییەك هەیە پەیوەندی بە ئەفسەرێکی هەواڵگری بیانی هەیە؟

کارەکەمان پێ کا، کاتێك قوتابییەکمان پەیوەست کرد بە دەزگەیەکی وڵاتێك، لەوێدا بینمان زۆرێك لە قوتابیان پەیوەندییان بەو دەزگەیەوە هەیە، لەم رادەیەدا لەنێوان سەرچاوە نیشتمانییەکان و دژە سیخوڕی گەیشتینە ئەو زانیاریەی هەڕەشەیەکی تاوانکاری هەیە لە گواستنەوەی تەکنەلۆژیای چەکی بایۆلۆژی بۆ شوێنێکی دیکە، داوامان لە ئێف بی ئای کرد ئەوانیش پەراوی لێکۆڵینەوەیان کردەوە، بەڵام نەمزانی چییان دۆزۆیەوە.

زۆر بەئاگایانەوە دەم ڕوانییە هەواڵگری پەیوەندیدار، بۆ ئـەوەش وێسـتگەی سەرچاوە نیشتمانییەکان وەك نموونە کۆمەڵێك سیستەمی تەکنـەلۆژیای کـوالیتی بـەزر کـرێ، زیـاتریش ئەمانـە بـۆ چارەسـەرکردنی هۆکـارە بایۆلۆژییـەکان بەکاردەهێندرێ، دیارە ئەمە بۆ ئاشکراکردنی لێکۆڵینەوەکانە لـەرووی پەیوەنـدی ژمـارەی تەلەفۆنـەکان و ناونیشـانی پۆسـتی ئـەلیکترۆنی. دواتـر گەیشـتین بـە کۆمەڵەیەکی تیرۆریستی ناسراو، هەموو ئەمانەش درا بە سەرچاوە نیشتمانییەکان و لەدواتر نێردرا بۆ بنکەی دژەتیرۆر و ئێف بی ئای تا لەدەرەوە راودوویان بنێن.

زۆرجار وەڵامەکانی کاری هەواڵگری وەڵامی زۆری بەدەست ناکـەوێ لەتـەك ئەوەی دەرئەنجامەکانیشی دیاریکراوە، هیچ کاتێك تابلۆکە تەواو نابێ، زۆرجاریش شت زیاد دەکرێ یان ون دەبێ و هەندێك شتی دیکەش گۆڕانکـاری بەسـەردا دێ، بەتایبەتی لەرووی بەرنامەی هەواڵگریمان کە پەیوەستە بە چەکی بایۆلۆژییەوە.

ئەو هیوام بەتەواوی نەگەیشتە ئـەنجام تـا حکومـەتی ئـەمریکی بـەهێزەوە بڕوانێتـە چـەکی بـایۆلۆژی، تـا زیـاتر کـار بکـەین بـۆ کۆکردنـەوەی زانیارییـە هەواڵگرییەکان، هەردەم بەخوڕ راپۆرت دەهات، کەچی ئەو بەخوڕییە هیچ کاتێك کۆتایی نەدەهات، بەڵام لەگەڵ سیاسەتمەداران باسی ئەوەمان دەکـرد، کـە ئەمـە بابەتە پەیوەستیشە بە قاعیدەوە، چونکە بەردەوام هەوڵ دەدات تا چەکی بایۆلۆژی بەدەست بێنێت.

بە هۆی گەڕانەکانم لە ویلایەتە یەکگرتووەکان زۆر تۆڕم بینـی بـۆ سەرچـاوە نیشتمانییەکان زۆرێك لە هاوولاتییانیش ئامـادە بـوون بـۆ هاوکـاری، هـەموان دەیانویسـت بـزانن ئێمـە چـیمان دەوێ، بەشـێکی زۆر هاوکارمـان بـوون، بۆیـە بەهێمنی لەگەڵ پارێزەرانی کۆمپانیاکان دواین، تـا تیمـە یاسـاییەکانمان هـەموو

بنەما یاساییەکان بگرنە ئەستۆ، ئەمەش زۆر گرنگە لە پیشەسازی گەیاندن و سەرەتاکان.

لە هەموو حاڵەتەکان پشتمان بە پرۆسە هاوبەشەکان دەبەست لەنێوان سەرچاوە نیشتمانییەکان و کەرتی تایبەت لەدەرەوەدا، بەچڕی کارمان لەسەر پاراستنی هاوبەشییەکان دەکردەوە، زۆر کەس رووبەڕووی نزمبوونەوەی کەسایەتییان بوونەوە، هەروا زیان کەوت بە بەرژەوەندییە بازرگانییەکانیانی کۆمپانییەکانیان، زۆرێك لەو کۆمپانیانە باسیان لەوە کرد لەگەڵ هەستکردن بە قازانجی کۆمپانیاکانیان هەروا لەسەریانە هاوبەش بن و یارمەتی سی ئای ئەی بدەن، پێیان وایە بەرژەوەندیی سەلامەتیی کۆمپانیاکانیان پەیوەستە بە سەلامەتیی وڵاتەکەیان.

وەك یەکێکیان گوتی "راستە ئەگەر پەیوەندییەکانمان ئاشکرا بێ ئەوا ئاژاوەیەك دێتە ئاراوە، بۆ ئەمەش بەشێك لە وەبەرهێن و پارێزەرەکانیان بۆ ماوەی چەند ساڵێك دەمخەنە نێوەندی دادگاوە، بەڵام کارەکە لەوە گەورەترە کاتێك ١١-٩ یەکێکی دیکە هاتە ئاراوە ئەو کات خەڵك و کەسانی من دەمرن، واتە هیچم نەکردووە بۆ وەستاندنی ئەمە".

تەنیا سەرۆکێکی جێبەجێکاری رەتی ئەوەی کردەوە تا لەگەڵمان دابنیشێ، بە پاساوی ئەوەی دەترسێ، منیش پرسیم ئایا بە سۆندە لێی دەدەن؟ ئایا کەسایەتی لەکەدار دەبێ کاتێك بێتە ناو ئەم نووسینگەیەوە؟

لەم کاتەدا ئەفسەرێکی گەنج گوتی "دەبێ چی بکەین؟".

"هیچ مەکە ئێمە لە وڵاتێکی ئازادین، بەڵام سەیری ژیان لەلای ئەو کەسە بکە، ئەو هەموو بەیانییەك سەیری خۆی دەکات، ئایا ئەو هەر وەك پیاو ماوە".

لەلایەکی دیکەوە سەرۆکێکی جێبەجێکار لە تێکساس پرسیاری ئەوەی دەکرد، چۆن دەتوانێ هاوکاریمان بکات، بۆ کوشتنی تیرۆریستەکان، واتە خۆی بچێ بیانکوژێ، پێم گوت کەسانی دیکە هەیە ئەو کارە دەکات، هەرچۆنێك بوو سوپاسم کرد.

## تەکنیکی نانۆ

هاوکارییەکانی کەرتی تایبەت هەموو ئەمریکای گرتەوە، هەر لە دۆڵی سیلیکۆن تا وول ستریت، هەر لە دەزگە جیاجیاکانی کەسانی سەر بەرچەڵەکانی دیکە تا دەزگە بچووکەکان، هەر لە بانکەکانەوە تا دەگاتە پیاوانی بزنسی درندە و لیبرالییەکان، دیارە هەموو ئەمانە لەژێر سایەی ئاو ئاس بوو کە سەرپەرشتیی زانستە نوێیەکان دەکات، بۆ باشترین نموونەش لەمبارەیەوە چاودێریکردنی تەکنیکی نانۆ بوو.

بۆ ماوەی چەند ساڵێك زۆرێك هەبوون بەرگریان لە تەکنەلۆژیای نانۆ دەکرد، لەم رووەوەش وەبەرهێنەرەکان هەموو هەوڵێکیان دەدا بۆ گەیشتن بەو تەکنیکە، بەڵام بەپێی رۆژگار دەرکەوت کە بەهاکەی چەندە، ئەمەش بەپێی قسەی هەموو ئەو زانا و دانایانەی لەگەڵیان دواین، هەندێکیان پێیان وابوو ئەو پیشەسازییە لە ماوەی دە ساڵدا تریلیۆنێك دۆلار بەدەست دەهێنێ.

نانۆ بەو مانایە دێ یەك لە ملیارێك بەمەش دەگوترێ نانۆمەتر یەك لە ملیارێك مەتر، نانۆ جەخت لە گەردیلە دەکاتەوە لە پێوانەدا، واتە گەردیلەیەکی بچووکە تا دەگاتە ئاستی گەردێك.

پێدەچوو کارەکە پەیوەندی بە قەبارەوە نەبێ، بەڵکو پەیوەستە بە گۆڕانی خەسڵەتەکانی ماددە، کە کار لە وەرچەخانی ئاستی نانۆ دەکاتن هەروا گەردیلەکانی تێکەڵی پێکهاتەیەکی نوێیە لە خەسڵەتەکانی ماددە، فراوانی پراکتیکی ئەم تەکنەلۆژیایە بچووکە زۆر سەیروسەمەرەیە.

لە سەرەتادا ئەو بابەتەم بە هەواڵگریی بەرگریی سەرچاوە نیشتمانییەکان ناساند، دۆنا کارەکەی گرتە دەست، چونکە بابەتێکی زۆر ئاڵۆزوە، ئەو وەك قوتابییەکی زیرەك هەموو شتە نوێیەکان لەخۆ دەگرێ و تێی دەگات، ئەو دەروونناسی خوێندووە دەزانێ سروشت و هەڵچوونەکانی چین، ئێمەش لەرووی هەواڵگرییەوە ئەوەمان نیشان دان، کە تەکنیکی نانۆ تا گۆڕانکاری دەخاتە نێو کاری ئاسایشی نەتەوەیی، لەنێو ئەوانەشدا سیخوڕی.

کاتێك نانۆ بە قوماشێك دەنێیت بە هیچ شێوەیەك ناتواندرێ بدۆزرێتەوە لە کاتێکدا هەڕەشەیەکی راستەوخۆیە بۆ سەر ئۆپراسیۆنەکانی سی ئای ئەی، بۆ ئەمەش دەکرێ ئەفسەرەکان گولەبەندی لەو شێوەیە بپۆشن کە لەلایەن ئاسیایەکەوە دووراوە، بۆ ئەمەش دەتوانی چاوێرێك لەسەر گولەبەندە دابنێیت، بۆیە هەموو کارایییەکان بەبێ سوود دەمێنێتەوە.

ئەگەر ژوورێك ژێرخانەکەی نانۆ بێ بە هیچ شێوە سەرە چەکێکی پێشکەوتوو نابردرێ، هەروا بۆ هۆکارێکە بۆ هەواڵگری ئاماژە بۆ ئەمەش ماددەی نانۆ لە سیستەمی گەیاندن بەکار دێ تا چەند کەرەستەیەکی بچووکتر بەرهەم بهێنن. هەروا هەر ئامرازێك بە نانۆ دروستکرابێ ئەوا دەتوانێ دژ بە مووشەکەکان ببێتەوە. ئەمەش پەیوەستە بە گۆڕانی دینامیکی خێرایی مووشەکەکە یان ڕێڕەوەکەی، بۆ ئەمەش قوماشی نانۆ دەتوانێ هەموو چالاکییەکان بکاتە تارمایی

واتــە ڕەنگــەکانی دەگــۆڕێ و لەتــەك ژینگەکــەی دەگــۆڕێ بــۆ ئالنگــاری و ڕووبەڕووبوونەوەکان.

وەزارەتی بەرگری هەر زوو وشیار بوو سەبارەت بە تەکنیکی نانۆ، ئەمەو لــە ساڵی ٢٠٠٢ پەیمانگەی تەکنیکی نانۆی دامەزرانــد، ئەمــەش لەلایــەن زانکــۆی ماساسوستس تەکنەلۆژیا پــەرەی پــێ درا، هــەموو ئەمانــەش بــۆ چالاککردنی سەربازە لە گۆڕەپــانی جەنگــدا، بــۆ ئەمــەش وەزارەت پــەنجا ملیــۆن دۆلاری لــە سەرەتادا بۆ ئەو بابەتە تەرخان کرد.

پرسیارەکە لەوەدایە نەیارانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەم کاتەدا چی دەکەن؟ چ گۆڕانکارییەك دێتەکایەوە لەرووی ئاسایشی نەتەوەیی؟ دەبێ هەڕەشــەکان چــی بن؟ ئەم پرسیارانەیە پێویستە سەرچاوە نیشتمانییەکان وەڵامی بداتەوە.

دۆنا و تۆڕەکانی رووپێوێکیان بۆ بەرنامەی نانۆ هەبوو لە وڵاتە بیانییــەکان، کە پەیوەست بوو بە پراکتیکەکانی ئاسایشی نیشــتمانی، بــۆ ئەمــەش سەرچــاوە نیشتمانییەکان زانیاری لەسەر چەندین دەزگەی بیانی هەبوو، بۆ ئــەوەی بــزانن چ سیناریۆیەکی پراکتیکی لەمبارەیەوە ئەنجام دەدەن.

کاتێك گەیشتینە ئەنجامێك سەرچاوەکانی نیشتمانی لەتەك ســی ئــای ئــەی لەدەرەوە پلانیان دانا ئەمەش بەهاوکاری دەزگایەکی بیانی، سیخوڕەکانمان هەر لە سەرەتاوە و لە یەکەم نموونەدا پارەیەکی باشیان وەرگرت.

یەکێك لە ئەفسەرانی نموونەی نانۆ گەیشتە نووســینگەکەم، تــا ئــەو کــارەم نیشان بدات سەبارەت بەو ماددەیەی چەندین لە پیاوانمان کاریان لەسەر کــردووە و پارەیەکی زۆریان لێ خەرجکردوون بەتەنیا سەیری ماددەکــەم کــرد، ئــەو کاتــەی سەیرم دەکرد بزیەك گرتمی زۆری نەمابوو بیدەمە قاقای پێکەنین.

کەس پێشبینی ئەوەی نەدەکرد ئەم ماددەیە ملیۆنـەها دۆلار بـۆ وەزارەتـی بەرگری دابـین دەکـات، کاتێـك بـەکاری دەهێـنن بـۆ توێژینـەوە و پێشـکەوتن؟ لەوانەشە ژیانی ئەمریکییەکان رزگار بکات؟

جێگرەکەم، کە زۆر بەباشی خزمەتی کردم، لە ساڵی یەکـەم بـەرەو کـارێکی دیکە چوو، هەروا توانیم جینا رازی بکەم تا ببێتە جێگـرم، ئـەو چـەندین مـاوە لەدەرەوە خزمەتی کردووە، لەو نێوەندەشدا وەك سەرۆکی وێستگە کاری کـردووە. هەروا بەرپرسی نووسینگەیەکی دژەتیرۆر بووە، بـەڵام لـەپێش ماوەیـەك لـەپێش ئەوەی بێتە ئێرە، خۆسی رودرینگیز جێگـری بەرێوەبـەری نـوێی ئۆپراسـیۆنەکان داوای کرد بچێتە نهۆمەکەی دیکە تا ببێتە سەرۆکی ئەرکان، بۆیە پێویستم بـەوە بوو جێگرێك بدۆزمەوە.

پێم ناخۆش جینـا ئـەو نووسـینگەیە جـێ دەهێڵـێ بۆیـە لـێم پرسـی ئایـا بیرۆکەیەکی هەیە تا یەکێکی دیکە لە شوێنی خۆیدا دابنێین.

"بێگومان هەیە هەر لـە سەرچـاوە مرۆڤایەتییەکانـدا، تیمێکـی زۆر باشـم کۆکردۆتەوە بەتایبەتی لە ئەفسەرە گەنجەکان، کە هەمووان خۆشـیان دەوێ، واتـە ئەو خاتوونی سەرکردە دۆنایە".

"بێگومان، ئەوە کارێکی باشە، بەڵام بۆچی بیرم لێ نەکردۆتەوە؟" من دەزانم هۆکارەکە چییە، ئەو ئەفسەری ئۆپراسـیۆنەکان نییـە، بـەڵکو ئەفسـەری ئیفـادە وەرگرتنە، من کەسێکی بێ لایەنم وەك هەموو ئەفسەرەکانی ئۆپراسیۆن، بەڵام ئەم بۆچوونەم هەڵەیە، چونکە دۆنا لەدەرەوە زۆر ئۆپراسیۆنی سازداوە، ئـەو وەك هـەر کەسێك بەشەکە دەناسێ، لەتەك ئـەوەی بەشـە بـە هـۆی ئـەوەوە جۆشوخرۆشـی کەوتۆتە نێویی، چـونکە دەستپێشـخەرییەکانی بۆتـە هـۆی زیـاتر کۆکردنـەوەی زانیاری. هەواڵگرییەکانیشی لە ماوەی ساڵێکدا بوو بە دوو هەندە، بۆیـە دەکـرێ سەرکردایەتی بکات، نەك تەنیا سەرکردایەتی بەڵکو زۆر کەسیش لەژێر فەرمانیدا

دەکرێ کار بکەن، ئەو دەتوانێ سەرکردایەتی تۆڕە کاراکانی ناو ئاژانسەکە بکات، لەلایەکی دیکەوە ئەو بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ قسەی پڕوپـووچ نییـە، بینیوومـە ڕووبەڕووی زۆرێك لە ئەفسەرە کوڕەکان بۆتەوە.

یەکسەر هاتە سەرم و بە سکرتێرەکەم وت: بزانە دۆنا لە شوێنی خۆیەتی؟

دۆنا بۆ ماوەی چەند چرکەیەك گەیشتمە ژوورەکەی، یەکسەر دانیشـتم، ئـەو تابلۆ و قەلەمێکی لەدەسـتدا بـوو، جینـا لـەو کاتـەدا چـووە پشـتەوەی مێـزی نووسینگەکەی.

"باشە چیتان دەوێ؟" دونا بەبێدەنگیش بزەیەکی کرد.

جینا گوتی : "هانك بڕیارێکی دیکە داوە سەبارەت بە جێگرەکەی".

"ئا زۆر باشە، کێیە؟".

"تۆ"

دۆنا گوتی "لەوانەیە گاڵتە بکەیت".

گوتم "نەخێر".

جینا گوتی "تۆ باشترینی، لەراستیدا تۆ تاکە کاندیدی".

"جینا دەتوانیت باسی کارەکـەی بـۆ بکـەیت" ئـەو قسـەیەم کـرد و چـەند ڕێنمایەکم پێ دا و چوومە دەرەوە تا دەست بە کاری گواستنەوە بکەن.

ئەمە یەکێکە لە باشترین بڕیارە کارگێڕییەکان کە داومانە.

بۆ ئەمەش دۆنا بۆ مـاوەی دوو سـاڵی دیکـە دەبـێ وەك جێگـری سـەرۆکی سەرچـاوە نیشـتمانیەکانە، لـەدوای ئـەوەی پلەکـەی بەرزدەبێتـە بـۆ گـەورە هەواڵگرییەکان، لەپاشاندا کارەکەی گوازرایـەوە وەك بەرپرسـی هـەموو هـەموو سەرچاوە نیشتمانییەکانی دەزگەی شـاراوە، سـەرەڕای ئـەوەی بـە زۆرێـك پلـە و

پۆستدا تێپەڕی، لەدواتردا لە خانەنشیندا بوو بە هەوالگری پێنجەم، واتە لە سەربازێکی ئاسایی بوو بە جەنەرالی خاوەن چوار ئەستێرە، چونکە هاوکار بووە لە پێشکەوتنی هەوالگری یەکلاکەرەوە، هەروا کارگێڕیی سەرچاوەکان بووە لەپاش ١١-٩.

توانیم بگەڕێمەوە ڕێگەی خۆم ئەمەش بە بوونی جێگرێکی باش، بۆیە زۆربەی کاتەکانم بۆ ئەوەە بوو تا لە زۆربەی ویلایەتەکانی ئەمریکا بگەڕێم، ئەمەش هەولدان بوو بۆ فێر بوون و سەرکرداتیکردن، لە مەیداندا، تا هاوکاری سەرچاوە مرۆییەکان بکەم تا پەیوەندییەکانیان بەهێز بکەن لەنێوەندی کارەکانیان.

هەموو کارەکانمان بووە جۆرێك بۆ هەلچوونی بەرپرسانی ئێف بی ئای، ئەوان وایان دەبینی سەرکەوتنی ئێمە واتە شکستی ئەوان، ئەوان هەولی ئەوەیان دەدا کەسایەتیی ئێمە بشێوێنن، بۆ ئەمەش چەندین راپۆرتیان بۆ کۆشکی سپی بەرز کردەوە، لەم کاتەدا من چەندین زانیاریم دا بە فران تاونسند راوێژکاری سەرۆك بۆ کاروباری ئاسایشی ناوخۆیی تا بەراوردێك بکات لە نێوان کارەکانی سەرچاوە نیشتمانییەکان و ئێف بی ئای سەبارەت بە دژەتیرۆر، ئەمەش بووە هۆی دلەڕاوکێی ئێف بی ئای، ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەوان زیاتر هەلبچن.

وەك سەرۆکی سەرچاوە نیشتمانییەکان نیگەران بووم لە سنووری کارەکانمان، چونکە قاعیدە و حزبی ئەللا و حەماس بەهەر شێوەیەك بێ ئەندامانی هاتوونەتە نێو ولاتەکەمان، من وام هەست لە ڕێگەی وشکانیەوە دێنە ناو ولات بەتایبەت لەو شوێنانەی بەکەمی دەوریاتەکانی پشکنین تیایدا دەسوڕێنەوە.

زۆر گرنگیم بە کۆچی ناشەرعی نەدەدا، بەو پێیەی هەموو ئەوانەی هاتوونەتە نێو ویلایەتە یەکگرتووەکان شەرعی نین و بەدوای کاردا دەگەڕێن، بەلام ئەگەر بمانەوێ دەریان بکەین دەبێ سەرەتا سزای ئەوانە بدەین کە کاریان پێ دەدەن؟

بەپێی شارەزایی خۆم هەتا لەدەرەوەی ئۆپراسیۆنە شاراوەکان، سنوورەکان بەهەر شێوەیەك بێ خەڵکێك هەیە دەتوانن لێی بێنە ژوورەوە، چونکە لەپێش چەند ساڵێکدا من و باوکم توانیمان تەنیا بە جانتایەکی پشتمان سنوورەکان ببڕین هەر لە باخچەی بیگ بەندی نیشتمانییەوە بچین بۆ ریۆ گراندی، ئەمەش دوای سێ رۆژ لە خەوتن لەسەر بەردەکانی چیا بەرزەکانی شیزۆس، ئەو کاتە زستان بوو، باوکم بێزار بوو لەو خواردنانەی من لێم دەنا لەو کاتەی خیوەتمان هەڵدەدا.

گوتی : "کوڕم دەبێ خواردنێکی باش بخوێن".

" باوکە هیچ شتێك لێرەدا نییە، زیاتریش لەم لای زێیەکەوە"، لەو کاتەی ئێمە لەتەك زێیەکەدا هەنگاومان دەنا، ئەو کاتە دوای نیوەڕۆ بوو، خۆرەکە زۆر گەرم نەبوو، بۆیە هەستێکی خۆشمان هەبوو.

دووبارە گوتییەوە "هیچ نییە؟".

کاتێك سەیری نەخشەکەم کرد لەدووری میلێك گوندێکی مەکسیکی لێیە.

"دەتوانین خۆمان لەو گوندە مەکسیکییە تاقیی بکەینەوە، بەڵام دڵنیا نیم لە پەڕینەوەمان لەزێیەکە".

بۆ ماوەی چەند سەد یاردەیەکی دیکە رۆیشتین کەسێکمان بینی بە بەلەمێکە، لێی نزیك بوینەوە و گوتم " بە چەند؟".

گوتی "یەك دۆلار بۆ پەڕینەوە و دوو دۆلاری بۆ گەڕانەوە بۆ ئەستادۆس ئاونیدوس".

گوتم "رازیم" بۆیە بەرەو مەکسیك رۆیشتین.

بەپێ گەڕاینەوە بۆ لای زێیەکە، لەپاش خواردنی تاکۆسی مەکسیکی، کاپتنی بەلەمەکەمان ئێمەی گەڕاندەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان، هیچ کاتێك سی ئای ئەی بەو جۆرە کەسێکە نەناردووە بۆ وڵاتێکی بیانی.

چیرۆکەکەم پێ ڕاگەیاند، لەو کاتەی من سەرۆکی سەرچاوە نیشتمانییەکانم، سەبارەت بە چەند کارمەندی گومرگ و دەوریاتە سنوورییەکان لەسەر سنووری ئەمریکی و کەندەی لەو کاتەی سەردانم کردن.

کارەکە لە کاتێکی سەرماوسۆڵەدا لە ماین بووم، لەو کاتەی سەردانی کارمەندانی چەسپاندنی یاسام کرد، تا ئەو کەسانە زیاتر لە هەواڵگری تێبگەن لە ئۆپراسیۆنە سنوورییەکاندا، چەندین چیرۆکی سەیروسەمەرەم بیست سەبارەت بەچۆنیەتیی چوونەژوورەوە کەسانێك بۆ ناو سنوورەکان، پێشتریش بە چەندین ناسنامەی جیاوە سنورەکانم بڕیووە، بەڵام کاتێك باسی سەفەرەکەم کرد بۆ مەکسیك لەگەڵ باوکمدا ئەوان زۆر پێکەنین.

پێشتر هیچ دەورییەکی سنوورم نەبینووە، واتە لە سنوور لەگەڵ کەندا، سواری گالیسکەکانی بەفر زۆر بەخێرایی تا گەیشتینە سەر سنوور، لەوێدا دەورییەکی پۆلیسی کەندیم بینی کە سواری گالیسکەی پاشایی دەبن، ئەو سنوورە هەمووی داپۆشرابوو بە بەفرێکی زۆر، لەتەك ئەوەی زۆرێك لە گالیسکەکانی بەفر، زۆر شوێنیشم بینی کە جێی پێی قاچاخچییەکان بوو کە کەلوپەل لە کەنەداوە دەگوازنەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان، پێم سەیر بوو بەو جۆرە جوولە دەکەن، پێدەچوو لە ماوەیەکی کەمدا ڕێیەکەیان بڕیبێ، چونکە زۆری نەبردووە بەفرێکی زۆر باریووە.

"چۆن سنورەکان دەبڕن بەبێ ئەوەی ببیندرێن؟".

یەکێك لە گەورەکان ئەو شوێنە گوتی" ئا، هەندێکجار هەندێکیان دەستگیر دەکرێن، بەڵام کارەکە زۆر جار بەپێی ژمارەیەکی سەرەکییە، چونکە ئەم سنوورە زۆر درێژە"، لەو کاتەدا نەخشەکەی دەرهێنا تا بزانێ ئێمە لەکوێین و چەندمان بڕیووە، ئێمە چەند میلێکمان بڕیبوو، ئەمەش ناوچەیەکی کەمە لەرووی ئۆپراسیۆنە فراوانەکانیان.

هەروا گوتی" با بەشێوەیەکی دیکە باسی بکەم".

بە فرۆکەیەکی بچووکی سستا لەسەر سنوور سوڕاینەوە، ئەو بەفرەی تازە دای کردبوو تابلۆیەکی نواندبوو، هەروا شوێنەواری قاچاخچی و ئەفسەرانی چەسپاندنی یاسا دیار بوو، لەوکاتەی چای گەرمان دەخواردەوە باسی توانا هەواڵگرییەکانیانم کرد لەتەك دەورییەکانی وشکانی و ئاسمانی، ئایا هەواڵگری وێنەیتان هەیە؟ یان هەواڵگریی ئاماژە؟ هەواڵگری مرۆیی؟

بە سەر ئاماژەیان بەوە کرد کە توانای وایان نییە و گوتیان"سەرەڕایی ئەوەی خەڵکی ناوچەکە هەندێکجار سوودیان هەیە سەبارەت بە هەر چالاکییەکی گومانلێکراو، بەڵام هیچ چاودێرییەکی تایبەتمان نییە".

پرسیم "چی لە واشنتنی پایتەخت بەدەست دێنن بەتایبەت بۆ هەواڵگرییە بەسوودەکانتان؟".

هەموو پێکەنین و گوتیان "هیچ شتێك".

"ئەی سەبارەت بە هاوپەیمانە کەندەییەکانمان؟".

لە وەڵامدا گوتیان " ئا، ئەوانیش هەمان گرفتی بوودجە و توانای کەمتریان هەیە".

کاتێك رۆیشتم کووپێك بەرەنگی داراستانێکی سەوزم پێ بوو، کە دەورییەکی سنووری ئەمریکی پێیان دام، ئەو کووپە لە پۆڵا دروست کرابوو، بە هیچ شێوەیەك ناشکێ، ئەمەش رێزێکی دیکە بوو لە قەبارەی ئالنگاری و رووبەڕووبوونەوە.

## بەشی چواردەیەم

# سیاسەت

**پیاوی دەوڵەت و سەرکردە بە پلەی یەکەم دەبێ بڕیاری ئەوە بدات چۆن جەنگەکە، دەستنیشان دەکات، کە تیایدا دەجەنگێت، بۆیە ناکرێ هەڵە بکات لە تێگەیشتن یان بیگۆڕێ و لە سروشتی خۆی لای بدات، ئەمەش سەرەتای ستراتیژییەت و گشتگیرییەکەیە.**

**-کارل فۆن کلاوسفیتر-لە جەنگدا**

له شوباتی ۲۰۰۵ فلیپ زیلیکۆف وەزیری دەرەوە داوای کـردم تـا سـەردانی بکەم، لەپێش دوو ساڵدا یـەکترمان بینـی بـوو، ئـەو بەڕێوەبـەری جێبـەجێکاری لیژنەی ۱۱-۹، چاوپێکەوتنەکەم لەگەڵ ئەودا بۆ دانانی راپۆرتێك بوو تا پشتگیرم بکات بۆ هێرشکردنە سەر قاعیدە لە ئەفغانستان، بۆ ئەمەش لە تەمووزی ۲۰۰٤ لیژنەکە راپۆرتەکەی بڵاوکردەوە.

بەشی یەکەمی دەقەکە کـە لیژنەکـە دای نـابوو، مـن نووسـیبووم و خـودی زیلیکۆف و تیمەکەی کارەکانی گرتبـووە ئەسـتۆ، هـەموو رووداوە مێژوویـەکانم بەشێوەیەکی روون باس کردبوو، بەشی دووەمی راپۆرتەکە راسپاردەی لیژنەکە بوو کە بەشێکی زۆر پڕووپووچانە نووسراو بوو، بۆیە لەسـەر کۆنگرێسـە بـۆ دووبـارە سەرپەرشتی کۆمەڵگەی هەواڵگری بکات، هاوکـات زۆرێـك لـە هەواڵگرییـەکان تێکەڵ بەیەکتر بکات، بەڵام مەبەست چییە لە دانانی بیرۆکراتییەکی دیکە لەگەڵ نوێکردنەوەی بەڕێوەبەری هەواڵگری نەتەوەیی؟ بۆچی دەستەکانی ئێـف بـی ئـای بکرێتەوە دوای ئەوەی ئەو هەموو هەڵەیان کردووە؟ بۆچی رێگە بە سی ئای ئـەی دەدەن بەپێی خودی ئەو راپۆرتە، لەوێدا هەستم بەوە کرد، کە هەڕەشـەی قاعیـدە زۆر بەرزە و هیچ حکومەتێکی دیکە بەو جۆرە نەبووە؟ یـان بۆچـی راسـپاردەکان جەخت لە لەلابردنی باڵی نیمچە سەربازی سی ئای ئەی دەکات، کە پێکهاتەیەکی یەکلاکەرەوەیە لەو کاتەی لە ۲۰۰۱-۲۰۰۲ زەبری لە دوژمن دا؟

بۆچی لیژنەکە سەیری شکستەکانی هەواڵگری نەکردووە؟ یان بۆچی باس لـە شکستە سیاسییەکان ناکـات؟ پـێم وابـوو خـودی سیاسـییەکان خۆیـان هـەموو لێژنەکەیان پێکهێناوە و دیاریان کردووە، هـەروا هـیچ خاڵێـك تیایـدا نـەبوو تـا سیاسیەکان گلەیی لە خۆیـان بکـەن، لـە کاتێکـدا هـیچ کـام لـە پیشـەگەرانی

هەواڵگری کورسییەکیان لەو لێژنەیە نییە، کارەکە بەو دەچوو لێژنەیەکی سەربەخۆ بێت بۆ پێداچوونەوە بە چاودێری تەندروستی بەڵام هیچ پزیشکێکیش لەم لێژنەیە بەشدار نەبێ.

لەوەش خراپتر لێژنە و جەماوەرەکە سی ئای ئەیان وەك تەکتیك دانابوو نابێ لە پێشبڕکێی پێکانە سیاسییەکان دابندرێ، لە کاتێکدا سی ئای ئەی هەڵەی کردووە، چونکە لەنێو هەوڵەکانی مرۆڤ کامڵبوون لە سیخوڕی و شەڕدا نییە، بەڵام سی ئای ئەی ئاگادارییەکی ستراتیژی خستبووە روو: قاعیدە دەیەوێ ئەمریکییەکان بە هەر شێوەیەك بێ بیانکوژێ هەر چەند ژمارەیان زۆر بێ، دوژمن چەندین جار ئەمەی دووبارە کردۆتەوە، هەواڵگری سی ئای ئەی زیاتر دژ بە تیرۆر بوون، کەچی بڕیاردەرانی سیاسەت پارەیەکی زۆریان خەرج کرد لە سەرکەوتنەکانی جەنگی سارد، لەپاشاندا دەسەڵاتێکی کەمیان بە سی ئای ئەی دا، لە کاتێکدا کەسێکی وەك بافێت بەرپرسیاریەتی زیاتری نەدەویست، بەڵام کۆفر وەك سەرکردەی دژەتیرۆر لەپێش ۱۱-۹ زۆر سکاڵای دەکرد لەوەی ئیمکانییەکی وایان نییە بۆ لەناوبردنی دوژمن، ریچمان وەڕس کردبوو بەوەی پێویستی بە کۆفرە تا کەرەستە و خەرجی زیاتر وەربگرین، ئەمەو ریچ و تیمەکەی ترسناکی ئەوەیان خستە روو تا بە فرۆکەیەکی کۆنی شا مەسعوود بڕۆن، چونکە ئێمە فڕۆکەکان نەبوو.

بیرم لەو شتانە دەکردەوە لەو کاتەی سەیری زیلیکۆفم دەکرد، کارەکە نێوانێکی زۆر هەبوو بەتایبەت لەنێوان کردەیەکی شاراوە و ئەکادیمیەك بۆتە راوێژکاری سیاسی، بەڵام بە هیچ شێوەیەك رقم لە زیلیکۆف و ئەندامانی لێژنەکە نەبوو، بەڵکو من ریزیانم دەگرت بە هۆی کارەکەیان، بەڵام نەك لەسەر دەرئەنجامەکانیان.

زیلیکۆف دەستی بەقسە کرد لەو نووسینگەیەی نزیك نووسینگەی کۆندۆلیزا رایسی وەزیری دەرەوە، ئێستاش ئەوە دەیەوێ بە هاوکاریی زیلیکۆف تیمێکی نوێ دابنێ.

ئەو پرۆفیسۆرێك بوو هزرێکی شیکردنەوەی شاکاری هەبوو، بەڵام کارا نەبوو لە پەیوەندییە کەسییەکان، لەپێش ئەوەی دەست بە گفتوگۆکان بکەین باسی جوگرافیای سیاسیمان کرد، نەی دەتوانی سەیرم بکات، ئەو دەی ویست بەرێز بێ و پەیوەندییەکان بهێنێتە ئاراوە، ئەو بۆچوونی منی دەویست منیش پوختەیەك لە بیرۆکەکانی خۆم پێ دا، لەوێدا هەستم بەوە کرد ئامادەیە گوێ بۆ رەخنەکانم بگرێ، پێم خۆشبوو ئەو دەویست بۆچوونەکانی من بزانێ.

تێبینی ئەوەم کرد بەراوردکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ دژەتیرۆر زۆر تەسك و کلاسیکییە، بۆیە جەخت لە چەند خاڵێك کردەوە:

" یەکەم سەرەڕایی ئەوەی دەوڵەتە نیشتمانییەکان، وەك بنەمایەکی رێکخستن دەمێنێتەوە لە کاروباری نێودەوڵەتی، ئێستا یاریزانەکان لە دەوڵەتەکانی دیکەن، وەك قاعیدە زۆر گرنگە، بۆیە پێویست بوو چەند یاریزانێکی دیکە بهێنینە ئارا، چ لە دوژمن و هاوپەیمانەکانمان، ئەمەش وەك هۆکارێك لە هزری ستراتیژیان، چونکە سەرکردایەتیکردنەکانیان یەکلاکەرەوەیە، هەروا دەبێ خۆمان ئامادە بکەین بۆ لەناوبردنی چەند سەرکردەیەکی دیکە یان بۆ هەڵسەنگاندن بێ، پێویستە نەخشەیەکی نوێ دابنێین بۆ خاکی مرۆڤایەتی، ئەمەش لە هەموو کات زیاتر بەشێکە لە دیمەنی ستراتیژی، ئەمەش پێویستی بە هەواڵگرییەکی زیاتر و باشتر هەیە".

"دووەم دەبێ هێرش بکەینە سەر دوژمن لەنێوەندی دالدە سەقامگیرەکانی، ئەمەش بەپێی بۆچوونی سیاسی نەك وەك هەواڵگری و ئۆپراسیۆنی سەربازی،

بەڵام لەناوبردنی داڵدەکانیان وەك ئامانجێکی ستراتیژی بێت، پێویستە هێزی خۆمان نیشان بدەین، بەنەرمی و بەرەقی، پێویستە داڵدە سەقامگیرەکانیان بدۆزینەوە؟ ئەم قسانەم دەکرد کاتێك نەخشەکەم نیشاندان.

"ئێرە و ئێرە و ئێرە، هەر لەسەر نەخشەکەدا ئاماژەی بە هێڵی "دوراند" و ئەفغانستان- پاکستان و کشمیر (پاکستان-هیندستان) و کەناری دەریای سولاویزی (مالیزیا-فلیپین-ئەندەنووسیا) لەتەك کەنار و ئەفریقیا و یەمەن لە دەریای سووردا تا دەگاتە رۆژهەڵات (لوبنان – سوریا. لوبنان-ئیسرائیل. ئیسراتیل –غەزە) کرد لەگەڵ ئەوەی زۆر شوێنی دیکە هەیە، بەڵام ئەوانی دیکە لە لیستی مندا نەبوون.

خاڵی هاوبەشی هەموو ئەوانە؟ هەموویان لەناوچە سنوورییەکاند بوونیان هەیە، دوژمن بەپێی جوگرافی سروشتی وسیاسی پەنا دەباتە ئەو شوێنانە، هەروا قاعیدە و حزبی ئەڵڵا دەزانن سنووری نێودەوڵەتی چۆنە بۆیە بۆ بەرژەوەندییەکانیان دەیقۆزنەوە، کەچی ئێمە وا سەیری جیهان دەکەین کە تەنیا دەوڵەتی نەتەوەین، بەڵام دوژمن بەو شێوەیە سەیری ناکات، هەروا بەو شێوەیە لە جەنگدا نییە، کە ئێمە بەستراوینتەوە بە کەلەبچەی بیرۆکراتی.

"کەی باڵیۆزەکانی باشووری ئاسیا کۆبوونەوە-واتە شانۆی دژەتیرۆر پێداچوونەوە بە دژەتیرۆر دەکەن؟ تەنیا سەیرێکی ناوچەکە بکەن، نەك تەنیا باس لە وڵاتە بەرپرسەکان بکەن؟" لێم پرسی "بۆچی تا ئێستا کۆنەبوونەتەوە".

ئەوەی بەپوختەیی خستمە بەردەستیان پێشتر لە ئەیلوولی ١٩٩٩ بە کۆفرم راگەیاندووە، تەنیا لە ئەفغانستان داڵدەکانی دوژمن کۆڕاوە، ئێستاش پاکستان گرفتی سەرەکییە، کەچی سۆماڵ و یەمەن زۆر خراپتر بووە، جەختمان لە ١٩٩٩ نەکردۆتەوە، تا بچینە ئەو ناوچانە هەواڵگری کۆبکەینەوە و کاری شاراوە بکەین،

کەچی لەپاش ۲۰۰۵ خۆمان ئامادە کرد بۆ دارشتنەوەی ئامانجە سیاسییەکانمان ئەمەش بۆ لەناوبردنی دالدەکانی دوژمن بوو، کەچی باسی ئەشکەوتێکیشمان نەکرد، کە ستراتیژی بێ.

تەنیا کێشەکە هەرێمایەتی نییە، بەڵکو پێویستە بیربکەینەوە و کار بکەین لەسەر چوار ئاستی سیاسی: ناوخۆیی و نیشتمانی و هەرێمایەتی و جیهانی.

لەو کاتەدا نەم دەزانی چۆن وەسفی کارەساتی عێراق بکەم، کە خودی ئەو وڵاتە لەنێوەندی کەڵەکەبووی ململانێیەکانە، لەو کاتەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەپێشبڕکیدا دژ بە قاعیدە، کەچی پەراوێزدەخرێ.

"سێیەم، پێویستە هەموو کەرەستەکان بقۆزینەوە بۆ هونەری فەرمانڕەوایی، ئێمە باس لە بەراوردی حکومەتێکی تەواوکار دەکەین، بەڵام نەمان کردووە، هیچ پلانێکمان نییە بۆ هێز و هەڵمەتێك زیاتر بێ لە سی ئای ئەی و سوپا، ئەمەش وا دەکا هەموو بارگرانییەکان بگرینە ئەستۆ، چی روودەدا لەپاش بڕینی ئەو هەموو گوندە و دۆڵانە؟ کارەبا و گەیاندن و چاودێری تەندروستی و پەروەردە و پەرەپێدانی ئابووری و هیوا لە کوێدا بێنین؟ ئێمە بەبێ ئەوانە ناتوانین سەرکەوتنێکی بەردەوام بەدەست بێنین، هێزە سەختەکەمان بوار و کاتمان بۆ دەڕەخسێنێ، ئەی دواتر؟

"ئێمە دوژمن و هاوپەیمانەکانمان بەتەواوی دەستنیشان نەکردووە، هیچ جیاکارییەکی تەواو لە نێو سیاسەتەکانمان دانییە، زۆر جار قاعیدە و بزاڤە ئیسلامییەکان لێك جیا ناکەینەوە، هەموو ئەمانە بەو سیفەتەی ئایدۆلۆژیایەکی سیاسییە و نەیاری دیموکراتی لیبرالیین، ئەگەر وانەبێ ئێمە لە شوێنی راستەقینەدا رووبەڕووی دوژمن نابینەوە، واتە لەناو دالدەکەی، هەروا هەموو کەرەستەکانی

دەسەڵاتەکان تێکەڵ بەیەکتری ناکەین، شکست دەهێـنین لـە هـەر سـێ ئامانجـە ستراتیژییەکان و ناتوانین بەدەستی بێنین"، لـە کۆتاییـدا گـوتم "جگـە لەوانـەش بەباشی کار دەکەین".

زیلیکۆف سەری لەقاند و خەندەیەکی کرد و گوتی " با باسێکی دیکە بخەینە روو".

"بێگومان، دەزانی لەکۆیدا بمدۆزیەوە".

وامزانی ئەمە دوا گفتوگۆمان بێ لەگەڵ یەکتردا.

لەپاش دوو مـانگ پەیوەنـدی پـێ کردمـەوە، دووبـارە لـە نووسـینگەکەی دەستمان بە گفتوگۆ کردەوە، زۆرێك لە رەخنە خرایە روو سەبارەت بە نەپێکانەکان لە عێراق لەوێـدا هـەوڵمان دا سـتراتیژیەتی خۆمـان بچەسـپێنین لـە جـەنگێکی کلاسیکیدا، بەوردتر بەرانبەر بوونەوە بە ململانێیە کەڵەکەبووەکان، ئێمـە دژ بـە هەڵمەتی تیرۆری قاعیدەین، کە پشت بە سەربازانی هەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت دەبەسـتێ، هـەموان پەیوەنـدیـان بـە یـاخیبوونی سـوونییەکان هەیـە، لەتـەك شۆڕشێکی شیعە، کە لەلایەن ئێرانەوە پشتگیری لێ دەکرێ، ئـەوان تـورێکن بـێ ئومێد بوونە لە کەسانی سەر بەرژێمی پێشوو، هەروا ئەمەش پەیوەستە بە چـەتە تاوانبارەکان، کە هەموو وڵاتیان بەتاڵان برد، ئێمە بەداگیرکردنی عێـراق خـەڵکی عێراق پێی خۆشبوو، بەڵام هەموو هاوپەیمانە عەرەبییەکانمان لە خۆمان تورە کرد.

لەو چاوپێکەوتنەدا پێم وابوو زیلیکۆف داوای شتێکی دیاریکراوم لێ بکات، دواتر لە دوو هاورێ گوێبیستی ئەوە بووم، ئەو لەجیاتی رایسی وەزیرە دەیەوێ لە پۆستی هەماهەنگی دژەتیرۆرم دابنێ، من کاندیدی یەکەمم، لەپێشتریشـدا کـۆفر رێبەر و سەرۆکم لە سەردەمی پاولی وەزیر ئەو پۆستەی بینیـووە، بۆیـە یەکسـەر

پەیوەندیم پێوە کردوو داوای ئامۆژگاریم لێ کرد، باسی ئەوەم کرد تا ئێستا پۆستە نەخراوەتە رووم، بەڵام ویستم خۆم ئامادە بکەم، لەو کاتەی رایس ویستی ئەو هەلەم پێ بدا.

کۆفر هاواری کرد "رازی بە"، "بیرت دێ کاتێك لە ئاژانس بووم چیم گوت؟ شوێنێکی شاکارە، بەڵام کاتم تەواو دەبێ بڕۆم، تەنیا جەخت لەوە بکەوە، کە تۆ تەنیا لەگەڵ رایسدا کار دەکەیت، نەك لەگەڵ کەسانی دیکە، بێگومان کار بۆ زیلیکۆفیش مەکە، تەنیا لەگەڵ رایس کار بکە، ئەو سەرچاوەی هێزتە، ئەمەو کار و پلەکەت وەك باڵیۆزێکی جولاو وایە، ئەمەش وەك نوێنەری سەرۆك وای، بۆ کوێ بڕوا تۆ لەوێت لەهەر شوێنێکی جیهاندا، تۆ نێردراوی ئەوی.

"هەروا چەند لایەنێکی خراپیشی هەیە، وەزارەتی دەرەوە دەزگەیەکە تووشی نەخۆشی وەزیفە بووە، ئاسایشی لاوازە، کارگێڕییەکەی خراپە، هەروا تیمەکەت بچووك و لاوازە، بوودجەکەت خراپە، تێگەیشتی؟".

بەروونی پێم گوت چی روونە "ئەی چی لەبارەی رووماڵکردن؟ ناگەڕێنەوە ئەمە".

"بێگومان رووماڵێکی رۆژنامەوانی دەبێ، لەوەی زیاتر بیری لێ دەکەیتەوە، ئەوە جگە لە دیبلۆماسییەتی گشتی، خۆت ئامادە بکە، بۆ ئەمە، هەروا خۆت ئامادە بکە وەك ئەوەی لە سی ئای ئەی لەدەرەوەدا، ئەوە زۆرجیاوازە، بەردەوام خۆش نییە، دەزگەی شاراوەش تەوەری هەموو گەردوون نییە".

لەپێش دوو ساڵ لەدەرەوە سەیری سی ئای ئەیم کرد، لەو کاتەی من لە کۆلیژی توێژینەوەی نێودەوڵەتی پێشکەوتوو بووم، لە دیبلۆماسیەتی گشتیدا پرسیارم کرد، بەڵام هیچ کاتێك لە خەیاڵمدا نەبووە.

له کۆفرم پرسی "کەواتە بابەتی ڕۆژنامەوانی شتێکی نامۆیە وانییە؟".

"بەڵێ زۆر نامۆیە، بەڵام دەتوانی مامەڵەی لەتەکدا بکەی، ئەوان دەتوانن پرسیارێکت لێ بکەن، بەڵام دەتوانی بە ئارەزووی خۆت وەڵام بدەیتەوە، بەساکاری تۆ زاڵی بەسەر چاوپێکەوتنەکەدا".

دوودڵ بووم، کۆفر هەستی بە دڵەڕاوکێم کرد.

"هانك تۆ کەسێکی زیرەکی، تۆ زیرەکترین کەسی لەناو دژەتیرۆری حکومەتدا، هیچ کەس لەتۆ باشتر نازانێ، تۆ لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا قاعیدە و تالیبانت لەناو برد، چەندین ئۆپراسیۆنت لە ئەفریقیا بەڕێوەبردووە، بەرامبەری کەسانی زۆر هیچوپووچ بوویتەوە، ئێستا تۆ نیگەرانی بەرامبەر بە ڕۆژنامەوانی؟ ترسنۆك مەبە، ئەو کارە نەفرتییە وەربگرە، بەڵام ئاگاداری رامسفێلد بە، ئەو کوڕی سۆزانییە، هیچ بەزەییەك نازانێ".

"بەڵێ، ئەمە دەزانم".

"تا دیدار"زۆر تووڕە بوو و تەلەفۆنەکەی لەسەرمدا داگرت.

کارەکە پەیوەست نەبوو بە رووماڵکردن و ڕۆیشتنم لە ئاژانس، بەڵکو پەیوەستە بەپاشەکشە لە خەونەکانم، لەگەڵ ئەوەی ڕێبازی سیخوڕی زیاتر جەخت لە شاردنەوەی ناسنامەی دەوێ، کەچی هەموو شتێك بەرەو ئاشکرا بوون دەڕوا، بۆیە پرۆسەی ئاشکرابوون لە ئەنجوومەنی پیران بەدیار دەکەوێ، ئەگەر کارەکە خرایە ڕووم، کارێك پێشتر نەخراوەتە ڕوو.

پێم وابوو "لەوانەیە لەو کاتەدا زۆر باش دەبم" بەبێ ئەوە ڕەنگدانەوەی هەبێ لەسەر گوێگرانم.

لەپێشتردا دڵخۆشیم داوەتە سەدان هاووڵاتی بیانی لە خانووە جیا جیاکانـدا، چ لە دانیشتن و خواردنەکان تا دەگاتە ئاهەنگە گەورەکانی نێو باخچە، کـارم لـە پرۆسەی چاودێری کردووە، نـاوی دەیـان کەسـی زانیـووە، هـەروا فێـری لێنـانی خواردنی "تاکۆ"ی گۆشتی بەراز بوومە، لەتەك لێنان و سـوورکردنەوەی گۆشـتی مامز "ئالامبالا"، ئاوم گەرم کردووە تا بەیانی ساردبێتەوە بیخۆمەوە، بۆ چـەند ساڵێك دژ بە میش و مەگەزی مەلاریا بوومەتەوە، سێ کوڕم پەروەردە کردوە لەو کاتـەی تووشـی نەخۆشـییە خراپـەکان بوونەتـەوە، کـە لـەبیانی ئـەفریقی ئـەو نەخۆشییانە باوە، لەلایەکی دیکەوە لە یەکێك لـە شـەقامەکانی ئـەفریقیا شـەڕم کردووە، لەگەڵ یەکێك ئەوانەی جانتاکان دەڕفێنن، لەو کاتەی دەسـتی منـداڵێکم گرتبوو، هەروا گریاوم بۆ لایبرۆدۆی سـەگ، لـەپاش ئـەوەی لەلایـەن یـەکێك لـە دزەکان دەرمانخواردوو کرابوو.

کارم کردووە بەبێ ئەوەی هیچ کرێیەك لەپای کارە سـیخوڕییەکانم وەربگـرم، بەتایبەت ئەو کاتانەی لە وڵـاتی بیانییـەکان بـووم، لـەو کاتـەی هاوسـەرەکەم و هاوبەشە سیخوڕەکەم پیاوەکەی ئێستا بۆتە بەرپرسێکی حکومی، هەموو ئەمانەم کردووە تا ورچەرخانێك لە ژیانم بێتە ئاراوە.

لەپاش چەند هەفتەیەك رایسی وەزیرە داوای کرد لە نهۆمی حەوتەم ببینـێ، لەوێدا چەندین کەس بوونە یاوەرم لەو کاتەی بەسەر مافوورە کۆنەکاندا تێپەڕیم تا گەیشتمە نووسینگە تایبەتییەکەی کە نەخشێندرابوو بـە داری تاریـك و مـۆبیلی پێست، لەوێدا بۆنی دەسەڵات دەهات.

بە هۆی شێوازە راسـتەقینەکەم پێشـوازی لـێ کـردم، دوو کورسـی لـەولاتر لەدوور دانیشتم، لەپێشتردا بە زیلیکۆفم راگەیاندبوو کە رازیم بە کارەکە، کەچـی ئەو زۆر ئاسـوودە نـەبوو، زۆر جـار لـە ٢٠٠١-٢٠٠٢ ئـەو کاتـەی راوێـژکاری ئاسایشی نەتەوەیی بوو زۆر جار یەکترمان بینی بوو و چـەندین جـار گفتوگۆمـان کردووە، لەوێدا زانیم بۆچوونی لەبارەی سی ئای ئەی ئەرێنی نییە.

لەو کاتەی دەستمان بە قسە کرد بیرم لـەوە کـردەوە ئـەو دەیـەوێ کارەکـان هەنگاو بە هەنگاو بکرێ، لەوانەیە بەئاگاییەوە لەگەڵم بـدوێ، چـونکە زۆر بـاش نامناسێ.

بەدواداچوونم بۆ چەند خاڵێك کرد، کە لەگەڵ زیلیکۆف باسمـان کـرد، کەچـی ئەمجارەیان پاوەرپۆینتم هێناو تا بەروونی شوێنی داڵدەکانی دوژمنـی لـە هـەموو جیهاندت نیشان بدەم، چونکە پێویستیمان بە کەرەستەکانی فـەرمانڕەوایی هەیـە بۆ بەراوردکردنی هەرێمایەتی، لەدواتر لەرایس نزیك بوومەوە تا پوختەکەی نیشان بدەم.

ئەو گوتی "رازیم ئێمە پێویستیمان بە بەراوردکاریی هەرێمایەتی هەیە".

"دەتەوێ پراکتیکی بکەم"

"بەڵێ"

پرسیم" لەکوێدا بەراستەوخۆیی کارت لەگەڵدا بکەم؟"

"بەڵێ، راستەوخۆ بۆ بەرژەوەندی من لە کاردای"، هەروا "پێویستە لەگـەڵ کەسانی دیکەی وەزارەتیش کار بکەی".

بەکورتی گوتم " بێگومان، سوپاسی تۆ دەکەم کە ئەو هەلەت بۆ رەخساندووم بۆ خزمەتکردن".

تەوقەمان کرد، کاتێك لە ژوورەکەی دەرچـووم، زانـیم وەك کـاری سـیخوڕ، کۆتایی هاتووە.

تا ئێستا پرۆسەی وردبینیی سیاسی، کە لەلایەن سەرۆك بۆش بەڕێوەجەبرێ، تا لە ئەنجوومەنی پیران بیچەسپێنێ، ئێستاش چاوەڕوانی کاری نوێم.

لەپێشتردا بە کایس و تینیتم راگەیاندووە لەبارەی جێهێشتنم لـە سـی ئـای ئەی، بۆ ئەمەش ئەوان پشتگیریان کردووم، لەو بیرکردنەوەدا بووم گەیشتمەوە ماڵ و بە سیندی هاوسەرم راگەیاند.

لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا لەلایەن ئەنجوومەنی پیرانـەوە وەك هەماهـەنگی دژەتـیرۆر دانـرام، کارەکـە هـەمووی بیسـت خولـەکی خایانـد، هـیچ پرسـیار و مقۆمقۆیەك دروست نەبوو، هەر لەوێدا سوێندم خـوارد، ئەمـەش لەیـەکی ئـابی ۲۰۰۵ بوو.

ئێستا لەتەك لایەنی سیاسیم، بەکاربەری هەواڵگریم، ئێستا هیچ شتێك نەما بە ناوی کارە شاراوەکان.

ئەم ساڵانە ئێستا وەك خەیاڵی لیّ هاتووە، کاتێك چوومە نێو سی ئای ئـەی لەوێدا فێری سیخوڕی بووم، تۆڕێك لە سیخوڕم بەڕێوە بردووە، هەواڵگری بەهادارم کۆکردۆتەوە، لـەرووی جیهانییـەوە کـاری شـاراوەم ئـەنجام داوە، فەرمانداریـەتی پیاوانم کردووە بۆ شەڕ، هاوکار بوومە لە پاتراسـتنی وڵاتەکـەم، وەك منـداڵێکی بچووك بە خەونی گەورە ژیاوم.

بە چەند ڕێگەیـەکی راسـتەقینەدا ڕۆیشـتم، بـۆ زۆر کـەس گریـاوم کاتێـك لەدەستمان داوە، لەگەڵ زۆرێك لە ترسـناکییەکانی سـیخوڕی و کـاری شـاراوە و جەنگ ژیاوم، هەروا توانیوومە هەڵەی سیاسەت لە دەرەوەم هەڵگرم.

بەڵام کاری خۆم خۆشویستووە کاتێك بە سی ئـای ئـەی دابـووم، لەوێشـەوە چەندین سەرکەوتنمان بەدەست هێناوە، شـانازیم بـەوە کـردووە بوومـە پـارێزەی دەستوور و نەتەوە مەزنەکەمان.

خـودا ئـەمریکا و سـیخوڕەکانی بپارێزێـت، چـونکە لـە هـەموو کاتێـك پێویستمان پێیەتی.

# کۆتایی

له کاتژمێر ٢٢:٢٣ به کاتی رۆژهەڵات و لە یەکی ئەیاری ٢٠١١ ریچ نامەیەکی بۆ هات و تیایدا هاتووە "بنلادن مرد"، لەو کاتێکدا ریچ لە ساڵی ٢٠٠٧ وازی له کارکردنی حکومی هێناوە، هاوکات هەڵساوە بە دامەزراندنی دەزگەیەکی راوێژکاری ستراتیژی جیهانی، لەدواتردا دۆنا لەپاش ساڵێك پەیوەندی کرد.

سەیری نامەکەی ریچم کرد، لەپاش چەند چرکەیەك بزەیەك گرتمی و سەرم لەقاند، لەپاش سیندی لە فلۆریدا، بۆ سەردانی دایکی چووبوو، منیش لە جۆرجیا بووم و سەردانی کەسانی خۆم دەکرد، هەروا سەردانی باوکم کرد، زۆر دڵخۆش بوو، هەروا لە بەیانیی یەکشەممەدا پێکەوە چووینە کڵیسا، هەر ئەو کاتەی سەیری نامەکەی ریچم کرد، دوای چەند خولەکێك سیندی تەلەفۆنی بۆ کردم؟

سیندی لێی پرسیم : "سەیری تەلەفزیۆن دەکەی؟".

"بەڵێ لەپاش ئەوەندە... لە کۆتاییدا سەیری دەکەم".

من و باوکم پێکەوە سەیری تەلەفزیۆنمان کرد، تیایدا چەندین هەواڵ باس دەکرا، لەو کاتەدا زۆرێك لە رۆژنامەوانەکان بە مۆبایل تەلەفۆنیان بۆ دەکردم، بۆیە مۆبایلەکەم کوژاندەوە.

لەپێش چەند کاتژمێرێك لەلایەکی دیکەی جیهانەوە، مغاویرەکانی دەریایی ئەمریکی بە کۆپتەرە تارماییەکان لە شاری ئابوت ئاباد دابەزیوون و چوونەتە نێو ئەو خانووەی کە ئوسامە بنلادن تیایدابووە بۆ ماوەی چەند ساڵێك، تەقەیان لێ

کردووە و کۆماندۆسێك کوڕی ئوسامەی کوشتووە و برای خزمەتکارەکەشی کوژراوە، هەروا مغاویر دەستی بەسەر تۆمارێکی زۆردا گرتووە و چەندین لەتەك چەندین فلاشی پڕ لە زانیاری و کۆمپیوتەر بۆ ماوەی ٤٥ خولەك لەسەر زەوی کەوتبوو، هیچ کام لەو شتانە تێکچووبوو، هەروا حکومەتی پاکستانی بە هیچ شێوەیەك ئاگاداری ئەو هێرشە نەبووە، تەنیا کۆمەڵە سەرکردەیەکی ئەمریکی زانیوویانە، بۆیە نهێنی هۆیەك بووە بۆ سەرکەوتن.

سی ئای ئەی ئوسامە بنلادنیان دۆزییەوە لەپاش سەدان بەڵگە و تەجنیدکردنی سەرچاوەکان و کارگێڕیکردنی تیمی یەکلایەنە و سوودوەرگرتن لە هەموو دەزگەکانی پەیوەندی بیانی، هەورا کارپێکردنی بنەمای چاودێری و شیکردنەوەی هەر کەرەستەیەك، شیکەرەوەکانی سی ئای ئەی هیچ بەڵگەیەکیان نەبوو لە بوونی ئوسامە بنلادن، کەچی لیۆن بانیتا سەرۆکی ئاژانسەکە متمانەیەکی زۆری بەخۆ هەبوو، بۆیە هەموو بابەتەکانی بە سەرۆك ئۆباما و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ ماوەی چەند مانگێك هەموو خاڵێکی بۆ روونکردۆتەوە، بۆیە رەنگەکانی هەواڵگری بۆ جارێکی دیکە بەدەرکەوتەوە، بۆ ئەمەش وەزارەتی بەرگری مغاویرە دەریاوانی ئەمریکی راسپارد لەتەك سی ئای ئەی، سەرۆك ئۆباماش رازی بووە، بۆ ئەمەش متمانەی سی ئای ئەی بەرزبۆوە، تا هەر هێرشێك بکات.

مغاویری دەریاوانی بە پێی بەندی پەنجا لە یاسای دەسەڵاتی سی ئای ئەی بەو پێیەی هێزێکە بە کاری شاراوەوە دەتوانێ بگاتە ئامانج.

بۆ ئەمەش لەناوبردنی سەرکردایەتیی قاعیدە ئامانجێکی ستراتیژییە، ئەم هێرشە بوێرە هەنگاوێکی گرنگ بوو بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، ئەمەش لەلای

هەموو قوربانیانی قاعیدە و کەسەکانیان هەنگاوێکی بەهێز بوو، ئەوە جگە لەوەی هەواڵێکی زۆر خۆشبوو بۆ هەموو پەیڕەوکارانی ئایینەکان، لەو کاتەی دادپەروەری تیایدا هاتە ئارا.

لە لایەکی دیکە دالدەی سەقامگیر ئامانجێکی دیکە بوو، لە کاتێکدا ئاستەنگ بوو بەرامبەر بە هەموو هەوڵەکانمان بەتایبەت لە ساڵانی ۲۰۰۱-۲۰۰۲، تواندرا تواناکانی قاعیدە لاواز بکەن، بەڵام کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی شکستی هێنا لەو سەرکەوتنە، کە لە یەکم جار بەدەست هات.

ساڵی ۲۰۰۵ تا ۲۰۰۷ هەستم بەو شکستە کرد، لەو کاتەی باڵیۆز و هەماهەنگی دژەتیرۆر بووم، بۆ ئەمەش قاعیدە لە هەموو روویەکەوە بەرەو پێشەوە چوو و فراوان بوو، بۆ جارێکی تالیبان کۆبوونەوە لەتەك یەکتری بۆ جارێکی دیکە نەخۆشییەکانیان بڵاوکردەوە، ئەمەش لە رێگەی هاوپەیمانە رادیکالییەکانیان لە هەموو پاکستاندا، لە ساڵی ۲۰۰٦ کاتێك چوومە پاکستان لەگەڵ ئەحمەد شریاوی وەزیری ناوخۆیی قسەم کرد، ئەو ترسی لەوە بووە تالیبانییەکان هەموو پاکستان بگرێتەوە، ئەو هەستی بە هەڕشەکە کرد، ئەو پشتۆنییەکە لە رەچەڵەك خەڵکی بیشاورە، بۆ ئەمەش چەندین جار لە کوشتن رزگاری بووە، کەچی لەپاڵ ئەودا چەندین پاکستانی ئازا و پاڵەوان کوژراون. وەك بە نازیر بۆتۆ کاندیدی سەرۆکایەتی بە دەستی قاعیدە و تالیبان و هاوپەیمانەکانیان کوژرا.

ئەو ئەفغانیانەی چوونە پاکستان ئێستا گەڕاونەتەوە و تا ۲۰۰٦ تواتنیان دەست بەسەر زۆرێك لە خاکی ئەفغانستان دابگرن، بۆیە ویلایەتە یەکگرتووەکان سووپایەکی زیاتری برد، تالیبانی لە ۲۰۱۱ بەرەو لاوازی برد، لەو کاتەی سەد

هەزار سەربازی ئەمریکی بڵاوەیان پێ کرا لەو وڵاتـەدا، بـەڵام تاکـەی ئـەمریکا ئاسایشیی ئەفغانستان بکرێتە ئەستۆ؟ تا کەی؟ هەروا سەرۆك ئۆباما لـە ٢٠٠٩ ڕێگەی دا زیاتر هێرش بکرێتە سەر بەتایبەت بۆ ناوچە خێڵەکییەکانی پاکسـتان، بۆ ئەمەش سەدان لە چـەکدارەکان کـوژران، بۆیـە زۆربـەی چـەکدارەکان بـەدوای دالدەیەکی سەقامگیردا دەگەڕان و بەشێکیان چوونە یەمەن و سـۆماڵ، بەشـێکی زۆریش چوونە پاکستان.

بەردەوامیش تاڵیبان و کۆمەڵە تیرۆریستییەکان هـەر لـە پاکسـتان بەشـێك بوون لە هەڕەشەی بەردەوام، وەك قاعیدە دەیان ویست ئەجنداکانیان بگوازنەوە بۆ سەر شانۆی ئەفغانی و پاکستانی، لەلایەکی دیکەوە چەکداری شـەباب لـە سـاڵی ٢٠١٠ لە سۆماڵ هێرشێکیان لە کامبالا کرد و ئەمەش بووە هۆی کوشـتنی ٧٤ کەس، هەروا لە حاڵەتێکدا قاعیـدە لـە یەمـەن هـەوڵیان دا نـاوی قاعیـدە لـە دوورگەی عەرەبی بەرزبکەنەوە، تا ئەو فرۆکانـە بسـووتێنن کـە بـەرەو ویلایەتـە یەکگرتووەکان دەڕوات، وەکە دانانی تەقینەوە لەناو پاکەتی مەرەکەبی پرینتەردا.

دەکرێ دوژمنێك بەو شێوە مکوڕ جەنگێکی جیهانی بهێنێتە ئاراوە، چونکە جیهان بۆ ئەو تیرۆیستانە کراوەیـە، بەتایبـەتی ئەوانـەی خاکیـان بەدەسـتەوەیە، دەبێتە هەڕەشەیەك بۆ هەموو شوێنەکانی جیهان.

کاتێك تاڵیبان و قاعیدە لە فەرمانڕەوایدا بن، چاودێری و خوێندن لەو ئاستە دانییـە، بـەڵام کاتێـك ئێمـە لـە ئەفغانسـتاندا بـووین دە لـە سـەدا چـاودێری تەندروسـتیی بـۆ خـەڵکی ئەفغانسـتان هـەبوو، لەتـەك ئـەوەی فـەرمانڕەوایی ئەفغانستان و پەرەپێدانە ئابوورییەکەی هێدی هێدی بەرەو لاوازی دەڕوا، بۆ نموونە هاوکاری ئەمریکی شکستی هێنا بەوەی لـە مـاوەی دە سـاڵ ١٥ ملیـۆن دۆلاری

تەرخان کردووە بۆ هاوکاری ئەفغانییەکان تـا دەسـەڵات بتـوانێ یاسـا جێبـەجێ بکات، بۆ ئەمەش بانکی نێودەوڵەتی رای گەیانـد کـە ٩٧ لـە سـەدا بەرهـەمی ناوخۆیی بە هۆی یارمەتیی دەرەکییەوەیە، ئەمەش بە هۆی گەنـدەڵی و ناکـارایی بوونە، لەوانەیە نیوەکەی دیکە بە هۆی بازرگانی تلیاکەوە بێ، بۆیـە زۆرێـك لـە گەلی ئەفغانی نەیان ویست بگەڕێنەوە ئەفغانستان، چونکە دەیان ویست ئاسایش و فەرمانی یاسا بگەڕێتەوە بۆیە نایانەوێ قاعیدە لە وڵاتەکـەیان بـوونی هـەبێ، لەلایەکی دیکەوە زۆرێك لە چەکدارەکانی تاڵیبان نایانـەوێ لـە دەرەوی سـنووری وڵاتەکەیان بجەنگن.

هەمووان دەزانن زۆرێك لە کۆمەڵە رادیکاڵییەکان لە جیهاندا پەیوەندیان بـە قاعیدەوە هەیـە، لـە زۆر شـوێنی وەك رۆژهـەڵاتی ئاسـیا و عێـراق سـەرکەوتن بەدەست هاتووە، سەبارەت بە پەیوەندیی کۆمەڵەکانی دیکە بە قاعیدەوە ئەوا رۆژ بە رۆژ ئەمە پەرەدەسێنێ، کاتێك بۆم دەرکەوت کە لە یەکێك لە کارەکانم بـووم و لەو کاتەی پۆستی هەماهەنگی دژ بە تیرۆرم وەرگرت.

نەتواندرا وەك بـەهاری عـەرەبی دژ بـە قاعیـدە بجوولێنـەوە، چـونکە ئـەم راپەڕینانە هیچ پەیوەندی بە قاعیـدە نـەبوو، لەسـاڵی ٢٠١١ بـەهاری عـەرەبی هاتەکایەوە، بەمەش زۆرێك لە حکومـەتی داپڵۆسـێنەری وەك تـونس و لیبیـا و میسر رووخا، هەروا گەلی یەمەن و سووریا هاتنـە سـەر جـادە، ئـەم شـۆڕانەش هـەمووی بـۆ گەڕاندنـەوەی کەرامـەت و دادپـەروەری بـوو، دیـارە تۆڕەکـانی کۆمەڵایەتی رۆڵی هـەبوو لـە گردبوونـەوەی ئـەو هـەموو خەڵکـە، گەلـەکان لێ نەگەڕان قاعیدە ئەو هەلە بقۆزێتەوە، بەڵام پرسیارەکە لێرەدایـە ئـەو هاووڵاتییـە یاخیبووانە دەتـوانن دەزگـای لیـبرالی دابمـەزرێنن، یـان ئیخـوان موسـلمین ئـەو شورشەیان لێ دەدزێ؟ ئایا قاعیدە روویەکی فراوانی دیکەی دەستکەوێ تا مـانۆڕ

بکات؟ ئایا هێرشێکی دیکە بۆ سەر خاکی ئەمریکی دەکرێ، لە کاتێکدا تیرۆیستە پێگەیشتووەکان خۆیان بە رادیکالی دەزانن؟

بەهاری عەرەبی بە هۆی ڕێڕەوی قەیرانی ئابووری لە ڕۆژئاوا هاتەئاراوە بەتایبەتیش لە باشووری ئەورووپا، لە کاتێکدا گەشەسەندنەکان لە چین و هیندا بەرەو پێش دەچوو، هەروا هێزەکانی وەك بەرازیل و ئەندونسیا هەلێکی جیایان وەرگرت بۆ پەرەپێدانی ئابووری.

لەلایەکی دیکەوە تەکنەلۆژیا دەسەڵات دەگرێتە ئەستۆ و یاریزانی دیکە دەوڵەتیش نین هەندێکیان باشن و هەندێکیش دڕندە لەو دۆخەدا سەر دەردێنن، ئەگەر کارەکە پەیوەست بێ بە عەرەبانچییەکی توونسی کاتێك تووشی خراپەکاری بۆوە، لەو کاتەدا خۆی سووتاند هۆیەك بێ بۆ هەڵگیرسانی بەهاری عەرەبی، یان پەیوەست بێ بە هەندێك ئاژاوەگێڕی ویکیلیکس، کە هۆیەك بوو بۆ شکاندنی دیبلۆماسیەتی ئەمریکی، بەڵام هەموو ئەمانە بوونەتە هێزێکی جیهانی ناهاوتا.

ئێستا جیهان بەتایبەت لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەك زیاتر بەرەو ئاستەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە دەچێ، پرسیارەکە لێرەدایە ئایا یەکێك لە کۆمەڵەکان دەبێتە قاعیدەیەکی دیکە؟ ئایا خاکی ئەمریکا ڕووبەڕووی هێرشی دیکە دەبێتەوە، لەو کاتەدا چۆن بەرپەچیان بدەینەوە؟ ئایا ئێران چەکی ئەتۆم بەدەست دێنێت و رادەستی بریکارەکانی وەك حزبی ئەڵڵا دەکات؟ ئایا لە عێراق حکومەتێکی دیموکراتی دێتە کایەوە و لەپاشاندا ئەو حکومەتە بژی تا پێداویستی هاووڵاتییانی دابین بکات؟ ئایا مەکسیك بەرەو گەشانەوە دەڕوا تا ببێتە کۆمەڵگەیەکی دینامیکی لیبرالی و خاوەن بازاڕێکی ئازاد؟ یان ئەوەتا ئەوانەی بازرگانی بە تلیاکەوە دەکەن بە ناوی دەوڵەت قسە دەکەن؟ ئایا ئاسمانیی

ئەنتەرنێت سەقامگیر دەبێ؟ ئایات رووسیا گەندەڵی لەناو دەبات و دەبێتە هێزێکی ئابووری بەردەوام.

کاریگەری تەکنەلۆژیا زانست و زیرەکی دەستکردی رۆبۆتی و نانۆ بەرەو کوێ دەڕوا لە کاتێکدا ئێمە لە جیهانی ئابووری و بازرگانی جیۆسیاسیداین؟ واتە داهێنەر و پیاوانی کار وەرچەرخانێ تەکنەلۆژیا دەکەن، تا وزەی نەرمان پێ ببەخشێ بە پشتگیرییەکی نوێکار؟ هەروا ویلایەتە یەکگرتووەکان چ کارێك دەکات لەرووی ئاسایشی نیشتمانی: ئابووری و فێرکردنی هاووڵاتییەکانی؟

زۆر جار هەمەرەکی و ناباوەڕی دەبێتە هۆیەك بۆ گۆڕانکاری خێرا، بەمەش نیگەرانی و ترس دێنێتە کایەوە، بەڵام هەر گۆڕانکارییەك لە بەرژەوەندی ئەمریکادایە، چونکە نەخشەی دەستوور و دەزگەکانمان بۆ خۆگونجاندن دانراوە، زۆری دیکەمان لەپێشە لەوانەیە ئەمەش بە بوونی هاووڵاتی بەهێز دێتەکایەوە، چونکە ئەوان لە مامەڵەدا نەرمونیانن و دەبنە سەرۆکێکی شایستە، ئێمە پێویستیمان بەو سەرۆکانە هەیە راستی لەنێوەندی هزر و وتاری سیاسیاندا هەبێ تا حکومەتێکی واقیعی دابنێن، ئەمەش هەموو لایەك دوور بخاتەوە لە خۆبەگەورەزانین و نەزانین و ئایدۆلۆژیای پێچەوانە چ لەلای چەپەکان یان لە لای راستڕەوەکان، ئێمە پێویستیمان بە سەرکردەی وەك واشنتن و لینکۆلن هەیە، تا لە هەواڵگری تێ بگەن و بەرپرسیاریەتییەکە بگرنە ئەستۆ.

پێویستە سەرکردەکانمان ئاگاداری هەموو شتێکی ئەو جیهانە بن، کە رۆژ بە رۆژ بەرەو ئاڵۆزی دەڕوات، ئەو کات پێویستیان بەو زانیاریانە دەبێ، کە لەو کاتەدا پێویستە، واتە ئەو زانیاریانەی شی کراوەتەوە، دەبێ ئامانجی سەرکردەکان دیاریکراو بێ تا ببێتە کردەیی، بەکاربێت، بۆ ئەمەش پێویستمان بە زانیاری

هەواڵگری باش هەیە، کە شێوەی لە هونەرە جوانەکان بچێت، کە تەنیا خاوەنەکەی تێ دەگات و بەهاکەی دەزانێ.

چەند وتەیەك لکێنراوە بە ئەرستۆ، کە دەڵێت: "هونەر، ئامانجی نواندنی رووە دەرەکییەکەی نییە، بەڵکو پەیوەستە بەو مەبەستانەی دەیەوێ بیخاتە روو"، بە هەمان شێوە هەواڵگریش بەو جۆرەیە.